# دەوڵەت و كۆمەڵگای مەدەنی



توێژینەوەیەك سەبارەت بە تیۆرە سیاسییەكان



نیرا چاندۆک

وەرگێڕانی
یوسف عەلیپوور



# دەوڵەت
# و
# کۆمەڵگای مەدەنی

## توێژینەوەیەك سەبارەت بە تیۆرە سیاسییەکان

**نیرا چاندۆك**

**وەرگێڕانی**

**یوسف عەلیپوور**



## خانەی موکریانی بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە

● **دەوڵەت و کۆمەڵگای مەدەنی (توێژینەوەیەک سەبارەت بە تیۆرە سیاسییەکان)**

● **نووسینی: نیرا چاندۆک**

● **وەرگێڕانی:** یوسف عەلیپوور

● **نەخشەسازی ناوەوە:** گۆران جەمال رواندزی

● **بەرگ:** رێمان

● **نرخ:** ٥٠٠٠ دینار

● **چاپی یەکەم ٢٠١٤**

● **تیراژ:** ٧٥٠ دانە

● **چاپخانە:** موکریانی (هەولێر)

● **لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانەکان ژمارەی سپاردنی(١٦)ی ساڵی (٢٠١٣) پێدراوە.**

**زنجیرەی کتێب (٨٣٨)**

## ناوەڕۆك

## سەبارەت بە دەوڵەت و کۆمەڵگای مەدەنی:

دەوڵەت دیاردەیەکە کە هزری بیرمەندە سیاسییەکانی بەخۆیەوە خەریك کردوە، چونکە هەر لە سەردەمی ئەفلاتونەوە تا ئێستا، لە زۆربەی پرسیارەکانیاندا رۆڵێکی سەرەکی هەبووە. دادپەروەری چییە؟ کام رێوشوێنی بنەڕەتی، گەرەنتی ژیانێکی باش دەکات؟ متمانە بەخۆبوونی مرۆڤ چۆن دەپارێزرێت؟ ئەخلاقی سیاسی چۆن بەدی دێت؟

پرسیاری لەم چەشنە هەمیشە پەیوەندی بە شوناس و فۆرمی دەوڵەتەوە هەیە، وەك دەسەڵاتێکی رێکخراوی سیاسی. لەبەر هەندێ هۆکاری جۆراوجۆر دەوڵەت گرنگترین تەوەر بووە لای بیرمەندە سیاسییەکان. لە لایەکەوە چونکە بیرمەندە کلاسیکییە سیاسییەکان خەختیان لە سەر ناوەرۆکی ژیانێکی شیاو کردۆتەوە و بیریارە پەیوەندیدارەکان هەوڵیانداوە کە ئەو چەشنە رێوشوێنە بنەڕەتیانە ــ و دەوڵەت لە چەقی ئەو رێوشوێنانەدا ـــ نیشان بدەن کە بۆ گەشەی مرۆڤ و دابینکردنی پێداویستیەکان و وەدیهاتنی تواناکانییان پێویستە. بێگومان دەوڵەت لە لێکدانەوە سیاسی، کلتوری، کۆمەڵایەتی و ئابوورییەکاندا، گرنگترین رۆڵی هەبووە. هەر بۆیە بۆ روونکردنەوەی هەر پرسێك کە لە شوێنێکدا هاتودتە گۆڕێ، هەمیشە ئاوڕیان لە دەوڵەت داوەتەوە.

بەڵام هەر ئەو ناوەندێتییەی دەوڵەت، وایکردوە کە بیرمەندەکان چۆنیەتی راڤەکردنی دەوڵەت لەبیر بەرنەوە، واتە ئەوەی لە بیر بردوونەتەوە کە بۆ ناسینی دەوڵەت لەکوێوە دەبێ دەست پێبکەن. زۆربەی بیرمەندەکان بە پشت بەستن بە شێوازی بەڕێوەبەرایەتی، زۆرەملێ و ئایدۆلۆژییەکانی دەوڵەت، خۆیان لەو پرسە دزیوەتەوە. لە راستیدا ئەوان پێیانوایە کە دەوڵەت بە مانای حکومەت یان سەروەریە. بەڵام هێشتا وەڵامی ئەو پرسە نادەنەوە کە بۆچی هەر دەوڵەتێك هەڵسوکەوتی تایبەت بەخۆی هەیە؟ ئەگەر سەرجەمی دەوڵەتەکان خاوەنی دەسەڵاتێکی رەهان و کارێکی دیاریکراویش بەڕێوەدەبەن، کەواتە سەرجەمی دەوڵەتەکان دەبێ هاوشێوەی یەکتری بن. بەڵام وانییە و دەوڵەتەکان لە بواری چۆنیەتی هەڵسوکەوت، پاشەکەوت کردن و رێکخستن و چۆنیەتی بەکارهێنانی دەسەڵاتی سیاسییەوە جیاوازن. ئاشکرایە کە بۆ ناسینی دەوڵەت دەبێ چاو لە شتێکی بەدەر لە خودی ئەو دامەزراوەیە (لە مانا بەرتەسکەکەیدا) ــ واتە چاو لە کۆمەڵگای مەدەنی ـــ بکرێت. ئەو پرسە رووبەڕووی

کۆمەڵێك پرسیاری دیکەمان دەکاتەوە: کۆمەڵگای مەدەنی چییە؟ دەوڵەت و کۆمەڵگای مەدەنی چ پەیوەندییەکیان پێکەوە هەیە؟ لە هەمووانیش گرنگتر ئەوەیە کە کۆمەڵگای مەدەنی چ تایبەتمەندییەکی هەیە کە دەبێ بۆ ناسینی دەوڵەت چاو لە کۆمەڵگای مەدەنی بکەین؟

بۆ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە دەبێ بزانین کە دەوڵەت ماناکەی زۆر لە دەسەڵات و سەروەری بەرفراوانترە، چونکە دەوڵەت هەمیشە بە دیاریکردنی چوارچێوەی سیاسی هەوڵدەدات ئەندێشە یان کردەوە سیاسییەکانی کۆمەڵگا کۆنترۆڵ و بەرتەسك بکاتەوە. بە واتایەکی دیکە دەوڵەت هەوڵدەدات چوارچێوەی گوتاری سیاسی دیاری بکات. سەرەڕای ئەمانەش سیاسەت بە مانای بیر و هزرە تیۆرەکان کە رۆڵی پەیوەندیی نێوان دوو پانتایی ئەزموونی و تیۆری دەگێڕێت، تەنیا تایبەت نییە بە کۆنترۆڵ و دیاریکردنی سنوورەکان، بەڵکو بەزاندنی ئەو سنوورانە و گۆڕان و بنیاتنانەوەی ئەو چوارچێوە سیاسییەش دەگرێتەوە. دەکرێ ئەو جێگایەی کە ئەم نێوەندی و کێشمەکێشەی تێدا بەڕێوە دەچێت و ئەو شوێنەش کە تێیدا کۆمەڵگا و دەوڵەت پەیوەندی دەبەستن، بە کۆمەڵگای مەدەنی ناو بەرین.

بەهاکانی کۆمەڵگای مەدەنی بریتین لە: بەشداریی سیاسی، وەڵامدانەوەی دەوڵەت و گشتی بوونی سیاسەت (هەر لە بەر ئەوە لەم کتێبەدا دوو چەمکی کۆمەڵگای مەدەنی و پانتایی گشتی بە هاوواتا بەکار دەهێنم).[1] دامەزراوەکانی کۆمەڵگای مەدەنی بریتین لە ئەنجوومەن و نوێنەرایەتییەکان، میدیای سەربەخۆ و ئەنجوومەنە کۆمەڵایەتییەکان. ئەندامانی کۆمەڵگای مەدەنی هاووڵاتین، واتە ئەو کەسانەی کە خاوەنی ماف و پلەوپایەیەکی یاسایی دیاریکراون. چەمك و بنیاتی "مافەکان" ئامانجیەکە بۆ پشتیوانی لە ئەندامانی کۆمەڵگای مەدەنی.

---

١- ئەم مانایەی کۆمەڵگای مەدەنیمان لە نەریتی فیکری مۆنتسکیۆ، دوتۆکڤیل و هابرماس وەرگرتووە. ئەو مانایە باس لە پێویستیی هەبوونی پانتایی تیۆری لە نێوان خێزان و دەوڵەتدا دەکات، ئەو پانتاییەی کە بۆ بەرزکردنەوەی کلتورێکی سیاسیی دیموکراتی لە رێکخراوە کۆمەڵایەتییە تایبەتیەکان پێکهاتووە. بە پێی ئەو گوتارە تایبەتیە، دیموکراسی پەیوەندی بە سیاسی بوونەوەی گرووپەکانی دەرەوەی دەوڵەتەوە هەیە، نەك بەخودی دەوڵەتەوە. ئەو گوتارە دەبێتە هۆی کاری هاوبەش، خۆڕێکخستن و رێزگرتن لە ئەندامانی دیکەی کۆمەڵگای مەدەنی ــ بە هەر رادەیەکیش کە بەرژەوەندی و تێگەیشتنەکانیشیان جیاواز بن.

بە بیٚ پشتیوانی کردن لە مافە سەلمێنراوەکان (کە شیاوی جێبەجیٚ کـردنن) وەك، ئـازادی رادەربڕین، ئازادیی کۆڕ و کۆمەڵەکان، ئازادی بیروباوەڕ و ئازادیی دروسـتکردن و بانگەشـەی ڕای گشتی، کۆمەڵگای مەدەنی ئیفیلج دەبیٚ. کۆمەڵگای مەدەنی بەم چـەمکانە ـــ مـاف، سەروەریی یاسا، ئازادی و هاوولاتیبوون ـ جۆرە گوتـارێکی عـەقلانی و رەخنـەیی دروسـت دەکات کە دەتوانێت لە دەوڵەت بپرسێتەوە. هەر لە سەر ئەم بنەمایە، لە هزری دێموکراتیدا، وەك یەکێك لە پێویسـتیە سـەرەکییەکانی دیموکراسـی جـەخت لەسـەر کۆمـەڵگای مـەدەنی کراوەتەوە. هەر لە بەر ئەو هۆیەشـە کـە دەوڵەتـە دەسـەڵاتخوازەکان تێدەکۆشـن کۆمـەڵگای مەدەنی سەرکوت بکەن. بوونی کۆمەڵگای مەدەنی یەکێکە لە تایبەتمەندییـەکانی دەوڵـەت و کۆمەڵگا دێموکراتییەکان.

بەڵام پێویستە ئەوە بزانین کە بوونی کۆمەڵگای مەدەنی بەو مانایە نییە کە هەمیشە لەگەڵ دەوڵەت رکەبەرایەتی دەکات یان سنوورە دەوڵەتییەکانی پانتایی سیاسی دەبەزێنێت، بەواتایەکی دیکە بوونی کۆمەڵگای مەدەنی لەوانەیە بۆ دیموکراسی پێویست بێت، بەڵام هەموو شتێك نییە. هەر بەم شێوەیەی کە کارە تیۆرییەکانی گرامشـی دەریدەخـەن، کۆمەڵگایـەکی مـەدەنی کـاتیٚ تووشی هێژمۆنی بوویێت دەبێتە ئامرازێك بەدەسـت دەوڵەتـەوە بـۆ کـۆنترۆڵی کـار و ئەندێشـە کۆمەڵایەتییەکان، جەوهەری کۆمەڵگای مەدەنیش لە لایەن بـیر و ئەندێشـەی ئەندامەکانیـەوە دیاری دەکرێت. ئەو بیر و ئەندێشانە لەوانەیە کۆمەڵگای مەدەنی بخەنە ژێر رکێفـی دەوڵەتـەوە، بەڵام هەر بەو چەشنەش ئەندامانی کۆمەڵگای مەدەنی دەتوانن پەی بە تواناکانی خۆیان ببەن بۆ رکەبەرایەتی لەگەڵ ئەو بۆچوونانەی کە پشـتگیری لـە دەوڵـەت دەکـەن. بـۆ گـەرەنتی کردنـی وەڵامدانەوەی دەوڵەت، بوونی کۆمەڵگای مەدەنی بایەخێکی زۆری هەیە، بەڵام هـەموو شـتێك نییـە. وەڵامدانـەوەی دەوڵـەت بەسـتراوەتەوە بـە خودوشـیاری، زیندوویـەتی و تێگەیشـتنە سیاسییەکانی ئەندامانی کۆمەڵگای مەدەنییەوە. پاسیڤبوونی کۆمەڵگای مەدەنی دەبێتە هـۆی سەرهەڵدانی ئەو دەوڵەتانەی کە وەڵامدەر نین، بەڵام خودوشیاریی سیاسیی کۆمـەڵگای مـەدەنی هێندێك سنوور بـۆ دەسـەڵاتی دەوڵـەت دروسـت دەکـات، ئەگـەریش ئەندێشـە سیاسـییەکانی کۆمەڵگایەکی مـەدەنیی خودوشـیار سـنوورەکانی گوتـاری سیاسـیی جێـی پەسـندی دەوڵـەت ببەزێنێت، دەوڵەت لە گەڵ قەیرانی شەرعیەت بەرەورِوو دەبێت.

شەرعیەتی دەوڵەت تا کاتێك بەردەوام دەبێت کـە "خـەڵکانی سیاسـی" ـــ بەبۆچـوونی هابرماس ـ سنوورەکانی جێی پەسندی دەوڵەت پەسند بکەن و چـالاکیە سیاسـییەکان لـەو

چوارچێوە دیاریکراوانەدا بەرێوە بچن، بەزاندن یان گۆڕینی ئەو سنوورانە ساتەکانی لێکترازان یان خاڵی وەرچەرخانی ژیانی سیاسیی کۆمەلگایەك دروست دەکات. ئەم خاڵی وەرچەرخانانە یان دەبنە هۆی گۆڕان و دارِشتنەوەی شێوازی کاری دەوڵەت یان دەبنە هۆی ئەوەی دەوڵەت متمانەی خۆی لە دەست بدات. بەم جۆرە سیاسەت و گوتارە سیاسییەکان بە گۆڕینی سنوورەکان و ناتەبایی بۆچوونەکانی کۆمەلگای مەدەنی، لەگەڵ شرۆڤەی دەوڵەت لە سەر پانتایی سیاسی سەروکاریان هەیە. ئەوان لەگەڵ لێکدانەوەیەکی نوێ بۆ کۆمەلگای سیاسی و چوارچێوەی گشتی و لە ئاکامدا لەگەڵ بنیاتنانەوەی گوتاری سیاسی بەرەوروون. ئەندێشە سیاسییەکان پەیوەستن بە پێکهاتنی فۆرمە نوێیەکانی سیاسەت و نیشانی دەدەن کە گوتاری سیاسیی جێی پەسندی دەوڵەت نابێ وەك دوایین قسە سەبارەت بە ریزبەندییە سیاسییەکان سەیر بکرێت. ئەمان پەیوەستن بە شەرعیەتی دەسەڵاتی دەوڵەت. بە کورتی سیاسەت سەروکاری لەگەڵ کێشمەکێش و ئاڵوویری کۆمەلگا و دەوڵەت هەیە، ئەو جێگایەی کە ئەم رووبەڕووبوونەوەیەی تێدا روو دەدات، کۆمەلگای مەدەنییە.

ئەمە رێك بنەمای هەوڵەکانی ئەم دواییانەیە بۆ زیندووکردنەوەی کۆمەلگای مەدەنی و گەڕاندنەوەی بۆ چەقی بەرنامە و هزری سیاسی. ئەوە راستە کە گەڕانەوەی کۆمەلگای مەدەنی بۆ دەستەواژە سیاسییەکان تا رادەیەك دەرەنجامی گەلاڵە نیولیبراڵییەکانی وەك بەتایبەتیکردن، ئازادسازی یان سڕینەوەی رێساکان و نادەوڵەتیکردن بووە کە بە دوای "پاشەکشەکردن بە دەوڵەت"ەوە بوون. بەڵام بەهێزبوونی کۆمەلگای مەدەنی دەتوانێت ببێتە هۆی ئازادی هێزەکانی بازاڕ و پاشەکشەی دەوڵەت لە چالاکییە کۆمەڵایەتییەکاندا، لێ ئەم بەرنامەیە پشتی بە لێکدانەوەیەکی زۆر ناتەواو و بەرتەسکی کۆمەلگای مەدەنی بەستوە. چەمکی کۆمەلگای مەدەنی لە بواری مێژوویی و سیاسییەوە مانایەکی زۆر لەوە فراوانتری هەیە و هزری رادیکاڵ بەشوێن پێداچوونەوە و زیندووکردنەوەی ئەو تێگەیشتنەوەیە.

لە روانگەی بیرمەندە رادیکاڵەکانەوە، ناکرێ زیندووکردنەوەی کۆمەلگای مەدەنی لە پلانە رزگاریبەخشەکان دەربهاویژرێتە دەرەوە. نائومێدی زۆر سەبارەت بە ئەندێشە سیاسییەکانی دەوڵەت بوو بە مایەی ئەوەی هێنانەئارای پلانێکی رزگاریبەخش، وەك پێویستی خۆی دەربخات، ئەم نائومێدیە بووەتە هۆی جەخت کردنەوەی سەرلەنوێ لە سەر سیاسیبوونی ئەندامانی کۆمەلگای مەدەنی. ئەم هەوڵانەی کە بۆ زیندووکردنەوەی کۆمەلگای مەدەنی بەرێوە دەچن، لەو باوەڕەوە سەرچاوەدەگرن کە کۆمەلگایەکی مەدەنی خودوشیار، بە پێی پێویست دیموکراسیش لەگەڵ خۆیدا

دێنێت. دەکرێ بگوترێت کە لایەنگرانی کۆمەڵگای مەدەنی بەردەوام باس لە هاندانی چالاکیی سیاسی دەکەن، واتە ئەو شتەی کە وەڵامدانەوە و هەست بە بەرپرسیارێتی کردنی دەوڵەت دەستەبەر دەکات و یارمەتی بە بونیاتنانەوەی سیاسەتی رادیکاڵ دەکات لەو کۆمەڵگایانەدا کە روانگەی دەوڵەت بە توندی نەیار بووە لەگەڵ مافی دەنگدان و سیاسەت. گوڵنەر ئەوەمان بیر دەخاتەوە کە "بێ بوونی کۆمەڵگایەکی مەدەنی بەهێز کە بتوانێت پانتایی گشتی بەهێز بکات و لە بەرامبەر دەوڵەتی بەهیموت ئاسادا (ئاژەڵێکی دێوەزمەئاسایە کە لە ئەفسانە عیبریەکاندا هەیە، شتێکی وەك لڤیاتانی هۆبزە) پەناگەیەك دروست بکات، رزگاربوون لە دونیای مۆدێرن بە هیچ شێوەیەك بەدی نایەت" (٥٩، ل٣٧١). وا پێدەچێت کە کۆمەڵگای مەدەنی بتوانێت ئەو بەرنامەیە بەرەو پێش ببات، چونکە لە رووی مێژووییەوە لەگەڵ کۆمەڵێك هەوڵ و کۆشش بۆ کۆنترۆڵی دەوڵەت و دۆزینەوەی بەهای رەخنەگرانەی کردەوە و ئەندێشەکانی دەوڵەت هاورێ بووە.

ئێستا ئەگەر روانگە سیاسییەکانی دەوڵەت تا رادەیەکی زۆر پەیوەندییان بە هێزی کۆمەڵگای مەدەنییەوە هەیە و ئەگەر دەوڵەت بەهەمان رادە کە دەیەوێ کاریگەریی لە سەر کۆمەڵگای مەدەنی هەبێت، هەر بەو رادەیەش دەکەوێتە ژێر کاریگەریی کۆمەڵگای مەدەنی خودوشیار، کەوابوو بە بێ تیۆرێك سەبارەت بە کۆمەڵگای مەدەنی ناکرێ تیۆرێکی جێی متمانەمان سەبارەت بە دەوڵەت هەبێت. خستنەڕووی تیۆرێك سەبارەت بە دەوڵەت، پێویستیی بە خستنەڕووی بۆچوونێکەوە هەیە سەبارەت بە چۆنیەتی هەمووارکردنی سنوورەکانی گوتاری سیاسیی جێی پەسندی دەوڵەت لە لایەن سنوورەکانی جێی پەسندی کۆمەڵگای مەدەنییەوە (ئەوە تەوەری پاژی دواترە).

کەواتە لێکدانەوەیەك کە تێیدا دەوڵەت سەنتەرە و بەشێوەیەکی جیا لە کۆمەڵگای مەدەنی، جەخت لە سەر دەوڵەت دەکاتەوە، زۆر ناتەواوە.[٢] ئەو لێکدانەوەیە لەم رووەوە ناتەواوە کە پەیوەندی دیالکتیکی نێوان دەوڵەت و کۆمەڵگا وەبەرچاو ناگرێت. هەربۆیە، ئەو لێکدانەوەیە بەر بە کارلێکی ئاڵۆزی دەوڵەت و کۆمەڵگا دەگرێت، چونکە تێیدا سەرنج نادرێتە سەر چۆنیەتی کاریگەری دەوڵەت لەسەر بەرنامە سیاسییەکانی کۆمەڵگای مەدەنی و هەروەها سەرنجیش نادرێتە سەر چۆنیەتی کەوتنە ژێر کاریگەری دەوڵەت بۆ ئەو بەرنامانە و

---

٢- ئەو لێکدانەوەیە دەکرێ بە تێگەیشتنی دەوڵەتتەوەر ناو ببرێت، بە باشترین شێوە لە ژێدەری ژمارە ٤٥ ی پێرستی سەرچاوەکاندا هاتووە.

چۆنیەتی بەهێزبوون و لاوازیی دەوڵەت و کۆمەڵگای مەدەنی لە لایەن یەکتریەوە و بە چۆنیەتی پوچەڵکردنەوەی بەرنامەکانی دەوڵەت لە لایەن کۆمەڵگاوە. لە راستیدا لە لێکدانەوەی دەوڵەتتەوەردا، بەبێ سەرنجدان بە (ناوڕدانەوە لە) کۆمەڵگە و هۆکارەکان و مەرجەکانی پەسندکردن، لەگەڵ دەوڵەتدا بەرەووڕووین. ئەو لێکدانەوەیە گیرۆدەی چەشنێك کورتبینییە، چونکە چۆنیەتی بێ متمانە بوونی دەوڵەتەکان ـــ واتە دیاردەکانی وەك بێ متمانەبوونی دەوڵەتە داگیرکەرەکان و یان بێ متمانەبوونی دەوڵەتەکانی خۆرهەڵاتی ئەوروپا لە دەیەی ١٩٨٠ بەهۆی سەپاندنی داهێنانە سیاسییەکان لە لایەن کۆمەڵگاوە بە سەر دەوڵەتدا ـــ نیشان نادات.

بەڵام لێرەدا دەبێ هەڵوەستەیەك بکەین. هزری دێموکراتی بە دروستی جەختی لە سەر گرنگیی کۆمەڵگای مەدەنی کردۆتەوە، چونکە هەر لێرەدایە کە دەکرێ کەشێکی سیاسی پێك بێت بۆ کۆنترۆڵکردنی دەوڵەت. سەرەڕای ئەوەش کۆمەڵگای مەدەنی تەنیا کاتێك دەتوانێ ئەو بەرنامەیە بەرەوپێش بەرێت کە بۆ خۆیشی دێموکراتی بێت. لە رووی لۆژیکیەوە، ئەگەر کۆمەڵگای مەدەنی خۆی ناوەرۆکێکی نادێموکراتیی هەبێت، ناتوانێت بەشێوەیەکی ئەوتۆ داوای دەوڵەتێکی دێموکراتی بکات. لە راستیدا بوونی دەوڵەتێکی دێموکراتی، پێویستیی بە هەبوونی کۆمەڵگایەکی مەدەنی دێموکراتی هەیە. گرفتی گوتاری لیبراڵی کە جەخت لە سەر کۆمەڵگای مەدەنی دەکاتەوە، ئەوەیە کە تایبەتمەندییەکی داخراو و دووری هەیە، واتە لە دەوری پرسە شکلیەکانی ماف، بەشداری و دیموکراسی سیاسی دەخولێتەوە. ئەو گوتارە زۆر کاری بە سەر توانین یان نەتوانینی ئەندامانی کۆمەڵگای مەدەنییەوە نییە بۆ بەشداری لە بواری گفتوگۆ و رووبەڕووبوونەوە لە بارودۆخێکی یەکساندا. ئەم گوتارە نیشانەی چەشنە واتاسازییەکی بەرایییە.

ئەو گوتارە دەبێ لە رێگەی روانگەیەکی رەخنەگرانەوە پەرەی پێ بدرێت و ئەمە بەرهەمەکانی "هیگڵ، مارکس و گرامشی"ن کە لێکدانەوەیەکی جوانتریان لەکۆمەڵگای مەدەنی بەدەستەوە داوە. ئەو نووسەرانە نیشانیان داوە کە کۆمەڵگای مەدەنی لە جیاتی ئەوەی گۆڕەپانی دیموکراسی، ئاشتی و چاکخوازی بێت، بە ئاشکرا ئەندامانی خۆی سەرکوت کردوە. هەروەك لە بەشی ٥ دا باسی کراوە، ئەوە بەو مانایەیە کە کۆمەڵگای مەدەنی وەك بواری گشتی سیاسەتی تیۆری، چوارچێوەیەکی گشتی سنووردارە، چونکە ئەو کەسانەی کە

سەرکوت کراون یان خراونە پەراوێزەوە، بەناچاری لە وتوێژە "دێموکراتییەکان" دەخرێنەدەرەوە.

لەم بەشەدا باسی ئەوە بە بەڵگە دەهێنرێتەوە کە لە رووی مێژووییەوە نەبوونی دیموکراسی لە کۆمەڵگای مەدەنیدا تا رادەیەکی زۆر تواناکانی ئەو بۆ دێموکراتیزەکردنی دەوڵەت لەناو دەبات. بەڵام ئەو پرسیە چەمکی کۆمەڵگای مەدەنی بێ بایەخ ناکات. ئەو چەمکە هەروا چەمکێکی بنەڕەتی و تەنانەت وەك بوارێکی بنەڕەتیتریش لە ژیانی سیاسیدا دەمێنێتەوە، بەمەرجێك هێزە دیموکراتییەکان هەوڵ بدەن کۆمەڵگای مەدەنی بخەنە ژێر رکێفی خۆیانەوە و چەشنێك لە روحی دێموکراتی زیندوو بکەنەوە. بۆ زیندووکردنەوەی کۆمەڵگای مەدەنی بەچەشنێك کە ئاوات و ئارەزووەکانی بیرمەندان و چالاکوانانی سیاسی بێنێتە دی، پێویستە لە رووی تیۆری و کردەییەوە کارێکی زۆر ئەنجام بدرێت. هەربۆیە لەم کتێبەدا نەتەنیا جەخت لە سەر گرنگیی کۆمەڵگای مەدەنی کراوەتەوە، بەڵکو پرسی بنەڕەتی چۆنیەتی رێکخستنی سیاسەتی دێموکراتییش لەنێوخۆی کۆمەڵگای مەدەنیدا تاوتوێ کراوە. شێوازەکانی بەرەوپێشبردنی کۆمەڵگای مەدەنی و دەوڵەت بە ئاراستەی دیموکراسیدا، تەوەری دوایین باسی ئەم کتێبەیە.

یەکەمین بەڵگەی ئەم کتێبە ئەوەیە کە بە بێ سەرنجدان بە گەشە و نەشەی سیاسیی کۆمەڵگای مەددنی، جەوهەری دەوڵەتمان بۆ دەرناکەوێت. بەڵگەی دووهەممان ئەوەیە کە کۆمەڵگای مەددنی تەنیا کاتێك دەتوانێ ئەرکی خۆی واتە دەستەبەرکردنی وەڵامدەرەوەیی دەوڵەت بە ئەنجام بگەیەنێت کە ناوەرۆکێکی دێموکراتیی هەبێت. لەم کتێبەدا لە سەر هەر دوو چەمکی کۆمەڵگای مەدەنی ودەوڵەت قسە کراوە. پێش گریمانەی بنەڕەتی ئێمە ئەوەیە کە بە بێ تیۆرێك سەبارەت بە کۆمەڵگای مەدەنی ناکرێ تیۆرییەك سەبارەت بە دەوڵەت بخەینەروو و بە پێچەوانەکەشی هەر راستە. هەر لە سەر ئەو بنەمایە، ئێمە سەرجەمی ئەو فۆرمانەی کە دەوڵەت و کۆمەڵگای مەدەنی لەیەکدی جیا دەکەنەوە، رەت دەکەینەوە. ئەو پرسانەی کە لەو فۆرمانە یان لەو واتاسازیانەوە سەرچاوە دەگرن، لە باسی دواتردا تاوتوێ دەکرێن.

## قۆناغی سیاسیی ئەم سەردەمە:

بەپێی لێکدانەوەی "بێرتران ژاکیلا" قەیرانی دەیەی ١٩٨٠ بەرەنجامی پشت کردنە دەوڵەت بوو، "ئەو شتەی کە دەبێتە هۆی مەیل بەرەو گۆڕانی سنوورەکانی ئێستای نێوان کۆمەڵگای مەدەنی و چوارچێوەی ژێر دەسەڵاتی دەوڵەت"(١٦٥، ل٢٩٦). چەمکی کۆمەڵگای مەدەنی کە بۆ ماوەی چەند دەیە چەمکێکی پەراوێزخراو بوو و ئێستا بۆتە چەمکێکی سەرەکی لە تیۆریی سیاسیدا، وەك بابەتی تیۆریی توێژینەوەی سیاسی، جێگای دەوڵەتی گرتووەتەوە. هەر بەو چەشنەی کە برایانت باسی دەکات، "پێش هەشتاکانی سەدەی بیست، هەم لە زانستی کۆمەڵناسی و سیاسەت و هەم لە چوارچێوەی گشتی دا، ئاماژەیەکی ئەوتۆ بە "کۆمەڵگای مەدەنی" هاوچەرخ نەکراوە. لە هەشتاکانی سەدەی بیستدا و دواتریش لە نەوەدەکانی سەدەی بیستدا، ئاماژەکردن بە کۆمەڵگای مەدەنی زیاتر بەرچاو دەکەوێ... ئێستا دروست کردن یان چاکسازیی کۆمەڵگای مەدەنی بەشێوەیەکی گشتی وەك یەکێك لە توخمە جەوهەریەکانی جۆرێك لە " گۆڕانکاریی گەورە" هەژمار دەکرێت کە لە ساڵی ١٩٨٩ هاتووەتە ئاراوە(٢٠، ل٣٩٧). بە بۆچوونی "کریك کلهۆن" رووداوەکانی ساڵی ١٩٨٩ ئەو پرسەی لە کۆڕ و کۆمەڵە زانکۆییەکانەوە گواستەوە بۆ گوتارێکی گشتیی بەربڵاوتر. ئێستا ئەو دەستەواژە کەوتووەتە سەر زمانی بەڕێوەبەری دامەزراوەکان، بازرگانەکان و سیاسەتمەداران و وایپێدەچێت کە هەر زانکۆیەکیش گروپێکی توێژینەوەی سەبارەت بە کۆمەڵگای مەدەنی دامەزراندبێت و ئەو دەستەواژەیە نیوەی تێزەکانی کۆمەڵناسی بۆخۆی تەرخان کردووە"(٢١، ل٢٦٧). ئەوە کۆمەڵگای مەدەنییە ــ نەك دەوڵەت ــ کە بووەتە بنەمای تیۆریی سیاسیی رەخنەگرانە لە نەریتە جۆراوجۆرەکاندا. لە راستیدا قۆناغی سیاسیی ئێستا، لەناوەندی سەرنجەکاندا شایەتی گۆڕانکارییەکی بەرچاوە. ئەگەر لە دەیەی ١٩٠٧دا تیۆریی سیاسی بە تەواوی لە سەر دەوڵەت چەقی بەستبوو، لە هەشتاکانی سەدەی بیست و نەوەدەکانی سەدەی بیستدا دەکرێ بگوترێ هەر بەو رادەیە سەرنجەکان بەرەو لای کۆمەڵگای مەدەنی راکێشراون. بەڵام ئەو پرسە تیۆریی سیاسی لەگەڵ بنبەستێکی فیکری بەرەوڕوو کردۆتەوە، چونکە ئەگەر پشت بەستن بە دەوڵەت ببووە هۆی سەرنج نەدان بە کۆمەڵگای مەدەنی، پشت بەستن بە کۆمەڵگای مەدەنیش بووەتە هۆی ئەوەی کەمتر ئاوڕ لە دەوڵەت بدرێتەوە.

دانانی چەمکێکی زاڵ لە جیاتی چەمکێکی زاڵی دیکە لە گوتاری سیاسیدا بووەتە هۆی ئەوەی کارلێکی دەوڵەت و کۆمەڵگای مەدەنی لە رووی واتاییەوە لەناو بچێت. بە بڕوای من

ئەو رووداوە فیکریە تایبەتییە بۆتە هۆی ئەوەی ئاستی تێگەیشتنی ئێمە بۆ ئەو دوو چەمکە دابەزێت. ئێمە دەبێ پەی بە هۆکار و چۆنیەتی سەرهەڵدانی ئەو گۆڕانە فیکریە بەرین و پێشهاتەکانیشی بە روونی بەیان بکەین. پێویستە لەو پێناوەدا چەند کارێك بکەین: گەڕانەوە بۆ ئەو سەردەمە فیکریەی کە دەوڵەت بابەتی سەرەکیی بووە. لێکدانەوەی ئەو گۆڕانکاریە سیاسی و فیکریانەی کە روانگەی دەوڵەتخوازیی تووشی قەیران کرد، لێکدانەوەی رۆڵی ئەو پرسە لە پشت کردنی تیۆریی سیاسی لەهەمبەر دەوڵەت و وەرسووڕانی بەرەو کۆمەڵگای مەدەنی و شرۆڤەی ئاکامەکانی ئەو کارە بۆ ناسینی سیاسەت.

## وەرچەرخانی تیۆری سیاسی بە ئاراستەی دەوڵەت:

لە کۆتایی شەستەکانی سەدەی بیستدا چەمکی دەوڵەت دیسانەوە لە تیۆری سیاسیدا گیانێکی تازەی وەبەر هاتەوە و لە بواری تیۆرییەوە وەها بایەخێکی پەیدا کرد کە هەرگیز لە دەیەکانی سەرەتای سەدەی بیستەم بەدواوە ــ واتە لە کاتێکەوە کە زانستی سیاسەت بایەخی داوە بە لێکۆڵینەوە لە دەزگا یاساییەکان ــ بەخۆیەوە نەبینیبوو. لە راستیدا لەوکاتەوە هەتا کۆتایی شەستەکانی سەدەی بیست کە شۆڕشی رەفتاری بەسەر زانستی کۆمەڵایەتیدا زاڵبوو، چەمکی دەوڵەت بەگشتی لە دونیای بەرهەمهێنانی چەمکەکان ــ ئەگەریش نەڵێین لە دەستەواژەکانی تیۆری سیاسی ــ کەوتبووە پەراوێزەوە. لابردنی چەمکی دەوڵەت لە تیۆری سیاسیدا، دەرەنجامی گۆڕانکاریە قوڵەکانی بواری سیاسی و لە ئاکامیشدا بواری فیکری بوو. دوای جەنگی دووەمی جیهانی، سەبارەت بەوەی خوێندنەوەی سیاسەت دەبێ ببێتە زانستێکی وردی بەهابەزێن چەشنە رێککەوتنێك لە هزری سیاسیی باودا هاتەئارا. ئەو رێککەوتنە زیاتر لە بیرمەندانی زانستی سیاسیی ئەمریکاوە سەرچاوەی دەگرت. ئەو هۆکارانەی کە ئەم تێڕوانینەیان زیندوو کردەوە بەرچاون. لە هەمووان گرنگتر بوونی ئەمریکا بە ناوەندی چالاکییە فیکریەکان و سەرهەڵدانی جەنگی سارد بوو، ئەو جەنگەی کە نە تەنیا ململانێی ئابووری و سیاسی بەڵکو ململانێی فیکریشی بۆ سەرکەوتن و زاڵبوون چڕتر کردەوە.

سەرکەوتنی سەرمایەداری دوای جەنگی دووەمی جیهانی و بوونی ئەمریکا بە گرنگترین دەسەڵاتی سەرمایەداریی جیهان لە هەموو بوارەکاندا بواری بۆ باڵادەستیی ئەمریکا رەخساند. لە ئەمریکادا چالاکییە فیکریەکان بە قووڵی لە ژێر کاریگەریی بارودۆخی سیاسیی ئەو وڵاتەدا بوون. بارودۆخی جەنگی سارد و "مەك کارتیزم" لە ئەمریکادا شوێنەوارە

فیکریەکانی خۆیان جێهێشت. هەروەك "دەیڤید ئیستن" یەکێك لە ڕێبەرانی تێڕوانینی ڕەفتاری لە زانستی سیاسەتدا لە ساڵی ١٩٨٥دا گوتوویەتی:

سیناتۆر جۆزێف مەك کارتی سەردەمێك دەست پێشخەر و ڕێبەری جەنگی دەروونی و یاسایی بوو لەگەڵ لیبراڵەکان و کەسانی دیکە لە ئەمریکادا. لەو پێناوەدا توێژەرەکان کرانە ئەو ئامانجانەی کە تووشی زۆرترین خەسارەت دەبن. مەك کارتیزم بووە هۆی سەرهەڵدانی مەیلێکی بەناو کۆمەڵایەتی و تیۆرێکی ڕەخنەگرانە. لەم ڕوانگەیەوە لێکۆڵینەوەی بابەتیانە و بێ لایەنانە و بەهابەزێن، قەڵغانێکی پاراستنی توێژەرەکان بوو. ئەو چەشنە توێژینەوەیە بە شێوەیەك لە شێوەکان پاساوی فیکریی ڕێگەپێدراو و بەکەڵکی بۆ دەربازبوون لە مەترسیەکانی مشتومڕی سیاسیی ئازادی خستە بەر دەست ئەوان... مەك کارتیزم...پێشاندەری ئەو بارودۆخە مێژووییە بوو کە چەشنێك مەیلی نهێنیانەی بەناو کۆمەڵایەتی دروست کرد. مەك کارتیزم لێکۆڵەرەوەکانی بەرەو ئەو بوارانەی لێکۆڵینەوە برد، کە مەترسیی سیاسی کەمتریان هەبوو (٤٢، ل١٤٠-١٣٩).

بەم چەشنە بارودۆخی سیاسی بووە هۆی گەشەی خۆڕێکخستنی زیاتر، تاوتوێکردنی دیاردەکان لە بواری چەندایەتی و پشت بەستن بە شێوەکار لە جیاتی بەرهەمی ڕێگەپێدراوی ئەو دیاردانەی کە جێگەی باس بوون. مەیلی بیرمەندانی ڕەفتارگەرای زانستی سیاسەت بەرەو گونجاندنی خوێندنەوە سیاسییەکان لەگەڵ پێوانە ورد و بابەتی و بەهابەزێنەکان بووە هۆی ڕەتکردنەوەی سەرجەمی ئەو چەمکانەی کە لەگەڵ ئەو ئامانج و ئاواتانە نەدەهاتنەوە. گرنگترین قوربانی ئەم تێڕوانینە دەوڵەت بوو. لە ڕوانگەی سیاسیی کلاسیکدا، دەوڵەت تایبەتمەندییەکی ڕێگەپێدراوی هەبوو و ڕێك هەر ئەو تایبەتمەندییەشی بووەتە هۆی ئەوەی بە توندی مشتومڕی لە سەر بکرێت. ئەو چەمکە نەیدەتوانی لەگەڵ پێوانەکانی زانستێکی وردی سیاسەت، بەهابەزێن و لە سەر بنەمای یەکدەنگی خۆ ڕێکبخات و هەر بۆیە چەمکی سیستەمی سیاسی جێگای ئەوی گرتەوە. بەو حاڵەشەوە زۆری نەخایاند کە چەمکی دەوڵەت لە بۆچونی سیاسی خۆگونجێن دەرهاویشترا.

ئاژاوە سیاسی و کۆمەڵایەتییەکانی کۆتایی شەستەکانی سەدەی بیست لە شارە گەورەکانی وڵاتانی پێشکەوتووی پیشەسازی، نارەزامەندیی بەربڵاو لە دژی بەرنامەکانی دەوڵەتی سەرمایەداری، دڵساردبوونەوە لە بەرنامە نەتەوایەتیەکان لە "جیهانی سێیەم"، مەترسی تۆتالیتاریزمی ئەو دەوڵەتانەی کە سەربەخۆییان بەدەست هێنابوو و دژایەتی لەگەڵ توندڕەویەکانی

ستالینیزم لە سەرەتای شەستەکانی سەدەی بیستدا بەگشتی باروودۆخێکی سیاسیی تایبەتیان دروست کرد کە بووە هۆی ئەوەی دیسانەوە دەوڵەت گرنگییەکی زۆری لە تیۆری سیاسیدا هەبێت. بیرمەندانی سیاسی بە باشی هەستیان بەوە کرد کە ئەگەر دەوڵەت لەبەرچاو نەگرن، لە مەڕ واتاسازی سەبارەت بە دیاردە سیاسی و کۆمەڵایەتییەکان لەگەڵ چ مەترسییەك بەرەوڕوو دەبن. هەست بەو خاڵە کرا کە خافڵ بوون لە دەوڵەت لە تیۆری سیاسیی خۆرئاوادا بە توندی کاریگەریی نەرێنی لە سەر زانستی سیاسی هەبووە. بەڵام هەر بەو چەشنەی کە دواتر باسی دەکەین، چۆنیەتی واتاسازیی دەوڵەت لەو سەردەمەدا بەشێوەیەکی بنەڕەتی لەگەڵ واتاسازی نەریتی جیاواز بوو.

هەرچەندە لە تەواوی نەریتەکانی تیۆری سیاسیدا وەرچەرخان ب ئاراستەی دەوڵەت زۆر زەق و بەرچاو بوو، بەڵام هێندێك لە گرنگترین باسەکان لە چوارچێوەی تیۆری مارکسیستیدا بەڕێوە چوون. پەرەسەندنی چەمکی دەوڵەت لە مارکسیزمدا، چەند خاڵی وەرچەرخانی لەگەڵدا بووە کە دەرخەری سێ قۆناغی فیکرین لە تیۆری دەوڵەتدا.

## مێژوویەکی کورتی پێداچوونەوەی تیۆری مارکسیستیی بە دەوڵەت:

لە پێگەیشتنی تیۆری مارکسیستی لەمەڕ دەوڵەت، دەکرێ سێ قۆناغی فیکری لەیەکتر جیا بکرێنەوە. قۆناغی یەکەم لە فۆرمۆڵبەندیە ناودارەکەی مارکس و ئینگڵس کە لە **بەیاننامەی پارتی کۆمۆنیست (١٨٤٨)**دا بەرجەستە بووەتەوە: "دەزگای بەڕێوەبەریی دەوڵەتی نوێ هیچ شتێك نییە جگە لە کۆمیتەیەك بۆ بەرەوپێش بردنی کاروباری هاوبەشی سەرجەم بورژوازی" (١١٤، ل ١٤٤). ئەو فۆرمۆڵبەندییە لە لایەن فۆرمۆڵبەندییەکی دیکەی مارکسەوە لە پێشەکیی **بەرەو رەخنە لە ئابووریی سیاسی (١٨٥٩)** جەختی لە سەر کرایەوە کە ئەویش هەر بەم رادەیە ناوبانگی هەیە: "سەرجەم ئەم پەیوەندییانەی بەرهەم هێنان، پێکهاتەی ئابووریی کۆمەڵگا دروست دەکەن، واتە ئەو بنەما و بونیادی کە بە هۆیەوە سەرخانێکی یاسایی و سیاسی پێکهاتووە و شێوازێکی دیاریکراوی وشیاریی کۆمەڵایەتیش لەگەڵیدا دەگونجێت" (١١٩، ل١٣٥).

شێوازی مارکس سەبارەت بە ژێرخان و سەرخان رەخنەی زۆری لێگیراوە، بەڵام ئەو شێوازە لەو سەردەمە مێژووییەدا، لە بواری تیۆرییەوە فۆرمۆڵبەندییەکی گرنگ بوو. مارکس بەم شێوە لە دژی لێکدانەوەی لیبراڵی راپەڕی سەبارەت بە دەوڵەت وەك دیاردەیەکی ئەبستراکت و

بەدەر لە کۆمەڵگا. بەڵام لەوەش گرنگتر، مارکس بەم شێوازەی خۆی، شێوازی هیگلیشی هەڵوەشاندەوە. لە میتۆدی هیگلدا، کۆمەڵگا خاوەنی ڕێکخستنێکی ستوونی بوو کە دەوڵەتی وەك لووتکەی قووچەکەی فۆرمۆلبەندی کۆمەڵایەتی چاو لێدەکرد. هیگڵ کۆمەڵگای مەدەنی کردە پاشکۆی دەوڵەت، چونکە دەوڵەت لای ئەو هەموو شتێك بوو. مارکس ئەم ڕیزبەندییەی پێچەوانە کردەوە و کۆمەڵگای مەدەنی لە سەرەوەتر دانا. لە ڕاستیدا دەکرێ بگوترێت کە گەڵاڵەی ژێرخان ـــ سەرخان بەو چەشنەی کە لە لایەن مارکسەوە گەڵاڵە کرا، هەر بە تەنیا شێوازێك نەبوو، بەڵکو خوازەیەك بوو، خوازەیەك کە لە سنووره کۆنەکانیش ئەولاوەتر چوو(٢٧).

هەر چۆنێك بێت، توێژەرانی دواتری مارکسیستی کە بە گشتی کاریگەریی بڕیارەکانی "ئەنترناسیۆناڵی دووهەم" و لێکدانەوەی ئامێرییان سەبارەت بە کۆمەڵگا پێوە دیاربوو، ئەو خوازەیان هەتا ئاستی بنەمایەکی دۆگم و دەمارگیرانە دابەزاند. تا رادەیەکیش جێی داخە کە ئەو خوازە فەلسەفیە، بوو بە چەشنێك لە شێوازی زانستی کۆمەڵایەتی کە توانایەکی کەمتری هەبوو، ئەو کارە خەسارەتێکی زۆری بە لێکدانەوە ئاڵۆز و پوختەکانی دەوڵەت گەیاند لە بەرهەمە مێژووییەکانی مارکس و واتاسازیە جیاوازەکانی ئەو سەبارەت بەدەوڵەت.[٣]

داشکانخوازیی ئامێری و ئابووریی مارکسیستەکانی دواتر، نەتەنیا ڕۆڵێکی پلە دوو و پاشکۆیانەی بۆ دەوڵەت دانا، بەڵکو لە ڕوانگەیەکی داشکانخوازانەش سەیری کۆمەڵگای کرد. لەو ڕوانگەیەوە، دەوڵەت و کۆمەڵگا و پەیوەندییەکانی ئەو دووانە دەکرا لە ڕێگای ئابووریەوە ئاشکرا بکرێت. کۆمەڵگا وەك کۆمەڵگایەکی چینایەتی هەژمار دەکرا کە تێیدا بەرهەمهێنان و سەرلەنوێ بەرهەمهێنانەوەی سیستەمی کۆمەڵایەتی لە لایەن یاسا ئابووریەکانەوە دیاری دەکرا. دەوڵەت تەنیا سەرخان و ڕەنگدانەوەی ژێرخانی ئابووری بوو. یاساکانی سیاسەت بێ ئەوەی کە بیەوێت پەیڕەوی لە یاسا ئابوورییەکان دەکرد. کەمتر هەوڵ بۆ ئەوە دەدرا کە

---

٣- بۆنمونە مارکس لە ساڵی ١٨٨٦دا نووسیویەتی: دەوڵەت "دەسەڵاتێکی سەربەخۆیە لە کۆمەڵگا" (١١٥، ل٦١٧) و نۆرمبەندیەکانی ئەو سەبارەت بە سەربەخۆیی ڕێژەیی دەوڵەت لە چینە باڵادەستەکان، لە هەژدەی برومری لویی بوناپارت ئەوەندە بەنێوبانگە کە پێویست بە دووپاتکردنەوەی نییە. تێگەیشتنی زاڵی "ئەنترناسیۆناڵی دووهەم" لە تیۆری مارکس بوو کە لێکدانەوەیەکی ئابووریخوازانە (economistic)ی لە بۆچوونەکانی مارکس بە سەر بیردۆزی سیاسیی مارکسیستیدا زاڵ کرد.

ئاڵۆزییەکانی دەوڵەت، کۆمەڵگا و پەیوەندیی ئاڵۆز و نادیاری ئەو دووانە باس بکرێت و روون بکرێتەوە.

ئەو رەخنەیەی کە لەو فۆرمۆلبەندییە گیراوە، رەخنەیەکی ناسراوە: ئەو فۆرمۆلبەندییە تووشی قەدەرخوازی یان ملهوڕی ئابووری بووە و سیاسەت وەك پەیڕەوی یاسا ئابوورییەکان هەژمار دەکرێت. بەم چەشنە، شوناسی تایبەتیی سیاسەت لەبەر چاو نەگیرا. هەر لە سەر ئەو بنەمایە هەتا ماوەیەکی زۆر رەخنەگرانی تیۆری سیاسیی مارکسیستی ــ لەوانەیە بە دروستیش ــ دەیانگوت کە مارکسیزم تیۆرێکی سەبارەت بە سیاسەت نییە. هەرچەندە مارکسیزم بە پێچەوانەی بۆچوونی سیاسیی خۆرێکخەر هیچ کات دەوڵەتی بە زبڵدانی مێژوو نەسپاردبوو، بەڵام سووربوونی لە رادەبەدەری مارکسیزم لە سەر ئابووری، پێشی بە تێگەیشتن لە دەوڵەتی گرت وەك دامەزراوەیەکی سیاسی.

قۆناغی فیکریی دووهەم لە گەشەی تیۆری دەوڵەتدا لە کۆتایی شەستەکانی سەدەی بیست دەستی پێکرد. لە رووی سیاسییەوە لەو قۆناغەدا شایەتی نارەزامەندی بەرفراوانین و خەباتی چڕوپڕین لە دژی دەوڵەت. لە رووی فیکرییەوە، لە کاتێکدا کە تیۆری سیاسی خەریکی تاوتوێکردنی سەرکوت و ئەو لەخۆنامۆبوونە بوو کە لە دەوڵەتەوە سەرچاوەی گرتبوو، زیندووکردنەوەی قسەوباسەکانی تایبەت بە ناوەرۆکی دەوڵەت و سیاسەت، تایبەتمەندیی جیاوازی ئەم قۆناغە فیکرییە بوو. ئەو قسەوباسانە لە ساڵی ١٩٨٦ بە کتێبی **دەوڵەت لە بەرامبەر کۆمەڵگای سەرمایەداری** لە نووسینی "رالف میلیباند" و لە ساڵی ١٩٧٢بە بەرهەمێکی بەپێزی "حەمزە عەلەوی"بە ناونیشانی"دەوڵەت لە کۆمەڵگا سەربەخۆکاندا: پاکستان و بەنگلادش" دەستی پێکرد. لەم قۆناغە تیۆرییەدا، شوناسی دەوڵەت و پەیوەندییەکانی لەگەڵ کۆمەڵگا کەوتە ژێر پرسیار. دەوڵەت بوو بە تەوەرێکی تیۆری جیاواز و تیۆر دەوڵەتتەوەرەیش بوو بە رەوتێکی زاڵی تیۆری سیاسی.

پشت بەستن بەدەوڵەت وەك تەوەرێکی تیۆریی سەربەخۆ، یەکێکە لە دەرەنجامەکانی پشت کردنی گشتیی تیۆری سیاسی لە رەفتارگەرایی پەنجاکانی سەدەی بیست و سەرەتای شەستەکان و ئایدۆلۆژیای بەهابەزێن. سەردەمی پاش رەفتارگەرای شایەتی تیۆری سیاسیی بەهاخواز و گەڕانەوەی رۆشنبیرانی چالاك بوو بەرەو زانستی سیاسی. تیۆری دەوڵەتتەوەر هێمای گەڕانەوەیە بۆ هۆگرییە رێگەپێدراو و ئەخلاقییە کلاسیکییەکانی تیۆری سیاسی ــ واتە ناوەرۆکی دەسەڵات، پرسی زاڵبوون و تووڕەیی و پرسی رزگاری. بۆچوونی دەوڵەتتەوەر بە

راوەستان لە بەرامبەر تێڕوانینی سیستەمی و ملهوڕانەی ئابووری، سەربەخۆیی بە سیاسەت بەخشی و شوناسی تایبەتیی ئەوی گەڕاندەوە. هەرچەندە ئەوە یەکێکە لە تایبەتمەندییەکانی سەرجەم فۆرمۆلبەندییە تیۆرەکان لە سەردەمی پاش رەفتارگەرایدا، بەڵام ئەو تایبەتمەندییە لە تیۆری مارکسیستیدا بە چەند قات بەرجەستەتر بوو.

تیۆری مارکسیستی دەیەویست دەوڵەت بگەڕێنێتەوە بۆ چەقی زانستی سیاسی، گرنگتر لەوەش ئەوە بوو کە تیۆری مارکسیستی خۆی خستە شوێنی لێکدانەوە ئامێری و دابەزینخوازە باوەکانی دەوڵەت. هەر بۆیە تیۆری مارکسیستی دووکاری بەڕێوە برد: لە لایەکەوە دەستی دایە بەربەرەکانێ لەگەڵ تیۆری لیبراڵی و لە لایەکی دیکەشەوە لە کۆڕوکۆمەڵە مارکسیەکاندا خەریکی قسەوباسێکی قوڵ بوو سەبارەت بە دەوڵەت. دەوڵەت وەك بونیادێکی دەسەڵاتداری سەربەخۆ لێکدرایەوە: بونیادێکی دەسەڵاتی سیاسی کە کاریگەرییەکی قوڵی لە سەر تەواوی چینەکانی کۆمەڵگا دادەنا. دەوڵەت جێگا و شوێنێکی دیاریکراوی لە فۆرمۆلبەندیی کۆمەڵایەتیدا دەستەبەر کرد. لەم فۆرمۆلبەندییەدا، نەریتی بۆچوونی بونیادگەرایی بەشێکی بەرینی هەبوو. لەم روانگەیەدا، دەوڵەت جێگا و شوێنێکی تایبەتی هەبوو، واتە نەتەنیا کۆمیتەی بەڕێوەبەریی بورژوازی بوو، بەڵکو وەك کۆمەڵێك لە دامەزراوە و ئەندێشەکان لێك دەدرایەوە کە رۆڵێکی دیاریکراوی لە سیاسەتدا دەگێڕا.

ئەم خاڵە سەلمێندرا کە دەوڵەت نەتەنیا لە لایەن چینە باڵادەستەکانەوە هێندێك کار بەڕێوە دەبات (وەك دابینکردنی سۆلیدارێتیی کۆمەڵایەتی، یەکێتیی نێوان چینە باڵاکان، دەستێوەردانی ئابووری بۆ پێشگیری لە کەمکردنەوەی نرخی سود، پێکهێنانی ئایدۆلۆژیا رێگەپێدراوەکان و لە هەمووان گرنگتر کۆنترۆڵی دسەڵاتی چینی کرێکار و نەهێشتنی قەیرانی سەرمایەداری)، بەڵکو هێندێك کاری تریش دەکات کە تایبەتە بە خودی دەوڵەت. ئەم کارە تایبەتیانە، و بەتایبەتی کاری تایبەت بە شەرعیەت پێدان، دەیانتوانی لەگەڵ بەرژەوەندییەکانی سەرمایەداری نەیەنەوە و لە راستیدا هەر واش بوون. کەوابوو نەدەبوایە دەوڵەت تەنیا وەك باڵی بەڕێوەبەرایەتی سەرمایەداران لێك بدرابایەوە.

دەوڵەت لە جیاتی ئەوەی وەك کۆمیتەی بەڕێوەبەریی دەوڵەت بناسرێت، بەشێوەیەکی رێژەیی بە چەشنێکی سەربەخۆ لە بورژوازی لێك درایەوە. چوار بەڵگەی جیاواز لە سەر سەربەخۆیی رێژەیی دەوڵەت باس کران. بە پێی بەڵگەی یەکەم، دەوڵەت بۆ ئەوەی بتوانێت لە پێناو بەرژەوەندەیی سەرجەم سیستەمی سەرمایەداری تێبکۆشێت، دەبێ سەربەخۆ بێت لە

بەشە دیاریکراوەکانی بورژوازی (١٥٣ و ١٥٤ و ١٥٥ و ١٥٦).[٤] بە پێی بەڵگەی دووهەم، دەوڵەت تووشی گرژی و ناکۆکییە: لە لایەکەوە دەبێ داواکاریی سیستەمی سەرمایەداری دابین بکات و لە لایەکی دیکەشەوە بۆ دەستەبەرکردنی شەرعیەتەکەی دەبێ سەرنجی هێزە بەرفراوانە کۆمەڵایەتییەکان بدات. پێویستیی دەستەبەرکردنی شەرعیەت کەوتە پێشەوەی پێویستیی سەرمایەداری (١٣٧ و ١٣٨ و ١٣٩ و ١٤٠ و ١٤١).[٥] بەڵگەی سێیەم تایبەتە

---

٤ - نیکوس پولانزاس بە پێچەوانەی تیۆری نامێریانەی دەوڵەت، سەلماندی کە سەربەخۆیی رێژەیی یەکێکە لە تایبەتمەندییە ناوەکییەکانی دەوڵەتی سەرمایەداری. جەختی لە سەر ئەوە کردەوە کە خوێندنەوەی دروستی بۆچوونەکانی مارکس و ئینگڵس سەبارەت بە دەوڵەتی بوناپارت نیشانی دەدات کە ئەو سەربەخۆییە رێژەییە بەرەنجامی هاوسەنگیی کاتیی هێزە کۆمەڵایەتیەکان نەبووە. بە پێی بەڵگەکەی ئەو، ئەو تێگەیشتنە "زۆر ناتەواو"بوو (١٥٥، ل٢٦٠). پولانزاس جەختی کردەوە کە خوێندنەوەی وردتری بەرهەمەکانی مارکس و ئینگڵس ئەوە نیشان دەدات کە بیرۆکەدارشتن سەبارەت بە سەربەخۆیی رێژەیی دەوڵەت "هەوڵێك بوو بۆ فۆرمبەندیی تیۆری واتای دەوڵەتی سەرمایەداری" کە تێیدا سەربەخۆیی رێژەیی دەوڵەت بەگشتی "وەکو یەکێك لە تایبەتمەندییە تیۆریە ناوەکییەکانی دەوڵەتی سەرمایەداری" چاو لێدەکرا (هەمان سەرچاوە، ل٢٥٨).

٥ - "ئۆفە" لە بەڵگەیەکدا کە زۆر لە بەڵگەکەی پولانزاس نزیکە دەڵێت کە دەوڵەت بۆ گەرەنتیی مانەوەی سیستەمی سەرمایەداری دەبێ سەربەخۆییەکی رێژەیی لە بەشە تایبەتیەکانی بورژوازی هەبێت. دەوڵەت خۆی لە بەرامبەر بەرژەوەندییە تایبەت و بەرتەسکەکانی تاك بە تاکی سەرمایەداران وەك "چاودێر و سەرپەرشت {دەناسێنێت}...، چونکە تەنیا بە دەست پێڕاگەیشتنی دەوڵەت بەو چەشنە سەربەخۆییە رێژەییەیە کە هەموو جۆرە بەرژەوەندییەك دەتوانێ وەکو جۆرێك بەرژەوەندیی چینایەتی لێ بێت" (١٣٧، ٣٥). بەڵام ئۆفە ئەم قسەیەی بە لێکدانەوەیەکی تر تا رادەیەك دادەبەزێنێت: دەوڵەت بۆ دەستپێڕاگەیشتنی بەو سەربەخۆییە رێژەییە "دەبێ بنەمایەك بۆ شەرعیەتی گشتیی خۆی دابین بکات" (١٣٩، ل٤٩). دەوڵەت دەتوانێت ئەو کارە بە کەڵك وەرگرتن لە پێکهاتە فەرمیەکانی دیموکراسیی بورژوایی بە ئەنجام بگەیەنێت. بەم چەشنە دەوڵەت توانیویەتی بنەمایەك بۆ شەرعیەتی سەربەخۆی خۆی دابین بکات، ئەو شتەی کە بۆ پوچەڵکردنەوەی دژایەتی سەرمایەداران پێویستە. ئەو کارە یارمەتی بە بەرێوەبردنی سیاسەتە درێژماوەکانی دەوڵەت دەکات بۆ پاراستنی سیستەمەکە. بە پێی بەڵگەی ئۆفە، سەربەخۆیی و توانایی دەوڵەت پەیوەندیی بە پشتیوانی و وەفاداریی جەماوەرەوە هەیە (هەمان سەرچاوە، ل٥٣). بەم جۆرە، دەوڵەت دەستی بە پێگەیەکی سەربەخۆ و سەرووتر لە چینە باڵادەستەکان رادەگات.

بەو وڵاتانەی کە سەربەخۆییان بەدەست هێناوە. "عەلـەوی" بـە بووژاندنـەوەی بۆچـوونەکانی مارکس لە **هەژدەی برومێری لویس بوناپارت**، ئاماژەی بەوە داوە کە لـەو وڵاتانـەی کـە لـە دەست داگیرکاری (کۆلۆنیالیزم) رزگارییان بووە، دەوڵەت لەرادەبەدەر پەرەی سەندوە، چـونکە داگیرکاری بووەتە هۆی ئەوەی کۆمەڵگا کەمتر گەشە بکات. کەوابوو دەوڵەت سەربەخۆییەکی رێژەیی هەیە و لە دەست، دەستێوەردانە سیاسییەکان ئاسوودەیە (١ و ١٦٧).[٦] بەڵگـەی چوارەم تێڕوانینێکی دەوڵەتتەوەری لێ کەوتووەتەوە. "فرد بلۆك" بەڵگەی ئەوەی هێناوەتـەوە کە بوونی دەسەڵاتی سیاسی، دەسەڵاتداران لە سەرەوەی بەشەکانی تـری کۆمـەڵگا دادەنێت. ئـەم کـارە وای لێکـردون گوشـارەکانی کۆمـەڵگا لـە بەرچـاو نـەگرن و بەشـوێن هـۆگری و بەرژەوەندییەکانی خۆیانەوە بن (١٣).[٧]

کاتێك کە قسـەکردن سـەبارەت بـە دەوڵـەت، پـاراوتر و پوختـەتر بـوو (بـۆ نموونـە لـە هەڵسـەنگاندن لەگەڵ ئەو فۆرمۆلبەندییانەی کە دەوڵەتیان بـە ئـامرازی بـورژوازی دەزانـی)، هەست بەو خاڵە کرا کە ئەگەرچی دەوڵەت بە توندی لە ژێر کاریگەریی هۆکارە ئابوورییـەکان دایە، بەڵام جێگـا و شـوێنێکی سـەربەخۆ و جیـاوازی لـە کۆمـەڵگادا هەیـە. دەسـتەواژەی جۆراوجۆر سەبارەت بە دەوڵەت و بەڕێوەبەرانی ئەو داهێنرا (بۆ نموونە "سەربەخۆیی رێژەیی"،

---

٦ - "سێن sen " لە خوێندنەوەیەکدا سەبارەت بە هیندستان بەڵگەی ئەوەی هێناوەتەوە کە "دەوڵەت ... بەردەوام لە هەوڵی ئەوە دایە کە سەربەخۆییەکی زیاتر بەدەست بێنێت. سەرچاوەی ئەم هەوڵە لە سەربەخۆیی رێژەیی دەوڵەت لە سەرەتای سەرهەڵدانی دایە، بەڵام ئەو سەربەخۆییە رێژەییە لەوانەیە ببێتە هۆی سەربەخۆیی زیاتری دەوڵەت لە کۆمەڵگا یان چینە کۆمەڵایەتییەکان و ئەوەش پەیوەندی بە رادەی گەشەی کۆمەڵگا و شێوە یان شێوازەکانی بەرهەمهێنانەوە هەیە." (١٦٧، ل٤). "سێن"یش هەروەك "عەلەوی" سەربەخۆیی دەوڵەت لە باشوری ئاسیا بە بەرەنجامی گەشەنەکردنی کۆمەڵگا دەزانێت لە سەردەمی داگیرکاریدا. ئەو تێگەیشتنە بە تەواوەتی لەگەڵ تێگەیشتنی پولانزاس لە بەرهەمەکانی مارکس و ئینگڵس جیاوازە. بە پێی ئەم تێگەیشتنە، دەوڵەت لەم کۆمەڵگایانەدا سەربەخۆییەکی رێژەیی هەیە کە تێیاندا هێزە کۆمەڵایەتییەکان هاوسەنگ بن.

٧ - "بلۆك" پێیوایە کە دەوڵەت کاراکتەرێکی سەربەخۆ و خودموختارە، بەو ئاکامە دەگات کە خاوەنانی دەسەڵاتی دەوڵەتی "بەکۆمەڵ بەشوێن پەرەپێدانی بەرژەوەندییەکان، دەسەڵات، متمانە و سامانی خۆیانەوەن" (١٣، ل٢٢٩). ئەم بۆچوونە لە بیردۆزیی دەوڵەتتەوەردا بە لوتکەی خۆی گەیشت، بەتایبەتی لە بەرهەمەکانی "سکۆچپۆل" کە تیۆری دەوڵەتی لە مەرجەکانی مارکسیستی دەرباز کرد.

"چـینەکانی ناوەڕاسـت"، "بـورژوازی بیرۆکراسـی"، "چـینی سیاسـی ـــ بەڕێوەبـەری" و "سەرمایەداریی دەوڵەتی") بۆ ئەوەی دەسەڵاتی لەرادە بەدەری دەوڵەت و بەڕێوەبەرانی ئەو و سەربەخۆیی ئەوان لە هەر دوو چینی سەرمایەدار و کرێکار پێشان بدرێت.

قسە و باس سەبارەت بە دەوڵەت بە دڵنیاییەوە بـە قـازانج بـووە، چـونکە یارمـەتی بـە تێگەیشتن لە شوناسی تایبەت و سەربەخۆی پێکهاتـە و ریزبەندییـەکانی دەسـەڵاتی سیاسـی کردووە، بەڵام ئەو باسانە وەك هەرچەشنە زێدە بەرهەمێك تووشی قەیران بووە. پرسی سەرەکی ئەوەیە کە پشت بەسـتن بە سـەربەخۆیی دەوڵەت بووەتە هۆی جیابوونەوەی دەوڵەت لە جێگـا و شوێنەکەی خۆی ــ واتە لە کۆمەڵگای مەدەنی ــ دابڕاوە. لە زۆربـەی فۆرمۆلبەندییـەکانـدا، سیاسـەت و کێشمەکێشی سیاسی چوونەتە ژێر ڕکێفی دەسەڵاتی دەوڵەتـەوە. توێـژەرەکان بـە توندی لە بۆچوونی دەوڵەتتەوەر هەڵگەڕانەوە: وا دیار بوو کە زۆر پشت بەسـتن بـە دەسـەڵاتی دەوڵەت بووەتە هۆی غـافڵبوون لـە سەرچـاوەکانی ئـەو دەسـەڵاتە و کاریگـەریی دەوڵـەت و کۆمەڵگا لە سەر یەکتری. بۆچـوونی دەوڵەتتـەوەر زۆری سـەرنج بـە پرسـەکانی تایبـەت بـە کێشمەکێشی سیاسی نەدابوو. لایەنگرانی ئەم بۆچـوونە هەسـتیان بـە ناسـینی ئـەو شـێوازە جۆراوجۆرانە نەکردبوو کە خەڵك بۆ خەبات لە دژی دەوڵەت بە دەستیانەوە گرتبوون و تەنانەت پێشی بە سەپاندنی دەسەڵاتەکەشی گرتبوو. هۆکارەکەشی ئەوە بـوو کـە بۆچـوونی سیاسـیی دەوڵەتتەوەر، دەوڵەتی لە پانتایی تێکهەڵچوونەکەی ــ واتە لە کۆمەڵگای مـەدەنی ـــ جیـا دەکردەوە.

کاتێك کە قسە و باسەکان سەبارەت بە سەربەخۆیی ڕێـژەیی دەوڵـەت بـەرەوپێش چـوون، دەرکەوت کـە شوناسـی دەوڵـەت بـە بـێ سـەرنجدان بـە گۆڕانکاریـەکانی دەرەوەی سـنوورە بەرتەسکەکانی، دیاری ناکرێت. قسەوباس سەبارەت بە سەربەخۆیی ڕێژەیی دەوڵەت بووە هۆی ئەوەی چەشنێك لە هەماهەنگی، ئامانج، ناقـار، بیرکردنـەوە و توانـایی پێکهێنـانی گەڵاڵـە سیاسییەکان بە دەوڵەت ببەخشرێت. لە زۆر بواردا دەوڵەتیان بە توانای ڕەها و هەموو شـتێك دەزانی. بەڵام گۆڕانکارییە سیاسییەکان و بەتایبـەت سـەرهەڵدانی بزووتنـەوە کۆمەڵایەتییـە جۆراوجۆرەکان نیشانی دا کە دەسەڵاتی دەوڵـەت زۆربـەی کاتـەکان هـەر مشـتومڕی لەسـەر دەکرێت. ئەو خاڵە ئاشکرا بوو کە ڕادە، شوناس و سنوورەکانی دەسەڵاتی دەوڵەت پەیوەنـدیی بە هۆکارگەلی دیکەوە هەیە و تاڕادەیەکی زۆر لە ڕێگەی خەباتەکانی کۆمەڵگای مەدەنییەوە دیاری دەکرێت. ئەو خەباتانە بەشێوازی جۆراوجۆر سنوورەکانی ژیانی سیاسییان گۆڕیون. ئەو

کاره کاریگەرییەکی زۆری لە سەر دانانی واتای دەوڵەت لە قۆناغی سێیەمی گەشەی تیۆری دەوڵەت داناوە.

نیکوس پولانزاس و کلاوس ئۆفە، ئەو دوو بیرمەندەن کە لە گەشەپێدانی تیۆری دەوڵەتدا یارمەتییەکی زۆریان بە تێپەڕین لە قۆناغی دووهەمەوە بەرەو قۆناغی سێیەم داوە. بەرهەمەکانی پولانزاس دەری خستووە کە ئەوە خەباتی کۆمەڵایەتی کۆمەڵگایە کە سنوورەکانی دەوڵەت دیاری دەکات. لە راستیدا لە بەرهەمەکانی پولانزاس دا وەرسووڕانێکی جێگای سەرنج بەرچاو دەکەوێت. لە بەرهەمە سەرەتاییەکانی پولانزاس دا، دەوڵەت سەربەخۆییەکی ڕێژەیی هەیە، چونکە دەوڵەت هۆکاری یەکانگیربوونی کۆمەڵایەتییە[8] و دەستکاری کێشمەکێشەکانی نێوخۆی چینی بورژوازی و کێشمەکێشەکانی چینی بورژوازی لەگەڵ چینی کرێکار دەکات و لەوەش ئەولاوەتر دەچێت. لە بەرهەمەکانی دواتری پولانزاس دا، دەوڵەت گیرۆدەی خەباتی چینایەتی بووە و لە ئاکامدا لەرزۆك بووە و تووشی هەڵچوون و داچوون هاتووە. ناوبراو دەڵێت سیاسەتی دەوڵەت "بە توندی ئاڵۆز و نارێك" دێتە بەرچاو (١٥٨، ل١٣٥). بە بۆچوونی پولانزاس ئەوە خەباتی چینایەتییە کە نەتەنیا دەزگای دەوڵەتی دەگۆڕێت (١٥٦، ل١٣٥)، بەڵکو "لەو دەزگایە ئەولاوەتر دەچێت، بەگشتی خۆی لە ژێر کۆنترۆڵی دەرباز دەکات و لە راستیدا سنوورەکەی دیاری دەکات" (١٥٤، ل٥٠ و ١٥٦، ل٢٩). بە پێی بەڵگەی پولانزاس، پەیوەندییە چینایەتیەکان لە دەزگای دەوڵەتیدا بەرجەستە دەبن و دەوڵەت خۆی بەرهەمی خەباتی چینایەتییە و ئەو پەیوەندییەش تیایدا رەنگ دەداتەوە (١٥٧، ل٧٥).

---

٨- پولانزاس بە رەتکردنەوەی بۆچوونی نامیری دەوڵەت، بەڵگەی ئەوەی دێنایەوە کە دەوڵەت تایبەتمەندییەکی سەرمایەداری هەیە، چونکە لە ریزی پێکهاتەکانی بەرهەمهێنانی سەرمایەداریدا جێگەی بووەتەوە. ئەو بەڵگەی ئەوەی دێنایەوە کە "پەیوەندیی چینی بورژوا لەگەڵ دەوڵەت، پەیوەندییەکی بابەتیانەیە. ئەوە بەو مانایەیە کە ئەگەر کرداری دەوڵەت لە ریزبەندییەکی کۆمەڵایەتیی دیاریکراودا لەگەڵ بەرژەوەندییەکانی چینی زاڵ لەو ریزبەندییەدا بێتەوە، ئەوە لە خودی سیستەمەکەوە سەرچاوە دەگرێت: بەشداریی راستەوخۆی ئەندامانی چینی دەسەڵاتدار لە دەزگای دەوڵەتیدا هۆکردی ئەو گونجانە بابەتیانەیە ــ ئەویش هۆکردێکی بەرێکەوت و مەرجدارــ نەك ئەوەیکە هۆکار بێت" (١٥٣، ل٢٤٥).

ئەو وەرچەرخانە لە بەرهەمەکانی پولانزاس دا لە لایەکەوە بە هۆی ئەو ڕەخنەیە بوو کە تیۆرییە سەرەتاییەکەی ئەو هیچ ئاماژەیەکی بە گۆڕانکارییە کۆمەڵایەتییەکان نەکردوە و تەنیا تیۆرییەکە سەبارەت بە سەرلەنوێ بەرهەمهێنانەوەی سەرمایەداری لە لایەن دەوڵەتێکی تەواو بەهێزەوە و لە لایەکی دیکەشەوە بەرەنجامی تێگەیشتنە لە گۆڕانکارییە سیاسییەکانی کۆمەڵگا. لە فۆرمۆلبەندییەکانی دواتری پولانزاس دا، دەوڵەت ئیتر خاوەنی دڵنیایی، وشیاری و توانایی ڕێکخستنەوەی داهاتووی سەرمایەداری نییە. لەم ڕووەوە کە سیاسەتی دەوڵەت لەگەڵ خەباتی کۆمەڵایەتی لە پەیوەندی دایە، سیاسەتی دەوڵەت تووشی ناکۆکی، دژایەتی، گومان و گۆڕان دەبێت (١٥٨، ل٦-١٨٥). پولانزاس هەروا لە سەر ئەو باوەڕە بوو کە کرداری دەوڵەت لە کۆمەڵگای سەرمایەداریدا، سەرلەنوێ بەرهەمهێنانەوەی بارودۆخی پێویست بۆ گەرەنتی کردنی کەڵەکەبوونی سەرمایەدارییە، بەڵام ئایا دەتوانێ ئەم کارە بە ئەنجام بگەیەنێت، جێگای گومانە، چونکە خودی دەوڵەت گیرۆدەی خەباتی چینایەتییە. وەرچەرخان لە تیۆریی دەوڵەتتەوەرەوە بە ئاراستەی تیۆریی کۆمەڵگاتەوەر، زۆر بەرچاوە.

کلاوس ئۆفە دووهەمین بیرمەندە کە لە تێپەڕین بەرەو قۆناغی سێیەمی تیۆری دەوڵەتدا بەشدارە.[٩] ئۆفە بە پشت بەستن بە تێڕوانینی سیستەمی هەوڵیدا بۆ ئەوەی هاوجوتبوونی

---

٩ - ئۆفە لە بەرامبەر بۆچوونی ئامێریی دەوڵەتدا، بەڵگەیەکی دیکەی باسکردووە کە لە سەر بنەمای تیۆریی سیستەمەکان دانراوە نەك لە سەر بنەمای بونیادگەرایی. ڕەخنەی ئەو لە تیۆری ئامێریی دەوڵەت وەکو ڕەخنەکەی پولانزاسە: بە پێچەوانەی تیۆرییە کارتێکەرەکان (influence theories) و باسە دەرهێنراوەکانی ئەڵمانی (German derivationist debates) دەوڵەت ئامرازێکی پوچەڵ نییە کە هەر گروپێکی کۆمەڵایەتی بتوانێ بەدەستییەوە بگرێت. ئۆفە دەڵێت کە بەڵگەی بنەڕەتیی ئەو تیۆرییانە ئەوەیە کە لە کۆمەڵگادا گروپی جۆراوجۆر هەن کە هێندێکیان دەوڵەت کۆنترۆڵ دەکەن. بە بڕوای ئۆفە ئەو بەڵگەیە ئەوە نیشان نادات کە لە بواری بونیادییەوە دەوڵەت دەبێ دەوڵەتێکی سەرمایەداری بێت. بە بڕوای ناوبراو ئەو هۆکارانەی کە دەوڵەتێك دەکەنە دەوڵەتێکی سەرمایەداری، دەبێ لە خودی سیستەمە سیاسیەکەدا بدۆزرێنەوە. تیۆریی ئامێری ناتوانێت "**پێویستیی بونیادی** دۆخێکی ئەوتۆ نیشان بدات" و ناکرێ ئەم تیۆرییە بۆ سەلماندنی **تایبەتمەندیی چینایەتیی** دەوڵەتیش بەکار بهێنرێت (١٣٧، ل٣٣). ئێمە دەبێ بزانین کام "بونیادی نێوخۆیی سیستەمی سیاسی، گرەنتی ئەو داهێنان و بەرژەوەندیەکانە دەکات کە لە پرۆسەی کەڵەکەبوون سەرچاوەیان گرتووە" (هەمان سەرچاوە، ل٦_٣٥ جەخت کردنەوەکە هی ئۆفەیە). کەوابوو تەنیا کاتێك

دەسەڵاتی سیاسی و ئابووریی نیشان بدات. بە بڕوای ئۆفە، دەوڵەت وەك ژێرسیستەمی "سیستەمی دووەمی( لاوەکی)" سیستەمی ئابووری، لۆژیکی سەرمایەداری بەرهەم دێنێتەوە، چونکە بنەمای کالاّ بە سەر ژێر سیستەمەکاندا حکومەت دەکات و ڕێکیان دەخات.

بنەمای ئەبستراکتی ڕاکێشانی هاوولاّتیان لە پەیوەندییە بەردەوامەکانی ئاڵوویر لە بازاڕ، یارمەتییەکی زۆرتر بە پاراستنی هەماهەنگی سیاسەتەکانی دەوڵەت لەگەڵ بەرژەوەندیی چینەکانی هۆکاری کەڵەکەبوونەکە دەکات نەك بە ئەگەری هەرچەشنە "کەین و بەینێك" لە نێوان "بەڕێوەبەرانی هاوبەشی" دەولەت و پیشەسازی (٣٨١، ل٢٥١).

سەرەڕای ئەوەش، ئۆفە بەڵگەی ئەوە دێنێتەوە کە دەوڵەت پێویستی بە وەفاداریی (وەلائی) جەماوەریش هەیە بۆ ئەوەی بتوانێت کرداری سەرەکیی خۆی واتە پاراستن و گەرەنتیی بنەماکانی کەڵەکەبوونی سەرمایەداری بەڕێوەبەرێت. ئەگەر کرداری ئابووریی سەرەکیی دەوڵەت پەرەپێدانی کەڵەکەبوونە، پێویستیی سیاسیی سەرەکیی دەوڵەتیش پێویستی بە شەرعیەتە. ئەو دووانە هەمیشە پێکەوە لە ناکۆکیدان. یەکەم، کاتێك کە دەوڵەت بۆ بەراوردکردنی داواکاریەکانی گروپە جۆراوجۆرە کۆمەلاّیەتییەکان هەوڵدەدات بۆ ئەوەی ئەو پێویستییانە دابین بکات کە سیستەمی سەرمایەداری بە کەڵەکەکردنی تایبەتیی ئەو ناتوانێت دابینی بکات، پەیوەندیی بەها بەکاربراوەکان لەگەڵ پێویستیەکانی بازرگانی رادەگیرێت. هەروەك ئۆفە دەڵێت، دەوڵەت بەکردەوە بەشە "ناکالاّییەکان" و بەدەر لە پێویستییەکانی بازرگانی پێکدێنێت. لەو ڕووەوە کە سیاسەتەکانی دەوڵەت بۆ دەستەبەرکردنی شەرعیەت دەبێتە هۆی سەرهەڵدانی تۆی شێوازە ناکالاّییەکانی ڕێکخستن، کرداری سەرەکیی دەوڵەت واتە گەرەنتی کردنی دۆخێکی پێویست بۆ کەڵەکەکردنی سەرمایەداری دەبێتە بلّقی سەر ئاو.

دووهەم، ئەوەی قەیرانی ئابووری دەخزێتە نێو بواری سیاسییەوە. کاتێك کە دەوڵەت بۆ پوچەڵکردنەوەی قەیرانی ئابووری هەوڵدەدات، چاوەڕوانیی تاکەکان دەباتە سەرێ، ئەو چاوەڕوانیانەی کە دەوڵەت بە ڕوونی ناتوانێ دابینیان بکات. بەلاّم هەوڵەکانی دەوڵەتیش بۆ

---

دەکرێ باسی دەوڵەتی سەرمایەداری بکرێت کە لە سیستەمی سیاسیدا تایبەتمەندییەکی چینایەتی بەرچاو بکەوێت کە لەگەڵ پێویستییەکانی کەڵەکەبوونی سەرمایەداری یەك بگرێتەوە.

دابینکردنی داواکاریەکانی بواری سیاسی هەر بەهەمان رادە لە لایەن تێبینیە ئابووریەکانەوە سنووردار دەکرێتەوە. لە ئاکامدا، هەروەك ئۆفە دەڵێت، دەوڵەت تووشی چەشنێك لە "دابەزینی شەرعیەت" دەبێت و ئەو کارە سەقامگیریی خودی دەوڵەتیش تێکدەدات.

ئۆفە لە سەر ئەو راستییە پێداگری دەکات کە دەستێوەردانی دەوڵەت لە کاروباری ئابووریدا، نەتەنیا بۆ ئابووریی سەرمایەداری بەڵکو بۆ سەقامگیریی سیاسیی خودی دەوڵەتیش دەتوانیٚ ئاکامێکی پێچەوانەی لێبکەوێتەوە. ئەو دەستێوەردانە دەبێتە هۆی سەرهەڵدانی قەیرانێکی سیاسی چونکە بزووتنەوە کۆمەڵایەتییە جۆراوجۆرەکانیش پێکدێن و داواکاریەکانی خۆیان لە دەوڵەت دەخەنەروو. بەم جۆرە، خەباتی چینایەتی تەنیا لە چوارچێوەیەکی ئابووریدا بەرتەسك نابێتەوە، بەڵکو پانتایی سیاسیش دەگرێتەوە. لە راستیدا کاتێك کە دەوڵەت دەچێتە نێو چوارچێوەی ئابوورییەوە، جیاوازیی ئابووری و سیاسەت لەناو دەچێت. کاروباری سیاسی هەم بۆ خوێندنەوەی سیستەمی ئابووریی پڕبایەخ دەبن و هەم بۆ خوێندنەوەی سیستەمی سیاسیش. بەڵام بە بڕوای ئۆفە، کاروباری سیاسی تەنیا لە دەوڵەتەوە سەرچاوە ناگرن، بەڵکو لە خەباتە کۆمەڵایەتییە جۆراوجۆرەکانیشەوە سەرچاوە دەگرن.

ئۆفە، پێشوازی لەو بزووتنەوە کۆمەڵایەتییە نوێیانە کرد کە لە خەباتی چینایەتی ئەولاوەتر دەچن. ئۆفە لە سەر ئەو باوەڕە بوو کە بزووتنەوە کۆمەڵایەتییە جۆراوجۆرەکان ئامرازی نوێن بۆ بەرەوپێش بردنی ستراتیژێکی نوێی ناسەرمایەداری. بە بڕوای ئەو، گەیشتن بە دەوڵەتێکی دێموکراتی لە رێگای خەباتی کۆمەڵایەتییەوە کە دەتوانێت پێویستییە هەنووکەییەکان بەرەوپێش بەرێت، لە پێشەوەی هەموو ستراتیژێکی دیکەوەیە. شێوازە پەسندکراوەکانی رێککەوتنی سیاسیی وەك یەکێتیە کرێکاریەکان و پارتە سیاسییەکان بەتەواوەتی شەرعیەتی خۆیان لەدەست داوە. ئەو خاڵەی کە بۆ باسەکەی ئێمە گرنگە، ئەوەیە کە بە بڕوای ئۆفە دەوڵەت ناتوانێت بە چەشنێکی سەربەخۆ کاربکات. دەوڵەت لە بارودۆخێکدا کاردەکات کە لە لایەن خەبات و کێشمەکێشەکانی کۆمەڵگاوە پێك دێت. ناکریٚ دەوڵەت تەنیا بە ئامرازی دەستی سەرمایەداران ناو ببەین.

"پیرسۆن"، ئۆفە بە تیۆریسیەنێکی پاش مارکسیست و "ئەلن وۆد"یش، پولانزاس بە پشتیوانی پاش مارکسیزم دەزانێت (١٥٠ و ١٨٧). بە بڕوای من ئۆفە و پولانزاس دوو تیۆریسیەنی راگوێزەرن کە رێگەیان بۆ تێپەڕین لە مارکسیزمی کلاسیکەوە بەرەو پاش

مارکسیزم خۆش کرد. پولانزاس و ئۆفە هەردووکیان کاری خۆیان بە بنەما سەرەتاییەکانی تیۆری مارکسیستی دەست پێکرد. هەردووك لە سەر ئەو باوەڕەن کە دەوڵەت لە سیستەمێکی سەرمایەداریدا، دەوڵەتێکی سەرمایەداری دەبێت، چونکە کاری تایبەتیی ئەو بریتییە لە دابینکردنی بارودۆخی سیاسیی پێویست بۆ سەرلەنوێ بەرهەمهێنانەوەی سەرمایەداری. بە بڕوای پولانزاس، تایبەتمەندیی دیاریکراوی دەوڵەت ئەوەیە کە هێندێك کار و کرداری دیاریکراو بەڕێوە دەبات کە تەنیا دەوڵەت توانای ئەو کارانەی هەیە. کاتێك کە دەوڵەت دەست دەداتە بەرهەمهێنانەوەی سیستەمێك لە بەرامبەر بەرژەوەندییەکانی چینێکی دیاریکراودا، بەکردەوە دەتوانێت لە دژی بەرژەوەندییەکانی ئەو چینە بێت. بە بڕوای ئۆفە، دەوڵەت لە کۆمەڵگای سەرمایەداریدا کەوتۆتە نێو کۆمەڵێك لە ژێرسیستەمەکانەوە کە لۆژیکی کالایی یەکیان دەخاتەوە. جێگا و شوێنی تایبەتیی دەوڵەت لەوەوە سەرچاوە دەگرێت کە ئەوە تەنیا دەوڵەتە کە دەتوانێت لەدژی توخمە کاولکارەکانی سەرمایەداری ڕاچێتەوە.

هەتا ئێرە بە بڕوای پولانزاس و ئۆفە چەشنێك لە قەدەرخوازیی پێکهاتەیی دەبینرێت. بەڵام ئەوان لەوەش ئەولاوەتر دەچن و بە تێپەڕین لە بنەما سەرەتاییەکانی تیۆری مارکسیستیی دەوڵەت، چەشنێك بزێوی دێتە نێو بەرهەمەکانیانەوە، چونکە ئەوان دەیسەلمێنن کە دەوڵەت بە بەڕێوەبردنی ڕۆڵی خۆی لەمەڕ هەموو سیستەمەکە، تووشی هێندێك ناکۆکی دەبێت کە ئەرکە بنەڕەتییەکەی لەگەڵ کێشە بەرەوڕوو دەکات. یەکەم، کاتێك کە دەوڵەت بە مەبەستی کۆنترۆڵکردنی قەیرانەکە دەست بەکار دەبێت، لە گەڵ خەباتی کۆمەلایەتیی جۆراوجۆر بەرەوڕوودەبێت. دووهەم، کاتێك دەوڵەت دەچێتە بواری ئابوورییەوە، بە پێکهێنانی ئەو بوارە ناکالاییانەی کە لۆژیکی کالایی هەموار دەکەن، دەبێتە هۆی پێکهاتنی کێشمەکێشە کۆمەلایەتییەکان. دواجاریش، کاتێك کە دەوڵەت ناچار دەبێت لە بەرامبەر بزووتنەوە کۆمەلایەتییە جۆراوجۆرەکاندا کاردانەوە نیشان بدات، پلانەکەی بۆ بەرهەمهێنانەوەی سەرمایەداری یان دابینکردنی شەرعیەت هەموار دەبێت. کەوابوو دەکرێ بڵێین کە دەوڵەت کەوتووەتە نێو گۆڕەپانی کێشمەکێشی سیاسییەوە. ئەو تێگەیشتنە بە پێچەوانەی ئەو تێگەیشتنەیە کە پێیوایە دەوڵەت سەربەخۆیە، لە سەر ئەو ئاستەنگانە جەخت دەکاتەوە کە بزووتنەوە کۆمەلایەتییەکان بە سەر دەوڵەتیدا دەسەپێنن. پولانزاس و ئۆفە هەردووکیان بەشێوەیەکی تایبەتی یارمەتییان بە دەرکەوتنی کەموکوڕییەکانی بیری دەوڵەتتەوەری داوە.

کاتێك کە کەموکوڕییەکانی تیۆری دەوڵەتتەوەر ئاشکرابوون، بادانەوەیەکی خێرا لە دەوڵەتەوە بەرەو کۆمەڵگای مەدەنی هاتە ئاراوە. لە قۆناغی سێیەمی گەشەی تیۆری دەوڵەتدا، بیرمەندانی سیاسی روویان لەو چەمك و بۆچوونانە کرد کە یارمەتی ناسینی کۆمەڵگای مەدەنیان دەکرد. ئەوان روویان لە بەرهەمەکانی "گرامشی"کرد کە دەوڵەت بە "بونیادی سیاسیی کۆمەڵگای مەدەنی" دەزانێت (٦١). ئەو کارە بووە هۆی راکێشانی سەرنجێکی زۆر بەرەولای کۆمەڵگای مەدەنی وەك بوارێك کە تێیدا روکارە ماناداره‌کان ــ جا چ روکاری دەسەڵاتخوازانە بن یان روخێنەرانە ــ بەرهەم دێن. تیۆری سیاسیی ئەم سەردەمەش کە کاریگەرییەکی زۆری بەرهەمەکانی فۆکۆی پێوە دیارە، واتە ئەو کەسەی کە لە سەر ئەو باوەڕە بوو کە دەوڵەت بەرهەمی ئەو وردە دەسەڵاتانەیە کە لە ئاستی کۆمەڵگادا بڵاو بوونەتەوە. بە بڕوای فۆکۆ دەسەڵات شتێك نییە کە لە سەرەوەڕا بەسەر خوارەوەدا داسەپێت، بەڵکو بە هەموو کۆمەڵگادا بڵاو بووەتەوە. فۆکۆ بەڵگەی ئەوە دێنێتەوە کە دەسەڵاتی دەوڵەت بەهیچ شێوەیەك دەسەڵاتێکی رەها نییە و خەڵك لە ژیانی رۆژانەی خۆیاندا بە پێی بونیادی دەسەڵاتی ناوچەیی و یاسا و رێساکان یان نهێنییە کۆمەڵایەتییە وردەکان کار دەکەن، ئەو نهێنیانەی کە زۆر جار لە دژی نهێنییە زاڵەکان رادەچنەوە و بەرتەسکیان دەکەنەوە. ئەو تێگەیشتنە لە لێکۆڵینەوە سیاسییەکاندا پەرەی سەندوە[١٠] و ئێمە دەباتە نێو گۆڕەپانی کۆمەڵگای مەدەنییەوە.

---

١٠ - بە بڕوای فۆکۆ(٤٩)، دەوڵەت سەرەڕای بەهێزبوونی دەزگاکانی ناتوانێت سەرجەم پەیوەندییەکانی دەسەڵات بخاتە ژێر رکێفی خۆیەوە و تەنیا بە پێی پەیوەندییەکانی ئەو دەسەڵاتەی کە هەیە دەتوانێت کار بکات. بە بڕوای فۆکۆ دەوڵەت تەنیا لە کاتێکدا دەتوانێت کاریگەر بێت کە رەگ و ریشەی لە کۆمەڵێك پەیوەندیی جۆراوجۆردا هەبێت کە بواری پێویست بۆ سەپاندنی شێوازە نەریتییەکانی دەسەڵات دەڕەخسێنێت.

## وەرچەرخانی تیۆری سیاسی بەئاراستەی کۆمەڵگای مەدەنی:

هەروەك بینیمان، ئەوەی بووە هۆی تێپەڕین لە قۆناغی دووەمەوە بەرەو قۆناغی سێیەمی گەشەی تیۆری سیاسیی دەوڵەت، سەرهەڵدانی دیاردەیەك بوو کە ناوی بزووتنەوە کۆمەڵایەتییە نوێیەکانی لە سەر دانرا. "ئۆمڤێت" لە خوێندنەوەی خۆیدا سەبارەت بە هیندستان، ئەو بزووتنەوە کۆمەڵایەتییە نوێیانە بەم شێوەیەی خوارەوە وەسف دەکات:

١- "بزووتنەوەی کۆمەڵایەتی"ن، بەو مانایە کە ڕێکخراو، بونیاد و ئایدۆلۆژیای بەربڵاو و گشتییان بۆ گۆڕانکاریی کۆمەڵایەتیی هەیە.

٢- "نوێ"ن، بەو مانایە کە خۆیان بەو ئایدۆلۆژیایەی کە هەیانە، بەکەڵك وەرگرتن لەو چەمکە "نوێیانەی" کە لەگەڵ مارکسیزمی نەریتی لە پەیوەندی دایە بەڵام بە ئاشکرا جیاوازە، باسی چەوسانەوە و ژێردەستەبوونی خۆیان دەکە، ئەو سیستەمەی کە پشتیوانی بارودۆخەکەیە و شێوازی کۆتایی پێ هێنانەکەیە. بەواتایەکی دیکە ناکرێ ئەوان تەنیا وەك "بزووتنەوە جەماوەرییەکانی" ئەو گرووپانە ناویەرین کە دەیانەوێت بە ڕێبەرایەتی چینی کرێکار و پارتە کرێکاریەکان بەرەوپێشەوە بڕۆن و یان ئایدۆلۆژیای چینی کرێکار قبوڵ بکەن. ئەوان بە وشیاریەوە ئەو چەشنە پەیوەندییانەیان ڕەتکردۆتەوە و بەو چەشنەی کە خۆیشیان ئەزموونیان کردووە، ئایدۆلۆژیا دەبنە ژێر پرسیارەوە.

٣- ئەوان بزووتنەوەی ئەو گرووپانەن کە مارکسیزمی نەریتی سەرنجێکی بە چەوسانەوەیان نەداوە (وەك ژنان، دالیتەکان (dalits: توێژی گڵاوەکان لە هیند)، و سودرەکان (sudras/shudra: یەکێك لە توێژەکانی خوارەوە و گڵاوی هیند) یان بە شێوازە نوێیەکانی سەرمایەداریی سەردەم دەچەوسێنەوە (ئەو جوتیارانەی کە بەهۆی چەوسانەوەی ئەو بازاڕەوە کە لە لایەن دەوڵەتەوە پشتیوانی لێ دەکرێت ناچارن بۆ سەرمایەداران بەرهەم بێنن، یان ئەو وەرزێر و دارستان نشینانەی کە بوونەتە قوربانیی قەڵاچۆکردنی ژینگە) و لە هەمانکاتدا بەهۆی سەرنجێکی لەرادە بەدەر بە "خاوەندارێتی تایبەتی" و کاری کرێگرتە، چەمکێك لەمەڕ ئەوان نەهاتووەتە گۆڕێ.

٤- کەوابوو، بۆ لێکدانەوەی تەواوی جێگا و شوێنی ئەو بزووتنەوانە دەبێ بە پێی چەشنێك لە مارکسیزمی ریفۆرم کراو ــ واتە ماتریالیزمی مێژوویی ــ دەست بکرێت بە شرۆڤەکردنی سیستەمی سەرمایەداری (١٤٥، لxv-xvi).

سەرهەڵدانی ئەو بزووتنەوە دێموکراتیانە کە لە چەندین چین و توێژ پێکهاتوون، بەمانای بوژانەوەی کۆمەڵگای مەدەنی لێك دراوەتەوە، بەڵام ئەم دووانە بە تەواوی پێکەوە یەکسان نین. چاکسازیی بزووتنەوە کۆمەڵایەتییەکان، ئاماژە بە دیاردە ئاشکرا و بەرچاوەکان دەکات، ئەوە لە

کاتێکدایە کە دەستەواژەی کۆمەڵگای مەدەنی گەرەنتی دەزگایەکی واتایە بۆ تێگەیشتن لە دەرەنجام و بەرهەمی ئەو خەباتانەی کە ناوبران. هەر بە مەبەستی دیاریکردنی چوارچێوەی ئەو رەوتە دێموکراتییە بوو کە بیرمەندان روویان لە چەمك، زمان و دامەزراوەکانی کۆمەڵگای مەدەنی کرد.

دەکرێ لە لایەکەوە کۆمەڵگای مەدەنی بە مانای دابین کردنی دیموکراسی و رزگاری لە قەڵەم بدرێت، بەڵام واتایەکی چەند قات گشتیتر و قووڵتر لە دیموکراسی هەیە. دیموکراسی دەکرێ ببێتە کۆمەڵێك کردەوەی دەوڵەتی، هەروەك چۆن زۆر جاریش هەر وای لێهاتووە، ئەو کردەوە "دێموکراتی"یانە بەگشتی دەبنە کۆمەڵێك شتی لاوەکی و شانۆگەریی سیاسیی وەك هەڵبژاردن، نوێنەرایەتیی پەرلەمانی و ئەو راپرسییانەی کە بە مەبەستی شەرعیەتدان بە دەوڵەت بەرێوە دەچن. بەداخەوە دیموکراسی تا رادەیەکی زۆر بووەتە شتێکی بێ ناوەرۆك کە رۆڵێکی بەکەڵکی بۆ دەوڵەت هەبووە، بەڵام بەشێوەیەکی ئەوتۆ پەیوەندیی نێوان دەوڵەت و کۆمەڵگا یان پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان روون ناکاتەوە.

لە بەرامبەریشدا، چەمکی کۆمەڵگای مەدەنی لەگەڵ کۆمەڵێك لە گریمانە و بەهاکان و دامەزراوەکانی وەك مافی سیاسی و کۆمەڵایەتی و مەدەنی، سەروەریی یاسا، دامەزراوە نوێنەرایەتیەکان، چوارچێوەی گشتی و لە هەمووانیش گرنگتر ئەنجومەنە جۆراوجۆرەکان تێکەڵە کە پێویستییە حاشاهەڵنەگرەکانی دیموکراسی پێك دێنن. "گێلنەر" لەو وتەیەی خوارەوە، لە مانای قووڵی کۆمەڵگای مەدەنی گەیشتوە:

مانای ئەو وشەیە لە راستیدا پەیوەندییەکی نزیکی لە گەڵ پێکهێنانی سیستەمێکی کۆمەڵایەتی و سیاسیی دێموکراتی یان لیبرالیدا هەیە. لە راستیدا، هەرچەندە بە کورتی وشەی "دیموکراسی" بەمانای دەسەڵاتێکی وەڵامدەر و بەشداریخوازانە قبوڵ دەکرێت، بەڵام شێوازی دیموکراسی بە رادەی شێوازی "کۆمەڵگای مەدەنی" بەکەڵك نییە (٥٥، ل٤٩٥).

کاتێك دەرك بە بەهای چەمکی کۆمەڵگای مەدەنی دەکرێت کە وەبیرمان بێتەوە ئەو چەمکە لە قۆناغێکدا سەری هەڵداوە کە دەسەڵاتی دەوڵەت کەوتووەتە بەر ململانێ و هەوڵێش دراوە بۆ ئەوەی بخرێتە ژێر کۆنترۆڵەوە. چەمکی کۆمەڵگای مەدەنی کاتێك چووە نێو تیۆری سیاسییەوە کە بیرمەندەکان وردە وردە لە سەر ئەو خاڵە جەختیان کردەوە کە بواری کۆمەڵایەتی بەشێوەیەکی سەربەخۆ لە ئاراستە تایبەتییەکانی دەسەڵاتی دەوڵەتی دەتوانێت خۆی رێکبخات. ئەو چەمکە لە بواری مێژووییەوە کاتێك سەریهەڵدا کە ئابووریناسانی سیاسیی کلاسیك هەوڵیاندا بۆ ئەوەی دەسەڵاتی دەوڵەتی بازرگانیی (مرکانتیلیست) کۆنترۆڵ بکەن. ئازادیی کۆمەڵگای مەدەنی بنەمای بزووتنەوە دێموکراتییەکانی سەدەی هەژدەیەمی

خۆرهەڵاتی ئەورووپای هێنائارا لە دژی دەوڵەتە ڕەهاخوازەکان. لـە ڕوانگـەی بیرمەنـدانی وەك هۆبز و لۆك، ئـیتر ئـەوە دەوڵـەت نـەبوو کـە سـنووری کۆمـەڵگای دیـاری دەکـرد، چـونکە شەرعیەتی خۆیشی پابەند بوو بە ڕەزامەنـدی خەڵکـەوە. لـە ڕاسـتیدا لـە تیـۆری لیبراڵـی، چەمکی کۆمەڵگای مەدەنی زۆر ئاوات و ئارەزووی ڕزگاریبەخشی لەخۆ دەگرت کە داکۆکییان لە پلەوپایە و مافی مرۆڤ لە بەرامبەر زوڵم و ستەمی دەوڵەتدا دەکرد و بوارێکی سـەربەخۆیان لە رووکارەکان، مافەکان و پلەوپایەی کۆمەڵایەتیی کەسەکان دیاری کرد.

کۆمەڵگای مەدەنی لە بنەڕەتـدا چـەمکێکە کـە بـە نـەریتی مۆدێرنیتـەی سیاسـییەوە بەستراوەتەوە، ئەو نەریتەی کە لە سەر بنەمای تاکگەرایی و داکۆکی لە مـافی مـرۆڤ بونیـات نراوە. هەر لەبەر ئەو هۆیە چـەمکی کۆمـەڵگای مـەدەنی لـە سـەر بنـەمای جیاکردنـەوەی لێکدانەوەی دوو بواری مەدەنی و سیاسی چێکراوە. ئەو چـەمکە بـۆ پێکهێنـانی پەیوەنـدیی ڕاستەوخۆی نێوان ئەو دوو بوارە پێکهات. ئەو چەمکە لـە لایـەکی تریشـەوە پەیوەسـتە بـە مۆدێرنیتیێ سیاسییەوە. ئەندامانی کۆمەڵگای مەدەنی، خەڵکانێکی "ئازاد و موختار" دەبن و ئەندامێتی لەو بوارەدا بۆ هەمووان ئازادە و پەیوەندیی بە جێگا و شوێنێکەوە نییە کـە بـە میرات پێیان گەیشتووە. هەر ئەو "مانا نوێیەی کۆمەڵگای مەدەنی" (٣٠، ل٣٢٥) بووە کە کاریگەریی هەبوو لە سەر چوون بە ئاراستەی ئەو بوارە.

## کۆمەڵگای مەدەنی لە تیۆری هاوچەرخدا:

بوژانەوەی چەمکی کۆمەڵگای مەدەنی ڕەگ و ڕیشەیەکی سیاسی هەبووە. سەرنجدان بـەم بوارە بەرەنجامی پەرەسەندنی لەرادەبەدەری دەوڵەت لـە خۆرهـەڵاتی ئـەورووپادا بـووە. بـەڵام چەمکی کۆمەڵگای مەدەنی لە سـەر بەرنامەکانی پەرەسـەندنی دیموکراسی لە بەرامبـەر دەوڵەتە بەربڵاوەکانی وڵاتانی سەربەخۆ و وڵاتانی پێشکەوتووی سەرمایەداریشدا کاریگەریی هـەبووە. واپێدەچێت کە پەرەسەندنی لەرادەبەدەری دەوڵەت بووەتە هۆی دابەزینی کۆمەڵگای مەدەنی. هاندانی خەڵك بۆ گەیشتن بەو ئامانجانەی کە لە سەرەوەڕا دیاریکراون، بووەتە هۆی نـابوتی و لەناوچوونی بوارێك کە تێیدا چالاکیی ئازادی ئەنجومەنەکان دەتوانێت توخمـەکانی گوتـارێکی گشتی بێت و گەرەنتی وەڵامدەرەوەیی دەوڵـەت بکـات. باسـی ئـەوە دەکـرێ کـە زاڵبـوون و پاوانخوازیی دەوڵەت لە دیاریکردنی چوارچێوەی گوتاری گشـتی و سـازانی کۆمەڵایـەتی لـەو

کۆمەڵگایانـەدا بووەتـە هـۆی لەناوچـوونی زیندوویـەتی کۆمـەڵگای مـەدەنی، و داهێنـانی چالاکییەکانی ئەنجومەنی لەناو بردووە.

بێگومان گوتاری کۆمـەڵگای مـەدەنی کاریگـەریی زۆری کۆمـەڵگا سۆسیالیسـتیەکانی پێشووی خۆرهەڵاتی ئەورووپای پێوە دیارە. بۆ نموونە "ئاراتۆ" بزووتنـەوە کۆمەڵایەتییـەکانی پۆڵندای بە نیشانەی سەرهەڵدانی "کۆمەڵگای مەدەنی لە بەرامبەر دەوڵەت"دا ناو بردوە (٣، ل٢٣). هەروەها "پێلچنسکی"ش بزووتنەوەی پۆڵندای بە "بوژانەوەی کۆمـەڵگای مـەدەنی" ناوبردووە (١٤٩، ل٣٦٣). ئەو گوتارەی کە لەو بەشـەی جیهانـدا سـەری هەڵـدا، وشـیارانە دەستی دایە بەرامبەرکێ لەگەڵ دەوڵەتە ستالینیەکان، ئەو دەوڵەتانەی کە بـە راکێشـان یـان سـەرکوتی کۆمـەڵگای مـەدەنی، ئـەوانیان لـەناو بـرد. "راپنیـك" بـە تـاوتوێکردنی تایبەتمەندیەکانی تۆتالیتاریزم یان داگیرکاری لە وڵاتانی سۆسیالیسـتی پێشـوو سـەبارەت بـە ئامانجی ئەو دەوڵەتانە بۆ لەناوبردنی کۆمەڵگای مەدەنی دەڵێت: "ئامانج {ئامانجی ئـەوان} بریتییە لە پەرەپێدانی "هاوڕێـیەتی" لە گەڵ سیستەم و تێکشکاندنی تاك وەك دوایین هـەنگاو بۆ ملکەچ بوونی کۆمـەڵگای مـەدەنی" (١٦٤، ل٢٧٥). هەربۆیـە ئـەو هەوڵانـەی کـە بـۆ زیندوکردنەوەی کۆمەڵگای مەدەنی بەڕێوە چوون، باسی لـە خـەباتی راسـتەوخۆ و وشـیارانە لەگەڵ سیاسەتەکانی ئەو دەوڵەتانە دەکرد.[11]

---

١١ - ناوەرۆکی ئەو دەوڵەتە"ستالینی"یانە کە گوشارە کۆمەڵایەتیەکان نەیاندەتوانی کاریان تێبکەن، تەنیا رێگای بۆ چەشنێکی تایبەت لە کۆمەڵگای مەدەنی خۆش دەکرد کە لەو وڵاتانەدا هەوڵیاندا پێکیان بێنن. لەو رووەوە کە پێیانوابوو لە رێگای بزووتنەوە و رێکخراوە کۆمەڵایەتیەکانەوە ناتوانرێ خەسارەت لەو دەوڵەتانە بدرێت، بەزۆری لە هەوڵی ئەوەدابوون کە کۆمەڵگای مەدەنی "دوور لە چاوی دەوڵەت" پێك بێنن. بە وتەی ریدی "خەڵکی خۆرهەڵاتی ئەورووپا کە لەگەڵ ئەگەری بەردەوامیی زاڵبوونی سۆڤیەت و لە ئاکامدا قەدەغەبوونی راپەڕین و چاکسازی بەمانا ئەریتیەکەی بەرەوڕوو بوون، هەوڵیاندا بۆ ئەوەی ستراتیژی دیکە بۆ گۆڕانکاریی کۆمەڵایەتی بدۆزنەوە. لەو پێناوەدا، ئەوان ــ بەتایبەت پۆڵندیەکان ــ چەمکی "کۆمەڵگای مەدەنی"یان بەدەستەوە گرت و پەرەیان بە چەمکی "شۆڕشێکی سنوردار"دا. بە کورتی ئەوان چەشنێك لە ستراتیژی (پێداچوونەوەی کۆمەڵگای مەدەنی)یان وەکو بوارێکی سەربەخۆ لە چالاکییە مرۆییەکان لە دەرەوەی دەوڵەت و چوارچێوە فەرمیەکاندا نۆرمبەندی کرد. ئامانجی ئەو ستراتیژە، بەدەستەوەگرتنی بەکردەوەی دەسەڵاتی دەوڵەت نەبوو، بەڵکو ئامانجەکەی پێکهێنانی وردە وردەی ناوچەیەکی ئازاد لە نێوخۆی

بەڵام پشت بەستن بە چەمکی کۆمەڵگای مەدەنی هەر بە هەمان رادە بەرەنجامی نارەزامەندیی قوڵ لەبەرامبەر دەوڵەتە "زێدەخوازەکان"ی وڵاتانی سەربەخۆدایە. دوای بزووتنەوەی خەڵکی چین لە ساڵی ١٩٨٩، ژمارەیەك لە توێژەران دەستیاندایە قسەوباس سەبارەت بە سەرهەڵدانی کۆمەڵگایەکی مەدەنی نوێ (٥٨و١٣٤و١٩و١٧٨). ئەو کەسانەی کە دەستیاندایە راڤەکردنی ئەو بزووتنەوەیە، پێگەی کۆمەڵایەتیی ئەو بزووتنەوە نارەزامەندیەیان، لە ئەنجومەنە مەدەنییەکانی دامەزراوە ئابووریە بچوکەکان، دامەزراوەکانی تایبەت بە توێژینەوەکان و چاپەمەنیە ئەدەبیەکاندا دیتەوە. ئەوان لە سەر ئەو باوەڕە بوون کە پەرەنەسەندنی ئەو دامەزراوانە بەرادەی پێویست بووە هۆی تێکشکانی بزووتنەوەی ناوبراو. توێژەرانی ئەفریقی دەستیاندایە قسەوباس سەبارەت بە پێویستیی کۆمەڵگای مەدەنی بۆ گەرەنتی کردنی دیموکراسی (٨و١٧٩و١٧و٦). "ستێپان" چەمکی کۆمەڵگای مەدەنی سەبارەت بە بزووتنەوە کۆمەڵایەتییەکانی ئەمریکای لاتین لە رێگای دیموکراسیدا دەکار کرد (١٧٦).

لە هیند، مانای کۆمەڵگای مەدەنی ـ ئەگەر نەڵێین وشەکەی ــ بەشێوەیەکی بەرین سەبارەت بە سەرهەڵدانی بزووتنەوە خەڵکیەکان لە دژی دەوڵەت بەکار هاتووە (٥٧و٦٢و٨٨و٩١و١٦٨و١٦٢). توێژەران بەشێوەیەکی روو لە زیاد سەرنجی کۆمەڵگای مەدەنییان داوە. دەوترێت کە ئەو بزووتنەوانە لەگەڵ شتێك لە پەیوەندی دان کە "کهلی" بە بەکارهێنانی دەستەواژەی "کۆمیسیۆنی سێ لایەنە" پێی دەڵێت "قەیرانی سەروەری". بە وتەی کهلی، "ئەو گوشارانەی کە لە نێوخۆی دەوڵەت و کۆمەڵگای مەدەنییەوە دێن، یارمەتییان کردووە بە سەرهەڵدانی چەشنێك لە دەسەڵاتی تایبەتی و نەشیاو و گەندەڵی و توندوتیژی لە ژیانی گشتیدا". کهلی قەیرانی سەروەری و هەڵوەشانەوەی ژیانی گشتی لە لایەکەوە بە بەرەنجامی دابەزینی پابەندی سەرکردەکان بە "سنووردارىی دەسەڵاتی تایبەتی" و

---

پەرێکهاتەکانی (meta_structures) جێی پشتیوانی دەوڵەت بوو. خەڵکی خۆرهەڵاتی ئەورووپا بە شوێن "شۆڕشێکی سنوردار"ەوە بوون کە بە بێ گۆڕانکاریی دەستبەجێی دەوڵەت و لە راستیدا بە بێ هەڕەشەی راستەوخۆی ئەو ببێتە هۆی گۆڕانی ژیانی تاك و ئەزموونە کۆمەڵایەتیەکەیان... بەجۆرە پێداچوونەی کۆمەڵگای مەدەنی بە بێ ئەوەیکە راستەوخۆ هەڕەشە لەو پەرێکهاتانە بکات کە لە لایەن دەوڵەتەوە پشتیوانییان لێدەکرا، لە ناکامدا دەبووە هۆی گۆڕینی ئەوان (١٦١، ل١٦٩).

له لایەکی دیکەشەوە بە بەرەنجامی داواکاریی روولەزیادی گروپە کۆمەلایەتییە جۆراوجۆرەکان دەزانێت کە بەسیاسیی بوونەتەوە (٨٥، ل٣٠٥).

"ئیل رودۆلف" و "ئیس رودۆلف"یش قەیرانی سەروەری هیندیان بە بەرەنجامی سەرهەلدانی ئەو گروپە داواکارە نوێیانە ناوبردوە کە زۆرترین گوشار دەخەنە سەر سیستەمی سیاسی (١٦٣). بەو پێیە، بۆچوونەکان لە دەولەت و دامەزراوەکانی ئەوەوە بەئاراستەی پەیوەندییەکانی لەگەل کۆمەلگا و کێشمەکێشی گروپە کۆمەلایەتییەکان لەگەل سیستەمی سیاسی چوون (٦٣).[12]

زۆربەی بیرمەندان، کۆمەلگای مەدەنی هیندیان بە یەکێتییەکی ناجێگیری ئەو گروپە کۆمەلایەتیانە ناوبردوە کە لە سەر بنەمای پەیوەندیی خزمایەتی، ئاینی یان خۆبەخشانەی کۆمەلایەتی دامەزراوە. ئەم جۆرە لێکدانەوەیە، بزووتنەوەکانی دژی کۆمەلگای مەدەنی لە چەشنی ئوسولگەری دەمارگرژانە لە هاورێیەتییە خۆبەخشەکان جیا ناکاتەوە. توێژەرەکانی دیکە ئەوەیان وەك کۆمەلێك لە بزووتنەوە نارازییەکان چاو لێکردوە کە لە دژی دەولەتی نەشیاو و نادادپەروەرانەی هیند راپەریون. "ئۆمڤێدت" دەنووسێت لە کۆتایی دەیەی ١٩٨٠دا لایەنی زالی سیاسەتی هیند، بزووتنەوە نوێیە کۆمەلایەتییەکانی ژنان، دالیتەکان، توێژەکانی خوارەوە، وەرزێران و جوتیاران و عەشیرەتەکان و هەروەها خەباتە قەومیەکان بوون... هێژمۆنی پارتی کۆنگرە شکستی خواردوە و سەرچەشنی "نەهرۆیی" پەرەسەندن، بێ بایەخ بووە (١٤٥) توێژەرانی هیندی بۆ وەسف کردنی داخوازیەکانی کۆمەلگا لە دژی دەولەت، دەستیانداوەتە گەشەدان بە کۆمەلگای مەدەنی. زۆربەیان کۆمەلگای مەدەنی بە پانتایی نادەولەتیی نارەزایەتی و ململانێکان دەزانن و سەبارەت بەوەی کە ئایا تاکگەرایی و

---

١٢ - "ئاشیس" ناندی نەیاری ئەو بۆچوونەیە. بە بروای ناندی، بە بەراورد لەگەل چواردەیەی پێشوتر کە دەولەتی هیند لەگەل کەسانی دیکە لە ململانێ دابوو، "دیارترین تایبەتمەندیی کلتوری سیاسیی هیند لەم سالانەی دواییدا بوونی دەولەتی نیشتمانی بە ئەکتەری زال لە بواری گشتیدا بووە". بە پێی گوتەکەی ئەو، دەولەت بە سەر کۆمەلگای مەدەنیدا زال بووە و تەنانەت لەناویشی بردوە (١٣٣، ل٩). وایێدەچێت کە ناندی سەبارەت بە دەسەلاتی دەولەتی هیند زێدەرۆیی کردبێت. ئەوە لە کاتێکدایە کە دینامیکیەتی ژیانی سیاسی ــ بەشێوەی سەرهەلدانی شوناسە نەتەوەییەکان، مەیل و کێشمەکێشە قەومیەکان، بزووتنەوەکانی خوازیاری ئازادییە مەدەنییەکان، بزووتنەوەی ژنان و یان بزووتنەوەی ژینگە پارێزی ــ بەچەشنێکی روولەزیاد خۆی لە کۆمەلگای مەدەنیدا نیشان داوە. دەولەت لە زۆر بواردا کە لەگەل ئەو بەرهەلستیانەدا بەرەورروو بووەتەوە کارێکی ئەوتۆی لە دەست نەهاتوە.

بەرهەمهێنانی کالآیی کە دیاریکەری کۆمەڵگای مەدەنییە لەهیند هەیە یان نا، پێکەوە ناکۆکییان هەیە.[١٣]

خاڵی جێی سەرنج لێرەدایە کە هەم لە خۆرهەڵاتی ئەوروپا و هەم لە وڵاتانی رزگاربووی دەست داگیرکاری، چەمکی کۆمەڵگای مەدەنی بەمانا نوێیەکی، لە دژی تێگەیشتنی ئەو کەسانەیە کە "لە سەرەوە بۆ خوارەوە" لە پەیوەندییەکانی دەوڵەت و کۆمەڵگا دەڕوانن. پشت بەستن بە گرنگیی چەقبەستنی کۆمەڵگای مەدەنی لەگەڵ ئایدیالی دیموکراسی و لیبرالیزمی سیاسی ئاوێتە بووە. پشتیوانانی ئەو رەوتە دەستیانداوەتە بەرامبەرکێ لەگەڵ کەسانی هەلکەوتووی بیرۆکرات کە ویستی سەرکوتکردنی کۆمەڵگای مەدەنی و دەستێوەردانیان هەبووە لە کۆمەڵگای مەدەنیدا. لایەنگرانی کۆمەڵگای مەدەنی راشکاوانە تێدەکۆشن بۆ ئەوەی قەڵەمڕەوی دەوڵەت بەرتەسك بکەنەوە و پەرە بە بواری نادەوڵەتی بدەن.

لە وڵاتانی پێشکەوتووی سەرمایەداریدا، چەمکی کۆمەڵگای مەدەنی لە ئاستێکی بەرز دایە، چونکە چالاکییەکانی دەوڵەتی بیرۆکرات و ئابووریی ئامێریی و عەقڵانی جێگایەکی ئەوتۆی بۆ پێکەوەهەڵکردنی پەیوەندیی نێوان تاکەکەس و گروپەکان نەهێشتوەتەوە. روبەڕووبوونەوەی لۆژیکی کۆمەڵگای مەدەنی کە لە سەر بنەمای پەیوەندی و سۆلیدارێتی دامەزراو بەسەر لۆژیکی بیرۆکراتی، مەزنخوازانە، نادێموکراتی و تێکەڵ بە توندوتیژی دەوڵەت، یەکێك لە شوناسە بەرچاوەکانی بەرهەمەکانی ئەم سەردەمە بووە (٨٢و٨٣). ئازادیی (دڵخواز)ی کۆمەڵگای مەدەنی لەگەڵ چوارچێوەی دژ بە ئازادیی چالاکییەکانی دەوڵەت هەڵدەسەنگێندرێت، رەوتی ئازادانەی بیروڕای گشتی لە کۆمەڵگای مەدەنییدا بە بڵاوبوونەوەی کۆنتڕۆڵ کردنی زانیاریەکان لە لایەن دەوڵەتەوە هەڵدەسەنگێندرێت و دەگوترێت کە پێکەوەسازانی کۆمەڵایەتی لە کۆمەڵگای مەدەنییدا لە سەر بنەمای ئەو نۆرمانەیە کە لە

---

١٣ - "راویندر کۆمەر" لێرەدا سەبارەت بەو گۆڕانکارییانەی کە لەساڵی ١٩٤٧ لە هیندا روویان داوە دەنووسێت "گەشەی ئابووریی پیشەسازی و بازرگانی بوونی ئابووریی گوندنشینی جیابوونەوەی بونیادی، یەکە نەریتییەکانی کۆمەڵگای هیندستانی زۆر لاواز کردوە و بەم جۆرە یەکێك لە کۆسپە سەرەکییەکانی رێکخستنی چینە هەژارەکان بۆ سیاسەتێکی ریشەیی چارەسەر کردوە و رێگای سەرهەڵدانی کۆمەڵگایەکی بە مانای راستەقینەی دونیایی لە هیند کراوەتەوە، کۆمەڵگایەك کە تێیدا توانستی تاکەکەسی بتوانێت لە کەشێکی ئازاد و بەدوور لە سەرینەوەی بیروبۆچوون و ململانێ خێڵەکییەکان دا بەیان بکرێت" (٩٧، ل٤٦).

ناوەرۆکی خۆیاندا لەگەڵ نۆرمەکانی دوو بواری دەوڵەت و ئابووری جیاوازییان هەیە. هەر بەو پێیە چاوەڕوان دەکرێت کە مەیلی دیموکراتیی کۆمەڵگای مەدەنی هەر دوو بواری دەوڵەت و ئابووری تووشی گۆڕانکاری بکات. بەم جۆرە کۆمەڵگای مەدەنی بۆتە کەشێك بۆ ئازادیی بێ ئەملاوئەولا و بۆتە چەمکێکی بنەڕەتی بۆ بەرنامەی دیموکراسیی بنچینەیی، ئەو بەرنامەیەی کە لە بۆچوونەکانی "گرامشی و هابرماس"ەوە سرووش وەردەگرێت (٩٨و١٣١).

## بەڵگەی کۆمەڵگای مەدەنی:

بەڵگە یان پاڵەی کۆمەڵگای مەدەنی داکۆکی لە خۆبەڕێوەبەرایەتیی ئەو بوارە دەکات لە ڕێگای دابینکردنی وشیارانەی رایەڵ و پۆی پتەوی ئەنجومەنەکان، گروپەکانی هاوکاری و بزووتنەوە کۆمەڵایەتییەکان. لە راستیدا پشت بەستن بە دروست کردنی رایەڵ و پۆی یاریدەدەرانەی سەربەخۆ لە دەوڵەت، لە تایبەتمەندییە جیاوازەکانی روانگەی ئەم سەردەمەیە، چونکە ئەو مەیلە لەگەڵ شێوازەکانی کۆنتری خەبات جیاوازی هەیە کە بەشوێن دەست بە سەرداگرتنی هەموو یان بەشێك لە دەسەڵاتی دەوڵەتەوە بوون.[١٤] بزووتنەوە کۆمەڵایەتییەکان لە کۆمەڵگای مەدەنییدا بەتەواوی مافی دەستێوەردانی دەوڵەت لە بەرنامەکانی خۆیاندا رەتدەکەنەوە و نەیاری سەرجەم هەوڵەکانی دەوڵەتن لەمەڕ کۆنترۆڵی ژیانی کۆمەڵایەتی. بەم جۆرە ئەو بزووتنەوە کۆمەڵایەتییە نوێیانە گوتاری دیموکراسییان لە چوارچێوەی سیاسییەوە گواستۆتەوە بۆ چوارچێوەی مەدەنی. ئەمە دەرخەری گەڕانەوەیە بۆ نەریتی کلاسیکی لیبراڵی، ئەو نەریتەی تێیدا دەوڵەتی دیموکراتی بە دەوڵەتێك دەگوترێت کە تەنیا لە ڕێگای دەستوور و دامەزراوەکانی وەك پەرلەمان، پارتە سیاسییەکان و

---

١٤ - بزووتنەوە دیموکراتییەکان دیاردەیەکی نوێ نین، بەڵام ئەوەی تا رادەیەك تازەیە، یەکەم، ئەو بزووتنەوانە هێندێك پرسیان هێناوەتە ئاراوە کە لە ریزی مەسەلە باوەکانی سیاسەت نەبوون، دووەهەم، ئەو بزووتنەوانە لەپاڵ یان لە ژێر دامەزراوە جێکەوتووە سیاسییەکانەوە گەشەیان کردوە و سێیەمیش، ئەو بزووتنەوانە هەوڵدەدەن بۆ ئەوەی دامەزراوە و شێوازی نوێ بۆ نارەزایەتییەکان دروست بکەن. ئەو بزووتنەوانە لەگەڵ گروپەکانی فشار، ململانێکانی هەڵبژاردن و یان خەباتی چینایەتیی جیاوازییان هەیە. سەرەڕای ئەوەش ئامانجی ئەو بزووتنەوانە دەست بەسەرداگرتنی دەسەڵاتی دەوڵەت یان تەنانەت بەشداربوون لە دەسەڵاتی دەوڵەتدا نییە، بەڵکو پەرەپێدانی پانتاییەکی سەربەخۆیە بۆ خۆیان. ئەو بزووتنەوە کۆمەڵایەتیانە دەکرێ بگوترێت لە هەموو شوێنێکدا بەشوێن "پاشەکشەکردن بە دەوڵەت"ەوە بوون. هەرچەندە لایەنگرانی ئەو بزووتنەوانە لەوانەیە بۆ گەیشتن بە بەرژەوەندییەکانی خۆیان هاوکاریی دەوڵەت بکەن، بەڵام لە هەمان کاتدا بۆ پەرەپێدانی کەشی ژیانی ئەنجومەنی لەوانەیە واز لە دەوڵەت بێنن.

جموجۆڵە ڕێکخراوە سیاسییەکانەوە کە تایبەتن بە بواری سیاسییەوە، بەرتەسك ناکرێتەوە، بەڵکو لە ڕێگای ژیانی ئەنجومەنیشەوە کە لە دەرەوەی قەڵەمڕەوی دەوڵەت بەڕێوە دەچێت، سنووردار دەکرێت. مانگی هەنگوینی دووروودرێژی دەوڵەتی کینزی، دەوڵەتی خۆشگوزەرانی، دەوڵەتی چەقبەستوو و دەوڵەتی زیندەخوازی بەئاشکرا کۆتایی پێهاتووە.

لە سەرتاسەری جیهاندا، کۆمەڵگای مەدەنی بۆتە چەمکێکی دیاریکەر بۆ سەلماندنی دروست کردنی قەڵەمڕەوێك لە ئازادی و مافی تاکەکەسی و پێکهێنانی سنووری دەوڵەت. کۆمەڵگای مەدەنی بووەتە گرنگترین ئایدیای ئەو کۆمەڵگایانەی کە لە پێناو دابینکردنی دیموکراسیدا خەبات دەکەن. پێدەچێت سەرجەم دوڵەتەکان لە ناوەرۆکی خۆیاندا سەرکوتکار بن و بیانەوێت سەربەخۆیی ژیانی کۆمەڵایەتی لەناو بەرن، بەچەشنێك کە بە تەواوەتی لیبراڵیزمی بەرایی وەبیر دێنێتەوە و دەگوترێت کە دەوڵەتەکان لە ناخی خۆیاندا زۆروێژ و نەیاری ئازادییە تاکەکەسییەکانن، کەوابوو ناکرێ ئەرکی ئیدارەکردنی ژیانی خەڵك بە دەوڵەتەکان بسپێردرێت.

بەهۆی دڵساردبوونەوە و بێ هیوابوون لە دەوڵەت، ئەو بۆچوونە گومانی لە سەرە کە دەڵێت لە ڕێگای بزووتنەوە شۆڕشگێڕیەکانەوە دەکرێت دەست بەسەر دەوڵەتدا بگیرێت. ئەو گومانە لە ئەزموونی وڵاتانی سۆسیالیستی و ئەو دەوڵەتە سەربەخۆیانەوە سەرچاوەی گرتوە کە سەردەمانێك ڕاپەڕینی نەتەوەخوازی بەناوی خەڵکەوە تێیاندا بەڕێوە چووبوو. بە دروستی باسی ئەوە دەکرێت کە کاتێك بە تەواوی دەسەڵات بەدەستەوە گیرا، سەرکردە نوێیەکان هەوڵیاندا بۆ ئەوەی ڕاپەڕینەکە بگونجێنن یان بێدەنگی بکەن و بەم جۆرە ورەی خەباتکارانەی ئەو بزووتنەوانە کەم بووە. جیاواز لەوەش ئەوە بەڵگەمەند دەکرێت کە پرۆسەکانی هاندان بۆ دەست بەسەرداگرتنی دەوڵەت دەتوانێت ئاکامێکی پێچەوانەی لێبکەوێتەوە:

ئەگەر ئەو ئامانجەی کە شوێن پێیەکەی هەڵدەگیرێت، وەك بابەتێکی "ڕاستەقینە، نەگۆڕ و دیاریکراو" چاو لێبکرێت، ئەو کارە بەگشتی بەر بە لێکدانەوەی ڕەخنەگرانەی ئامرازەکان یان ئەو پرۆسانە دەگرێت کە بۆ دەست پێڕاگەیشتنیان بە ئامانجی ناوبراو کەلکیان لێ وەرگیراوە. سەرەڕای ئەوەش کەسانێك کە بە دەسەڵات دەگەن، دوای ماوەیەك بێ ئەوەی دەست بدەنە ڕاڤەیەکی ڕێك و پێك و ڕەخنەگرانەی ئەو ئامرازانەی کە بۆ گەیشتن بە ئامانجی جێی مەبەست بەکار هێنراون، هەوڵدەدەن هەمووی ئەو ئامرازانە بەکاربێنن کە بۆ گەیشتن بە ئامانجەکەیان سوودی هەیە. تارادەیەك بەشێوەیەکی حاشاهەڵنەگر ئامراز و سەرکردەکانی شۆڕش لە ئامانجە شۆڕشگێڕانەکان دوور دەکەونەوە (١٦١، ل١٧٣).

بەڵگەی ئەوە دەهێنرێتەوە کە ئەوەی پێویستە، نەك ڕووداوێکی کتوپڕ و کورت ماوەی وەك ڕاپەڕین، بەڵکو کۆمەڵگایەکی مەدەنییە کە بزێوی خۆی پاراستوە، سەرنجی بە ئامرازەکانی بەڕێوەبردنی ئەرکەکانی خۆی داوە و بووەتە هۆی گۆڕانی لەسەرخۆ و بەشێنەیی و لە هەمانکاتیشدا دەبێتە هۆی خەملاندنی دەوڵەت. لایەنگرانی کۆمەڵگای مەدەنی ئەوە بەڵگەمەند دەکەن کە دەسەڵاتی دەوڵەت دەبێ لە ڕێگای کۆمەڵگایەکی مەدەنی بزێوەوە کۆنترۆڵ و سنووردار بکرێت. بە تەواوی وادێتە بەرچاو کە کاتی ئەوە هاتووە ئەندامانی کۆمەڵگای مەدەنی بەرپرسیارێتی بەڕێوەبردنی ژیانی خۆیان بە هاوکاریی یەکتری بە ئەستۆ بگرن و کۆنترۆڵی بارودۆخی کار و ژیانی خۆیان بەدەستەوە بگرن.

هۆکارێکی دیکە کە هەر بەو ڕادەیە یارمەتی بە بەهاداربوونی کۆمەڵگای مەدەنی کردوە، بێ هیوایی لە بەشداریی لە پێکهاتەکانی ڕەسمی دەسەڵاتی سیاسیدا بووە. دامەزراوەکانی وەك پارتە سیاسییەکان، یەکێتیە کرێکاریەکان و گروپەکانی گوشار، تایبەتمەندییەکی بیرۆکراتییان بەخۆوە گرتوە و لە داواکارەکانی خۆیان دوور کەوتوونەتەوە. بە پێی وتە هەرگیز لەیاد نەچووەکەی هابرماس، ئەو دامەزراوە بیرۆکراتییانە "جیهانی ژیان"ی خەڵکیان داگیر کردون. ئەرکی کۆمەڵگای مەدەنی دامەزراندنی پەیوەندی و پێکهێنانی پێکهاتەکانی پشتگیریی هاوبەشە لە نێو ئەندامەکانی خۆی دا. ئەرکێکی دیکەی کۆمەڵگای مەدەنی پابەندبوونە بە نەریت و بەها جیاوازەکان لەگەڵ دەوڵەت، دەزگای بەڕێوەبەرایەتی و سیستەمە ئابووریەکان. بەم جۆرە کۆمەڵگای مەدەنی بەمانای چوارچێوەیەکی ئەنجومەنییە کە لە سەر هۆگرییە هاوبەشەکان ڕاوەستاوە و خەڵك تێیدا دەتوانن بە شوێن ئامانجە سەربەخۆکانی خۆیانەوە بن.[15] کۆمەڵگای مەدەنی بە مانای چوارچێوەیەکە کە لە جیاتی کۆنترۆڵی ئەندامانی خۆی و پەیوەندییەکانیان، دەست دەداتە پاراستن و بارهێنانیان.

---

١٥ - "ژان کۆهن" کۆمەڵگای مەدەنی بە مانای "سەقامگیرکردنی دامەزراوە کۆمەڵایەتیەکان لە سەر بنەمای یاسا بە شێوەی لیبراڵیزمی کلاسیك" لێکداوەتەوە. بە بڕوای ناوبراو، کۆمەڵگای مەدەنی لە سێ بەش پێك دێت: پانتاییەکی کۆمەڵایەتی کە لە دامەزراوەکان، ئەنجومەنەکان و مەیلە جۆراوجۆرەکان پێکدێت، چوارچێوەیەکی هەڵبژاردنی ئەخلاقیی سەربەخۆ یان چوارچێوەیەکی تایبەتی و سیستەمێکی یاسایی کە لە سیستەمێکی دەستووری پێکهاتوە و ئەو چوارچێوە کۆمەڵایەتییە دەپارێزێت و جیای دەکاتەوە (٣٠، ل٣٢٥). "ئاراتۆ" کۆمەڵگای مەدەنی بە پێکهاتەیەك لە دامەزراوەکانی لایەنگری سەروەریی یاسا و دابینکەری مافی مەدەنی، پانتاییەکی گشتیی ئازاد و ئەنجومەنە سەربەخۆ جۆراوجۆرەکان دەزانێت (٢٩، ل٢٣).

ئەو تێگەیشتنەیە بۆ کۆمەڵگای مەدەنی کە لە بەرنامەکانی دابینکردنی دیموکراسی لە سەرتاسەری جیهاندا پەرەی سەندوە. لە هەر دوو بواری تیۆری و پراکتیکیدا، ئەو چەمکە بەشێوەیەکی تەواو جیاواز نیشانی دەدات کە ئەو خەباتانە لەگەڵ تێگەیشتنە رزگاریخوازانەکانی پێشو جیاوازییان هەیە. ئەو خەباتانە بەشوێن گۆڕانکاری کۆمەڵایەتی یان پێکهێنانی لێکدابڕانە شۆڕشگێڕانەکانەوە نین، ئامانجەکانی کۆمەڵگای مەدەنی بەرتەسکن: پێکهێنانی کۆمەڵگایەکی مەدەنی زۆر رێك و پێك، رێکخراو، سەربەخۆ و شیاوی هاندان لە خوارەوەڕا (٣١). گەلاڵە سیاسییەکانی کۆمەڵگای مەدەنی لەو بوارەوە بەرتەسکن کە بەشوێن دەست بە سەرداگرتنی دەوڵەت یان گۆڕانی دەسەڵاتی دەوڵەتەوە نین. ئامانجیان پەرەپێدانی پانتاییەکانی ژیانی تاك و کۆمەڵە لە دەرەوەی دەوڵەت.

وا پێدەچێت هەرچەشنە هەوڵێك بۆ دەست بە سەرداگرتنی دەسەڵاتی دەوڵەت یان دابەزاندنی لۆژیکی ئابووریی سەرمایەداری دەبێتە هۆی سەرهەڵدانی کاردانەوەیەك کە ئاکامی نالەباری بۆ ئەو دامەزراوە و نۆرمە کۆمەڵایەتییە نوێیانە دەبێت کە هەتا ئێستا پێکهاتوون. تا رادەیەك ئەو لێکدانەوە رەشبینانەیە لە ئارادایە کە هەر دەوڵەتێك، بە هەر رادەیەکیش کە چاوگێکی شۆڕشگێڕانەی هەبێت، هەروەك دەوڵەتەکەی پێش خۆیەتی. لەو روانگەوە دەکرێ لەو خاڵە تێبگەین کە کۆمەڵگای مەدەنی بەدوور لە چاوی دەوڵەت دادەمەزرێت، چونکە سەربەخۆیی لەو بوارانەدا دەدۆزرێتەوە کە هەڕەشە لە دەسەڵاتی دەوڵەت ناکات.

لە تەواوی ئەو بەڵگانەدا، پشتیوانیەکی توند لە سەربەخۆبوونی دەوڵەت بەرچاو دەکەوێت و لە بنەڕەتدا ئەو چەمکانە بەکارهاتوون کە سەیتەرەی دەوڵەت کەم دەکەنەوە. لە قبوڵی دەوڵەت وەك کاراکتەرێکی کۆمەڵایەتیی سەربەخۆ و خودموختارەوە ئێستا گەیشتووینەتە قۆناغێکی مێژوویی دیاریکراو کە وادیارە دەوڵەت رۆڵێکی زۆری لە بەرنامە کۆمەڵایەتییەکاندا نییە، هەڵبەتە ئەو کارە بەمانای هەوڵدان نییە بۆ لەناوبردنی دەوڵەت، دەوڵەت هێشتاش بۆ پاراستنی شوناسی نەتەوەیی، پشتیوانیکردن لە ئازادییەکان و ئەگەری پەیوەندی بە ناوەندە یاساییەکانەوە هەر وەك پێویستییەك ئەژمار دەکرێت. بەڵام ئێستا هەوڵ بۆ ئەوە دەدرێت کە دەستپێشخەریەکان سەبارەت بە تەواوی پرسە کۆمەڵایەتی و سیاسییەکان بە کۆمەڵگای مەدەنی بسپێردرێت.

## "مەدەنییەت"ی کۆمەڵگای مەدەنی:

چەمکی کۆمەڵگای مەدەنی بە ئاوێتەکردنی سەرنجڕاکێشی دیموکراسی و پلۆرالیزم (فەرەییخوازی) و بەو ڕۆڵە کەمەی کە بۆ دەوڵەتی داناوە، کەسانی بیرمەند و کارای هانداوە کە وەك ڕێگای ڕزگاریی کۆمەڵگا سۆسیالیستی و سەرمایەدارییەکان ئەو ڕێگایە قبوڵ بکەن، ئەو کۆمەڵگایانەی کە لە ژێر باری قورسی عەقڵانییەتی بیرۆکراتیدا وەزاڵە هاتوون. چەمکی کۆمەڵگای مەدەنی کە دەرخەری ئەو شتەیە کە مارکس بە "خەبات و ئایدیا هاوچەرخەکان" ناوزەدی کردبوو، بووەتە پلان و نەخشەیەك بۆ پێداچوونەوەی تیۆری سیاسیی رادیکاڵ و چەپخوازانە و هەروەها تیۆری لیبراڵی لێکەوتووەتەوە. لە ڕاستیدا سنوورەکانی وردی ئەو دوو ڕاڤە سیاسییە کەمڕەنگ بۆتەوە، بە ڕادەیەك کە لە گوتاری کۆمەڵگای مەدەنیدا هەر بەو ڕادەیەی کە ئاماژە بە جۆن لۆك و ئادام سمیس و هیگڵ دەکرێت، ئاماژە بە دوتۆکڤیل و گرامشیش دەکرێت. گێڕانەوەی کۆمەڵگای مەدەنی لە گوتاری هاوچەرخدا تایبەت نییە بە بیرمەند یان نەریتێکی تایبەتی، چونکە لە سەرچاوە و نەریتە فیکرییە جۆراوجۆرەکانەوە سەرچاوەی گرتووە. بەڵام لە بنەڕەتدا ئەو گێڕانەوەیە تایبەتە بە نەریتێکی تەواوی هزری سیاسی کە لەگەڵ پرسەکانی تایبەت بە ڕزگاریی مرۆڤ لە پەیوەندی دابووە.

لە تیۆری سیاسیی کلاسیکدا، دەسەڵاتی ڕزگاریدەرانەی کۆمەڵگای مەدەنی لەوەوە سەرچاوە دەگرێت کە تەنیا لەو چوارچێوە دایە کە تاکەکان خۆیان وەك بوونەوەری کۆمەڵایەتی دەناسێنن. ئەوان دەزانن کە تەنیا بە هاوکاری یەکتری دەتوانن بە شوێن ئامانجە تایبەتییەکانی خۆیانەوە بن. هیگڵی فەیلەسوفی گەورە دەیگوت: "هاوکاری لەگەڵ ئەوانیتر دەبێتە هۆی ئەوەی سنوورەکانی تاك دەستکاری بکرێت، تاك ئیتر پەتی و ناتێکەڵاو نییە و لە ئاکامدا بەهۆی هێزی ڕاهێنانی دامەزراوەکانی کۆمەڵگای مەدەنی، ویژدانێکی کۆمەڵایەتی پەیدا دەکات و تەنیا لە چوارچێوەی ئامانجە گشتییەکاندا بەشوێن ئامانجەکانی خۆیدا دەگەڕێت" (٦٧، ل٤_٣٥٣). لە کۆمەڵگای مەدەنیدایە ــ لە بەرامبەر خێزاندا ــ تاك لە ئەندامێتی خۆی لە کۆمەڵگا تێدەگات.

(پێلچنسکی) دەڵێت: "کۆمەڵگای مەدەنی بەو مانایە بریتییە لە بوارێك کە تێیدا مرۆڤی نوێ بەشێوەیەکی ڕێگەپێدراو بەرژەوەندییە تاکەکەسیەکانی خۆی دابین دەکات و تاکێتی خۆی پەروەردە دەکات" (١٤٩، ل٣٦٤). بەڵام ڕێك هەر لەو چوارچێوەیە دایە کە تاك "فێری بەهای کرداری بەکۆمەڵ، سۆلیدارێتی کۆمەڵایەتی و هاوپەیوەندیی

خۆشگوزەرانی لەگەڵ کەسانی تر دەبێت و بۆ هاووڵاتیی و بەشداریی لە چوارچێوەی سیاسیی دەوڵەتدا ئامادە دەبێت" (هەمان سەرچاوە). بەم جۆرە ئەگەر لە لایەکەوە کۆمەڵگای مەدەنی بەپێی لۆژیکی ئابووریی نوێ، بوارێکە بۆ بەرژەوەندیی تایبەتیی تاکەکانی کۆمەڵگا، لە لایەکی دیکەوە بوارێکە کە تێیدا تاکەکان وەك بوونەوەری کۆمەڵایەتیی خۆیان دەناسن. ئەندامانی ئەو بوارەی مەدەنییەت، فێری بەهای رێزگرتن و لێبووردەیی لەگەڵ کەسانی دیکە دەبن، چونکە چاکسازی تاك بەستراوەتەوە بە چاکسازی تاکەکانی دیکەوە، کۆمەڵگای مەدەنی تایبەتمەندییەکی فێرکارانەی هەیە چونکە تاك فێری بەها و بایەخی کردارە بەکۆمەڵەکان دەکات.

کەوابوو، کۆمەڵگای مەدەنی مەڵبەندێکە کە تێیدا کەسانی موختار و تێگەیشتوو بەشێوەیەکی خۆویستانە پەیوەندیی کۆمەڵایەتی لەگەڵ کەسانی دیکە دادەمەزرێنن. بایەخی ئەو پەیوەندییانە رێك لەوەدایە کە ئەو پەیوەندییانە پشت ئەستوور بەو لێکدانەوە دروستەن کە هیچ مرۆڤێك بەبێ یارمەتی کەسانی دیکە ناتوانێت بە ئامانجەکانی خۆی بگات. تێگەیشتن لەم پرسیە دەبێتە هۆی ئەوەی تاکەکان لە بواری جۆراوجۆری هۆگرییە هاوبەشەکانیاندا ــ لە بوارەکانی ئابووری، کۆمەڵایەتی و بە گشتی سیاسی ــ لە دەوری یەکتر کۆببنەوە. بە وتەی دو تۆکڤیل، "هونەری ئەنجومەن یان کۆڕوکۆبوونەوە" وزە و توانایەکی زۆر بە کۆمەڵگای سیاسی دەبەخشێت. ئەنجومەنە مەدەنییەکان رێگا بۆ پێکهاتنی ئەنجومەنە سیاسییەکان خۆش دەکەن. کۆمەڵگای مەدەنی حەزەکانی ئێمە هەموار دەکات، شوێن پێ هەڵگرتنی هەوسارپچڕاوانەی بەرژەوەندییە تاکەکەسییەکان بەرتەسك دەکاتەوە و ئێمە بۆ سیاسەت بار دێنێت. کەوابوو لە رێگای کۆمەڵگای مەدەنییەوەیە کە دەکرێ لە کۆمەڵگا دێموکراتییەکاندا بەر بە زێدڕۆییەکانی دەوڵەتە چەقبەستوەکان بگیرێت. کۆمەڵگای مەدەنی بۆ سنووردارکردنی دەسەڵاتی دەوڵەت پێویستە.

بەم جۆرە، کۆمەڵگای مەدەنی کە کەشێك بۆ ژیانی هاوبەش یان ئەنجومەنی دەرەخسێنێت، لە ناوەندی کەشێك دایە کە لە لایەکی ژیانی ئابووریی ئەتۆمی یان تاکەکەسی و لە لایەکەی دیکەشیەوە سەروەری دەوڵەت لە ئارادایە. ئەوە رێك هەمان تێگەیشتنی گرامشییە، تیۆر لێهاتووی ئیتاڵی. ئەو لە یادداشتەکانی زیندان دا دەڵێت: "کۆمەڵگای مەدەنی لە لایەکەوە لە نێوان پێکهاتەی ئابووری و لە لایەکی دیکەشەوە لە نێوان دەوڵەت و دەزگا یاسادارێژەرەکان و سەپاندنی کردەوە توندوتیژیەکانی دا بەرەورووویە" (٦١، ل٩_٢٠٨).

هەر لەم رووەوە کە کۆمەڵگای مەدەنی لە نێوان سیستەمی ئابووری و دەوڵەت دایە، کۆمەڵگای مەدەنی لە لایەن هەر دووکیانەوە بەرهەم دێت. گرامشی ئەوە نیشان دەدات کە دەوڵەت بە چ شێوەیەك تێدەکۆشێت بۆ ئەوەی کۆمەڵگای مەدەنی بخاتە ژێر هێژمۆنی خۆیەوە و بەم جۆرە دیسانەوە خۆی بەرهەم بێنێتەوە. کەوابوو بە پێچەوانەی ئەو دەستەواژە باوەی کە دەڵێت "کۆمەڵگای مەدەنی لە بەرامبەر دەوڵەت دایە"، ناکرێ هەر لە خۆڕا ئەو دووانە لە بەرامبەر یەکتریدا دابندرێن. سەرەڕای ئەوەش لە بۆچوونی هاوچەرخدا رێك جەخت لە سەر ئەو روبەڕوبوونەوەیە کراوەتەوە.

بۆ نموونە، "پاتریك چابال" لە پێشەکیی خۆیدا بۆ کتێبی **زاڵبوون بە سەر ئەفریقادا: هێندێك تێبینی سەبارەت بە چوارچێوەی دەسەڵات**، بەم جۆرە کۆمەڵگای مەدەنی شرۆڤە دەکات: "کۆمەڵێکی بەربڵاو لەو گروپ و کەسانەی کە بەردەوام دەگۆڕێن و تەنیا خاڵی هاوبەشیان ئەوەیە کە لە دەرەوەی سەروەری دەوڵەت دان و... تا رادەیەك هەستیان بە **جیاوازی و بەرامبەرکێی خۆیان لەگەڵ دەوڵەت** کردوە" (٢٦، ل١٥). "بایارت"یش لە بەرهەمەکەی خۆیدا هەر لە هەمان کتێبدا، بەم چەشنە باسی کۆمەڵگای مەدەنی دەکات: "کۆمەڵگای پەیوەستە بە دەوڵەت... تا ئەو جێگایەی کە رووبەڕوی دەوڵەت دەبێتەوە" (هەمان سەرچاوە، ل١١١). ئەو دواتر هێندێك لێکدانەوەکەی خۆی دەستکاری دەکات، بەڵام خاڵی بنەڕەتی لە لێکدانەوەکەیدا ئەوەیە کە پەیوەندیی نێوان کۆمەڵگای مەدەنی و دەوڵەت پەیوەندییەکی گرژ و پڕ لە کێشمەکێشە.

دەستەواژەی "کۆمەڵگای مەدەنی لە بەرامبەر دەوڵەتدا" بە دڵنیاییەوە یارمەتیمان دەدات بۆ ئەوەی سەرنج بدەینە زوڵم و سەرکوتی دەوڵەت، بەڵام ئەو دەستەواژەیە شوناسی ئاڵۆز و دژبەیەکی پەیوەندیی ئەو دوو بوارە دەرناخات. یەکەم، هەر دوو چەمکی دەوڵەت و کۆمەڵگای مەدەنی خۆی لەخۆیدا لە بەرامبەر یەکتریدا نین. بە بڕوای هیگڵ کۆمەڵگای مەدەنی دەرخەری قۆناغێکە لە نێوان هەستە نەپوختە و ناتەواوەکان لە لایەك و لۆژیکی گشتیی دەوڵەت لە لایەکی دیکەوە. کۆمەڵگای مەدەنی قۆناغێکە لە پرۆسەی پێکهاتنی دەوڵەت. بە بڕوای گرامشی کۆمەڵگای مەدەنی بوارێکە کە تێیدا دەوڵەتی سەرمایەداری گەلاڵەی سەپاندنی هێژمۆنی خۆی دادەڕێژێت. لە تێڕوانینی گرامشی دا، کۆمەڵگای مەدەنی دەبێتە ئامرازی دەستی دەوڵەت، لە راستیدا گرامشی وەرچەرخانێکی سەرنجڕاکێش لە تیۆری کۆمەڵگای مەدەنیدا پێك دێنێت. بیرمەندە لیبراڵەکانی وەك دۆ تۆکڤیل، کۆمەڵگای

مەدەنییان بە قەڵغانێك زانیوە كە تاك لە بەرامبەر دەوڵەتدا دەپارێزێت. لە بەشێكی زۆری تیۆری لیبراڵیدا، كۆمەڵگای مەدەنی بەمانای چوارچێوەی یاسایی و سەروەری یاسایە كە لە لایەن دەوڵەتەوە گەرەنتی دەكرێت. بەم جۆرە بوونی كۆمەڵگای مەدەنی لە دەوڵەتەوە سەرچاوە دەگرێت. ئەوە لە كاتێكدایە كە بە بڕوای گرامشی، كۆمەڵگای مەدەنی قەڵغان یان پارێزەرێكە بۆ دەوڵەت. خاڵی بنەڕەتی ئەوەیە كە لە هیچ كام لەو دوو نەریتەدا، كۆمەڵگای مەدەنی خۆی لە خۆیدا وەك سەرچاوەی خەبات لە دژی دەوڵەت هەژمار ناكرێت. منیش لە بەشێكی دیكەدا بەڵگەی ئەوە دێنمەوە كە كۆمەڵگای مەدەنی لە ڕێگای كار و كردەوە و ئەندێشەكانی دەوڵەتەوە پێك دێت. كۆمەڵگای مەدەنی تەنیا كاتێك دەتوانێت سەرچاوەی خەبات لە دژی دەوڵەت بێت كە ئەندامەكانی ئاگایانە لە دەرەوەی هێژمۆنی دەوڵەت بن و سەرپێچی ئەو هێژمۆنیانە بكەن. ئەندامانی كۆمەڵگای مەدەنی دەتوانن ئەو كارە بكەن، چونكە ئەوان دەتوانن سوود لە زۆر بەها و بایەخ وەربگرن كە لە ڕووی مێژووییەوە هاوڕێی ئەو چەمكە بوون.

جیاواز لەوەش گرنگتر لە تیۆری هاوچەرخدا ئەوەیە كە دەوڵەت و كۆمەڵگای مەدەنی نەك هەر لە بەرامبەر یەكتریدا ڕاوەستاون، بەڵكو پەیڕەوی لە لۆژیكی جۆراوجۆریش دەكەن. بە بڕوای "ئاراتۆ و كۆهن" كۆمەڵگای مەدەنی لەخۆگری "بەرزبوونەوەی خۆڕێكخستنی پەیوەندییەكانە لە بەرامبەر كردەوەی ستراتیژیك/ئامێری و خۆڕێكخستن لە هەموو بوارەكاندا" (٤، ل٣_٢٧٢). لەم ڕوانگەوە دەوڵەت پانتایی توندوتیژی و زۆرەملێیە، بەڵام كۆمەڵگای مەدەنی مەڵبەندی پێكهاتەكانی پشتیوانی، سۆلیدارێتی و ئەنجومەنە یاریدەدەرەكانە. دەوڵەت مەڵبەندی توندوتیژی و زۆردارییە، بەڵام كۆمەڵگای مەدەنی پانتایی پەیوەندی و لێك تێگەیشتنە.

سەبارەت بە كۆمەڵگای مەدەنی لە بەرهەمە كلاسیكەكاندا، هیچ كات لۆژیكی كۆمەڵگای مەدەنی و لۆژیكی دەوڵەت لە ناكۆكیدا نین. لە ڕاستیدا لەو بەرهەمانەدا، دەوڵەت و كۆمەڵگای مەدەنی لە بواری واتاییەوە پێكەوە گرێدراون و هەر وەك ماركس نیشانی داوە، هەر دووكیان بەرهەمی هەر ئەو پرۆسە مێژووییانەن كە كۆمەڵگای نوێی دروست كردووە. سەرهەڵدانی دەوڵەتی ناكەسەكی (غەیر شخصی) نوێ كە لە سەر بنەمای بنەما گشتییەكان دامەزراوە، بەرەنجامی ڕاگواستنی هەندەكی(جزئی)یە بۆ چوارچێوەی مەدەنی. ماركس لە ڕێگای تێكدانە مێژووییەكەی بۆچوونی هیگڵەوە بوو كە توانی پەیوەندیی بنەڕەتی دەوڵەت و

کۆمەڵگای مەدەنی نیشان بدات، چونکە دەوڵەت نوێنەری سیاسیی گروپێکی زاڵ بوو بە سەر کۆمەڵگای مەدەنی دا. کەوابوو دەوڵەت و کۆمەڵگای مەدەنی، هەر دووکیان پەیڕەوی لە یەك لۆژیك دەکەن.

تیۆری لیبراڵی نیشانی داوە کە کۆمەڵگای مەدەنی بەو سیستەمە مافە پتەوەی کە لە چەقی دایە، کاتێك دەتوانێت هەبێت کە دەوڵەتیش باوەڕی بەو بنەما و بۆچوونە هاوبەشانە هەبێت و پشتیوانی لە حورمەتی تاکەکان لەو مەڵبەندەدا بکات. هەروەك "مایکل والستر" دەڵێت، لە کۆمەڵگای مەدەنیدا "هەمیشە شیمانەی ئەوە دەکرێت کە دەوڵەتێك بوونی هەیە کە یاسا دادەڕێژێت، متمانە بە یاسا دەبەخشێت، ئاشتی و تەبایی دەپارێزێ، بەشوێن سیاسەتێکی کۆمەڵایەتییەوەیە و گەرەنتی کارامەبوونی دامەزراوە کۆمەڵایەتییەکان دەکات"(١٨٣، ل٢١٧). ئەگەر دەوڵەتەکە نادیموکراتی بێت، ناکرێ کۆمەڵگایەکی مەدەنی دێموکراتی لە ئارا دابێت، چونکە یەکەمین ئەرکی دەوڵەتێکی نادیموکراتی، نابودکردنی کۆمەڵگای مەدەنی دەبێت. ئەگەر بوونی دەوڵەتێکی دیموکراتی بەستراببێتەوە بە هەبوونی کۆمەڵگایەکی دیموکراتیەوە، پێچەوانەکەشی هەر بەو رادەیە دروستە.

دووهەم، دەستەواژەی "کۆمەڵگای مەدەنی لە بەرامبەر دەوڵەت دایە" پرسەکان، کەلێن و کەلەبەرەکان و کێشمەکێشەکانی نێوخۆی کۆمەڵگای مەدەنی بە تەواوی تووشی نارۆشنی دەکات. لە لێکدانەوەیەکی پوختەدا لەمەڕ کۆمەڵگای مەدەنی، دەبێ جیاوازییەکانی نێوان تایبەتمەندییە گریمانەییەکانی کۆمەڵگای مەدەنی و هەڵسوکەوتە راستەقینەکەی بدرێتە بەر سەرنج. بە واتایەکی دیکە کۆمەڵگای مەدەنی هەمیشە لەگەڵ مەدەنییەت هاوڕێ نییە. بە بڕوای هیگڵ، مارکس و گرامشی، کۆمەڵگای مەدەنی کە لە سەر بنەمای لۆژیکی کۆمەڵگای سەرمایەداری دادەمەزرێت، پانتاییەکی نایەکسانە کە تێیدا ئەو رووکارە ئابووری و کۆمەڵایەتیانەی کە پشتیان بە بنەماکانی بازاڕ قایمە، چەشنە ریزبەندییەك لە نێوان تاکەکاندا پێك دێنێت. بە بڕوای مارکس، کۆمەڵگای مەدەنی هەرچەندە بە رواڵەت گەلێك تایبەتمەندیی مەدەنییەت و دیموکراسی پێوە دیارە، بەڵام لە بنەڕەتدا بریتییە لە سەرکوتی چینایەتی. "ۆود"یش پەیڕەوی لە مارکس دەکات و ئێمەی لە کۆمەڵگای مەدەنی وەك مەڵبەندێکی هەماهەنگ دوور کردۆتەوە:

چەمکی نوێی "کۆمەڵگای مەدەنی" نیشانی دەدات کە چەپەکان سەبارەت بە مەترسیەکانی زوڵم و سەرکوتی دەوڵەت فێری وانەکانی لیبراڵیزم بوون، بەڵام بە رواڵەت

وانەکانی سۆسیالیزمیان لە مەڕ زولم و سەرکوتی کۆمەڵگای مەدەنی لەبیر کردووە. لایەنگرانی کۆمەڵگای مەدەنی لە لایەکەوە داکۆکی ئێمە لە دامەزراوەکان و پەیوەندییە نادەوڵەتیەکان لە بەرامبەر دەسەڵاتی دەوڵەتدا بەهێز دەکەن و لە لایەکی دیکەشەوە خۆڕاگریی ئێمە لە بەرامبەر توندوتیژی و گوشاری سەرمایەداریدا لاواز دەکەن (١٨٨، ل٦٣).

لە تێگەیشتنێکی ڕەخنەگرانە سەبارەت بە کۆمەڵگای مەدەنی، دەبێ سەرنجی تایبەتمەندیەکانی ئەو مەڵبەندە بدەین کە لە بەرامبەر زولم و سەرکوتی چینایەتیدا تووشی خەسارەت دەکەن. دەبێ ڕوانگەی ڕەخنەگرانە، زولم و سەرکوتی خودی کۆمەڵگای مەدەنیش لەبەرچاو بگرێت. بۆچوونی ڕەخنەگرانە دەبێ نیشانی بدات کە بۆچی کۆمەڵگای مەدەنی بەر لەوەی بتوانێت ببێتە گۆڕەپانێك بۆ پێکهاتەکانی پشتگیری و ڕێکخراوە یاریدەدەرەکان، دەبێ لە لایەن بزووتنەوە کۆمەڵایەتییەکانەوە شوناسێکی دیموکراتی بەخۆیەوە بگرێت. "ئەگەر چەشنێك پرۆسەی هەمووارکردنەوە نەبێت کە لە بەرامبەر سەروەریدا خۆڕاگری بکات، دەوڵەت بەخێرایی دەبێتە پشتیوانی ئەو دۆخەی کۆمەڵگای مەدەنی و ئامرازەکانی زاڵبوون دەبن بە پرۆسەی هەمووار کردن" (١٦١، ل١٧٢).

سێیەم، لە تیۆری هاوچەرخدا، چەمکی کۆمەڵگای مەدەنی، چەمکێکی نەرێ یان هیچە، واتە بە بێ زێدەڕۆی هەموو شتێك دەگرێتەوە بێجگە لە دەوڵەت. "تایبەتمەندیی جیاکەرەوەی کۆمەڵگای مەدەنی لەوەدایە کە هێندێك لە بوارەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی ـ خێزان، مەڵبەندە ئابووریەکان، چالاکییە فەرهەنگییەکان و پێکەوەهەڵکردنی سیاسی ــ دەگرێتەوە کە لە ڕێگای ڕیزبەندیی تایبەتی یان ویستی تاکەکان و گروپەکانی بەدوور لە کۆنترۆڵی ڕاستەوخۆی دەوڵەت، ڕێك دەخرێن" (٦٨، ل١٨١_١٨٠). "چاباڵ"یش لە قسە و باسەکانی خۆیدا سەبارەت بە وڵاتانی باشوری سەحرای ئەفریقا بە شێوەیەکی هاوچەشن بەم جۆرە کۆمەڵگای مەدەنی وەسف دەکات:

هەر شتێك سەر بە دەوڵەت نەبێ، سەر بە کۆمەڵگای مەدەنییە. کۆمەڵگای مەدەنی نەتەنیا هەمووی ئەو شتانەی کە بە ڕوونی سەر بە دەوڵەت نین، بەڵکو تەواوی ئەو کەسانەش کە لەوانەیە لە ماف و دەسەڵات بێبەری بووبن، دەگرێتەوە: نە تەنیا گوندنشینان، ماسیگران، خێوەت نشینان، کەسانی جۆراوجۆر لە هەر تەمەنێك دابن، ئەندامانی شوراکانی ئاواییەکان، یان کۆخ نشینەکان، بەڵکو کەسانی پسپۆڕ، سیاسەتمەدارەکان، قەشەکان و پێشەوایانی

ئاینی، رۆشنبیران، ئەفسەرە سەربازییەکان و تەواوی ئەو خەڵکانەی کە دەستیان بە دەوڵەت ڕانەگەیشتوە یان هەست دەکەن کە دەستیان پێی ڕاناگات، لەخۆ دەگرێت (٢٦، ل١٥).

کۆمەڵگای مەدەنی بووەتە مەعجونێکی واتایی کە خێزانەکان، گروپە ئاینییەکان و سەرجەمی چالاکییە نادەوڵەتییەکان دەگرێتەوە. ئەو لێکدانەوەیە لەگەڵ لێکدانەوەیەکی تایبەتی کە لە بەرهەمە ڕەسەنەکانی بۆچوونی سیاسیدا بەرچاو دەکەوێت، بەتەواوی دژایەتی هەیە. لە گوتاری لیبراڵی نەریتیدا، کۆمەڵگای مەدەنی چوارچێوەیەکە کە ئەندامەکانی ئەو کەسانەن کە مافێکی پارێزراویان هەیە و تایبەتمەندییەکانیشی گشتگیربوون، ئازادیی چاپەمەنییەکان و بوونی ئەنجومەنەکانە. لە نەریتی مارکسی ــ هیگڵی دا، کۆمەڵگای مەدەنی چوارچێوەیەکە کە تێیدا پرۆسە کۆمەڵایەتییەکان، دونیای ماددیی ئابووریی سەرمایەدارییان پێکهێناوە و بڵاوی دەکەنەوە. کۆمەڵگای مەدەنی گۆڕەپانی کەسانی خۆویست و پەیوەندییە کۆمەڵایەتییە ئامێرییەکانە. لە بەرهەمەکانی گرامشیش دا کۆمەڵگای مەدەنی گۆڕەپانی هێژمۆنی و خەبات لە دژی ئەو هێژمۆنییەیە. لە زۆربەی تیۆرەکاندا، کۆمەڵگای مەدەنی گۆڕەپانی ئەو کاروکردەوە و ڕوکارانەیە کە کۆمەڵگا و دەوڵەت پێکەوە گرێ دەدەنەوە. بۆ ئەوەی کۆمەڵگای مەدەنی ببێتە بنەچەیەك بۆ باسکردنی بۆچوون و ستراتیژییەکی سیاسیی ڕادیکاڵ و ڕەخنەگرانە، دەبێ ئەو تێگەیشتنە دیارەی کۆمەڵگای مەدەنی قبوڵ بکەین.

چوارەم، بەهۆی نەبوونی چەمکێکی ورد سەبارەت بە کۆمەڵگای مەدەنی، ئەو دەستەواژەیە مانای جۆراوجۆری بۆ کەسە جۆراوجۆرەکان بەخۆوە گرتووە. "زۆربەی کاتەکان وشەی" کۆمەڵگای مەدەنی" بەکار دەهێنرێت، بێ ئەوەی دیاری بکرێت مەبەست لەمە، سیاسەتەکانی بازاڕی و سەرمایەداری میلتون فریدمەن یان بزووتنەوە کۆمەڵایەتییەکانی وەك "بزووتنەوەی سۆلیدارێتی"یە و یان چەشنێك لە کۆمەڵگای سیاسی یان چوارچێوەیەکی گشتیی جێی پەسندی بیرمەندانی وەك مۆنتسکیۆ هەتا دو تۆکڤیل و هابرماسە کە سەردەمانێك بیر لەوە دەکرایەوە کە لە کافەکان و قاوەخانەکاندا هەیە" (٢١، ل٢٦٧). ئەو تێگەیشتنە کە دەڵێ دەبێ پاشەکشە بەدەوڵەت بکرێت چونکە سەربەخۆیی و ئازادی تاکی لەناو بردوە، دەتوانێت بەمانای ئازادسازی هەوسارپچڕاوی بازاڕ بێتە ئەژمار، هەروەك بەکردەوەش ئاوا لێکدراوەتەوە. چەمکەکانی ئازادی و سەربەخۆیی لە دەوڵەت، بە تەواوی لەگەڵ گەلاڵە قایکارەکان و لێکدانەوە قایکارانەکان لەمەڕ کۆمەڵگای مەدەنی بۆ بەرتەسك کردنەوەی دەوڵەت، پەرەپێدانی کار و کاسبی تاکەکەسی، دنەدانی ململانێی هەوسارپچڕاو و

پشتیوانی لە خاوەندارێتی تایبەتی، دێتەوە. ئەو تێگەیشتنە لەجیاتی ئەوەی ببێتە بنەچەیەك بۆ تیۆری سیاسیی رادیکاڵ، لە راستیدا دەتوانێت یاریدەدەری تیۆری سیاسیی قایمکارانە بێت. بەواتایەکی تر ئەو تێگەیشتنە دەتوانێت ببێتە مۆتەکەیەك بۆ بیرمەندە رادیکاڵەکان.

ئەو کەسانەی کە ئێستا جەخت لە سەر کۆمەڵگای مەدەنی دەکەنەوە، بەهۆکاریی سیاسیی ستراتژیك و جۆراوجۆر، ئەو بزووتنەوە پێویستانەیان لەبەرچاو نەگرتوە و وردە وردە چەمکی کۆمەڵگای مەدەنی بەتوندی مایەپوچ دەکەن. من گومانم هەیە لەوەی ئەوان بەو ناکامانە گەیشتبن، چونکە لە تیۆری سیاسیدا لە دەوڵەت خافڵ بوون. لەگەڵ گرنگ بوونی کۆمەڵگای مەدەنی بۆ بیرمەندە سیاسییەکان، دەوڵەت وەلا نراوە و لە زۆربەی بەرهەمە پاش مارکسیستیەکاندا، چەمکی دەوڵەتی تێدا نییە و دەوڵەت ئیتر چەقی لێکۆڵینەوەکان و خەباتی سیاسی نییە (٥٠). ئەو کارە ناکامێکی تارادەیەك جددی بۆ ناسینی سیاسیی دەوڵەت و کۆمەڵگای مەدەنی تێدایە، چونکە هەر بەو چەشنەی کە پشت بەستن بە دەوڵەت پێشی گرنگیدانی گرتووە بە کۆمەڵگای مەدەنی، پشت بەستن بە کۆمەڵگای مەدەنیش بەری ناسینی پەیوەندیی ئاڵۆزی ئەو دەگرێت لەگەڵ دەوڵەت.

لە تاوتوێکردنی کۆمەڵگای مەدەنیدا هەمیشە دەبێ دەوڵەت لەبەرچاو بگیرێت، چونکە کۆمەڵگای مەدەنی تەنیا لە پەیوەندیی لەگەڵ دەوڵەت دایە کە مانا پەیدا دەکات. یەکێك لە بەڵگە بنچینەییەکانی ئەم کتێبەش ئەوەیە کە دەڵێت تەنیا کاتێك دەتوانین دەوڵەت بناسین کە بچێتە چوارچێوەی کۆمەڵگای مەدەنییەوە. هەر بەم چەشنەش کۆمەڵگای مەدەنی کاتێك دەناسرێت کە ئەو بە بوارێك بزانین کە یەکەم، دەوڵەت لە رێگایەوە هەوڵدەدات بۆ کۆنترۆڵکردنی کۆمەڵگا و دووهەمیش ئەوەی کە لەم بوارە دایە کە دەکرێ لەگەڵ دەسەڵات و چینە زاڵەکان خەبات بکرێت. کەوابوو گرنگترین تەوەری تیۆریی ئەم کتێبە، کۆمەڵگای مەدەنییە.

هەرچەندە دەکرێ بگوترێت کە وەرسووڕانی تیۆری سیاسی بە ئاراستەی کۆمەڵگای مەدەنی دیاردەیەکی فیکریی گرنگ و دڵخۆشکەرە، بەڵام بەکارهێنانی ئێستای ئەو چەمکە بە قوڵی جێی تێڕامانە. کەڵك وەرگرتن لەو چەمکە بۆ ئامانجە ستراتێژیکەکان دەتوانێت گرنگی بە ئامانجگەلێکی تایبەتیی بدات (لێرەدا مەبەست رزگاربوون لەچنگ دەوڵەتێکی دەست تێوەردەرە)، بەڵام کەڵك وەرگرتنی ساکارانە و ناڕەخنەگرانە لەو چەمکە دەتوانێت پرسی تەواو جیاواز پێك بێنێت. کەڵك وەرگرتنی ستراتژیك لە چەمکەکان بەگشتی یان دەبێتە هۆی ساکارسازی یان گەورەکردنەوەیان. هەروەها ئەگەر کار و کردەوە و رووکارە سیاسییەکان لە

سەر بنەمای لێکدانەوەیەکی هەڵە یان لانیکەم ناتەواوی چەمکەکان پشت نەستوور بێت، کەمتر دەتوانن رۆڵێکی رزگاریدەرانەیان هەبێت.

من لەم کتێبەدا بەڵگەی ئەوە دێنمەوە کە کۆمەڵگای مەدەنی وەك بوارێك کە کۆمەڵگای مەدەنی و دەوڵەت پێکەوە گرێ دەدات، پێویستییەکی رەهایە بۆ دیموکراسی. بەڵام پێویستیی رەهای کۆمەڵگای مەدەنی نەتەنیا لە بوونی وەها مەڵبەندێکەوە بەڵکو لەوەوە سەرچاوە دەگرێت کە ئەو بوارە لە بواری مێژوویەوە لەگەڵ بەها دیموکراتیە بەشداریخوازانەکان، وەڵامدەرەوەکان و پێکهێنانی گوتارێکی گشتی لە رێگای ژیانی ئەنجومەنیەوە لە پەیوەندی دابووە. سەرەڕای ئەوانە، من لە جیاتی ئەوەی بە تەنیایی کۆمەڵگای مەدەنی بە چارەسەری سەرجەم گرفتەکان بزانم، خودی ئەو پانتاییەشم خستوەتە بەر تێڕامان. من بەڵگەی ئەوەم هێناوەتەوە کە بەرلەوەی ئەو بوارە بتوانێت رۆڵە چاوەڕوانکراوەکەی خۆی واتە دیموکراتی کردنی دەوڵەت بگێڕێت، خودی ئەو بوارە دەبێ بکەوێتە بەر رامان و تایبەتمەندییەکی دیموکراتی بەخۆیەوە بگرێت. ئەوە بەو مانایەیە کە بۆ ئەوەی کۆمەڵگای مەدەنی رۆڵێکی رزگاریدەرانەی هەبێت، ئەو پرسانەی کە بیرمەندانی سیاسی سەبارەت بەو چەمکە گەڵاڵەیان کردوە، دەبێ بە هەند وەربگیرێن. ئەگەر لە گەڵاڵەی بووژاندنەوەی کۆمەڵگای مەدەنیدا هەر دووك گروپی لایەنگران و رەخنەگرانی بەشدار نەبن، ئەو گەڵاڵەیە بەناچاری گەڵاڵەیەکی تاك رەهەندی و نوقسان دەبێت.

داخوازیی بەرتەسك کردنەوەی دەوڵەت دەتوانێت ببێتە ئایدۆلۆژیای سەرمایەداری و پارێزەری ئەو بارودۆخەی کە هەیە، مەگەر ئەوەی سەرنج لە زوڵم و سەرکوتی کۆمەڵگای مەدەنیش بدرێت. کۆمەڵگای مەدەنی خۆی لە خۆیدا هیچ چەشنە بەهایەکی ئەنجامناسی تێدا نییە، مەگەر ئەوەی خودی ئەو بوارەش بکەوێتە بەر تێڕامان و گەڵاڵەیەك بۆ دێموکراتیزەکردنی دابڕێژرێت. داواکاریی پاشەکشەکردن بەدەوڵەتیش هیچ بایەخێکی تایبەتی نییە، مەگەر ئەوەی زوڵم و سەرکوتی کۆمەڵگای مەدەنی بە یەکجاری لەناو بچێت بۆ ئەوەی خەڵك بتوانن بە پێی بنەماکانی ئازادی و یەکسانی و لە چوارچێوەی گوتارێکی گشتیی رەسەندا پێکەوە لە پەیوەندی دابن.

بەهێزکردنی کۆمەڵگای مەدەنی بەشێکی گرنگی هەرچەشنە گەڵاڵەیەکی سیاسی و تیۆرییە لە پێناو پێکهێنان و پاراستنی دیموکراسیدا، بەڵام بەر لەو کارە دەبێ شوناسی کۆمەڵگای مەدەنی، جێگاکەی ئەو لە فۆرمۆلبەندی کۆمەڵایەتی و پەیوەندیی ئەو لەگەڵ

دەوڵەت بناسین. پڕ بایەخبوونی کۆمەڵگای مەدەنی ئەوە دەخوازێت کە خودی ئەو چەمکە تاوتوێ بکرێت. بەو پێیە ئەو کارە هەوڵێکە بۆ ناسینی تۆخمەکان، ئاماژەکان و نەگونجانی ئەو چەمکە لە نەریتە جۆراوجۆرەکاندا.

سەرەنجام، کاتێك دەتوانرێت بۆ چەمکێك لە دیاریکردنی دیاردە کۆمەڵایەتییەکاندا بەها دابنرێت کە ئەو چەمکە، یارمەتی بە ناسینی چەمکەکانی تر بکات. ئەوە بەو مانایەیە کە هەر چەمکێك لە چوارچێوەی کۆمەڵێك لە چەمکەکانی نێوخۆی نەریتێکی تیۆریی تایبەتدا دەکرێ دەرك بکرێن. بەواتایەکی دیکە لە نێوان چەمکەکاندا پەیوەندییەك لە ئارادایە. کەوابوو بۆ خوێندنەوەی چەمکێك دەبێ بتوانین ئەو لەگەڵ چەمکەکانی دیکە گرێ بدەینەوە و بزانین کە ئەو چەمکانە بە چ شێوەیەك یەکتری بەرهەم دێنن. بۆ نموونە لە تیۆری مارکسیستیدا، ئەگەر کار لە لایەن سەرمایەوە دروست دەبێت، سەرمایەش لە لایەن کارەوە دروست دەبێت، و ناکرێ بە بێ یەکتری لەو دوانە تێبگەین و هەرکامێکیان بەستراونەتەوە بەوەی دیکەوە. وە ئەو دوو چەمکە پێکەوە، ئەو توانایییە بە ئێمە دەبەخشن کە بچینە نێو بواری بەرهەمهێنان، دابەشکردن و گەڕان و لەخۆنامۆبوون و خەباتی چینایەتی و جەوهەری سیاسەت بناسین. پەیوەندیی چەمکەکان لەگەڵ یەکتری بەردی بناغەی تیۆر پێك دێنن. کەوابوو ئەو چەمکەی کە سەرنجی دەدرێتێ، دەبێ هەم ناقارێك بە ئێمە نیشان بدات و هەم چوارچێوەیەکیش بخاتە بەردەستی ئێمەوە، ئەو چەمکە دەبێ بتوانێت رێگا بۆ لێکۆڵینەوە نوێیەکان خۆش بکات.

کۆمەڵگای مەدەنی چەمکێکی ئەوتۆیە چونکە رێگای بۆ خوێندنەوەی دەوڵەت ئاوالاکردوە، شوناس و بزێویی دەوڵەتی دیاری کردوە، وەڵامی زۆربەی پرسیارە بێ وەڵامەکانی تیۆریی دەوڵەتتەوەری داوەتەوە و پەیوەندیی کۆمەڵایەتیی نێوان دەوڵەت و کۆمەڵگا دادەمەزرێنێت. هەر بەو رادەیە ئەو چەمکە بنەچەیەك بۆ خوێندنەوەی ئەندێشە سیاسی و بزووتنەوە کۆمەڵایەتییەکانی پێکهێنەری کۆمەڵگای مەدەنی وەك چەشنێك لە مەڵبەندی پەیوەندیگرتن و تێکهەڵچوون دابین دەکات. کۆمەڵگای مەدەنی وەك مەڵبەندێکی ناوەڕاست یان پەیوەندی، لە نێوان دەسەڵات، کێشمەکێش و کاردانەوەی دەوڵەت وەك دەسەڵاتی رێکخراوی فۆرمۆلبەندی کۆمەڵایەتی، پەیوەندییەك دادەمەزرێنێت.

ئەم کتێبە وەك مێژوویەکی واتایی، وەك چەشنێك لە مانادانان سەبارەت بەکۆمەڵگای مەدەنی و وەك رەخنە لە بەکارهێنانی سەردەمیانەی ئەم چەمکە، لە سەر کۆمەڵگای مەدەنی جەخت دەکاتەوە وەك مەڵبەندێك کە لە رێگای ئەوەوە دەکرێ دەوڵەت وەك پەیوەندییەکی

کۆمەڵایەتی بناسێندرێت. ئەم کتێبە هەر لەو روانگەوە لە سەر کۆمەڵگای مەدەنیش جەخت دەکاتەوە، چونکە لەو چوارچێوەیەدایە کە سیاسەتی واتایی دەکرێ بونیات بنرێت، تاک دەتوانێت دەستی بە ئازادی و یەکسانی رابگات، و دەکرێ دیموکراسی وەدی بێت. بەڵام لەم کتێبەدا دەوڵەت و تێکهەڵچوونی سیاسی لەگەڵ دەوڵەت بەردەوام لەژێر سەرنج دایە. هەر بۆیە ئەم کتێبە لەگەڵ ئەو بەرهەمانەی کە سەبارەت بە کۆمەڵگای مەدەنی نووسراون، جیاوازی هەیە، ئەو بەرهەمانەی کە جەخت لەسەر ژیانی رۆژانەی تاکەکان و فەرهەنگەکەیان دەکەنەوە، بەڵام کاریان بەسەر تێکهەڵچوونی سیاسی لەگەڵ دەوڵەت نییە. ئەم کتێبە سرووشی زۆری لە مارکسیزم وەرگرتووە بەڵام بە هێندێك گۆڕانکاری، فۆرمۆلبەندییە تیۆریی مارکسیزمی نەریتی هەموار کردووە. بۆ نموونە ئەم کتێبە لەو تێگەیشتنەی مارکسیزمی کلاسیك کە کۆمەڵگای مەدەنی لەگەڵ ئابووریی کالایی بە یەکسان دادەنا، لای داوە. لە بەرامبەر ئەوەدا لەو کتێبەدا ئەوە بەڵگەمەند کراوە کە کۆمەڵگای مەدەنی چوارچێوەیەکی ئەندێشە سیاسییە گونجاوەکانە کە گوتارێکی سیاسی پێك دێنن و دەیپارێزن. گرنگتر لە هەمووی ئەوانە لەم کتێبەدا بەڵگەی ئەوە هێنراوەتەوە کە لە فۆرمۆلبەندییەکی کۆمەڵایەتیدا، سیاسەت ملکەچی لێکدانەوەکان و پەیوەندییەکانی خودی کاربەدەستە سیاسییەکان.

## رامان له دەوڵەت:

دەوڵەت یەكێك بوو لە بابەتە كلاسیكەكانی زانستی سیاسەت و ئێستاش هەر وایە. لە ڕاستیدا زۆربەی بیرمەندانی سیاسی خوێندنەوەی دەوڵەت بە هۆكاری هەبوونی زانستی سیاسەت دەزانن.[١٦] بەو پێیە بۆچوونی سیاسی تارادەیەك نوقمی رامان لە دەوڵەتدا بووە. هەر بەو جۆرەی كە "دیوی" ئاماژەی پێكردوە، "كاتێك كە باسی وشەی دەوڵەت دەكەین، تارماییەكی زەینی، روانگەمان لێڵ و تاریك دەكات" (٣٨، ل٩_٨). بیرمەندە سیاسییەكان بەو هەموو هەستیارییەی كە سەبارەت بە دەسەڵات هەیانە، جەخت لە سەر دەوڵەت دەكەنەوە، چونكە دەزانن كە دەوڵەت بەرجەستەبووی دەسەڵاتە. دەوڵەت دەتوانێ بەچەشنێك ژیانی تاكەكان ڕێكبخات و كۆنترۆڵیان بكات كە هیچ دامەزراوەیەكی تر ئەو توانایییەی نییە. كەوابوو كەم تا زۆر هەموو دیاردەكانی كۆمەڵگا لە لایەن دەوڵەتەوە ڕێك دەخرێن. لە ڕاستیدا قسەكردن لەسەر هەر دیاردەیەك ــ لە هەموو بوارەكانی پەیوەندیی سێكسی، خێزان، ئایین، ژینگە، یاسا، مافەكان، كلتور و یان دەقە ئەدەبییەكان ــ بەبێ سەرنجدان بە دەوڵەت وەك دەسەڵاتێكی ڕێكخراوی فۆرمۆڵبەندیی كۆمەڵایەتی، كەم تا زۆر مەحاڵە. دەوڵەت وەك دەسەڵاتی ڕێكخراوی فۆرمۆڵبەندیی كۆمەڵایەتی، هەم ئەو دیاردانە دەخاتە چوارچێوەیەكی تایبەتییەوە و هەم ڕێكیشیان دەخات. بۆ نموونە، گرامشی لە ساڵی ١٩٢٩ و لەكاتێكدا كە خەریكی تاوتوێكردنی ڕۆڵی ڕۆشنبیران لە مێژووی ئیتاڵیا دابوو، رووی لە خوێندنەوەی دەوڵەت كرد. "لە مانگی ئوتی ساڵی (١٩٢٩)، گرامشی، مەیلی تایبەتیی ڕۆشنبیرانی ئیتاڵی بۆ مێژوو لەگەڵ مەیلی من بۆ تاوتوێكردنی تەواوی چەمكی دەوڵەت... و هەوڵەكانی

---

١٦- لە ساڵی ١٨٩٥، "بلونچلی" لە **بۆچوونی دەوڵەت** دا نووسی كە زانستی سیاسەت بە مانای ڕاستەقینەی ئەو، زانستێكە كە لەگەڵ دەوڵەت لە پەیوەندی دایە. لە ساڵی ١٩٨١دا، یانی نزیكەی نەوەد ساڵ دواتر، "پی بری" لە **پێشەكییەك بۆ بۆچوونی سیاسیی نوێ** نووسی كە "مێژووی بۆچوونی سیاسی بەگشتی لەدەوری دەوڵەت خولاوەتەوە". گوتەكانی ئەو دوو بیردۆزە تەنیا وەكو نموونە باسكران بۆ ئەوەی سەرنجی گشتیی زانستی سیاسەت سەبارەت بە دەوڵەت نیشان بدەن.

من بۆ ناسینی زیاتری لایەنە تایبەتییەکانی پەرەسەندنی مێژوویی خەڵکی ئیتاڵیا، گرێ دایەوە" (١٨، ل١٩).

بەو حاڵەشەوە سەرەڕای ئەو هەموو بابەتانەی کە لەسەر هەیە، و سەرەڕای ئەو مشتومڕە گەرم و گوڕانەی کە لەمەڕ دەوڵەت بەڕێوە دەچن، ئەو خاڵە روون بووەتەوە کە تێگەیشتن لە ناوەڕۆکی دەوڵەت دەکرێ وەك شتێکی مەحاڵ باس بکرێ. لە راستیدا دەوڵەت وەك ئامانجێکی خەیاڵی وایە کە رێك لەو کاتەدا کە پێمانوایە لە بواری ماناییەوە پێی گەیشتووین، لە چنگمان دەردەچێت. هەموو تیۆرك لە لێکدانەوەی دەوڵەتدا لەگەڵ کۆمەڵێك پرسی جۆراوجۆر بەرەوڕوویە.

لە لایەکەوە دەوڵەت رۆڵێکی دژبەیەکی هەیە لە سەر ژیانی تاك و گرووپەکان. دەوڵەت لە لایەکەوە دامەزراوەیەکی زۆرەملێیە و لە لایەکی دیکەشەوە کۆمەڵێك سەرەتی (امتیاز) و پشتگیریی دیاریکراو بۆ ئەندامانی دەستەبەر دەکات (وەك دەستڕاگەیشتن بە مافی هاوولاتیی، خزمەتگوزاریە کۆمەڵایەتییەکان و کەلوپەلە گشتییە پێویستیەکان) کە هیچ دامەزراوەیەکی دیکە توانا یان ویستی دابینکردنیانی نییە. هەرچەندە کە دەوڵەت نوێنەری بەرژەوەندییەکانی چینە باڵادەستەکان، بەڵام لە هەمانکاتدا چوارچێوەیەکە کە تێیدا دەکرێ بەرژەوەندییە گشتییەکانی کۆمەڵگا فۆرمۆلبەندی بکرێت. بێجگە لەوەش ئەگەر دەوڵەت چوارچێوەی یاسایی، سیاسی و زۆرەملێی کۆمەڵگا دیاری دەکات، لە هەمانکاتدا هەستی ئەوەش دروست دەکات کە سەر بە کۆمەڵگایەکی سیاسیی بەرینتری. وە هەر بەو رادەیە کە ئامرازێکە بۆ پاراستنی نەزم و یاسا، دامەزراوەیەکیشە بۆ بەڕێوەبردنی دادپەروەری.

لە راستیدا رۆڵی فرە رەهەند و دژبەیەکی دەوڵەت، پێناسەکردنەکەی دژوار دەکاتەوە. بیرمەندەکان بۆچوونی جیاوازیان لەسەر ئەوە هەیە کە ئاخۆ کام لایەنی رۆڵی دەوڵەت سەرەکی و راستەقینەیە و کامەشیان لاوەکی و بە رێکەوتە؟ ئەو ناکۆکییانەی کە لە پەیوەند بەدەوڵەتەوە لە ئارادان، تا رادەیەکی زۆر هەر لەو پرسیەوە سەرچاوە دەگرێت. بۆ نموونە دەیڤید ئیستن لە سەر ئەو باوەڕەیە کە دەبێ خۆ لە هەرچەشنە پێناسەکردنێك سەبارەت بە دەوڵەت ببوێرین، چونکە ئەو کارە مشتومڕێکی وەڕەزکەر و زەلکاوێکی واتایی لێدەکەوێتەوە (٤٣). لە بەرامبەر ئەوەشدا جۆن هوفمەن دەڵێ پێویستە دەوڵەت لە ناوەندی هەرچەشنە بۆچوونێکی سیاسی دابێت (٧٤).

بەو حاڵەشەوە دەبێ ئەوە قبوڵ بکرێت کە سەرەڕای ئەو مشتومڕە توندانەی کە سەبارەت بەدەوڵەت وەك بابەتێکی تیۆری باس دەکرێن، و سەرەڕای ئەو گومان و دوودڵییانەی کە چەمکی دەوڵەت لە بیروزەینی بیرمەندانی سیاسیدا دروستی دەکات، تا رادەیەك هەمووان لە سەر ئەو باوەڕەن کە پێویستیمان بە چەشنێك لە دەوڵەت هەیە. ئەو رەخنەگرانەش کە بە توندترین شێوە هێرش دەکەنە سەر دەوڵەت، دان بەوە دادەنێن کە هەبوونی چەشنێك ناوەند و دەسەڵاتێکی رێکخەر پێویستە کە بتوانێت هەستی متمانەکردن بە ژیان بپارێزێت. کەسانی ئازادیخوازی وەك هایك کە دەوڵەتی خۆشگوزەرانی بە دژی ئازادی دەزانن و رەتیدەکەنەوە، لە هەمانکاتدا هەبوونی دەوڵەتێکی لانیکەمیش قبوڵ دەکەن کە بتوانێت خزمەتگوزارییە پێویستییەکانی وەك پاراستنی نەزم و یاسا، پشتیوانی لە خاوەندارێتی تایبەتی و بەڕێوەبردنی گرێبەستەکان بە ئەنجام بگەیەنێت.

ئەو دەستە لە لێکۆڵەرەکانیش کە بەشوێن کەمکردنەوەی زوڵم و دەستدرێژین بۆ سەر چینە ژێردەستەکان، هەر هەمان بۆچوونیان هەیە. بۆ نموونە، هرینگتۆن بە بۆچوونێکەوە کە داکۆکی لە مافەکانی ژنان دەکات جەخت دەکاتەوە لە سەر ئەوە کە سەرەڕای گومانی لایەنگرانی ژنی دژە لیبراڵ و نیۆدەوڵەتیخوازانی لیبراڵ سەبارەت بەدەوڵەت، "هەر خودی ئەو پرسیەی کە دەوڵەت دەست دەداتە ئافراندن و کەڵەکەکردن و چەقبەستنی دەسەڵاتی سیاسی، دەتوانێت بیکاتە باشترین دۆستی لایەنگرانی ژن، نەك دوژمنیان، چونکە دەستڕاگەیشتن بە دەسەڵاتی سیاسی راستەقینە بۆ کۆنترۆڵی دیموکراتیی راستەقینە پێویستە: هەڵبەتە پێویستە بەڵام بەس نییە" (٦٥، ل٦٦).

دەسەڵاتی سیاسی دەتوانێ تا رادەیەکی زۆر دەسەڵاتی پیاوسالار و چینایەتی لەناو بەرێت. دەسەڵاتی سیاسی لانیکەم دەتوانێت زوڵم و زۆری پیاوسالارانە و ئابووری بۆ سەر توێژەکانی خوارەوە لە بوارەکانی چینایەتی، رەگەزی و نەژادی لەناو بەرێت. حاشا لەوە ناکرێ کە لە سەدەکانی نۆزدە و بیستدا، ئەوە دەسەڵاتی سیاسیی دەوڵەتەکان بو . لە بەرامبەر دەسەڵاتی ئابووریی تۆقێنەری پیشەسازی تایبەتیدا راوەستاوە و دابینکردنی پێداویستیەکانی ژیانی کرێکارانی بەسەر خاوەنکارەکاندا سەپاندوە و کۆمەڵێك هەنگاویشی بۆ پشتیوانیکردن لەهەموو خەڵکی، هەڵێناوەتەوە (هەمان سەرچاوە).

دەکرێ بگوترێت، زۆربەی بیرمەندانی سیاسی دانیان بەوە داناوە کە پێویستە دەوڵەت هەبێت، بەڵام گرفتەکە کاتێك دێتە ئاراوە کە بمانەوێت نەتەنیا سەبارەت بەو دەوڵەتەی کە هەیە، بەڵکو ــ گرنگتر لەوەش ــ سەبارەت بەو دەوڵەتەی کە دەبێ هەبێت، پێناسەیەك بەدەستەوە بدەین. کەم تا

زۆر سەرجەمی گەلاڵە دەوڵەتیەکان تایبەتمەندییەکی ڕێگەپێدراویان هەیـە. چەمکسـازی سـەبارەت بە دەوڵەت، هەمیشە بەرەورووی ڕەخنەی ئەو دەوڵەتانە دەبێتەوە کە هەن. بیرمەندانی سیاسی کـە بـە تـەواوەتی ئاگـاداری تواناکـانی دەوڵـەت بـوون سـەبارەت بـە نوێکردنـەوەی پەیوەندییـە کۆمەلآیەتییەکان، زۆر بە پارێزەوە لە بەرابەر ئەو دەوڵەتانەی کە هەن، هەنگاو هەڵدەگرن. هەر لـە سـەر ئەو بنەمایە، لیبراڵەکان جەختیان لـەوە کردۆتـەوە کـە دەوڵـەت دەبـێ سـنووردار بکرێـت و مارکسیستەکانیش لە سەر ئەو باوەڕەن کە بە کاری سیاسی دەبێ ئاڵوگۆڕ لە دەوڵەتەکاندا دروسـت بکرێت. لە هەمانکاتدا بۆچوونی سیاسی هەمیشە بە ڕامانەوە لە دەوڵـەتی دڵخوازیشـی ڕوانیـوە، ئەو دەوڵەتەی کە بتوانێت هەلومەرجێك پێك بێنێت کە لەگەڵ سروشتی مرۆڤ بێتەوە.

چەمکی دەوڵەت لە تیۆری سیاسیدا، چەمکێکی جێگای مشـتومڕە، چـونکە هەرچەشـنە لێکۆڵینەوەیەك سەبارەت بە دەوڵەت، لێکۆڵینەوەیەکی بەهادارە. باش وایە بزانین، ئەو کاتەی کە ویستیان دەوڵەت لە زانستی سیاسەت دوور کەنەوە، ئەو کاتە بوو کە بیرمەندانی زانسـتی سیاسی لە قۆناغی ڕەفتارگەرایدا هەوڵیاندا بە پەیڕەویکردن لە زانستی سروشتی، ئەم زانسـتە بکەنە زانستێکی بەهابەزێن.

بەم جۆرە، بەر لە هەرچەشنە پێناسەکردنێك بۆ دەوڵەت پێویستە ئاماژە بـە دوو خـاڵ بکرێـت: یەکەم ئەوەی هەرچەشنە پێناسـەکردنێك تایبەتمەندییـەکی ڕێگەپێدراوی هەیە. ناکرێ هـیچ چەشـنە تیۆرەکی بابەتیانە لە بارەی دەوڵەتەوە هەبێت. دووهەم ئەوەی بەهۆی ڕۆڵی دژبەیەکی دەوڵـەت لـە ژیانی تاك و گروپەکاندا، هەرچەشنە پێناسـەکردنێکی دەوڵـەت ناتـەواوە. مەحاڵـە بکرێـت ڕۆڵـی دژبەیەکی دەوڵەت لە پێناسەیەکدا و یان تەنانەت لە چەند پێناسەدا، پیشـان بـدرێت. لانـی زۆری کارێك کە تیۆرکی سیاسی دەتوانێ بیکات، پشت بەستن بەو لایەنەی دەوڵەتە کە گومـان دەکرێـت گرنگییەکی تایبەتی بۆ هەبوون و ئەرکی ئەو هەیە. لە ڕاستیدا هەرچەشنە پێناسەیەك سەبارەت بە دەوڵەت تایبەتمەندییـەکی سـتراتژیك و بژاردەیی دەبێت.

## پێناسەکردنی دەوڵەت:

لە سەرەتادا دەکرێ ئاماژە بەو لێکدانەوەیە بکەین کە دەوڵەت تەنیا ڕەنگدانەوەی ئەبستراکتی خواستێکی گشتی نییە، بەڵکو لە چوارچێوەی پەیوەندییەکانی دەسـەلآتی نێوخۆی کۆمەڵگادایە. کەوابوو لە هەرچەشنە پێناسەکردنێك سـەبارەت بـە دەوڵـەت، دەبێ پەیوەندیی دەوڵـەت لەگـەڵ کۆمەڵگایـەکی بـەرینتر کـە دەوڵـەتی تێـدا بـووە،

ڕێکیخستووە و نیشانەی ڕێکخراوە سیاسییەکەیەتی، نیشان بدرێت. لەو رووەوە کە دەوڵەت نیشانەی دەسەڵاتی ڕێکخراوی فۆرمۆلبەندیی کۆمەڵایەتییە، دەوڵەت دەرخەری پەیوەندییەکی کۆمەڵایەتییە. هەر لە سەر ئەو بنەمایە، جیاکردنەوەی دەوڵەت لە کۆمەڵگا دەکرێ کارێکی هەڵە بێت و گرفت بنێتەوە. ئەو خاڵە پێویستی بە شیکردنەوە هەیە و ئێمە بە تاوتوێکردنی دوو ڕوانگەی زۆر ناسراو لەمەڕ دەوڵەت، ئەو کارە دەکەین. ڕوانگەی یەکەم بە ڕێبازی "دەوڵەتخوازی" ناسراوە و سەرچەشنی ڕوانگەی دووهەمیش بەرهەمەکانی "میشێل فۆکۆ"ن. ڕوانگەی یەکەم جەخت لە سەر دەوڵەت دەکاتەوە و ڕوانگەی دووهەمیش لە سەر کۆمەڵگا پێداگری دەکات و هەروەك لە قسە و باسی دواتردا بەڵگەیان بۆ دێنینەوە، هەردوو ڕوانگەکە نوقسانن و کەموکوڕییان تێدایە.

## دەوڵەت لە ڕوانگەی دەوڵەتخوازیەوە:

بۆچوونی مارکسیستەکان لەمەڕ سەربەخۆیی ڕێژەیی دەوڵەت کە لە حەفتاکانی سەدەی بیستدا زۆر پەرەی سەند، لە لایەن دەوڵەتخوازانەوە بەو پەڕی خۆی و تا رادەیەکیش ناشیاوی خۆی گەیشت (٤٥و١٣٥و١٣٦و٩٦). "کۆمیتەی دەوڵەتەکان و پێکهاتەی کۆمەڵایەتی" کە لە ساڵی ١٩٨٣ لە لایەن "ئەنجومەنی توێژینەوەی زانستی کۆمەڵایەتی ئەمریکا"وە دامەزرا، لە کتێبێکی گرنگدا بەناونیشانی **گەڕانەوە بەرەو دەوڵەت** (١٩٨٥) هەوڵیدا بۆ ئەوەی ڕوانگەیەکی دەوڵەتتەوەر لە جیاتی ڕوانگەی کۆمەڵگاتەوەر دابنێت. ئەوان بە توندی لە سەر ئەوە پێیان دادەگرت کە دەوڵەت سەربەخۆیە لە کۆمەڵگا، کەوابوو هەر خوێندنەوەیەك سەبارەت بە دەوڵەت، دەبێ لە سەر هێز و توانایی دەوڵەت چەق ببەستێت، نەك لەسەر پەیوەندی دەوڵەت و کۆمەڵگا. دەوڵەتخوازان بە ڕەخنەی بەردەوام لە لێکدانەوەی پلۆرالیستی، بونیادی ـ ئەرکی، و مارکسیستی سەبارەت بە دەوڵەت، داکۆکییان لە بۆچوونی دەوڵەتتەوەر کرد. (لێکدانەوە نوقسان و تەك ڕەهەندەکانی دەوڵەتخوازان لە مەڕ فرەگەرایی و مارکسیزم، ڕەخنەی زۆری لێگیراوە). (٢و٢٢و٢٣). ڕەخنەگران بەڵگەی ئەوە دێننەوە کە لایەنگرانی ئەو ڕێبازە بنەما سەرەکییەکانی ئەو بۆچوونەی سەرەوەیان پێچەوانە

کردۆتەوە.[17] هەڵبەت دەوڵەتخوازی روانگەیەکی تاك و یەکدەست نییە، و تێگەیشتنی جۆراوجۆری تێدایە. لە لایەك دەوڵەتخوازی نەرمونیانتری "سکۆچپۆڵ" هەیە و لە لایەکی دیکەشەوە دەوڵەتخوازیی توندڕەوانەی ئەریك نوردلینگر، بەم حاڵەشەوە چەشنە هاوبەشییەك هەموویان پێکەوە گرێ دەداتەوە.

لە لایەکەوە، دەوڵەتخوازەکان بە توندی دژایەتی لەگەڵ تیۆرەکانی کۆمەڵگاتەوەر دەکەن سەبارەت بە دەوڵەت. ئەوان دەڵێن کە ئەندێشەکانی کۆمەڵگاتەوەر، دەوڵەت تا ئاستی کۆمەڵگا دێننە خوارێ. بەم جۆرە دەوڵەت شوناسی تایبەتی خۆی وەك ئەکتەرێکی کۆمەڵایەتی و بونیادێکی سەربەخۆ لەدەست دەدات. دەوڵەتخوازەکان بەڵگەی ئەوە دێننەوە کە بۆ روونکردنەوەی دەوڵەت، دەبێ پێداگری لەسەر سەربەخۆیی دەوڵەت بکرێت. بۆ نموونە سکۆچپۆڵ بە رەخنەیەکی دوور و درێژ لە سەر مارکسیزم، داکۆکی کردووە لە خوێندنەوەیەکی سەربەخۆ بۆ دەوڵەت. ئەو بەڵگەی ئەوە دێنێتەوە کە هەرچەندە پشت بەستنی مارکسیستەکان بە جموجۆڵی پێکهاتەیی گرنگە، بەڵام مارکسیزم لە داشکانخوازی، گەشەخوازی و ناکامناسیدا دەتلێتەوە، چونکە بەرادەی پێویست سەرنج بە وردەکارییە مێژووییەکان یان دەوڵەت وەك یەکەیەکی سیاسیی سەربەخۆ نادات. ناوبراو لە سەر ئەو باوەڕەیە کە دەوڵەت لە بگۆڕە هۆکردە چەند رەهەندیەکان پێکدێت کە ناکرێ تا ئاستی لۆژیکی گشتگیری سەرمایەداری کەم بکرێنەوە. سکۆچپۆڵ ئەوەی قبوڵە کە پشت بەستنی مارکسیستە نوێیەکان بە دەوڵەت و

---

17 - ئەڵمۆند لە وەڵامی رەخنەی سکۆچپۆڵ بۆ تاوتوێکردنی روانگەی پلۆرالیستی دەوڵەت بەو ناکامە دەگات کە "لێکدانەوەی ئێمە پێمان نیشان دەدات کە ئەو لێکدانەوەیە سەبارەت بە فرەخوازی (پلۆرالیزم) لە هەر دوو بواری تیۆری و ئەزموونییەوە هەڵەیە. زۆر بە جوانی دیارە کە لە بەرهەمەکانی فرەخوازاندا، سەربەخۆیی دەوڵەت بە فەرمی ناسراوە و لێکدانەوەیەکی دوولایەنە ـــ لە کۆمەڵگاوە بۆ دەوڵەت و لە دەوڵەتەوە بۆ کۆمەڵگا ـــ بەڕێوە دەچێت.(٢، ل٨٦٨). ناوبراو بەڵگەی ئەوە دێنێتەوە کە نەریتی زاڵ بە سەر زانستی سیاسەتدا، هەمیشە سەربەخۆیی رێژەیی بەرپرسانی دەوڵەتی بە فەرمی ناسیوە. کامك (٢٣) ئەوە بەڵگەمەند دەکات کە سکۆچپۆڵ لە رەخنەکەی خۆیدا سەبارەت بەتیۆری مارکسیستی، بەشێوەیەکی دەستەبژێرانە سوود لە بابەتەکان وەردەگرێ و رەخنەکەی لە تیۆری مارکسیستی نوقسان و نەگونجاوە. هەر بەم چەشنە جێسۆپ رەخنەی دەوڵەتخوازەکان وەکو تێگەیشتنێکی "بێناوەرۆك" رەتدەکاتەوە لەمەڕ "کۆمەڵگاتەوەری خوێندنەوەکانی تر کە بە ئاگاییەوە لەگەڵ بۆچوونەکانی ئەوان لە ناکۆکی دان" (٨٠، ل٢٨٧).

ئامانجەی ئەوان بە سەربەخۆیی ڕێژەیی دەوڵەت نیشانەی بەرەوپێشچوونێکی دڵخۆشکەرە. بەڵام ئەو هەروا لە سەر ئەو باوەڕەیە کە مارکسیستە نوێیەکان "گریمانە قوڵ و جێکەوتووەکانی کۆمەڵگاتەوەریان پاراستوە و گومانێکیان لەوەدا نییە کە دەوڵەتەکان هەر لە ناخی خۆیاندا لە لایەن چینەکان و خەباتی چینایەتییەوە پێکدێن و تێدەکۆشن بۆ ئەوەی شێوازەکانی بەرهەم هێنان بپارێزن و پەرەی پێبدەن." (١٧٢، ل٥).

سکۆچپۆڵ بەڵگەی ئەوە دێنێتەوە کە پشت بەستن بە چین وەك یەکێك لە تایبەتمەندییە پێکهاتەییەکانی دەوڵەت بەر بەوە دەگرێت کە وەك ئەکتەرێکی سەربەخۆ سەرنجی دەوڵەت بدرێت. لە ڕاستیدا ئەو کارە دەوڵەت تا ئاستی گوێڕایەڵێکی بێ ئەملا و ئەولای چینە باڵادەستەکان دێنێتە خوارێ. ڕوانگەی کۆمەڵگاتەوەر لەوانەیە گەرەنتی دەربڕینێکی شیاو بۆ سەدەی نۆزدەیەم بووبێت، بەڵام لە سەدەی بیستەمدا دەوڵەت بووەتە کاراکتەر، نەك ڕەنگدانەوەی پەتی هێزە کۆمەڵایەتییەکان. سکۆچپۆڵ لە سەر ئەو باوەڕەیە کە ئێستا ئەو ڕاستییە لە تیۆری سیاسیدا لەبەر چاو دەگیرێ. ئێستا بەرژەوەندییەکان و پێویستییەکانی دەوڵەت سەربەخۆن و ڕەنگدانەوە و نمودی بزێویی کۆمەڵگا نین.

دەوڵەتخوازەکان بە پەیڕەوی کردن لە لۆژیك و بەڵگەکانی سکۆچپۆڵ تێدەکۆشن بۆ ئەوەی بە سێ شێوە تێگەیشتنەکانی ئێمە لەمەڕ دەوڵەت بونیات بنێنەوە. یەکەم، ئەوان لەسەرەوەبوونی بەرەنجامی کۆمەڵگا لە تیۆری مارکسیستیدا پێچەوانە دەکەنەوە. ئەوان ئەو پرسیان قبوڵ نییە کە گروپە تایبەتییەکانی کۆمەڵگا دەتوانن سوود لە دەوڵەت وەربگرن وەك ئامرازێك بۆ بەرەوپێش بردنی خواستەکانی خۆیان و یان دەوڵەت هیچ کارێك ناکات بێجگە لەوەی بەرژەوەندییە تایبەتییەکانی تاك و گروپەکان بکاتە بڕیاری دەوڵەت. لە ڕاستیدا دەوڵەتخوازەکان تێدەکۆشن بۆ ئەوەی "سندوقە ڕەشەکە" بکەنەوە. بە بڕوای دەوڵەتخوازەکان، دەوڵەت گرنگترین و زۆرجاریش تەنیا ئەکتەری ژیانی سیاسییە، چونکە ئەوە دەوڵەتە کە بەرنامەکان دیاریدەکات و لەو ڕێگایەشەوە کاریگەری لە سەر کۆمەڵگا دادەنێت.

دووهەم، بە بڕوای دەوڵەتخوازەکان، دەوڵەت کار و تایبەتمەندیی بنەڕەتی دیاریکراوی هەیە کە بە شێوەیەکی سەربەخۆ لە هەر چەشنە هۆکار یان گوشارێکی دەرەکی بەڕێوەیان دەبات. کاری بنەڕەتی هەر دەوڵەتێك بریتییە لە پاراستنی نەزم و یاسا و دابینکردنی داهاتی خۆی. جیاواز لەوەش هەموو دەوڵەتێك دەبێ کاردانەوەی هەبێت لە بەرابەر گوشارە ئابوورییەکان و سیستەمی ئابووری نێودەوڵەتی کە لە دەوڵەتە نەتەوەییەکان پێکهاتووە. هیچ دامەزراوەیەکی

دیکەی کۆمەڵگا جێگا و شوێنێکی ئەوتۆی نییە و هیچ دامەزراوەیەکی تریش ئەم کارە تایبەتییانە بەڕێوە نابات. دەوڵەتیش بەهۆی بەڕێوەبردنی ئەو کارانەوەیە کە لە بەشەکانی دیکەی کۆمەڵگا جیا دەبێتەوە.

سێیەم، دەوڵەتخوازەکان هەوڵ دەدەن بۆ ئەوەی ئەو گریمانەیە بێ بایەخ بکەن کە بەرپرسانی دەوڵەتی بە فەرمان یان لە لایەن چینە باڵادەستەکانی کۆمەڵگاوە کار دەکەن. ئەوان لە سەر ئەوە جەخت دەکەنەوە کە روانگەی بەرپرسانی دەوڵەتی زۆرجاران ــ ئەگەر نەڵێین هەمیشە ــ لەگەڵ روانگەی گروپەکانی نێو کۆمەڵگا جیاوازییان هەیە. جێگاوشوێنی ئەم بەرپرسە فەرمیانە لە دەزگا دەوڵەتیەکاندا، پێگەیەکی تاقانەیان لەمەڕ ناسینی دیاردە ئابووری، کۆمەڵایەتی و سیاسییەکان پێدەبەخشێ. هەر لە سەر ئەو بنەمایە، بۆچوونەکانی ئەوان نەتەنیا لەگەڵ بۆچوونەکانی گروپەکانی کۆمەڵگا جیاوازی هەیە، بەڵکو هەر لە بنەڕەتدا لەگەڵ ئەوان ناتەبایە. کەوابوو، پەیوەندیی دەوڵەت لەگەڵ کۆمەڵگا، لەناخی خۆیدا ئاوێتەی روبەڕووبوونەوەیە. هەر چۆنێك بێت، بە سەرنجدان بە دەسەڵاتی بەرین و جێگا و شوێنی ستراتژیکی دەوڵەت، ئەگەر ئەو رووبەڕوو بوونەوەیە بێتە ئاراوە، ئەوە بەرژەوەندیی خاوەنانی دەسەڵاتی دەوڵەتە کە سەرکەوتن مسۆگەر دەکات. هۆکارەکەشی ئەوەیە کە خاوەنانی دەسەڵاتی دەوڵەت لە هەلومەرجێکدان کە دەتوانن بە سەر هەر هێزێکی دیکەی کۆمەڵگادا سەرکەون و لە گەڕی بخەن. هەر ئەو کارە بەسە بۆ ئەوەی دەوڵەت ببێتە کاراکتەرێکی سەربەخۆ لە کۆمەڵگا.

بە پێی ئەو روانگەیە، دەوڵەت لە ناخی خۆیدا تایبەتمەندیی جۆراوجۆری هەیە و نەتەنیا وەك کۆمەڵگا نییە بەڵکو جیاوازیشە لە کۆمەڵگا. دەوڵەت بەرنامەکان دیاری دەکات و بە شێوەیەکی سەربەخۆ کار دەکات. ناکرێ ئەو بەرنامانە وەك بەرنامەی پێشنیارکراوی هێزە کۆمەڵایەتییەکان لە قەڵەم بدرێن و هیچ پێویستیش ناکات کە ئەم هێزانە کاریگەرییان لە سەر دابنێن. هەر لە سەر ئەو بنەمایە، سەربەخۆیی دەوڵەت شتێکی پێکهاتەییە نەك بەرەنجامی رێکەوتێکی مێژوویی. سەربەخۆیی لە ناخی هەموو دەوڵەتێکدا هەیە. سکۆچپۆڵ بە پێی بەڵگەیەکی ئەوتۆ داوا لە ئێمە دەکات کە بە گۆڕینی شێوازەکانی ناساندن، سەرنجێکیش بە رۆڵی دەوڵەت بدەین وەك یەکێك لەهۆکارەکانی دیاریکەری هێزە کۆمەڵایەتییەکان.

روانگەی ئێمە سەبارەت بەدەوڵەت لە بنەڕەتدا پەیوەندیی بە چۆنیەتی ناسین و تێگەیشتنی ئێمەوە هەیە. پێناسەکان نەتەنیا خاڵی دەسپێکی ڕاڤەی دەوڵەت دیاریدەکەن، بەڵکو بۆچوونی بیرمەندەکانیش دەردەخەن. بۆچوونی سەربەخۆیی دەوڵەت پەیوەندییەکی بنەڕەتیی لەگەڵ ئەو پێناسەکردنانە هەیە. بۆ دەرخستنی بۆچوونی دەوڵەتخوازەکان، بۆ نموونە ئاماژە بە دوو مانا دەکەین. لە ساڵی ١٩٧٩، سکۆچپۆڵ هەستیاریی خۆی بەرامبەر بە جێگا و شوێنی کۆمەڵایەتیی دەوڵەت نیشان دەدات:

ئەگەر ڕێك سەیری بکەین، دەوڵەت تەنیا گۆڕەپانی خەباتی کۆمەڵایەتی ـ ئابووری نییە. دەوڵەت کۆمەڵێك لە ڕێکخراوە بەڕێوەبەری، چاودێری و سەربازیەکانە کە بەرپرسێکی بەڕێوەبەر لە سەرەوەی هەیە و کەم تا زۆر لە لایەن ئەوەوە هەماهەنگ دەکرێن. هەموو دەوڵەتێك لە قۆناغی یەکەمدا بەرژەوەندییەکانی کۆمەڵگا هەڵدێنجێ و ئەوان بۆ پێکهێنان و پاراستنی ڕێکخراوە زۆرەملێ و بەڕێوەبەرایەتیەکان دەکار دەکات. هەڵبەتە ئەو ڕێکخراوە بنەڕەتییە دەوڵەتییانە لە تان و پۆیەك لە پەیوەندییە کۆمەڵایەتی و ئابوورییە چینایەتیەکان و هەروەها لە تان و پۆی پرۆسە نەتەوەیی و نێونەتەوەییەکاندا پێك دێن و کار دەکەن. بێجگە لەوەش ڕێکخراوە زۆرەملێ و بەڕێوەبەریەکان تەنیا بەشێك لە هەموو سیستەمی سیاسین. سیستەمە سیاسییەکان بێجگە لەو ڕێکخراوانەی کە نێوبران لەوانەیە دامەزراوەی دیکەش لەخۆ بگرن کە لە ڕێگای ئەوانەوە بەرژەوەندیی کۆمەڵایەتی لە سیاسەت داڕێژەری دەوڵەتیدا ڕەنگ دەداتەوە و یان ئەو دامەزراوانەی کە لە ڕێگای ئەوانەوە کاراکتەرە نادەوڵەتیەکان بۆ بەشداری لە بەڕێوەبردنی سیاسەتەکاندا خۆ ڕێکدەخەن. سەرەڕای ئەوەش، ڕێکخراوە زۆرەملێ و بەڕێوەبەریەکان بنەمای دەسەڵاتی دەوڵەت پێکدێنن. (١٧١، ل٢٩).

لەو فۆرمۆڵبەندییەدا، سکۆچپۆڵ لە سەر پێکهاتەی کۆمەڵایەتی دەوڵەت جەختی کردۆتەوە و ئەو پرسیەش قبوڵ دەکات کە زۆر کاراکتەر لە دەرەوەی دەوڵەتیش هەن کە کاریگەریان بە سەر سیاسەتەکانی دەوڵەتەوە هەیە. بەو حاڵەشەوە، سکۆچپۆڵ دواتر لە یەکێکی دیکە لە بەرهەمەکانی خۆیدا بە توندی بادەداتەوە (١٧٢). لێرەدا سکۆچپۆڵ لە جیاتی سەرنجدان بە پێکهاتەی وەبەرگری دەوڵەت، زیاتر سەرنج بە سەربەخۆیی دەوڵەت، تواناکانی ئەو و کاریگەریی ئەو لە سەر سیاسەت دەدات.

لە لایەکەوە دەکرێ دەوڵەتەکان وەك ئەو ڕێکخراوانە هەژمار بکرێن کە لە ڕێگای ئەوانەوە گروپە فەرمیەکان بەشوێن ئامانجی دیاریکراوی خۆیانەوەن و بە سەرنجدان بە بەرژەوەندییەکانی

هەنوکەی دەوڵەت بە نیسبەت بارودۆخی کۆمەڵایەتییەوە، کەم تا زۆر ئەو ئامانجانە وەدی بێنن (تواناکانی دەوڵەت). لە لایەکی دیکەوە بە روانگەیەکی گشتی تەرەوە دەکرێ دەوڵەت وەك کۆمەڵێك رێکخراو و کردەوەی ئەوان لە قەڵەم بدرێت کە کاریگەری لە سەر واتا و شێوازەکانی سیاسەت دادەنێن بۆ سەرجەم گروپ و چینەکانی کۆمەڵگا (سەربەخۆیی دەوڵەت) (١٧٢، ل٢٨).

لەو فۆرموڵبەندییەدا، پشتکردن لە پێکهاتە، دەوروبەر و داواکارەکان و چوون بەرەولای توانایی و دەسەڵاتی بەرپرسانی دەوڵەتی زۆر روون و ئاشکرایە. لێرەدا هێزە کۆمەڵایەتییەکان و بەرنامەکانی ئەوان بۆ دواوە پاڵ پێوە دەنرێن. دەوڵەت دەبێتە "لڤیاتان"ێکی تەواو کە ژیانی خەڵکی کۆنترۆڵ، دەسکاری و رێکدەخات. دەوڵەت بە چ شێوەیەك ئەو بڕیارانە دەردەکات؟ دەوڵەت لەگەڵ کێ قسە دەکات؟ سیاسەتەکانی دەوڵەت چۆن وەردەگیرێن؟ بۆچوونی خەڵك سەبارەت بە بەرنامەکانی دەوڵەت چییە؟ و یان خەڵك بە چ شێوەیەك لەگەڵ ئەو بەرنامانە بەرەورِوو دەبنەوە؟ ئەوانە هێندێك لەو پرسیارانەن کە لە بۆچوونی دەوڵەتتەوەردا بە ئاسانی چاوپۆشیان لێدەکرێت. یەکێك لە رەهەندە بنەرِەتیەکانی تیۆری دەوڵەت، واتە پەیوەندیی دیالکتیکی دەوڵەت و کۆمەڵگا، بەتەواوی فەرامۆش دەکرێت.

لە شێوازی توندرِەوانەی دەوڵەتخوازیدا،[18] دەوڵەت مانایەکی زۆر بەرتەسکی هەیە و بە کۆمەڵێك لە دەزگا زۆرەملێ و ئیداریەکان دەگوترێت. و لە فۆرموڵبەندی نوردلینگریشدا، دەوڵەت تا ئاستی کۆمەڵێك لە ئەولەویەتە فەرمیەکان دادەبەزێت:

---

١٨ - نورد لینگر لە ساڵی ١٩٨٨ لە بابەتێکدا ناوەرۆکی روانگەی دەوڵەتخوازی دەرخستوە: یەکەم، بەرپرسانی دەوڵەتی ئەولەویەتە تایبەتیەکانی خۆیان لە سیاسەتدانانەندا دیاریدەکەن. ئەولەویەتەکانی ئەوان لەگەڵ ئەولەویەتەکانی کۆمەڵگا جیاوازە. ئەوەی سنوری ئەو سیاسەتانە دیاری دەکات، ئەوەیە کە لە دەروونی خودی دەوڵەتدا چەشنێك دابەشکردن و هەڵاواردن لە ئارادایە و لەوانەیە لە نێوان بەرپرسانی دەوڵەتیدا جیاوازیی بیروڕا هەبێت. دووهەم، دەوڵەت بە پێی ئەولەویەتەکانی خۆی کار دەکات، هەرچەندە کە ئەو ئەولەویەتانە لەگەڵ ئەولەویەتەکانی بەهێزترین کاراکتەرە "تایبەتیەکان"یش جیاوازیان هەبێت. سێیەم، چالاکیی بەردەوامی دەوڵەت و بونیادە دامەزراوەییەکەی کاریگەری لەسەر کۆمەڵگا و هەوڵی کاراکتەرە تایبەتیەکان دادەنێت بۆ سنووردارکردنی دەوڵەت. سەرەنجام دەوڵەت ئەولەویەتێکی راڤەیی هەیە: ئەو هۆکارانەی کە سەربەخۆیی پێدەبەخشن، کاریگەریەکەیان گرینگترە لە کاراکتەر و بگۆرِە کۆمەڵایەتییەکان(١٣٦، ل٨٨١).

لە پێناسەکردنی دەوڵەتدا دەبێ ئاماژە بە تاکەکان بکرێت نەك بە دیاردەکانی دیکەی وەك "ریزبەندییە دامەزراوەییەکان" یان سیستەمی یاسایی ڕێگەپێدراو. لەو ڕووەوە کە ئێمە بەگشتی سەروکارمان لەگەڵ سیاسەت داڕێژەری دەوڵەتدا هەیە، لێکدانەوەیەك سەبارەت بە دەوڵەت کە تاکەکان لە چەقیدا نەبن، دەتوانێ ڕاستەوخۆ هەڵەی شێوازخوازی یان کەلوپەلخوازی لێبکەوێتەوە... تاکەکان تەنیا ئەولەویەتی خۆیان هەیە و بۆ وەدیهاتنیشیان کار دەکەن. وە تەنیا کاتێك کە تاکەکان دەکەونە چەقی لێکدانەوەکەی ئێمەوە، لە ئاماژە بە ئەولەویەتەکانی دەوڵەتدا دەکرێ لە پێشهاتە هیگلیەکانی (جەوهەری و میتافیزیکی) خۆ دەرباز بکەی. (١٣٥، ل٩).

بەکردەوە، کۆمەڵێك ئالۆزی واتایی لەو لێکدانەوانەدا پێکدێن. پێناسەکردنی دەوڵەت دەبێتە وەسفی دەسەڵات و تواناکانی بەرپرسە فەرمیەکان. دەوڵەت لەگەڵ ڕژێمێکی تایبەتی یان خاوەنانی دەسەڵاتی دەوڵەت یەکسان دەبێت، بەڵام جیاوازییەکی ڕوون لە نێوان دەوڵەت و ڕژێمدا هەیە. دەوڵەت بە مانای دەسەڵاتی ڕێکخراوی فۆرمۆلبەندی کۆمەڵایەتی و بەواتایەکی تر بە مانای ڕێکخراوی سیاسیی کۆمەڵگایە. کەوابوو دەوڵەت چوارچێوەیەکی ڕێکخراوەیی و ئایدۆلۆژیکی پێکدێنێت کە ڕژێمەکان لەناو ئەو چوارچێوەیەدا کار دەکەن. لەو ڕوانگەوە، دەوڵەتەکان دەوامێکی زیاتریان دەبێت لەچاو ڕژێمەکان کە خاوەن و سەپێنەر و ڕاڤەکەری دەسەڵاتن لە قۆناغێکی مێژوویی تایبەت. گۆڕانی ڕژێم حەتمەن گۆڕانی دەوڵەتی لێ ناکەوێتەوە، هەرچەندە ڕژێمێکی تایبەتی دەتوانێت بە چەشنێکی تایبەتی دەسەڵات ڕاڤە بکات و بەکاری بێنێت، بەڵام ناوەرۆك و سنوورەکانی ئەو دەسەڵاتە زۆر ناگۆڕێن، ئەوانە پابەندن بە فۆرم و ناوەرۆکی دەوڵەتەوە.

دووهەم، جەخت لە سەر خاوەنەکانی دەسەڵاتی دەوڵەت دەکرێتەوە، ئەوە لە کاتێکدایە کە نازانین ئەوان کێن؟ ئەو لێکدانەوەیە هەلومەرجی کۆمەڵایەتیی ئەوان، بنەچە و ئاخێزگەیان، هۆکارە کاریگەرەکان بە سەر ڕوانگەکانیاندا، و پرۆسەکانی بڕیاردانیان دەرناخات. ئەم پرسانە کە هەمیشە جەوهەری تیۆری دەوڵەتیان پێك هێناوە، هەر سەرنجیان نادرێتێ. بەواتایەکی دیکە، لەو لێکدانەوەیەدا، بەرپرسە فەرمیەکان یان خاوەنەکانی دەسەڵاتی دەوڵەت و هۆکاری جیاوازییان لەگەڵ یەکدی دەرناکەوێت. بەدڵنیاییەوە، ئەو بەرپرسە فەرمیانە سەر بە بەشە جۆراوجۆرەکانی کۆمەڵگان. هەر لە سەر ئەو بنەمایە، ڕوانگە و تێگەیشتنە درێژماوەکانی ئەوان بە شێوەی لۆژیکی لە جێگاوشوێنی کۆمەڵایەتی ئەوانەوە سەرچاوە دەگرێت. کەوابوو،

کۆمەڵگا و گەلاڵە کۆمەڵایەتییەکانی ئەوە کە لە پشتەوەی ئەم بەرپرسە فەرمیانە و مانای تایبەتیی دەوڵەت لەو لێکدانەوەیە دایە. بەڵام دەوڵەتخوازەکان سەرنجیان نەداوەتە ئەوەی کە لە پشتەوەی دەوڵەت و پێکهاتە فەرمی و ئاشکراکانی ئەودایە و ناتوانن پەی بە ناوەڕۆکی دەوڵەت بەرن وەك شتێك کە ڕەوایی بە پێکهاتە مێژووییەکەی کۆمەڵگا دەبەخشێت. سەرجەمی ئەو بیرمەندە دیارانەی کە جێگا و شوێن و هەلومەرجی ئەو بەرپرسە فەرمیانەیان بە ئێمە نیشان داوە ـــ و لە هەمووان گرنگتر ڕالف میلیباند(١٢٧) و سی.ڕایت میلز(١٨٩) ـــ وەلا دەنرێن. دەوڵەت ـــ تا ئەو جێگایەی کە باسی ئاخێزگەی کۆمەڵایەتی بەرپرسانی فەرمی ئەو و داواکارەکانی ئەوان مەبەستە ـــ وەك سندوقێکی ڕەشە و هیچ هەوڵێکیش بۆ کردنەوەی نادرێت.

سێیەم، گرنگترە ئەوەیە کە دەوڵەتخوازەکان بە هەڵاواردنی ڕاڤەکارانەی دەوڵەت لە کۆمەڵگا، ئەم دووانە سەربەخۆ لە یەکدی و تەنانەت لەبەرامبەر یەکتریشدا دادەنێن. ئەو کارە نەتەنیا نیشانەی تێگەیشتنێکی بەرتەسکە لە دەوڵەت، بەڵکو پەیوەندییە ئاڵۆز و دژبەیەکەکانی دەوڵەت بە پێکهاتە کۆمەڵایەتییە بەربڵاوترەکانەوە ـــ وەك ئەو ڕێکخراوانەی کە بەشێوەی جۆراوجۆر نەتەنیا پشتیوانی لە دەوڵەت دەکەن، بەڵکو دەسەڵاتی خودی دەوڵەت لەوانەوە سەرچاوە دەگرێت ـــ لە بەرچاوان ون دەکات. دامەزراوە بە ڕواڵەت سەربەخۆکانی وەك خوێندنگەکان، ڕاگەیاندنەکان، ئەنجوومەنە کۆمەڵایەتییەکان، و لایەنەکانی وەك نوێنەرایەتی ئایدۆلۆژیك نەتەنیا دەسەڵاتی دەوڵەتی تێیاندا ڕەنگ دەداتەوە، بەڵکو بونیاتنەریشین. کاتێك کە دەوڵەت لە کۆمەڵگا جیا دەکەینەوە، بە گوتەی گرامشی دەکەوینە داوی لیبراڵەکانەوە و دەوڵەت لەگەڵ حکومەت یەکسان دەبێت، "ئەو شتەی کە ڕێك دەرخەری بارودۆخی ئابووری ـــ پیشەیی و بەواتایەکی تر ئاوێتەبوونی کۆمەڵگای مەدەنی و کۆمەڵگای سیاسییە. ئەوە لە کاتێکدایە کە مانای گشتیی دەوڵەت ئەو توخمانە دەگرێتەوە کە دەگەڕێنەوە سەر کۆمەڵگای مەدەنی (واتە دەکرێ بڵێین دەوڵەت = کۆمەڵگای سیاسی + کۆمەڵگای مەدەنی و بەواتایەکی دیکە هێژمۆنییەك کە ئاوێتەی ناچارکردن و زۆرەملێ بێت)" (٦١، ل٣-٢٦٢).

لە ڕاستیدا پیرۆزیی دەوڵەت لە لێکدانەوەی گشتیدا ناکرێ لەو دامەزراوانە یان لە میتۆلۆژی نادیارتری دەوڵەت (بەرهەم هێنان و سەرلەنوێ بەرهەمهێنانەوەی ئەفسانەکان، سرودەکان، مێژووی سەرزارەکی، بیرەوەریی پاڵەوانەکانی ڕابوردوو و ڕوحی بونیاتنەرانی

دەوڵەت و بونیاتنەرانی نەتەوە لە کۆمەڵگادا) جیا بکرێتەوە. هەروەك بۆچوونە جوانەکانی گرامشی نیشانی دەدات، دەوڵەت کۆمەڵێك لە دامەزراوە و ئەرکەکانە کە پەیوەندییەکی راستەوخۆیان پێکەوە نییە. بۆ نموونە، لایەنی زۆرەملێی دەوڵەت لەگەڵ ئەو بەشە لە لایەنە فەرمی و نافەرمیەکانی دەوڵەت کە لە زەینی تاکەکاندا رەوایی پێدەبەخشن، پەیوەندییەکی زۆر راستەوخۆیان نییە. ئەو لایەنە ناوبراوانە لەوانەیە بەشێوازی پێکهاتەکانی کەڵەکەکردن، بانگەشەی ئایدۆلۆژیا، پشتیوانی لە کلتورەکان، یەکسان کردنی دەوڵەت لەگەڵ نەتەوە، و لەو وڵاتانەشدا کە سەربەخۆییان بەدەست هێناوە بەشێوەی دژەئیمپریالیستی دەربکەون. لە راستیدا بۆ ناسینی دەوڵەت، تاوتوێکردنی پەیوەندییە ئاڵۆزەکانی نێوان خودی دامەزراوە دەوڵەتیەکان و پەیوەندییەکانی نێوان دامەزراوە دەوڵەتی و نادەوڵەتیەکان لە سەرلەنوێ بەرهەمهێنانەوەی گشتیی زاڵبونی سیاسیدا پێویستە.

چوارەم، ئەو بیرمەندانە، دەوڵەت بە زانا و توانای رەها دەزانن. دەوڵەت رێك دەزانێت کە دەبێ چی بکات و دەتوانێ بەبێ هیچ ئەملاولایەك گەڵاڵەکانی خۆی بەکردەوە دەربێنێت. بۆ نموونە نورد لینگر لە سەر ئەوە پێداگری دەکات کە "ئەولەویەتی سیاسەت دانانی (دەوڵەتە سەربەخۆکان) پەیوەندی بەخۆیانەوە هەیە و زۆریش دیارن. ئەو ئەولەویەتانە لە بنەڕەت و ناوەرۆکی خۆیاندا لەگەڵ ئەولەویەتی هی چکام لە ئەنجومەن، گروپ، توێژ، قەوم و ناوچە بچوك و گەورەکانی کۆمەڵگا، بۆ هەمیشە ناگونجێن" (١٣٦، ل٨٨٢). دەوڵەت وەك یەکەیەکی داخراو و جیاواز لە کۆمەڵگا وێنا دەکرێت و دەسەڵاتەکەشی بەرپرسانی دەوڵەتی پێکی دێنن: "نە هیچ پێویستییەکی بە مامۆستای تایبەتی هەیە و نە مەیلێکیش بۆ ئەوە هەیە" (هەمان سەرچاوە). پشت بەستن بەدامەزراوەکان، حکومەت و نەزم و سەقامگیری، و کێشمەکێشی بەرپرسانی فەرمی سەبارەت بە لایەنە جۆراوجۆرەکان، بەئاشکرا نیشانەی لەبەرچاو نەگرتنی هەرچەشنە کاریگەرییەکی هۆکارە دەرەکییەکانە لە سەر دەوڵەت.

رێنوێنی و چالاکییەکان، پرۆسە نێوخۆییەکان، رێزبەندیی پێکهاتەیی، و ئامرازە رواڵەتیەکانی دەوڵەت، یارمەتی دەکات بە پێکهاتنی باوەڕەکان و شتە سیاسییە باوەکان، پانتایی و ستراتیژیەکانی بەشداریخوازانە و دژایەتیخوازانە، بەرجەستەبوونی سیاسی و ریزبەندییە قەومی، چینایەتی و ئەو گروپانەی کە کاریگەری دەبێت بە سەریانەوە و فۆرمی رێکخراوەیی و پانتایی و لێهاتوویی ئەو گروپانە. دەوڵەت وەك دامەزراوەیەك یارمەتی بە

دیاریکردنی ئەو پرسەشش دەدات کە چ کەسێك چ شتێك و لە چ کاتێکدا و بە چ شێوەیەك بەدەست بێنێت. (هەمان سەرچاوە، ل٨٨٤).

پرسکە ئەوەیە کە لەم تێگەیشتنەدا، کۆمەڵگا دەبێتە بوونەوەرێکی پاسیڤ و گوێڕایەڵ. کۆمەڵگا لە بواری واتاییەوە وەك مولکی رەهای دەوڵەت هەژمار دەکرێت. دەوڵەتخوازەکان کە بەتوندی نەیاری بۆچوونەکانی روو لە دابەزینی کاروباری سیاسی بۆ کاروباری کۆمەڵایەتین، بۆخۆیشیان کاروباری کۆمەڵایەتی بۆ کاروباری سیاسی دادەشکێنن. ئەوان بە تەواوی چوارچێوەی سیاسی لەگەڵ دەوڵەت بە یەکسان دەزانن و زۆر سەرنج بە کێشمەکێشەکان و یەکێتیە سیاسییەکانی نێو کۆمەڵگا نادەن. ئەوان هیچ سەرنجێك نادەن بە پرۆسەکانی دانپێدانان و دژایەتی، و ستراتیژیەکانی پەیوەندی و جیایی کە خودی کۆمەڵگا ناسەقامگیر دەکەن. دەوڵەتخوازەکان، دەوڵەت بە بێ داواکارەکان و پێکهاتەی وەبەرگری ئەو لەبەرچاو دەگرن. لە راستیدا دەوڵەتخوازەکان دەوڵەت لە کۆمەڵگا، ئاخێزگە، و بارودۆخی دانپێدانراوی ئەو جیا دەکەنەوە. دەوڵەتی جێی پەسندی ئەوان لە بۆشاییەکی کۆمەڵایەتی دایە.

پێنجەم، ئەگەر پێکەوە هەڵکردنی ئاڵۆزی دەوڵەت و کۆمەڵگا لەبەرچاو نەگیرێت، دەبێتە هۆی ئەوەکە چۆنیەتی سنووردارکردن، نۆژەنکردنەوە و یان بەفیڕۆچوونی پلانەکانی دەوڵەت لە لایەن کۆمەڵگاوە، تا رادەیەکی زۆر لەبەرچاو نەگیرێت. بە بۆچوونی دەوڵەتخوازەکان، پەیوەندیی دەوڵەت لەگەڵ کۆمەڵگا، پەیوەندییەکی یەك لایەنەیە و ئەوە دەوڵەتە کە هەمیشە جڵەوی کارەکانی بەدەستەوەیە: "دەوڵەتێکی بەهێز (ئەولەویەتەکانی کۆمەڵگا) لەگەڵ ئەولەویەتەکانی خۆی بە ئاراستەیەکدا دەبات. بەرپرسانی دەوڵەتی ئەو گروپانەی کە ئەولەویەتی جیاوازیان هەیە، بۆ گۆڕینی ئەولەویەتەکانی خۆیانیان هان دەدەن، بەو قەناعەتەیان دەگەیەنن کە کەڵك وەرگرتن لە سەرچاوەکانی ئەوان بە قازانجیان نییە، کۆمەڵێك سەرەتی بێ بایەخیان پێدەدەن بۆ ئەوەی واز لە دژایەتیکردنی خۆیان بێنن و پشتیوانیی کاراکتەرە کۆمەڵایەتییە پاسیڤەکان بەرەولای خۆیان راکێشن." (١٣٦، ل٨٨٣).

لەو رووەوە کە روانگەی دەوڵەتخوازی، تەنیا سەرنج بە هاوسەنگی، نەزم، و کارە فەرمیەکانی دەوڵەت دەدات، واپێدەچێت کە لەو روانگەیەدا ئامانجی سەرەکیی دەوڵەت بریتییە لە کۆنترۆڵی کۆمەڵگا و بردنی بە ئاقارێکدا کە خۆی پێیدا دەڕوات. ئەو روانگەیە پاسیڤ و نەگۆڕە، چونکە هەرچەشنە گۆڕان و گۆڕانکارییەك کە لە خوارەوەڕا بێت لەبەر چاو ناگرێت. ئەم روانگەیە لە هەمانکاتدا کورت بینانەشە، چونکە هیچ سەرنجێك بە

پێکەوەهەڵکردنی ئاڵۆزی نێوان کۆمەڵگا و دەوڵـەتیش نـادات. ئـەم روانگەیـە هـەروەها بـە تەواوی بەر بە ناسینی چۆنیەتی بێ بایەخبوونی دەوڵەتەکانیش دەگرێت (وەك بێ بایـەخبوونی دەوڵەتە داگیرکەرەکان یان دەوڵەتەکانی ئـەوروپای خۆرهـەڵات و یـەکێتی سـۆڤیەتی پێشـوو بەهۆی ئەوەی جڵەوی سیاسی لە لایـەن کۆمـەڵگاوە لـە دەوڵـەت سـتێندرایەوە). سـەرەنجام، دەوڵەتخوازی بۆچوونێکی وشك و قایکارانەیە، چونکە دوڵەتخوازەکان هەر سـەرنج نادەنـە ئـەو پرسیە کە هێزە کۆمەڵایەتییـەکان دەتـوانن لـە دەوڵـەت دوور بکەونـەوە، دەتـوانن باشـترین بەرنامەکانی بەرپرسانی دەوڵەت بگۆڕن و بزێویی کۆمەڵگا لە دەوڵەت و دامەزراوەکانی زیاتر دەچێتە سەرێ. بە بڕوای دەوڵەتخوازەکان، دەوڵەت کۆمەڵە دامەزراوەیەکە کە هەمیشـە خـۆی بەرهەم دێنێتەوە. لە راستیدا بە بڕوای ئەوان، دەوڵەت بە تـەواوەتی ئـازادە و سـەر بـە هـیچ شوێنێك نییە و لە بەرامبەر هیچ کەسیشدا بەرپرسیار نییە.

گرنگتر لە هەمووان ئەوەیەکە تیۆریی دەوڵەتخوازی بە تایبەتمەندیە راسـتخوازانەکانیەوە ، تیۆریـیەکی مەترسـیدارە، چـونکە دڵخوازیـوونی چەشـنە گوتـارێکی گشـتی کـە کارەکـان دیاریدەکات و مەوداکانی دەوڵەت بەرتەسك دەکاتەوە، لـەناو دەبـات. هـەروەك کاپوراسـو و لیواین دەڵێن، "دژوارە بتوانی لەو لێکدانەوەیە رزگار بی کە دەوڵەت بەشـێوەیەکی سـەربەخۆ لە بنەما سەلمێنراوەکانی دیموکراسی لا دەدات. یەکێك لە بنـەما سـەرەکییەکانی دیموکراسـی تایبـەتە بە پرسیار و وەڵامی نێوان دەسەڵاتدار و ژێردەستەکان... بەکورتی، بە هـەر رادەیـەك دەوڵەتێك لە بەرامبەر بەرژەوەندییە تایبەتیەکاندا کەمتر وەڵامـدەرەوە بێـت، بـە پێـی تیـۆر دیموکراتی زیاتر گومـانی دەخرێتـە سـەر" (٢٤، ل٢-١٩١). دەوڵـەتخوازەکان سـەبارەت بـە چۆنیەتی کۆمەڵگایەك کە دەوڵەت پێویستیەتی، قسەی زۆریان کـردوە، بـەڵام سـەبارەت بـە دەوڵەتێك کە بۆ کۆمەڵگا پێویستە، هـیچ قسـەیەکیان نـەکردوە. بـا لایـەنگرانی بیرۆدزیـی دەوڵەتخوازیش پێیان وا نەبێت، بەڵام قایکاری لەو فۆرمۆلبەندیانەدا بەرچاوە.

لەو فۆرمۆلبەندیانەدا، پرسە هەمیشـەییەکانی تیۆری سیاسیی کلاسیك لەبەرچاو ناگیرێن. دەوڵەت لە کوێوە هێز و دەسەڵاتی خۆی بەدەست دێنێت؟ چ شتێك دەبێتە هۆی ئەوەی خـەڵك رێکارەکانی سەربەخۆ لە دەوڵەت دارێژن؟ بەچ شـێوەیەك هاوکێشـەی دەسـەڵاتێکی نـوێ لـە کۆمەڵگادا پێك دێت؟ و ئەو هاوکێشە نوێیانە بەچ شێوەیەك هاوکێشەکانی دەسەڵات کـە لـە دەوڵەتدا رەنگ دەدەنەوە، تووشی ململانێ دەکەن؟ لە چ بوارێکدا جیاوازی بـیرورا لـە نێـوان دەوڵەت و کۆمەڵگا لە ئارا دایە؟ بۆچی و لە چ کاتێکدا دەوڵەت لە گەڵ قـەیرانی شـەرعیەت

بەرەورووو دەبێت؟ روانگەی دەوڵەتخوازی، دیاردەی راپەڕین لە خوارەوەڕا و هەروەها گوشار و بۆچوونەکانی خەڵك بۆ پێکهێنانی دەوڵەتێکی دڵخواز لە بەرچاو ناگرن، واتە ئەو شتەی کە پێشووتر رووی داوە. دەوڵەتخوازەکان، دەسەڵات وەك ئامرازێك بەدەستی دەوڵەتێکەوە دەبینن کە بنەچەیەکی نییە، نەك وەك پرۆسەیەکی جێگای مشتومڕ، دژ بەیەك و بگۆڕ. روانگەی دەوڵەتخوازی بە بێ سەرنجدان بە کۆمەڵگا، نوقسانە. هەروەك هێلد دەڵێت:

هەرچەندە تاوتوێکردنی "پێناسەی بەکۆمەڵ"ی رێکخراوە دەوڵەتیەکان و بەرژەوەندیەکانی کاربەدەستانی دەوڵەت بەڕاستی کارێکی گرنگە، بەڵام بە هیچ شێوەیەك نابێ لەو بارەیەوە زیادەڕەوی بکرێ، چونکە یەکێك لە پڕبایەخترین یارمەتی مارکسیستەکان و فرەخوازەکان، تێگەیشتنیانە سەبارەت بە چۆنیەتی کاریگەری خەباتی کۆمەڵایەتی لە سەر رێکخراوەکان، فەرمانگەکان، و سیاسەت دارشتنەکانی دەوڵەت. (٦٨، ل٤٧).

ئەگەر ناسینی پانتایی دەسەڵاتی بەرینی دەوڵەتی هاوچەرخ کە کردویەتە کاراکتەرێکی سەربەخۆ، گرنگە، ناسینی ئەو هۆکارانەی کە دەستەبەرکردن، پاراستن، و سەپاندنی دەسەڵات لە لایەن دەوڵەتەوە خۆش دەکەن، گرنگیەکی زیاتری هەیە. بەواتایەکی دیکە، ناسینی هۆکار و چۆنیەتی سەربەخۆبوونی دەوڵەت زۆر گرنگە. ئەوەی دیسانەوە گرنگیەکی زیاتری هەیە، تاوتوێکردنی چۆنیەتی کاریگەری دانانی هۆکارە کۆمەڵایەتییەکان لە سەر سیاسەتەکانی دەوڵەت و چۆنیەتی گۆڕینی سنوورەکانی دەسەڵاتی دەوڵەت بەهۆی تێکشکانی سنوورە دەوڵەتیەکانی چوارچێوەی سیاسی لە لایەن کۆمەڵگای مەدەنییەوەیە. لە راستیدا ئێمە دەبێ فۆرمۆڵبەندیە کۆمەڵایەتی و سیاسییە تایبەتیەکانی مێژوویەك کە سەربەخۆیی بەدەوڵەتێك دەبەخشن، تاوتوێ بکەین و ئەم سەربەخۆییە بە شتێکی مێژوویی بزانین نەك بە یەکێك لە تایبەتمەندییەکانی هەتاهەتایی هەموو دەوڵەتەکان.

سەرەنجام، دەوڵەتخوازەکان بە پەراوێزخستنی روانگەی کۆمەڵگاتەوەر، چاوپۆشی لە هەموو چوارچێوەکانی سیاسەتی رێکخراوی دەرەوەی سنوورەکانی دەوڵەت دەکەن. لە ئاکامدا، ئەو چوارچێوەیەی سیاسەتی تیۆری و رێکخراو، یان ئەو چوارچێوەیەی کە شوێنی پەیوەندی و تێکهەڵچوونە و دەکرێ بە کۆمەڵگای مەدەنی ناوبەرین، بێ بایەخ و ناسیاسی دەبێت. بەم جۆرە سیاسەت لەگەڵ دەوڵەت یەکسان دەبێت و لە پرۆسەی دانپێدانان و دژایەتی لە کۆمەڵگای مەدەنی جیا دەبێتەوە. لە راستیدا لەو روانگەیەدا، سیاسەت تا ئاستی مانای بەرتەسکی ململانێی تاکەکسی بەرپرسانی دەوڵەتی لەگەڵ یەکتر یان ململانێ لە سەر

سیاسەتەکانی دەوڵەتی دێتەخوارێ! ئەوە بێجگە لە ناساندنی خاو و ساکارانەی دەسەلات، هیچ شتێکی تر نییە. بۆ باسکردنی تیۆرییەك سەبارەت بە دەوڵەت کە خەیاڵمان ئاسودە بکات، بۆ چارەسەری کەموکوڕیەکانی دەوڵەتخوازی دەبێ تیۆرێك سەبارەت بە کۆمەڵگای مەدەنی باس بکەین و خودی دەوڵەت وەك پەیوەندییەکی کۆمەلایەتی هەژمار بکەین.

## دەوڵەت لە روانگەی فۆکۆییەوە:

ئەگەر دەوڵەتخوازەکان بە بێ نرخکردنی کۆمەڵگا، پاڵیان بە دەوڵەت داوە، ژمارەیەکیش لە بیرمەندە کۆمەلایەتییەکان کە بە توندی لە ژێر کاریگەریی بەرهەمەکانی میشل فۆکۆ دان، بە لە بەرچاو نەگرتنی گرنگی دەوڵەت، پاڵیان بە کۆمەڵگا داوە. دەسپێکی ئەو وەرچەرخانە دەکرێ لە بەرهەمەکانی گرامشی دا و لە پشت بەستنی بە کۆمەڵگای مەدەنیدا بدۆزرێتەوە. گرامشی سەرنجی لە لای دەوڵەتێکی تەواوعەیار و گشتگیر بوو، واتە دەوڵەتێك کە بە ئامرازە زۆرەملێ، ئەخلاقی، و فێرکاریەکان هەوڵدەدات بۆ ئەوەی هێژمۆنی خۆی بەسەر کۆمەڵگادا زاڵ بکات. گرامشی دەیەویست لەوە تێبگات کە دەوڵەت بۆ پەرەپێدانی پێگەی دەسەلاتی خۆی، بەچ شێوەیەك لە رووی کات و شوێنەوە پەرە دەستێنێت؟ بەو پێیە ناوبراو ئەو بەشە لە دامەزراوە کۆمەلایەتییەکان کە بەگشتی وەك دامەزراوەی تایبەتی و نادەوڵەتی دێنە ئەژمار، بە بەشێك لە دەوڵەت دەزانێت. ئەو نیشانی دەدات کە دەوڵەت لە کۆمەڵێك دامەزراوە و شێوەکار پێك دێت کە پشت ئەستوور بە ناوەندەکانی دەسەلاتی کۆمەڵگای مەدەنییە. بەو حاڵەشەوە، گرامشی لە سەر ناوەرۆکی تایبەتی کاروباری سیاسی جەختی دەکردەوە. بە بڕوای گرامشی دەوڵەت بە مانای کۆمەڵگای سیاسی، دەکرێ بە هێژمۆنی ئاوێتەبووی جەبر و زۆرەملێ بزانین. دەکرێ کۆمەڵگای مەدەنی بە سیستەمی بەرگریکارانەی دەوڵەتی نوێ یان چوارچێوەی پاراستنی دەوڵەت نێو بەرین. ئەوە خودی دەوڵەتە کە بە تەواوی ئامرازەکانیەوە بە سەر سیستەمی ناوبراودا سەروەری دەکات.

لە تیۆرێکدا کە دواتر لە لایەن فۆکۆوە باس کرا (١٢٩)، پشت بەستنی گرامشی بە کۆمەڵگای مەدەنی پەرە دەستێنێ بەلام پشت بەستنی ئەو بە ناوەرۆکی تایبەتیی دەوڵەت لەبەرچاو نەگیراوە. فۆکۆ هاوکێشەکانی دەسەلات، کە پێشووتر لە دەوڵەت و دامەزراوەکانیدا بەرتەسك دەکرایەوە، بۆ تەواوی لایەنەکانی پێکەوەهەڵکردنی کۆمەلایەتی پەرەپێدا. فۆکۆ بە

رەتکردنەوەی راڤەی داکشانی دەسەڵات (لە سەرەوە بۆ خوارەوە) کە بە دەوڵەت، سەروەری و یاسا دەست پێدەکات، دەستیدایە راڤەکردنی هەڵکشانی دەسەڵات.[19] لە فۆرمبەندی فۆکۆدا، دەوڵەت بە پێی پەیوەندییەکانی ئەو دەسەڵاتەی کە لە پێشووترەوە لە کۆمەڵگادا هەن، پێکدێت و لەچاو ئەو ناوەندانەی دەسەڵات پلەیەکی خوارتری هەیە. فۆکۆ بەپشت بەستن بە چۆنیەتی ئەزموونی دەوڵەت لە لایەن تاکەکانەوە لە تەواوی بوارەکانی پەیوەندیی مرۆیدا و چۆنیەتی دروستکردنی تاکەکان لە لایەن ئەو پەیوەندییانەوە، سەرنجی ئێمە لە نهێنییە ناشکرا و بەرچاوەکانی دەسەڵات بەرەولای فیزیکی وردی دەسەڵات و شێوازە تایبەتیەکانی لە بارودۆخە تایبەتیەکاندا، بەرەولای فۆرمۆلبەندی دەسەڵات لە گوتارەکان، و بەرەو لای ئەو راستییە رادەکێشێت کە دەسەڵات هەمیشە و لە هەموو شوێنێك بوونی هەیە و هیچ دەسپێك و کۆتاییەکی نییە، بەو ئاکامە دەگات کە دەوڵەت تەنیا بە پێی زاڵبوون و سەرکوتی نێو کۆمەڵگا دەتوانێ کار بکات.

بەو بەڵگەیەوە کە سیستەمی پتەوی زاڵ بە سەر جیهاندا لە لایەن دەوڵەتی بورژواییەوە پێکهاتووە، تەنیا کاتێك دەتوانێ لە سەر پێ راوەستێ و بەردەوام بێت کە رەگ و ریشەی لە پەیوەندییەکانی دەسەڵاتی جۆراوجۆر و نادیار دابێت کە پێکهاتەی پێویست بۆ شێوازە نیگەتیڤەکانی دەسەڵات دابین بکەن، فۆکۆ جەخت دەکاتەوە کە:

ئەوەی کە پێویستیە، چەشنێك لە فەلسەفەی سیاسییە کە بە پێی چەمکی دەسەڵات و لە ئاکامدا بە پێی ماناکانی یاسا و پێشگیری بونیات نەنرابن. ئێمە دەبێ سەری پاشا لە جەستەی جیا بکەینەوە: لە تیۆری سیاسیدا هێشتا ئەو کارە بەرێوە نەچووە... تاوتوێکردنی پرسکە بە پشت بەستن بە دەوڵەت بە مانای تاوتوێکردنیەتی بە پشت بەستن بە دەسەڵاتدار و

---

١٩- فۆکۆ دەڵێت "نامەوێ بڵێم دەوڵەت گرنگ نییە، بەڵکو دەمەوێ ئەوە بڵێم کە پەیوەندییەکانی دەسەڵات و لە ئاکامدا راڤەکردنی ئەو پەیوەندییانە بەناچاری لە چوارچێوەی دەوڵەت ئەولاوەتر دەچێت، لە بەر دوو هۆکار: یەکێکیان ئەوەیە کە دەوڵەت سەرەڕای هێزی زۆروزەبەندی دەزگاکانی ناتوانێت تەواوی پەیوەندییەکانی دەسەڵات بخاتە ژێر رکێفی خۆیەوە و خاڵی دووهەمیش ئەوەیە کە دەوڵەت تەنیا دەتوانێت لە سەر بنەمای پەیوەندییە بەجێماوەکانی دەسەڵاتی پێشوو، کار بکات... ئەو دەسەڵاتە باڵادەستەی ئەو تەنیا لە شوێنێك دەتوانێ پێ بگرێت و دەوامی هەبێت کە رەگ و ریشەی لە پەیوەندیەکانی دەسەڵاتە جۆراوجۆر و نادیارەکاندا بێت کە پێکهاتەی پێویست بۆ شێوازە نەرێنییە گەورەکانی دەسەڵات دابین بکەن." (٥٠، ل٦٤).

سەروەری و بەواتایەکی دیکە یاسا، ئەگەر کەسێك پێیوابێت کە تەواوی ئەو رەنگدانەوانە سەر بە دەزگای دەوڵەتن، ئەوە بەو مانایەیە کە هەر لە بنەڕەتدا پێیوابووە کە سەرکوتکارانەن (٥٠، ل٦٣).

فۆکۆ ئەوەی قبوڵە کە پەیوەندییەکانی مەوجودی نێوان دەسەڵات چوونەتە چوارچێوەی چەشنە ستراتیژێکی جیهانیی زاڵی بورژواییەوە و ئەو شتەش لە دەوڵەتدا بەرجەستە دەبێتەوە. وەك چەشنێك لە دەسەڵاتی کەم و گشتی دان بە گرنگی دەوڵەتیش دادەنێت، بەڵام لە ئاکامدا ئەوەی لە خوێندنەوەی لایەنەکانی ژیانی رۆژانەدا گرنگە، ناوەرۆکی پەرتەوازە، ناوچەیی و لێکدابڕانی دەسەڵاتە. تەنانەت کاتێك کە ئەو ناوەندە جیاوازانەی دەسەڵات لە چوارچێوەی چەشنێك لە ستراتیژی جیهانی زاڵدا پێکەوە پەیوەست دەبن، پەیوەندییەکانی ئەو ناوەندانەی دەسەڵات هەروا لێکدابڕاو و سست دەمێننەوە و تەنیا تا رادەیەك لەوانەیە ببنە چوارچێوەیەکی میتاگوتاری یان سەروو گوتاری. هەر لە بەر ئەوە، فۆکۆ بوونی هەر سەرچەشنێکی گشتیی زاڵ، هەماهەنگ و یەکپارچەیی پێکهاتە بەرینەکانی دەسەڵات، هەبوونی هۆکارێکی کۆتایی بۆ دەسەڵات و یان هەبوونی چەشنێك لە بەرامبەرکێی گشتگیری نێوان دەسەڵاتدار و ژێردەستەکان رەتدەکاتەوە. بەکورتی، فۆکۆ سەرەڕای ئەوەی دەوڵەت بە بەرجەستەبووی ژمارەیەکی زۆر لە پەیوەندییەکانی دەسەڵات دەزانێت، هیچ بایەخێکی تایبەتی بۆ دەوڵەت دانانێت. سەرەڕای ئەوەش، هەروەك جێسۆپ دەڵێت، "فۆکۆ بەراستی لەگەڵ گرفت بەرەوڕوویە لە تێپەڕین لە پەرتەوازەیی و بێ ڕێسایی و نارێکی وردە دەسەڵاتەکانەوە بەئاراستەی دیاریکردنی توندی چینایەتیان لە چوارچێوەی خۆیاندا و لە ڕێگای ڕۆڵی ناوەندێتی دەوڵەت" (٨٠، ل٢٣٨).

راڤەکانی فۆکۆ پێشکەوتنێکی تیۆریان لەمەڕ دەوڵەت بەدەست هێناوە، بەڵام ئەو بۆچوونانە نوقسانی و کەموکوڕیان تێدایە. فۆکۆ لە هەوڵە جدیەکانی خۆیدا بۆ بادانەوەی تیۆرەکان لە دەوڵەتەوە بەرەو لای ناوەندەکانی وردی دەسەڵات، ناوەرۆکێکی تایبەت وەك گوتاری سەرەکیی دەسەڵات بۆ دەوڵەت دانانێت. ئەو پێیوانییە دەوڵەت پێکهاتەیەکی زاڵی سەربەخۆیە. لە ساڵی ١٩٧٨دا، پولانزاس کە رێك هەر لە بەر ئەو هۆیە رەخنەی لە فۆکۆ دەگرت، نووسی:

ئەو، ئەم باشیەی هەیە کە یەکێك لە لایەنە تەکنیکییەکانی دەسەلآت کـە دەبێتـە هۆی گوێڕایەڵی و فەرمانبەری توێژە ژێردەسـتەکانی ڕێکخراوەکـان، واتـە شـێوەکانی پێکەوەگونجان، بەرجەستە دەکات، بەلآم لە لێکدانەوەکیدا، هەمیشە ڕۆڵی توندوتیـژی فیزیکی، راشکاوانە کەم دەکرێتەوە. یەکێك لە هۆکارەکانی ئەوەش کەم سەرنجدانی ئەوە بە ڕۆڵی یاسا لە پێکهێنانی شێوازێکی بنەڕەتی بۆ ئەو توندوتیژیە (١٥٨، ل٧٩).

پولانزاس لە دوو لاپەڕەی دواتری رەخنـەی خۆیـدا لـەوەش ئـەولاوەتر دەچێت و دەڵێـت: "توندوتیژی فیزیکی کە لە پاوانی دەوڵەتدایە، هەمیشە بنەمای تەکنیکییەکانی دەسـەلآت و کاروکردەوەی سازشـکارانە پێـك دێنێت. ئـەو توندوتیژیـە پاوانخوازانەیـە دزە دەکەنـە نێـو شێوەکانی دیسیپلین و ئایدۆلۆژیا و تەنانەت کاتێکیش کە بەشێوەی راستەوخۆ بەڕێوە ناچـن، شێوازە مادییـەکانی یەکـە کۆمەلآیەتییـەکانی ژێـر دەسـەلآت دیـاری دەکـات." (هـەمان سەرچاوە، ل٨١).

گرنگی نەدانی فۆکۆ بە دەوڵەت و دەسەلآتە زۆرەملێ و ڕێکخراوەکەی، بووە هـۆی ئەوەی نەتوانێت هەست بە ڕۆڵی ناوەندێتی و سەرەکیی دەوڵەت لـە پرۆسـەی بەرهـەم هێنان و نەزم و ڕێکخستنی دەوڵەتدا بکات. سـەرنج نەدانی فۆکۆ بەم کارە بـەرەنجامی دەرك نەکردنی ئەو پرسیـە بوو کە دەوڵەت لە بارودۆخێك دایە کە دەتوانێت ئەو چەشنە لە پێکهاتەکانی دەسەلآت هەڵبژێرێت کە بە فەرمی دەتوانن لـە چوارچـێوەی یاسـا و فەرمانەکاندا فۆرمۆلبەندی بکرێن. ناوبراو ئەو پرسیەی قبوڵ نەکرد کـە دەوڵـەت وەك پێکهاتەی گشتگیری دەسەلآت، شەرعیەتی بە پێکهاتە دیاریکراوەکان بەخشیوە و بـە فەرمی ناساندونی و پێکهاتەکانی تریش وەلا دەنێت. فۆکۆ بە هەوڵی چڕوپڕی خۆی بۆ دوور کردنەوەی ئێمە لەدەوڵەت سەرنجی بەو مەسەلانە نەدا کە دەوڵەت بەچ شـێوەیەك لەبەر هۆکاری ستراتژی هێندێك لە پێکهاتەکانی دەسـەلآتی تـا ئاسـتێکی بـالآ بـەرز کردوونەتەوە و پێکهاتەکانی دیکەش وەلا دەنێت و ئەو کارە بەچ شێوەیەك دەسەلآتێکی سەربەخۆ بە دەوڵەت دەبەخشێت.

جیاواز لەوەش، جەخت کردنەوەی فۆکۆ لە سەر پێویستیی "بـڕینی سـەری پاشـا" دەبێتە هۆی ئەوەی نەتوانێت ئەو پرسیە دەرك بکات کە دەوڵەت بەچ شێوەیەك پێکهاتە هێژمۆنیەکانی دەسەلآت لە کۆمەڵگادا دەسەلمێنێت و بەم جۆرە کۆمـەڵگا سـەقامگیر دەکات. ئەو نوقسانیەی فۆکۆ تارادەیەك بـەرەنجامی ئـەو پرسـیەیە کـە ئـەو شـێوازە

جۆراوجۆرەكانی دەسەڵات لەیەكتری جیا ناكاتەوە. بەڵام دەكرێ بە پێی شكڵ، خاوەن و بەرهەمەكانیان دەسەڵات پۆلێنبەندی بكرێت.[20] ئەم شێوازانەی دەسەڵات بەتەواوی لێك جیا نین، ئەوان پێكەوە پەیوەندییان هەیە و گوتارێكی سەرەكی پێك دێنن كە ئەویش بەنۆرەی خۆی كۆمەڵگا پێك دێنێت. جا ئەو گوتارە سەرەكییە لە دەوڵەت و لە رێگای ئەوەوە شێوازێكی روونتر بەخۆیەوە دەگرێت. دەسەڵاتی سیاسی لە بواری رێكخراوەییەوە، دەسەڵاتی باڵادەست و زاڵە، چونكە گوتارەكانی دیكە لە رێگای ناساندنی سیاسییەوەیە كە شەرعیەت پەیدا دەكەن و بە فەرمی دەناسێندرێن. ئەوە دەوڵەتە كە دەسەڵاتی لە كۆمەڵگادا سەپاندوە و دەستی بەسەر داگرتوە و بەم جۆرە هەم رێكی دەخات و هەم پشتگیریشی دەكات. كەوابوو، دەوڵەت شێوازەكانی دیكەی دەسەڵات رێكدەخات: "ماناكردنەوەی دەسەڵاتی سیاسی وەك دەسەڵاتێك كە ئامرازە تایبەتیەكەی ئەو، ملهوڕییە، یارمەتیمان دەدات بۆ ئەوەی لەوە تێبگەین كە بۆچی هەمیشە ئەویان بە دوایین دەسەڵات زانیوە، ئەو دەسەڵاتەی كە خاوەنەكانی لە هەر كۆمەڵگایەكدا لە گرووپی باڵادەست و زاڵ بە سەر ئەو كۆمەڵگایەدا پێكهاتوون" (١٥، ل٧٧). كەموكوڕی كارەكەی فۆكۆ لەوەدایە كە بەتەواوەتی چاوپۆشی لە ناوەرۆكی تایبەتی دەسەڵاتی سیاسی كردوە.

---

٢٠- بۆ نموونە نۆربێرتۆ بۆبیۆ بە پێی بنەچە، رەنگدانەوە و بەرهەمەكان دەسەڵاتی پۆلێنبەندی كردوە: "دەسەڵاتی ئابووری لە خاوەندارێتی ئەو كاڵا تایبەتیانەی كە پێویستن یان وەك كاڵای پێویست هەژمار دەكرێن، لە بارودۆخێكدا كە كەمن بۆ ناچاركردنی ئەو كەسانەی كە لە هەبوونی ئەو كاڵایانە بێبەرین، بە مەبەستی تایبەت بەكاردەهێنرێت... لە هەر كۆمەڵگایەكدا كە دوو گرووپی دارا و نەدار بوونیان هەیە، دەسەڵاتی داراكان لە توانایییەكانیان بۆ ناچاركردنی كەسانی دیكەی كە خاوەنی هیچ شتێك نین... لە بە ئەنجام گەیاندنی كارەكانی جێی پەسندی داراكان سەرچاوە دەگرێت. دەسەڵاتی ئایدۆلۆژی لە دەست بەسەرداگرتنی زانست یان پەروەردە تایبەتیەكان و تەنانەت لە دەست بەسەرداگرتنی زانیاری یان نهێنییەكانی هەڵسوكەوت بۆ سەپاندنی كاریگەری بە سەر هەڵسوكەوتی ئەوانیتر دا و ناچاركردنی تاكەكانی گرووپێك بۆ بە بەڕێوەبردن یان بەڕێوەنەبردنی كارێك كەڵك وەردەگرن..." (١٥، ل٧٦). بۆبیۆ دان بەوە دادەنێت كە لە ئاكامدا ئەوە هەر دەسەڵاتی سیاسییە كە سەردەكەوێت.

گرفتێکی دیکەی کاری فۆکۆ ئەوەیە کە تایبەتمەندییەکی ڕێگەپێدراوی هەیە. ئەگەر هەر بەوچەشنەی کە فۆکۆ دەڵێت، هیچ چەشنە پەرگوتارێکی دەسەڵات بوونی نییە کە شیاوی رووخاندن بێت، ئەگەر دەسەڵات هیچ دەسپێك و کۆتاییەکی نییە و ئەگەر دسەڵات تەنیا و تەنیا لە خواستی دەسەڵات دایە، کەوابوو ئیتر ڕێگایەك بۆ تێکشکاندنی پێکهاتەکانی دەسەڵات بوونی نییە. تاکەکان بۆ هەمیشە یەخسیری دەسەڵاتن و هیچ ڕێگایەکیان بۆ دەربازبوون نییە. هیچ ڕێگایەك بۆ دەربازبوون نییە، چونکە هیچ چوارچێوەیەکی کۆمەڵایەتی بوونی نییە کە لە ئازاری دەسەڵات لە ئەمان دابێت. گرنگتر لە هەمووان ئەوەیە کە هیچ چەشنە ناوەندێکی فەرمی چەقبەستنی دەسەڵات بوونی نییە کە دەستی بەسەردا بگیرێت یان ئاڵوگۆڕی تێدا پێك بێت. ئەو ڕوانگەیە لەبواری سیاسییەوە ڕەشبینانەیە، چونکە لە لایەکەوە بە ئێمەی نیشان دەدات کە لە چ جێگاوشوێنێکەوە دەکرێ پێکهاتەکانی دەوڵەت تێك بشکێندرێن و لە لایەکی دیکەشەوە هیچ ئاماژەیەك بەو پرسیە ناکات کە بەچ شێوەیەك دەکرێ گۆڕانکاری لە دەوڵەتدا بکرێت.

ئەگەر بۆ باسکردنی تیۆرێکی شیاو سەبارەت بە دەوڵەت، نەتەنیا دەبێ سەبارەت بەو دەوڵەتەی کە هەیە بەڵکو ــ گرنگتر لەویش ــ دەبێ سەبارەت بە دەوڵەتی دڵخوازیش قسە بکرێت، کەتە تیۆری دەوڵەت دەبێ ئاوێتەی تیۆرێك بکرێت سەبارەت بە چۆنیەتی بەرامبەرکێ لەگەڵ دەوڵەت و گۆڕینی. فۆکۆ تیۆرێك سەبارەت بە خەباتی بەشێنەیی لەدژی دەوڵەت باس دەکات، بەڵام هیچ تیۆرێك سەبارەت بە چۆنیەتی پێکهێنانی ئەو دەوڵەتە دڵخوازە ناهێنێتە ئاراوە. بە وتەی لوین، گەڵاڵەی فۆکۆ "بەکردەوە تووشی شکست دەبێت، تەنیا ئەو کاتە نەبێت کە ئەو پرسیارە ئەزموونی/وەسفییەی ئەو کە دەڵێت کۆمەڵگای ئێستای ئێمە پێویستی بە چ جۆرە بەڕێوەبەرایەتییەك هەیە، بەو پرسیارە ڕێگەپێدراوە/ راڤەییە تەواو بکەین کە دەڵێت ئێمە چ کۆمەڵگایەکمان دەوێت و پێویستیمان بە چ کۆمەڵگایەکە" (١٠٤، ل١١٣). چونکە کۆمەڵگاش پێویستی بە دەوڵەت هەیە، کاتێك دەبێ بیر لەو پرسیەش بکەینەوە کە پێویستیمان بە چ دەوڵەتێك هەیە، بەڵام بە بڕوای فۆکۆ هەموو ئەندامانی بەڕێوەبەر یان کۆمەڵگای سیاسی لە لایەن کۆمەڵگاخوازی و ناوەکیکردنەوەی دەسەڵاتەوە پێك دێن. ئەوان ناتوانن خۆیان لە پێکهاتەکانی دەسەڵات دەرباز بکەن یان لە بەرامبەر زوڵم و سەرکوتدا خۆڕاگری بکەن، مەگەر بە شێوازە بەراییەکانی خۆڕاگری. کەوابوو، تاك ناچارە لەگەڵ دەوڵەتێکی تایبەت ــ بەهەر ڕادەیەکیش سەرکوتگەر بێت ـــ هەڵ بکات. تاکی جێی

مەبەست لە ئاکامدا دەبێتە تاکێکی گوێڕایەڵ و پاسیڤ کە ناتوانێت دەست بداتە خۆڕاگری، مەگەر لە ئاستێکی زۆر سەرەتاییدا.[21]

بەواتایەکی دیکە بە پێچەوانەی بۆچوونی هەمیشەیی بیرمەندانی سیاسی کلاسیك، رەخنەی دەوڵەت ناتوانێت لەگەڵ بیرکردنەوە سەبارەت بە چۆنیەتی پێکهاتنی دەوڵەتێکی دڵخواز ئاوێتە ببێت، چونکە لە مرۆڤی جێی مەبەستی فۆکۆدا، سەرکوت بووەتە شتێکی دەروونی و هەر لە بەر ئەو هۆیە ئەو تەنانەت ناتوانێت بیر لە شێوازی ژیانێکی دیکە بکاتەوە. ئێمە ناتوانین وەسفی ئەرشیڤی خۆمان بکەین، چونکە بە پێی بنەمای هەر ئەو ئەرشیڤە قسە دەکەین و کار دەکەین. بەڵام مرۆڤەکان سەبارەت بە مێژوو دواون. ئەوان سەبارەت بە دەوڵەتە دڵخوازەکانی خۆشیان قسەیان کردوە و زۆر جاریش ئەو دەوڵەتانە دامەزراون. فۆکۆ نەیدەتوانی دەرکی ئەو خۆڕاگرییە داهێنەرانەیە بکات، چونکە لە سەر ئەو باوەڕە نەبوو کە بتوانرێ دۆخێك پێك بێت کە جیاوازییەکی بنەڕەتی لەگەڵ دۆخەکەی ئەوکاتی هەبێت. هەر خەیاڵێك، هەرچەشنە زەوقێکی سیاسی و هەر وێناکردنێك کە ببێتە هەوێنی خەیاڵێکی سیاسی داهێنەرانە، پوچەڵ دەکرێتەوە و لەو ڕێبازەدا ئەو دەوڵەتە زۆرویژەی کە لە سەر کارە، بەشێوەیەکی شاراوە رەوایی پەیدا دەکاتەوە.

ئێمە دەبێ ئاخێزگە و گەشەی مێژوویی دەوڵەت تاوتوێ بکەین، ئێمە بۆ ئەوەی پەی بە دەسەڵاتی مەترسیداری دەوڵەت بەرین، دەبێ بزانین کە دەوڵەت چۆن بە شێوازە چەند رەهەندیەکان، ئاست و سنوورێکی بۆ کاروبارە یاسایی و دڵخوازەکان دیاری کردوە و بەم جۆرە نەتەنیا چالاکییە گشتییەکان بەڵکو چالاکییە تایبەتیەکانی ئێمەش دادەڕێژێت. ئەگەر چاومان لێ بێت کە پرسەکانی وەك، رەگەز، پەیوەندی سێکسی، منداڵداری و بوونی منداڵ کە رەنگە وەك تایبەتی ترین کارەکانی ئێمە بێنە ئەژمار،

---

٢١ - بە بڕوای فۆکۆ، هێرش کردنە سەر دەسەڵات دەبێ لە تەواوی بەرەکان ــ زانکۆ، زیندان، بواری دەروونناسی ــ یەك لە دوای یەك بەڕێوە بچێت، "چونکە هێزەکانی ئێمە ئەوەندە زۆر نین کە بتوانین هاوکات پەلامار بەرین و دەبێ ئەم کارە بە بێ هەرچەشنە تیۆرێکی گشتی بەڕێوەببەین، چونکە تیۆر خۆی بەشێکە لەو دەزگایەی کە دەمانەوێ بیڕوخێنین." ئەو هەرچەشنە لایەنێکی یەکێتیخوازانە رەتدەکاتەوە بەڵام لە هەمانکاتیشدا ئەوە قبوڵ دەکات کە دەزگای ناوبراو لە بەرامبەر پەلاماری نەیاراندا، یەکێتی خۆی دەردەخات. بەم جۆرە هەرچەندە گوتاری فۆکۆ سەبارەت بە نالیبەتی پرنسیپێکی گشتی، پێویستی بە دەسەڵاتێکی گشتی پێشووتر هەیە، بەڵام ئەو خۆی لە لایەنە گشتیەکان دوور دەکاتەوە. بەداخەوە فۆکۆ کە دەیەویست دەست بداتە خۆڕاگری لە بەرامبەر دەسەڵاتدا، لە پێکهێنانی خۆڕاگری لە بەرامبەر پێکهاتەی یەکجارەکی دەسەڵات لە کۆمەڵگا ــ واتە دەوڵەت ــ بێ توانا دەبوو.

کاریگەری دەوڵەتیان بەسەرەوەیە، ئەوکات پشت بەستن بە کۆمەڵگا بە بێ هەرچەشنە سەرنجدانێك بە دەوڵەت بەس نییە. بەو کارە (پشت بەستنی پەتی بە کۆمەڵگا) ناتوانین لەوە تێبگەین کە دەوڵەت بە چ شێوەیەك ناوەند و پێکهاتەکانی دەسەڵاتی بەشێوەیەکی ستراتژیك هەڵبژاردوە، ئەوانی چۆن ڕێکخستوون و بە چ شێوەیەك وەفاداربوون بە شێوازێکی تایبەتیی دەسەڵاتی لەناو بردوە و گەشە بە شێوازەکانی دیکە دەدات. بەمکارە تێگەیشتنی ئێمە سەبارەت بەدەوڵەت دەچێتە سەرێ، بەڵام تێگەیشتنی ئێمە بەگوێرەی پێویست نییە یان نوقسانە.

ئەگەر پشت بەستنی بێ ئەملا و ئەولا بە دەوڵەت بەس نییە، پشت بەستنی بێ ئەملا و ئەولا بە کۆمەڵگاش بەس نییە. ئەگەر دەوڵەتخوازەکان کاروباری کۆمەڵایەتی بۆ کاروباری سیاسی ــــ ئەویش لە مانا بەرتەسکەکەی ئەودا ــــ دادەشکێنن، بیرمەندانی وەك فۆکۆش وەها پەرە بە چەمکی سیاسەت دەدەن کە کاروباری سیاسی بۆ کاروباری کۆمەڵایەتی دادەشکێنن. بەدڵنیاییەوە، ئەو تیۆرە سیاسییەی کە کاریگەری فۆکۆی بەسەرەوەیە، پەرەی بە مانای سیاسەت و دەسەڵات داوە، ئەو چەمکانەی کە بەشێوەی نەریتی وەك چەمکێکی سەر بەدەوڵەت هەژمار کراون. سیاسەت لە چوارچێوەی پێکهاتە و دامەزراوە فەرمییەکان ئەولاوەتر چووە. هەروەك هوفمەن دەڵێت، ئەو تێگەیشتنە لە سیاسەت "سەرنجڕاکێشە، بەڵام ئەو شتەی کە لە بواری واتاییەوە لەوانەیە جێگای سەرنج بێت، بە پێی پێویست لە بواری لۆژیکیەوە دروست نییە. بە هەندێك بیرکردنەوە بۆمان دەردەکەوێت کە بەهەر رادەیەك مانای سیاسەت بەربلاوتر بێت، دەرخستنی ڕووی ڕاستەقینەی سیاسەت دژوارترە... دەستنیشانکردنی ڕێگایەك بۆ خەرج کردنی پارەی گیرفان بە قەدەر پەسندکردنی یاسایەك یان هەڵوەشاندنەوەی دەوڵەتێك، تایبەتمەندییەکی سیاسی بەخۆیەوە دەگرێت" (٧٤، ل٢٣). لە ئاکامدا دژوارە بکرێ سیاسەت وەك چەشنێك لە چالاکی ڕێکخراو لە چالاکییەکانی دیکە جیا بکرێتەوە. پرسکە ئەوەیە کە ئەگەر پێشوتر تیۆری سیاسی مانایەکی بەرتەسکی سیاسی هەبوو کە پێشی بە ناسینی بنەچە و سەرچاوەی دەسەڵات دەگرت، ئێستا مانای سیاسەت وەها بەربلاو بووە کە یەکپارچەییەکەی لەگەڵ گرفت بەرەوڕوو کردۆتەوە. سیاسەت لە چالاکیی ڕۆژانەی تاکەکاندا تواوەتەوە و لە ناوەرۆکی تایبەتیی خۆی بەتاڵ بوەتەوە.

دەوڵەتخوازەکان بە پشت بەستن بە دەوڵەت، چاوپۆشی لە کۆمەڵگا دەکەن و ئەو بیرمەندانەش کە کاریگەری فۆکۆیان بەسەرەوەیە، بە پشت بەستن بە پێکەوەهەڵکردنی کۆمەڵایەتی، دەوڵەت لە بەرچاو ناگرن. تەنیا پشت بەستن بە دەوڵەت یان کۆمەڵگا ئەوە دەگەیەنێت کە ئەوان خۆیان بە چەشنێکی سەربەخۆ لە یەکتری پێکدێن و سەرلەنوێ خۆیان بەرهەم دێننەوە. لەو تێگەیشتنە تەك ڕەهەندیانەدا، ڕۆڵی هەرکام لەو دووانە (دەوڵەت و کۆمەڵگا) لە پێکهێنان و

سنووردارکردنی ئەوی تریان لەبەرچاو ناگیرێت. بەواتایەکی دیکە ئەو پەیوەندیانە سەرنج نادەنە ئەو پەیوەندییە ئاڵۆز، دژ بەیەك و بونیات نەرانەی کە لە نێوان دەوڵەت و کۆمەڵگادا هەیە. کەوابوو ئایا دەکرێ بۆچوونێك بۆ خوێندنەوەی دەوڵەت باس بکرێت کە ئەو پەیوەندییە بونیات نەرانەیە بە گرنگترین تایبەتمەندیی دەوڵەت بزانێت؟ با ببینین.

## رامان لە دەوڵەت وەك پەیوەندییەکی کۆمەڵایەتی:

ئەگەر لە سەر رۆڵی دەوڵەت و کۆمەڵگا لە بونیاتنان و بەرتەسکردنەوەی یەکتریدا قسە بکەین، دەتوانین دەوڵەت وەك پەیوەندییەکی کۆمەڵایەتی هەژمار بکەین،[22] چونکە دەوڵەت بە مانای دەسەڵاتی رێکخراوی فۆرمۆڵبەندی کۆمەڵایەتییە. لەو لێکدانەوەیەدا، لە هەمان کاتدا کە سەرنج

---

٢٢ - لە بەرهەمەکانی مارکس دا فۆرمبەندی جۆراوجۆر سەبارەت بە دەوڵەت بەرچاو دەکەون (بۆ ئاشنابوون لەگەڵ شەش لێکدانەوەی مارکس سەبارەت بە دەوڵەت بڕوانە، چ. ل.٨٠) بەڵام ئەو لە بنەڕەتدا لە سێ بوارەوە دەوڵەت بە پەیوەندییەکی کۆمەڵایەتی دەزانێت: (١) دەوڵەت وەکو نوێنەری هێزە باڵادەستەکانی کۆمەڵگا. لە **ئایدۆلۆژی ئاڵمانیدا** کە لە ساڵەکانی ١٨٤٥-٦ نووسراوە، مارکس دەوڵەت بە رەنگدانەوەی "زانستیانەی" دەسەڵاتدارێتی چینە خاوەندارەکان ناو دەبات (١١٣، ل١٠١). ئەو بەڵگەیە لە **بەیاننامەی پارتی کۆمۆنیست** دا پەرە دەستێنێت. لە ساڵی ١٨٤٨دا مارکس دەنوسێت: "بورژوازی لانیکەم لە سەردەمی سەرهەڵدانی پیشەسازی نوێ و بازاڕی جیهانی بەدواوە، لەچوارچێوەی دەوڵەتی نوێنەرایەتی نوێ دەستی داوەتە پاوانکردنی دەسەڵاتی سیاسی" (١١٣، ل١٤٤). (٢) دەوڵەت وەکو چەشنێك لە پێکهاتەی دەسەڵاتی نیوە سەربەخۆیە کە هەوڵدەدات لە سەرووەڕا کۆمەڵگای مەدەنی رێکبخات: **لە هەژدەی برومێر لویس بوناپارت** کە لە ساڵی ١٨٥٢دا نووسراوە، مارکس نیشانی دەدات کە دەوڵەت لە **بارودۆخێکی مێژوویی تایبەت** دا، بە شێوەیەکی رێژەیی سەربەخۆیە لە هەموو چینەکان و لە بارودۆخێك دایە کە دەسەڵاتی خۆی بە سەر کۆمەڵگادا دەسەپێنێت: "ئەوە تەنیا لە سەردەمی بوناپارتی دووەم دایە کە وادیارە دەوڵەت بە تەواوی سەربەخۆیە" (١١٩، ل١٣٠). کەوابوو سەربەخۆیی دەوڵەت پەیوەندیی بە هاوسەنگیی مێژوویی هێزە چینایەتیەکانی کۆمەڵگاوە هەیە. (٣) دەوڵەت وەکو هێزێکی کۆمەڵایەتی کە لە ناکۆکییە کۆمەڵایەتیەکانی کۆمەڵگای مەدەنیدا گرفتار بووە: لە ساڵی ١٨٤٤دا مارکس دەنوسێت دەوڵەت " لە سەر بنەمای ناکۆکی نێوان **ژیانی گشتی و تایبەتی**، و بەرژەوەندییە **هەمەکی و هەندەکیەکاندا** راوەستاوە. بەم جۆرە دەوڵەت دەبێ خۆی لەچوارچێوەی چالاکییە **فەرمی و نیگەتیڤە**کاندا سنووردار بکاتەوە، چونکە چوارچێوەی دەسەڵاتی ئەو رێك لەو جێگایە کۆتایی پێدێت کە کار و ژیانی مەدەنی دەست پێدەکات... لێکهەڵوەشان، دارمان و **کۆیلەتی کۆمەڵگای مەدەنی** بونیادی سروشتی **دەوڵەتی نوێ** پێك دێنێت" (١٢٤، ل٤١٢).

بە پەیوەندیی بنەڕەتی دەوڵەت و کۆمەڵگا دراوە، لە جیاتی داشکاندنی هەرکام لەوان بۆ ئەوی تریان، ئەوان لە بواری راقەییەوە لە یەکتری جیا بوونەتەوە. بەواتایەکی دیکە، لەو روانگەیەوە دەکرێ سنوورەکانی نێوان دەوڵەت و کۆمەڵگا دیاری بکرێت. هەروەك میچل (١٢٩) دەڵێت، ئەو سنوورانە، بگۆڕ، شاراوە و شیاوی کارتێکردنن، بەڵام هەرچۆنێك بێت هەر هەن.

میچل ئەوە بەڵگەمەند دەکات کە زانستی سیاسەت نەیتوانیوە مانایەکی ئەوتۆ بەدەستەوە بدات کە بتوانێ دەوڵەت لە جیهانی کۆمەڵایەتی جیا بکاتەوە کە لە لایەن دەوڵەتەوە رێکدەخرێت: "مانای دەوڵەت بەردەوام پەیوەندی بە جیاکردنەوەی ئەوەوە هەیە لە کۆمەڵگا و سنووردانانی بەکردەوە لە نێوان ئەو دووانەدا دژوارە" (١٢٩، ل٧٧). هەرچەندە ئەوە راستە کە دیاریکردنی سنووری نێوان دەوڵەت و کۆمەڵگا دژوارە، بەڵام دەکرێ بەشێوەیەکی رواڵەتی سنووری نێوان ئەو دووانە دیاری بکرێت، چونکە جیاوازیی چۆنایەتی نێوان دەوڵەت و کۆمەڵگا و تەنانەت جیاوازیی چۆنایەتی تری نێوان ئەندێشەکانی ئەو دووانە لە ئارادایە.

دەکرێ کۆمەڵگا بەهەموو ئەو کردەوە کۆمەڵایەتیانە بگوترێت کە کۆمەڵێك لە لایەن ئەوانەوە بوونی خۆی رادەگەیەنێت و سەرلەنوێ خۆی بەرهەم دێنێتەوە. ئەو لایەنە کۆمەڵایەتیانە بە پێی پێویست شێوازی جۆراوجۆریان هەیە، بەڵام لەوە گرنگتر ئەوەیە کە ئەوان لە سەر بنەمای پۆلێنبەندییەك دامەزراون و هەر لە بەر ئەوەیە کە باسی هەبوونی چەشنێك لە پەیوەندی دەکەن. بەواتایەکی دیکە، ئەو لایەنانە گەلێك هاوکێشەی دەسەڵات لە نێو ئەندامانی سیستەمی کۆمەڵایەتیدا پێکدێنن. ئەو پەیوەندییانە هەر لە شێوازی بەرهەمهێنان، ئاڵوویر و خەرجی کۆمەڵگاوە کە دەکرێ وەك پەیوەندیی بنەڕەتیی چینایەتی ناوی بەرین، هەتا شێوازی رێکخراوبوونی پەیوەندیی گروپەکان لە سەر بنەمای رەگەز، نەژاد و قەوم و کەموکوڕیەکان لەلایەن کۆمەڵگاوە لەخۆ دەگرن. شێوازی وردی پەیوەندییەکانی دەسەڵات لە هەر کۆمەڵگایەکدا پەیوەندیی بە مێژووی ئەو کۆمەڵگایە و دابونەریتی کۆنترۆڵ و گۆڕاپەڵبوونی ئەوەوە هەیە. شێوازی وردی لایەنە کۆمەڵایەتییەکان بە تێپەڕینی زەمەن گۆڕانیان بەسەردادێت و هەندێك لەوان درێژەیان دەبێت و هەندێکیشیان لەناو دەچن و شێوازی نوێ بەخۆیانەوە دەگرن. ئەوە بەو مانایە نییە کە هاوکێشەکانی دەسەڵات هەمیشە رێکوپێك و تەواوکەری یەکترین یان ئەوەی سیستەمەکانی دەسەڵاتی رێکوپێك و وەك یەك پێکدێنن. لە هەر قۆناغێکی مێژوویی تایبەتدا، کۆمەڵێك پەیوەندیی کۆمەڵایەتی تایبەت رۆڵی باڵایان

دەبێت و پەیوەندییە تایبەتیەکانی دیکەش دەخەنە ژێر رکێفی لۆژیکی تایبەتی خۆیانەوە. ئەو رایەڵ و پۆیەی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان لەو قۆناغە تایبەتیەدا، ناوەرۆکێکی تایبەتی بە کۆمەڵگا دەبەخشێت. بەڵام ئەو "بونیادە مێژووی"یانە (بە پێی گوتەی گرامشی) بە پێی پێویست تێکدەشکێن و ناجێگیرن.

دوو پرس دەبنە هۆی ئەوەی رایەڵ و پۆی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییە زاڵەکان، رایەڵ و پۆیەکی ناسەقامگیر و شکێنەر بن. یەکەم ئەوەی هەندێك کەس هەوڵدەدەن بۆ ئەوەی سەرجەم هاوکێشەکانی تری دەسەڵات زاڵ بکەن و ئەوەش دەبێتە هۆی ئەوەی لە کۆمەڵگادا شایەتی کێشمەکێشی نێوان ئەو گروپانە بین کە لە هەوڵی ئەوەدان روانگە کۆمەڵایەتییەکانی خۆیان بچەسپێنن. دووهەمیش ئەوەیە کە خۆراگری لە ناوخۆوە و لە نێوان هاوکێشەکانی دەسەڵاتدا، بە تەواوەتی گەڵاڵەی زاڵبون، لاواز و ناسەقامگیر دەکات. زاڵبون و هێژمۆنی رایەڵ و پۆیەکی تایبەت لە پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان لە قۆناغێکی مێژوویی تایبەتدا هاوکاتە لە گەڵ چەشنێك لە پۆلێنبەندی، خستنەپەراوێز و وەلانان. لە ئاکامدا ئەو گروپانە کە وەلا نراون ـــ جا چ کەسانی هەڵکەوتە یان چینە ژێر دەستەکان بن ـــ بەردەوام تێدەکۆشن بۆ ئەوەی خۆیان لەو هێژمۆنییە دەرباز بکەن. کۆمەڵگا وەك تۆرێکی کۆمەڵایەتی بەردەوام خۆی نۆژەن دەکاتەوە، چونکە ناوەرۆکێکی جێگای مشتومڕ و ناسەقامگیری هەیە و لەگەڵ گۆڕانی بەردەوامی یەکێتییەکان و ئەو خەباتانە بەرەورووییە کە بۆ دەسەڵات تێدەکۆشن.

تایبەتمەندیی سەرەکی دەوڵەت ئەوەیە کە دەوڵەت بە رێکخستنی پەیوەندییەکانی دەسەڵاتی باڵادەست لە کۆمەڵگادا، ئەو تایبەتمەندیانەی دەوڵەت سەقامگیر دەکات و بەم جۆرە کۆمەڵگاش سەقامگرتوو دەکات. دەوڵەت وەك کۆمەڵێك لە ئەندێشە سیاسییە تایبەتیەکان، رەوایی دەدات بە کۆمەڵێك لە پەیوەندییە کۆمەڵایەتییە هێژمۆنیەکان، چونکە لە رێگای سەپاندنی کردەوەی یاساییەوە ئەو پەیوەندییانە رێکدەخات و بە فەرمیش دەیانناسێنێت. لەو روانگەوەیە کە دەکرێ دەوڵەت وەك دەسەڵاتێکی رێکخراوی فۆرمۆلبەندی کۆمەڵایەتی بە هی سەردەمێکی مێژوویی تایبەت بزانین.

## دەوڵەت وەك دەسەڵاتی ڕێكخراوی فۆرمۆلبەندیی كۆمەڵایەتی:

كەوابوو بەو شێوەیەی خوارەوە دەكرێ سنوورەكانی نێوان دەوڵەت و كۆمەڵگا دیاری بكەین. یەكەم، هەرچەندە دەسەڵاتی دەوڵەت لە سەرەتادا لە كۆمەڵگاوە سەرچاوە دەگرێت، بەڵام دەوڵەت شێوازێكی ڕێكخراوی دەسەڵاتە كە چەشنە سەربەخۆییەكی هەیە. ئەوە لە بەر ئەو هۆیەیە كە دەوڵەت دەتوانێت دەسەڵات هەڵبژێرێت، وتەزاكانی دیاری بكات، ڕێكی بخات و بیكاتە ڕەمز و وەك دامەزراوەی فەرمی لێبكات. تواناكانی دەوڵەت لە هەڵبژاردن، پۆلێنبەندی، ڕیزبەندی و ڕەواپیدان بە دەسەڵاتە كە جێگاوشوێن و دەسەڵاتێكی تایبەتی پێدەبەخشێت.

هەموو دەوڵەتێك هەندێك لە ستراتیژییەكان، هێزەكان، بەرژەوەندییەكان، ئاسۆكانی زەمەنی و ئەو پێداویستیانەی كە لە سەری ڕێك كەوتوون، بەرز دەكاتەوە. هەموو دەوڵەت یان ڕژێمێكی تایبەتی بە پێی ئەو ستراتیژیانەی كە هێزەكان بۆ بەدەستەوەگرتنی دەسەڵاتی دەوڵەت بەكاری دێنن، بۆ هەندێك لە هێزەكان دەستڕاگەیشتنی ئاسانتر دەبێت. وە ئەو دەوڵەت یان ئەو ڕژێمە بە پێی بەرژەوەندی و شێوەكارەكانی دەستێوەردانی سیستەمەكە، بۆ بەدواداچوونی هەندێك لە ستراتێژە سیاسی یان ئابوورییەكان گونجاوتر دەبێت (٨٠، ل١٠).

توانایی هەڵبژاردن و بەیاسایی كردنی هەندێك لە شێوازەكانی دەسەڵات و لە ئاكامدا وەلانانی شێوازەكانی دیكەیە كە لە كۆمەڵگادا پێگەیەكی تایبەت و بەرەوپێش بە دەوڵەت دەبەخشێت. ئەو كارە هەروەها ئەو توانایە بە دەوڵەت دەبەخشێت، بۆ ئەوەی سەربەخۆ لە چینەكان و گروپە لێكدژەكانی كۆمەڵگا بێت.

دووهەم، دەوڵەت لە كۆمەڵێك لە فۆرمە تایبەتیە سیاسییەكان پێكدێت كە بەناوی بەرژەوەندیی گشتییەوە، بڕیارە پێویستەكان دیاریدەكەن و بەڕێوەی دەبەن. دەوڵەت وەك نوێنەری خواست و ئیرادەی كۆمەڵ دەتوانێت دەست لە هەموو لایەنەكانی ژیانی كۆمەڵایەتی وەردات. لە زۆربەی كۆمەڵگاكاندا دەوڵەت سەرچاوەی كۆتایی دەسەڵاتە.

سێیەم، دەوڵەت بەشێوەیەكی تایبەتی كە ڕێكخراوەكانی دیكەی كۆمەڵگا ناتوانن، ئامرازەكانی زۆرەملێ دەخاتە ژێر ركێفی خۆیەوە: "سیستەمێكی یاسایی هەمیشە دەبێ لە لایەن هەندێك كەسی چەكدارەوە گەرەنتی بكرێت، كەسانێك كە توانایی و ویستی پێویستیان بۆ بەڕێوەبردنی یاسا و دەستبەسەركردن و تەنبێ كردنی ئەو كەسانە هەیە كە گوێڕایەڵی ناكەن" (١٧٣، ل١٠٢). ئەوە پاوانكرانی ئامرازە زۆرەملێیەكانە كە دەوڵەت لە كۆمەڵگای

مەدەنی جیا دەکاتەوە، چونکە هەر بەوچەشنەی کە یوری دەڵێت، هەر ئەو پرسیە کە یەکێتی بە دەوڵەت دەبەخشێت.

یەکێتی دەوڵەت لە پاوانکردنی ئامرازەکانی زۆرەملێ و توندوتیژی فیزیکی لە هەر دووك بواری نێوخۆیی و دەرەکی ـ لە بەرامبەر دەوڵەتە نەتەوەییەکانی دیکەدا ـ سەرچاوە دەگرێت. بەو پێیە، دەوڵەت لەو گروپە لە دامەزراوەکانی کۆمەڵگای سەرمایەداری پێکدێت کە بە تەنیا یان بەکۆمەڵ لە سەر بنەمای چەقبەستنی زۆرەملێ و ملهوڕی فیزیکی راوەستاون (هەمان سەرچاوە، ل١٠٣).

بە پێچەوانەی کۆمەڵگا کە سیاسەت تێیدا جۆراوجۆر و پەرتەوازە و جێگای مشتومڕە، چەشنە هەماهەنگی و یەکپارچەییەك ـ هەرچەند کەمیش بێت ـ لە فۆرمەکانی دەوڵەتدا هەیە. بەو پێیە، ناکرێ دەوڵەت تا رادەی کۆمەڵگا داشکێنین، چونکە دەسەڵاتێکی فیزیکی بۆ بەڕێوەبردنی بڕیارەکانی خۆی هەیە، ئەو دەسەڵاتەی کە رێکخراوەکانی دیکە لێی بێبەرین.

چوارەم، لەو رووەوە کە دەوڵەت لە لایەن فۆرمە سیاسییە تایبەتیەکانەوە، پێکهاتەکانی دەسەڵاتی ناسەقامگیری کۆمەڵگا سەقامگیر دەکات، نەزمی کۆمەڵایەتی لە لایەن دەوڵەتەوە پێکدێت و هەر لە رێگای سنوورێکیشەوە کە دەوڵەت دیاری دەکات، بەرتەسك دەکرێتەوە. هەر ئەوەندە بەسە وەبیرمان بێتەوە کە بیرمەندە سەرەتاییەکانی مۆدێرنیتە ـ لەوانە هۆبز ـ بە چ شێوەیەك بە رەخنەگرتن لە کۆمەڵگا بەو ئاکامە گەیشتن کە دەوڵەت پێویستە هەبێت. هۆبز دەڵێت بەبێ هەبوونی حاکم یان پاشا، هەبوونی کۆمەڵگا ئەگەر لەکران نەهاتوو نەبێت، لاوازە. "ئەو (مرۆڤە دەسکردە) ژیان و جموجۆڵ بە کۆمەڵگا دەبەخشێت" (٧٣، ل٥٩). بە بڕوای هۆبز دەوڵەت بۆیە پێکهات کە کۆمەڵگاش بتوانێ پێك بێت، پێشمەرجی سەرهەڵدانی کۆمەڵگا و پێکەوە هەڵکردنێکی رێکوپێکی کۆمەڵایەتی، دەوڵەتە. ناوبراو ئەوە بەڵگەمەند دەکات کە بە بێ هەبوونی دەوڵەت، کۆمەڵگا تووشی بشێوی دەبێت.

لە تەواوی نەریتە سیاسییەکانیشدا رێککەوتنێك سەبارەت بە پێویستیی دەوڵەت لە ئارادایە، چونکە لاوازی و ناسەقامگیریی کۆمەڵگا قبوڵ کراوە. تەنانەت تیۆری مارکسیستی کە سەبارەت بە دەوڵەت و بانگەشەکانی ئەو زۆر رەشبینە، جەخت لە سەر ئەو پرسیە دەکاتەوە کە دەوڵەت لە ناکۆکییەکانی کۆمەڵگاوە سەرچاوە دەگرێت. بە بڕوای مارکسیستەکان، کۆمەڵگا تەنیا کاتێك پێویستی بە دەوڵەت نامێنێت، کە بەشێوەیەکی نوێ خۆی رێکبخاتەوە. تا کاتێك کە کۆمەڵگا خۆی رێکوپێك نەکات و خۆی رێك نەخاتەوە،

دەوڵەت ڕێکیدەخات. وە هەر ئەو توانای دروستکردن و ڕێکخستنەوەی کۆمەڵگایە کە سنوورەکانی نێوان دەوڵەت و کۆمەڵگا پێك دێنێت، ئەو سنوورانەی کە میگدال لە دیاریکردنی ئەوان بێ هیوا ببوو.

توانایی دەست نیشانکردن، ڕێکوپێك کردن، پۆلێن بەندی و شەرعیەتدان بە هاوکێشەکانی دەسەڵات لە کۆمەڵگا و کەڵك وەرگرتن لە زۆرەملێ و ملهوڕی بۆ پشتیوانیکردن لێیان، جێگا و شوێنێکی تایبەت بە دەوڵەت دەبەخشێت. چەقبەستن و ڕێکوپێك کردنی دەسەڵات لە لایەن دەوڵەتەوە، دەبێتە هۆی ئەوەی دەوڵەت ببێتە شێوازێکی تایبەت لە دەسەڵات. سەرەڕای ئەوەش ئەگەر ئاوڕێك لە پشت سەری دەوڵەت بدەینەوە و لە ڕاستیدا ئەگەر چاو لە کۆمەڵگا و کاریگەریی بونیات نەرانەی ئەو بکەین، هەر لەگەڵ هەمان گرفتەکانی تیۆری دەوڵەتخوازی بەرەوڕو دەبینەوە. لە بەر هۆکارەکانی خوارەوە، بۆ هەر خوێندنەوەیەك سەبارەت بە دەوڵەت، دەبێ دەوڵەت لە چوارچێوەی خەباتی کۆمەڵایەتی نێوخۆی کۆمەڵگای مەدەنیدا دابنێین.

یەکەم، دەوڵەت ناتوانێت هەموو ناوەندەکانی دەسەڵات بخاتە ژێر ڕکێفی خۆیەوە و فۆرمێکی تایبەتیان پێ ببەخشێت. دەوڵەت دەستی داوەتە هەڵبژاردنێکی "ستراتژی" و بەم جۆرە شێوازێکی تایبەتی دەسەڵات بەرجەستە دەکات. ئەوە بەو مانایەیە کە بەردەوام هەندێك لە هاوکێشەکانی دەسەڵات و چەمکە کۆمەڵایەتییەکان لە دەرەوەی سنوورە کۆمەڵایەتییەکانی دەوڵەتن. کاتێك کە هاوکێشەکانی دەسەڵات و گروپەکانی نەیاری دەوڵەت هەوڵدەدەن بۆ ئەوەی لێکدانەوەی خۆیان بە سەر کۆمەڵگادا بسەپێنن و بەم جۆرە سەقامگیریی خودی کۆمەڵگا لەناو دەبەن، پێکهاتەی کۆمەڵایەتی دەوڵەتیش سەقامگیریی خۆی لە دەست دەدات. بە واتایەکی دیکە، دەوڵەت بە "سەپاندن"ی کۆمەڵێکی تایبەت لە هێزە کۆمەڵایەتییەکان لە سەردەمێکی مێژوویىدا، وەك کۆمەڵێك لە فۆرمە کۆمەڵایەتییەکان، شێوازێکی تایبەت بە کۆمەڵگا دەبەخشێت. بەڵام لەو ڕووەوە کە خودی ئەو پێکهاتە دەسەڵاتە مێژوویيانە بەردەوام تووشی ناسەقامگیری دەبن، گۆڕانی هاوسەنگیی هێزە کۆمەڵایەتییەکان لە سەر دەوڵەت و چۆنیەتی هەڵسوکەوتی ئەو کاریگەری دەبێت. بەرامبەرکێ لە گەڵ ئەو پێکهاتانەی دەسەڵات لە کۆمەڵگادا، بە پێی پێویست وەك ڕێکخراوی سیاسیی ئەو پێکهاتانەی دەسەڵات، بەرامبەرکێ لەگەڵ دەوڵەتیشی لێدەکەوێتەوە.

ئەو دەوڵەتەی کە زۆر سەرنج بە کێشمەکێشەکان و یەکێتیەکانی نێوخۆی کۆمەڵگا نادات، نە دەتوانێ ڕاشکاوانە کار بکات و نە دەشتوانێ کردەوەکانی خۆی ڕێکوپێك و هاوسەنگ بکات. دەوڵەت ــ بە هەر ڕادەیەکیش کە دەسەڵاتێکی زۆری هەبێ ــ دەبێ سەرنجی گۆڕانی هاوسەنگیی

هێزە کۆمەڵایەتییەکان و سەرهەڵدانی چەمکەکانی کۆمەڵایەتیی نوێ لە کۆمەڵگادا بدات، ئەگینا گرنگیی خۆی لە دەست دەدات. ئەگەر وا نەکات دەبێتە دەوڵەتێکی بێ کۆمەڵگا. ئەوە راستە کە لە مێژوودا، دەوڵەتی دابڕاو لە کۆمەڵگاش هەبوون، بەڵام ئەو دەوڵەتانە کاتی بوون، چوونکە پێگەیەکی کۆمەڵایەتییان نەبووە. هەمووی ئەو بەرهەمانەی کە سەبارەت بە راپەڕینەکان نووسراون، شایەتی ئەو کارەن. ئەو دەوڵەتانەی کە بەرەورووی شۆڕش بوونەتەوە (هەر لە دەوڵەتی پاشایەتی فەرانسەی ساڵی ١٧٨٩وە بگرە هەتا دەوڵەتی تیزاری روسیا بەر لە راپەڕینی ساڵی ١٩١٧، دەوڵەتانی داگیرکەری وڵاتانی وەك ئەلجەزایر، ڤێتنام، موزامبیك، گینەی بیسائۆ، هیندستان، و چینی دوای شەڕی دووهەمی جیهانی، و یان دەوڵەتە ستالینیەکانی خۆرهەڵاتی ئەوروپا لە دەیەی ١٩٨٠)، ئەو دەوڵەتانە بوون کە سەرنجێکی ئەوتۆیان بە سەرهەڵدان و گۆڕانی پێکهاتەکانی دەسەڵاتی کۆمەڵگا نەداوە. ئەوان بۆ دابڕان و خۆهەڵاواردن لە کۆمەڵگا و گۆڕانکاریەکانی ئەو دەبوایە بەهایەکی زۆریان بدابایە. وە هەر لە بەر ئەو هۆیە بوو کە بوونە دەوڵەتی زێدە و ناپێویست.

ئەگەر ئەو لێکدانەوەیە قبوڵ بکەین، ئەوکات چۆنیەتی سەربەخۆیی دەوڵەت لە کۆمەڵگا لە بنەڕەتدا پەیوەندیی بەهاوسەنگی هێزە کۆمەڵایەتییەکانی نێو کۆمەڵگاوە دەبێت. لەو رووەوە کە دەوڵەت لە سەر بنەمای دەسەڵاتی کۆمەڵایەتی راوەستاوە و رەنگدانەوەی ئەو دەسەڵاتەشە، ناوەرۆکی دەوڵەت پەیوەندیی بە کۆمەڵگا و چۆنیەتی هاوکێشەکان و کێشمەکێشەکانی نێوخۆی کۆمەڵگاوە هەیە. بەواتایەکی دیکە، هەرچەندە دەوڵەت پێکهاتەیەکی جیاوازی دەسەڵاتە و بەردەوامیش لە هەوڵی ئەوەدایە کە کۆمەڵگا بخاتە ژێر رکێفی خۆیەوە، بەڵام رادەی توانایی ئەو بۆ رێنوێنی و کۆنترۆڵی کۆمەڵگا، پەیوەندیی بە رادەی کێشمەکێش لە کۆمەڵگادا هەیە. دەوڵەت لە رووی ناچاریەوە لەنێوان بەرهەمە ئاڵۆز و دژبەیەکەکانی خەباتی چینایەتی و جەماوەری لە کۆمەڵگادا کار دەکات.

ئەوەش دەرخەری ئەوەیە کە ئەگەر دەوڵەتێك زیاد لە پێویست سەربەخۆیە، لە بەر ئەوەیە کە یان دژایەتییەك لەگەڵ پێکهاتە هێژمۆنیەکانی کۆمەڵگا ناکرێت و یان ئەوەی چەشنێك لە هاوسەنگی لە نێوان هێزە چینایەتیەکانی کۆمەڵگا لە ئارادایە. ئەوە بنەمای بۆچوونی بەناوبانگی مارکس لە **هەژدەهەمی برومێر لویس بوناپارت** دایە. بەم جۆرە سەربەرخۆیی رێژەیی دەوڵەت پەیوەندیی بە هۆکارە مێژووییەکانەوە هەیە: بزێویی مێژوویی زاڵ بە سەر رۆڵ و کاری دەوڵەتدا.

ئەو لێکدانەوەیە تەنیا کاتێك راستە کە ئەوە قبوڵ بکەین کە ناکرێ دەسەڵات لە کۆمەڵگادا بە شتێکی روون و دیار بزانین. ناوەرۆکی پێکهاتەکانی دەسەڵات بەهۆکاری جۆراوجۆرەوە بەستراوەتەوە: پێکهاتە مێژووییەکان، پێکهاتە هێژمۆنیەکان، خۆشەویستیی

نەیارەکان، کێشمەکێش لە سەر هێژمۆنی و هاوسەنگیی کۆمەڵایەتی و سیاسی سەرچاوە گرتوو لەو لە قۆناغێکی تایبەتیدا. دەکرێ ئەو پرسیەش قبوڵ بکەین کە دەوڵەت ڕەنگدانەوەی هاوکێشەی دەسەڵاتی باڵادەستە، بەڵام پرسیەکی دیکە ئەوەیە کە خودی ئەو دەسەڵاتە بەردەوام نۆژن دەبێتەوە.

هەربۆیە، تان و پۆی هێژمۆنی هێزە کۆمەڵایەتییەکانی کۆمەڵگا هەمیشە لە حاڵی گۆڕان دان و هەر ئەو کارەش وایکردوە کە پێگەی کۆمەڵایەتیی دەوڵەتیش بەردەوام بگۆڕێت. لە بواری لۆژیکیەوە، دەوڵەت بۆ ئەوەی خۆی وەك پەیوەندییەکی کۆمەڵایەتی بپارێزێت، دەبێ هاوسەنگیی گۆڕانکاریەکانی هێزە کۆمەڵایەتییەکانی تێدا ڕەنگ بداتەوە. لە بەرامبەریشدا، لێکدابڕانی ئەو پەیوەندییە کۆمەڵایەتیانە، دەبێتە هۆی سەرهەڵدانی قەیران و دەوڵەت یان دەبێ بەخۆیدا بچێتەوە یان ئەوەی کۆن و بێ کەڵك دەبێت. ئەوەی پێی دەگوترێ قەیرانی ڕەوابوونی دەوڵەت، لە دژایەتی کۆمەڵگا لەگەڵ دەسەڵاتی دەوڵەت و پێکهاتنی ستراتیژیە نوێیەکانەوە سەرچاوە دەگرێت.

لەو ڕوانگەیەدا، بەرپرسیارێتی گۆڕانکاریی کۆمەڵایەتی و سیاسی و بەرپرسیارێتی بەرتەسك کردنەوەی دەوڵەت، بە توندی بە کۆمەڵگا دەسپێردرێت. بەواتایەکی دیکە ناوەرۆکی دەوڵەت پەیوەندی بە ئەگەری سەرهەڵدان و پێکهاتنی دژایەتی و خەبات لە کۆمەڵگادا هەیە. ناوەرۆکی دەوڵەت بە چالاکبوون، توانایی دەستپێشخەری، و هۆگریە سیاسییەکانی کۆمەڵگا، پەیوەندییان بە کۆنترۆڵی دەسەڵاتی دەوڵەتەوە هەیە. هەر بەو پێیە ئەگەر کۆمەڵگا نەیهەوێ بە ئامانجێکی دیموکراتیانە بە سەر کۆنترۆڵ و گوتاری سیاسیدا چاودێری بکات و یان ئەو دەسەڵاتەی بە دەوڵەت سپاردبێت، ئەگەری زۆری هەیە کە یەخسیری دەوڵەت ببێت. دەوڵەت کاتێك دەستی بە توانایی هێژمۆنی ڕادەگات کە لە گەڵ هیچ چەشنە دژایەتییەك بەرەوڕوو نەبێتەوە. لە ئاکامدا ئەوە کۆمەڵگایە کە ناوەرۆکی دەوڵەت دیاری دەکات. تەنیا کۆمەڵگایەکی وشیار و خودئاگا دەتوانێ گەرەنتی بەردەوامبوونی دەوڵەتێکی دیموکراتی و بەرپرسیار یان وەڵامدەرەوە بکات و هەر لە بنەڕەتەوە لە کۆمەڵگای مەدەنی دایە کە لە نێوان چالاکیی سیاسیی کۆمەڵگا لە لایەك و ناوەرۆکی دەوڵەت لە لایەکی دیکەوە، پەیوەندی دادەمەزرێت.

# دەوڵەت و چالاکیی سیاسیی کۆمەڵگای مەدەنی:

لێرەدا ئەو پرسیارەی لەوانەیە بێتە ئاراوە ئەمەیە کە: ئابووریی سەرمایەداری چی لێدێت؟ ئایا پشت بەستن بە کۆمەڵگای مەدەنی لە گرنگیی پەیوەندیی بونیادی کەڵەکەبوونی سەرمایەداری لەگەڵ دەوڵەت لە کۆمەڵگای سەرمایەداریدا کەم ناکاتەوە؟ لە لێکدانەوەی مارکسیستی لەمەڕ دەوڵەت، بەگشتی جەخت لە سەر پەیوەندییەکانی دەوڵەت لەگەڵ بونیادی کەڵەکەبوون کراوەتەوە و ئاماژە بە ناوبژیوانیی کۆمەڵگای مەدەنی کراوە. ئێمە دەتوانین ئەو جۆرە ناساندنە، داشکاخوازانە یان ملهوڕانە ناو بەرین، بەڵام ناتوانین بەلایانەوە بنێین، چونکە ئەو شێوازانەی ناساندنی دەوڵەت لە کۆمەڵگای سەرمایەداریدا یەکەمین بنەمای ناساندنی دەوڵەت لە بەردەستی ئێمە دادەنێن. ئەو ناساندنانە لاگیری کۆمەڵایەتی دەوڵەت نیشان دەدەن و ئەو وشیاریە تیۆریەمان پێدەبەخشن کە دەوڵەت نە بێلایەنە و نە دەشتوانێ لە خزمەت چینێك یان گروپێك دابێت، هەرچەندە کە ئەم چینە یان ئەم گروپە لە بارودۆخێکیشدا بێت کە لە ئاستی سیاسیدا بتوانێت بە سەر دەوڵەتدا زاڵ بێت. وەك بنەمای یەکەم، ئەو وشیاریە ئێمە لەوە ئاگادار دەکاتەوە کە دەوڵەت بنج و بناوانی لە سیستەمە تایبەتیە کۆمەڵایەتی ــ ئابووریەکاندایە. ئەو وشیاریە ئێمە لەوەش ئاگادار دەکاتەوە کە پێکهاتە ئابوورییەکان بەشێوازی جۆراوجۆر کۆنتڕۆڵی دەوڵەت بەدەستەوە دەگرن. هەروەك یۆری دەڵێت:

ئەو داواکارییە کە هەموو دەوڵەتێکیش لەگەڵی بەرەوڕوویە، لە بنەمایەکەوە سەرچاوە دەگرێت کە دەوڵەتی تێدایە. دەوڵەت ناتوانێ خۆی لە پاراستنی ئەو دۆخە بدزێتەوە، هەرچەندە کە پێکهاتەی نێوخۆیی و سیاسەتی دەوڵەتەکانیش پێکەوە جیاوازییان هەیە. هەر بۆیە هەموو دەوڵەتێك لانیکەم لە نێوخۆی پێکهاتەیەك دایە کە تێیدا بۆ ئەوە هەوڵدەدات کە بارودۆخی پێویست بۆ کەڵەکەکردنی بەرژەوەندییەکانی سەرمایە دابین بکات و بیپارێزێت. (١٧٣، ل١٠١).

بەڵام لەوە گرنگتر، یۆری جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە " لەو روانگەوە و بە تەنها لەو روانگەوەیە کە دەکرێ دەوڵەت لەگەڵ ناوەرۆکی سەرمایە و پێویستیەکانی گۆڕانی پرۆسەی کەڵەکەبوون گرێ بدرێتەوە" (هەمان سەرچاوە). دەوڵەت لە کۆمەڵگای سەرمایەداریدا لانیکەم ناچارە کە بارودۆخی کەڵەکەبوون سەرلەنوێ بەرهەم بێنێتەوە، بەڵام ئەوەی ئایا هەمیشە دەتوانێ بە سەرکەوتوویی ئەو کارە بە ئەنجام بگەیەنێت، جێگای گومانە. جێسۆپ دەڵێت، "دەوڵەت بواری دەستەبژێرکردنێکی ستراتیژییە و هیچ کات ناتوانێ لە بەرامبەر تەواوی پێداویستیە کۆمەڵایەتی و گەلاڵە سیاسییەکاندا بێ لایەن بێت، بەڵام هەرچەشنە لاگیرییەك بەردەوام باسی چەشنێك لە مەیل و هۆگری دەکات و بە ستراتیژی گونجاو دەتوانێت لاواز یان بەهێز ببێت. لە چوارچێوەی سنوورێکی

ستراتیژیکدا که له لایەن پێکهاتە و فۆرمە کاریەکانی دەوڵەتەوە دیاری دەکرێن، بەرهەم و ئاکامی دەسەڵاتی دەوڵەت پەیوەندی بە هاوسەنگیی بگۆڕی ململانێی هێزە چالاکە سیاسییەکانی نێوخۆ و دەرەوەی دەوڵەتیشەوە هەیە. لە سەر ئەو بنەمایە بۆ دەرك کردنی ئەوەی دەوڵەت تایبەتمەندییەکی سەرمایەداری هەیە (یان دەتوانێ هەیبێت) یان نا، دەبێ هەم فۆرمی دەوڵەت تاوتوێ بکرێت و هەم هاوسەنگی هێزەکان" (٨٠، ل٣٥٣).

لاگیری دەوڵەت لە پێکهاتەکانی دەسەڵاتی هێژمۆنی لە کۆمەڵگادا تەنیا باسی چەشنێك لە مەیل و هۆگری دەکات، چونکە دەوڵەت نەتەنیا لە نێوان پێکهاتەکانی کەڵەکە کردنی سەرمایەداریدا، بەڵکو لە نێوان ئەو خەباتە جەماوەریانەشدا هەیە کە ویستی هاوسەنگ کردنی فۆرمە ئابووری و سیاسییە زاڵەکانیشی تێدایە. ئەو خەباتە جەماوەریانە رۆڵێکی زۆریان لە دیاریکردنی سنوور و چوارچێوەکانی دەسەڵاتی دەوڵەتیدا هەیە. هەروەك پولانزاس لە بەرهەمەکانی دوایی خۆیدا ئاماژەی پێدەکات، [٢٣] دەوڵەت کەوتووەتە داوی ئەو خەباتە چینایەتیانەوە، هەر بەو پێیە لەوانەیە دەوڵەت نەتوانێت سیاسەتێك کە بە قازانجی چینە ئابووریە زاڵەکانە، بناسێت یان پشتیوانی لێ بکات.

دەوڵەت هەمیشە ناتوانێت پشتیوانی لە چینە ئابوورییە زاڵەکان بکات، چونکە پەیوەندییە ئابووری و سیاسییەکانی کۆمەڵگای مەدەنی کەوتوونەتە نێوان دەوڵەت و

---

٢٣- پولانزاس لە سەر ئەو باوەڕە بوو کە سەربەخۆیی ڕێژەیی دەوڵەت هۆکردی باروودۆخی مێژوویی نییە، بەڵکو یەکێکە لە تایبەتمەندیە زاتیەکانی دەوڵەت. لە سەر ئەو باوەڕە بوو کە ئەم کارە بەرەنجامی جیایی و لێکدابڕانی چینی سەرمایەدارە. کاریگەری گرامشی بە سەر پولانزاسەوە دیارە، چونکە پولانزاس رۆڵی رۆشنبیرێکی رێکخراوەیی بۆ دەوڵەت دادەنێت کە یەکێتی بە چینە سەرمایەدارەکان دەبەخشێت.

لە بەرهەمەکانی دوایی پولانزاس دا بادانەوەیەکی توند بەرچاو دەکەوێت. پولانزاس دەستبەرداری ئەو لێکدانەوەیە بوو کە دەیگوت دەوڵەت هێمای سۆلیدارێتی کۆمەڵایەتییە و وازی لەو لێکدانەوەیەش هێنا کە دەیگوت خودی دەوڵەت گۆڕەپانی خەباتی کۆمەڵایەتییە. پولانزاس بەو باوەڕە گەیشت کە دەوڵەت گۆڕەپانی کێشمەکێشی چینایەتییە. ئەوە نیشانەی تێپەڕین بەرەولای قۆناغی سێیەمی گەشەی تیۆری دەوڵەت بوو. ئەو ئیتر جەختی لە سەر پێشێتی خەباتی چینایەتی بە سەر دەزگای دەوڵەتیدا دەکردەوە. ئەو خەباتانە تەنیا هۆکردی ئەوە نین کە بە ئاشکرابوونی زیاتری دەوڵەت لە قۆناغی سەرمایەداری پاوانخوازاندا، دەوڵەت بووەتە ئامانجی هەموو خەباتێکی کۆمەڵایەتی و خەباتی چینایەتیش باڵی بەسەردا دەکێشێت، بەڵکو هۆکردی ئەوەشە کە دەوڵەت لە کۆمەڵێك دامەزراوە پێك دێت کە ئەو دامەزراوانە نوێنەری گروپە جۆراوجۆرەکانی کۆمەڵگان و هەر لە بەر ئەو هۆیەشە کە خەباتی کۆمەڵایەتی لە نێوخۆی دەزگاکانی دەوڵەتدا روو دەدات.

سیستەمی ئابووریەوە. بەو پێیە، هەموو دەوڵەتێك لە چوارچێوەی پەیوەندیی جۆراوجۆر و پڕ لە کێشمەکێشێك دا کار دەکات کە کۆمەڵگای مەدەنی پێك دێنن. کۆمەڵگای مەدەنی وەك پانتایی سیاسی گرنگیەکی دیاریکەری هەیە، چونکە شوێن، دامەزراوەکان، بەهاکان و پرۆسەکان دەخاتە بەر دەستی ئێمە کە لە ڕێگایانەوە دەتوانین دەوڵەت بەرەورووی ململانێ بکەینەوە. کۆمەڵگای مەدەنی بوارێکە کە لەوێدا دەکرێ گەڵاڵەیەکی دژی هێژمۆنی بەڕێوە ببرێت. کەوابوو دەوڵەت لە لایەن کۆمەڵگای مەدەنییەوە بەرتەسك دەکرێتەوە.

ئێستا هەر بەو چەشنەی کە باسەکانی دواتر نیشانی دەدەن، کۆمەڵگای مەدەنی بەهیچ شێوەیەك چەمکێکی بێ ئەملاو ئەولا نییە. لە لایەکەوە دەوڵەت هەوڵدەدات بۆ ئەوەی فۆرم و ڕێکخراوێکی تایبەت بە کۆمەڵگای مەدەنی ببەخشێت، و لەلایەکی دیکەشەوە، کۆمەڵگای مەدەنی دیاردەیەکی هاوچەشن و یەکدەست نییە. چالاکیی سیاسی کۆمەڵگای مەدەنی تووشی چەشنێك جەمسەربەندی بووە: لە لایەکەوە فۆرمەکانی لایەنگری بەرنامەکانی دەوڵەت هەن و لە لایەکی دیکەشەوە فۆرمەکانی دژ بە بەرنامەکانی دەوڵەت. ئەو کارە دوو پێشهاتی لێدەکەوێتەوە. یەکەم، کۆمەڵگایەکی مەدەنی بێدەنگ و گوێڕایەڵ دەبێتە هۆی سەرهەڵدانی دەوڵەتێکی مەزنخواز و کۆمەڵگایەکی مەدەنی چالاك و زیندووش دەبێتە هۆی سەرهەڵدانی دەوڵەتێکی دیموکراتی و بەرپرسیار. دووهەم، چەمکی کۆمەڵگای مەدەنی خۆی لە خۆیدا هیچ بەهایەکی نییە و هەروەك چۆن گرامشی بە شێوەیەکی بەڵگەمەند دەریخستوە، دەتوانێت یارمەتی بە بەڕێوەبردنی گەڵاڵەی دەوڵەت بۆ پێکهێنانی هێژمۆنی بکات.

کۆمەڵگای مەدەنی لە لایەن گەڵاڵە سیاسییەکانی ئەندامەکانیەوە پێکدێت. کۆمەڵگای مەدەنی بۆ ئەوەی بەربەست بۆ دەوڵەت دروست بکات، دەبێ ئاگاداری بەرپرسیارێتی خۆی بێت ئەویش نەتەنیا لە بەرامبەر زوڵم و دەستدرێژی دەوڵەتدا، بەڵکو لە بەرامبەر زوڵم و دەستدرێژی نێوخۆی کۆمەڵگای مەدەنیش دا دەبێ ئاگاداری خۆی بێت. کۆمەڵگای مەدەنی بۆ گەرەنتی کردنی دیموکراسی دەبێ لەگەڵ دەوڵەت گفتوگۆ بکات، بەڵام تەنیا کاتێك هەبوونی دەوڵەتێکی دیموکرات گەرەنتی دەکرێت کە خودی کۆمەڵگای مەدەنیش تایبەتمەندییەکی دیموکراتی هەبێت. هەرچەندە لە تەواوی نەریتەکانی تیۆر سیاسیدا لە سەر ئەوە جەخت کراوەتەوە کە کۆمەڵگای مەدەنی

دەتوانێت کۆنترۆڵی دەوڵەت بکات، بەڵام بەشێوەیەکی دیار گومان سەبارەت بە خودی کۆمەڵگای مەدەنیش لە بەرهەمەکانی هیگڵ، مارکس و گرامشیدا بەرچاو دەکەون. لە بەشەکانی دواتردا بەو ئاکامە دەگەین کە کۆمەڵگای مەدەنی تەنیا کاتێك دەتوانێت بەربەست بۆ دەوڵەت دروست بکات و گەرەنتی هەبوونی دەوڵەتێکی دیموکراتی بکات، کە لەناوخۆی هەر ئەو چوارچێوەیەدا گەرەنتی دیموکراسی بکات. ئێستا چەمکی کۆمەڵگای مەدەنی و واتا جۆراوجۆرەکانی پەیوەندیدار بەوەوە تاوتوێ دەکەین.

## کۆمەڵگای مەدەنی: مێژوویەکی چەمکی:

لە بەشی پێشوودا بەڵگەی ئەوەمان هێنایەوە کە بە بێ ئاماژە کردن بە کۆمەڵگای مەدەنی ناتوانین دەوڵەت بە باشی راڤە بکەین. سەرەڕای ئەوەش، لە تیۆری سیاسیدا بەهیچ شێوەیەك رێککەوتنێك سەبارەت بە لێکدانەوەی کۆمەڵگای مەدەنی لە ئارادا نییە. لە ناوخۆ و لە نێوان نەریتە فیکریە جۆراوجۆرەکانەوە، لەسەر مانای کۆمەڵگای مەدەنی جیاوازی بیروڕا هەبووە. لە ئاکامدا ئەو چەمکە، چەمکێکی چەند لایەنە و ئاڵۆزە. ئەو چەمکە مانای جۆراوجۆر لە خۆی دەگرێت کە ئەو مانایانە لە نەریتی جۆراوجۆرەوە سەرچاوە دەگرن و لە هەندێك لاوە لێك نزیك و لە هەندێك لاشەوە لێك دوورن. دەکرێ ئەوە بە بەرەنجامی ئەو راستیە بزانین کە لە قۆناغە جۆراوجۆرە مێژووییەکاندا، رەهەندی جۆراوجۆری ئەو چەمکە زاڵبوون و هەر ئەو کارەش چەمکی کۆمەڵگای مەدەنی بەشێوەیەکی بنەڕەتی تووشی ئاڵوگۆڕ کردووە.

هەرچەندە قسە و باسی گەرم و گوڕ لە مەڕ چەمکی کۆمەڵگای مەدەنی لە ئارادان، بەڵام ئەم قسەوباسانە هەماهەنگیەکی بنەڕەتییان هەیە، چونکە هەرچەندە لەوانەیە چەمکی کۆمەڵگای مەدەنی ناوەرۆکێکی تاقانە و نەگۆڕی نەبێت، بەڵام چەندەها تایبەتمەندیی جیاوازی هەیە. هەرکام لەو تایبەتمەندییانە بوونە پێکهاتەیەك بۆ فۆرمەکان و مشتومڕە فیکریەکانی دیکە لەمەڕ ئەو چەمکە. هەر بۆیە، دەکرێ مێژووی واتایی کۆمەڵگای مەدەنی لە سەر بنەمای گێڕانەوە دیارەکان و کاردانەوەکانی بەرامبەریان، دیاری بکرێت.

شرۆڤەی مێژوویی چەمکێکی تایبەت، لەو بوارەوە گرنگە کە یارمەتی بە ناسین و جیاکردنەوەی لێکدانەوە جۆراوجۆرەکان و دژبەیەکەکانی ئەو چەمکە دەکات. شرۆڤەی مێژووی تیۆری چەمکێك، مانا جۆراوجۆرەکانی ئەو چەمکە روون دەکاتەوە و ئەو کارە بۆ خودی ئێمەش کەلێنێکی تیۆری بۆ ناسینی ئەو چەمکە ئاوالا دەکات. بە تاوتوێکردنی تەواوی نەریتی تیۆریی سیاسی لە گۆشەنیگای چەمکێکی تایبەتەوە و بەناسینی کەموکوڕیە

واتاییەکانی رابوردوو، دەتوانین توخمە سەرەکی و دیاریکەرەکانی ئەو چەمکە ئاوێتە بکەین و بە مەعریفە و تێگەیشتنێکی نوێ بگەین.

سەرەڕای ئەوەش، ئەوەی گرنگیەکی زیاتری هەیە ئەوەیە کە تاوتوێکردنی چەمکێك لە بواری مێژووییەوە، ئەو توانایەمان پێدەبەخشێت کە هەڵەی کەسانی پێش خۆمان دووپات نەکەینەوە. کەوابوو، ئەو تاوتوێکردنە مێژووییە یاریدەدەری ئەو چەمکە دەبێت لە پێناو مەبەستە سیاسییەکاندا، چونکە هەرچەندە کۆمەڵگای مەدەنی بووەتە چەمکێکی بنەڕەتی بۆ داڕشتنی گەلاڵە رادیکاڵەکان لە دونیای سەردەمدا، بەڵام تێگەیشتنێکی نوقسان و تەك ڕەهەندی و خەیاڵی لەو چەمکە دەتوانێت فۆرمی سیاسی نالەباری لێبکەوێتەوە. ئەوە بەو مانایەیە کە لە تاوتوێکردنە مێژووییەکەی چەمکی کۆمەڵگای مەدەنیدا نەتەنیا دەبێ بۆچوونەکانی بنیاتنەر و لایەنگرانی کۆمەڵگای مەدەنی، بەڵکو دەبێ بۆچوونەکانی ڕەخنەگرانی کۆمەڵگای مەدەنیش تاوتوێ بکرێت. تاوتوێکردنی مێژوویی چەمکێك وەك کارێکی فیکری و سیاسی بەهایەکی تایبەتی هەیە.

مێژووی ئەو چەمکەی کە لە دێڕەکانی خوارەوەدا باس دەکرێت، دەستەبژێر کراوە و بەهیچ شێوەیەك سەرجەمی تیۆرەکانی تایبەت بە کۆمەڵگای مەدەنی ناگرێتەوە (بۆ راپۆرتێکی مێژوویی گشتیتر چاو لە ٨٢و٨٣و٣١ بکەن). من بە پشت بەستن بەو ئەندێشە بنەڕەتییانەی کە لە پەیوەند لە گەڵ دەوڵەت و کۆمەڵگادا هاتوونەتە ئاراوە، هەوڵم داوە بۆ ئەوەی پەیوەندی و لێکدابڕانەکان لە مێژووی چەمکی کۆمەڵگای مەدەنیدا تاوتوێ بکەم. بەبڕوای من، تاوتوێکردنی کۆمەڵگای مەدەنی تەنیا لە پەیوەند لەگەڵ دەوڵەتدایە کە مانا پەیدا دەکات.

## مێژووی تیۆری:

چەمکی کۆمەڵگای مەدەنی بۆ ماوەیەکی دوور و درێژ، بەشێك بووە لە نەریتی فیکری خۆرئاوا. ئەو نەریتە فیکرییە هاوڕێ لەگەڵ گۆڕانکارییە مادی، سیاسی و فیکرییەکانی کۆمەڵگای خۆرئاوا گۆڕانی بەسەر داهاتووە. ئەو نەریتە فیکرییە لەگەڵ گۆڕانکارییە مێژووییەکانی کۆمەڵگای خۆرئاوادا ــ وەك سەرهەڵدانی بالادەستیی دونیایی و نائایینی، گەشەی خاوەنداریتی تایبەت، سەرهەڵدانی کلتورێکی شارنشینی، داڕمانی دەوڵەتە ملهوڕەکان، سەرهەڵدانی بزووتنەوە دیموکراتیەکانی سەدەی نۆزدەهەم، و دەستوورگەرایی نوێ و سەروەری یاسا ــ پەیوەندییەکی لێك هەڵپێکراوی هەبووە. ئەو نەریتە فیکرییە زیاتر لە

هەموو شتێك پەیوەندیی بە گەشەی ئابووریی سەرمایەداری و لە ئاکامدا جیایی ئابووری لە سیاسەتەوە هەبووە. بەم جۆرە، ئەو نەریتە فیکریە بە بێ هیچ ئەملا و لایەك، پەیوەندیی بە سەرهەڵدان و سەقامگرتوویی سەرمایەدارییەوە هەبووە.

ئەو وتەیەی کین راستە کە دەڵێت، چەمکی کۆمەڵگای مەدەنی "بەر لە سەرهەڵدانی سەرمایەداریش هەبووە و بۆ نموونە لە ئەندێشەی سیاسی چاخی کۆن و ناوەڕاستدا بە باشی پەرەی ئەستاندبوو و گرنگتر لەوەش ئەوەیە کە تەواوی مانا نوێیەکانی سەرەتای ئەو چەمکە، پەیوەندییان بە پرسی سیاسی، چۆنیەتی و باروودۆخی کۆنتڕۆڵ و رەوایی بوونی دەسەڵاتی دەوڵەتەوە هەیە" (٨٣، ل٣-٣٢). بەڵام هەروەك دواتر دەیبینین، بەر لە سەرهەڵدانی کۆمەڵگای بورژوازی، مانای کۆمەڵگای مەدەنی بە وردبینییەکی ئەوتۆ بەکار نەدەبرا. کۆمەڵگای مەدەنی تەنیا کاتێك بوو بە چەمکێکی روون ویەکانگیر کە چوارچێوەی مەدەنی بەباشی خۆی گرت. و پێکهاتنی چوارچێوەی مەدەنیش هەر بەرەنجامی سەقامگیریی سەرمایەداری بوو. ناوەندێتی کۆمەڵگای مەدەنی لەگەڵ سەرهەڵدانی دەسەڵاتی سیاسی گشتی و لەگەڵ ناوەندێتی ژیانی ئابووری لە کۆمەڵگای سەرمایەداریدا پەیوەندییەکی نزیکی هەیە. بە بڕوای بۆبیو، ئەو "زنجیرە فیکرانە هاوکاتن لەگەڵ سەرهەڵدانی جیهانی بورژوازی: ناساندنی مافی سروشتی تاکەکان و گروپە کۆمەڵایەتییەکان بەشێوەیەکی سەربەخۆ لەدەوڵەت و بەشێوەیەك کە دەسەڵاتی سیاسی بەرتەسك بکاتەوە و ناساندنی چوارچێوەیەك لە پەیوەندییەکانی سەروتاکەکەسیەوە وەك پەیوەندییە ئابوورییە خۆبەڕێوەبەرەکان کە رێکوپێك کردنەکەی پێویستی بە هێزێکی زۆرەملێ نییە" (١٥، ل٢٢).

سەرەڕای ئەوەش، ئەو زنجیرە فیکرانە لە نەریتی فیکریی خۆرئاوادا هاوکات بووە لەگەڵ ئەم مەسەلانەی خوارەوە: ناساندنی مافەکانی تاك بە تایبەت مافی خاوەندارێتی تایبەتی، پیرۆزیی ماف و ئازادیە تاکەکەسیەکان، زاڵبوونی بازاڕ، تاکگەرایی، و جیاکردنەوەی بواری تایبەتی لە بواری گشتی. جیاواز لەوەش، ئەو ئەندێشانەی کە ناوبران لەگەڵ دامەزراوە و رێبازە پەرلەمانیەکان و هەروەها لەگەڵ باوەڕهێنان بە پێویستیی کۆنتڕۆڵ و بەرتەسك کردنەوەی دەسەڵاتی دەوڵەتەوە لە پەیوەندی دابوون. هەرکام لە ئەندێشە پەیوەندیدارەکان لە قۆناغە جۆراوجۆرەکانی گەشەی چەمکی کۆمەڵگای مەدەنیدا دەرکەوتوون. هەر کام لەمانە لە سەردەمی مێژوویی جیاوازدا زاڵبوون، بەڵام بەگشتی یاریدەدەری روون بوونەوەی

تایبەتمەندییەکانی شتێك بوون کە دەکرێ ناوی کۆمەڵگای مەدەنی لە سەر دابنێین.[٢٤] لە دێرەکانی دواتردا دەست دەدەینە تاوتوێکردنی ئەو تایبەتمەندییانە.

لە لایەکەوە دەتوانین بڵێین کە چەمکی کۆمەڵگای مەدەنی لە بەرامبەر چەمکی ئەرەستویی **کوینونیا پولیتیکە** (بەمانای گۆمەڵگای سیاسی) دایە. بە بڕوای یۆنانییەکان کۆمەڵگای سیاسی لە سروشتی مرۆڤەکانەوە سەرچاوەی دەگرت، چونکە مرۆڤ "ئاژەڵێکی سیاسی" و لە ناخی خۆیدا بوونەوەرێکی سیاسییە. مرۆڤ بڕوابەخۆبوون و سرووشتی راستەقینەی خۆی لە چوارچێوەی سیاسەتدا بەدەست دێنا و هەر لە بەر ئەو هۆیە چالاکییە ناسیاسییەکان لە پلەی دووهەم دابوون. هەبوونی چوارچێوەیەکی تایبەتی یان نادەوڵەتی کە تێیدا تاکەکان بتوانن واز لە ئەرکە گشتییەکان بێنن یان بتوانن لە رێگای ئەوەوە کۆمەڵگای

---

٢٤ - هەرچەندە مانای کۆمەڵگای مەدەنی لە سەرەتادا زۆر بە وردی دەکار نەدەکرا، بەڵام بە تێپەڕینی زەمەن، دانانی واتای جۆراوجۆر بۆ جیاکردنەوەی کۆمەڵگای مەدەنی لە چەمکەکانی دیکە یارمەتی بە روونتربوونەوەی ئەو چەمکە کرد. لە بەرهەمێکدا سەبارەت بە مێژووی کۆمەڵگای مەدەنی لە نوسینی ئادام فرگۆسن(٤٦)، کۆمەڵگای مەدەنی وەکو یەکێك لە تایبەتمەندییەکانی کۆمەڵگایەکی پێشکەوتوو لە بەرامبەر کۆمەڵگا بەرابییەکاندا هاتۆتە ئەژمار. دواتریش هیگڵ بە شێوەیەکی هاوچەشن رایگەیاند کۆمەڵگا بەرابییەکان لە بوونی کۆمەڵگای مەدەنی بێبەری بوون. بیرمەندانی گرێبەستی کۆمەڵایەتی ــ هۆبز و لۆك ــ یش کۆمەڵگای مەدەنییان لە بەرامبەر دۆخی سروشتیدا دادەنا. بەبڕوای هیگڵ، کۆمەڵگای مەدەنی جیاوازبوو لە کۆمەڵگا و خێزان، ئەوە لە بیردۆزی هیگڵ دابوو کە چەمکی کۆمەڵگای مەدەنی مانایەکی تایبەتی بەخۆیەوە گرت، چونکە بە بڕوای هیگڵ، کۆمەڵگای مەدەنی یەکێك لە تایبەتمەندییەکانی کۆمەڵگای بورژوازیی نوێ بوو. لە زمانی ئەڵمانیدا هاوواتای کۆمەڵگای مەدەنی، burgerliche gesellschaft ە و هەر لە بەر ئەو هۆیە بە بڕوای هیگڵ و مارکس کۆمەڵگای مەدەنی بەمانای کۆمەڵگای بورژواییە. بەڵام ئەوە بە هیچ شێوەیەك وەرگێڕانێکی دەقاودەق نییە، بەڵکو کۆمەڵگای مەدەنی چەشنێکی تایبەت لە کۆمەڵگایە کە بە سەرهەڵدانی سەرمایەداری سەقامگیر دەبێت. بە بڕوای مارکس، کۆمەڵگای مەدەنی بە مانای چوارچێوەیەکی سەربەخۆ لە ئاڵوگۆڕە ئابوورییەکانە کە لە سەر بنەمای کاڵا راوەستاوە، کۆمەڵگای مەدەنی جیاوازە لە کۆمەڵگاکانی پێشووتر کە تێیاندا دەسەڵاتی سیاسی و دەسەڵاتی ئابووری ئاوێتە بوون. بە بڕوای گرامشی، کۆمەڵگای مەدەنی بەمانای چوارچێوەیەکە کە تێیدا دەوڵەت گەلاڵەیەك بۆ سەپاندنی هێژمۆنی خۆی دەخاتەڕوو، کۆمەڵگای مەدەنی یەکێکە لە تایبەتمەندییەکانی دەوڵەتە ئاوێتە و ئاڵۆزەکان لە بەرامبەر دەوڵەتە ساکار و ملهوڕەکاندا.

سیاسی بەرتەسك بكەنەوە، تا رادەیەكی زۆر پێش بینی نەدەكرا. ئەو ئەندێشەیەش لە ئارادا نەبوو كە تاكەكان دەبێ مافی سەربەخۆ و پارێزراویان هەبێت.

ئەو ئەندێشانە لە تیۆری یۆنانیەكاندا بوونی نەبوو، چونكە بە بڕوای ئەوان تاك لە زاتی خۆیدا بەشێك لە پرۆسەیەكی سیاسی بوو كە تاكەكان لە ڕێگای ئەوەوە لێهاتوویيەكانی خۆیانیان وەدی دێنان. مافی سەرەكی تاك بریتی بوو لە بەشداریی لە گوتوبێژەكانی كۆمەڵگایەكدا كە ئەو خودسازیەی وەدی دێنا. ئەو مافە لە ڕاستیدا ئەركێكی مەدەنی بوو.

هەڵبەتە مانای ئەرەستویی "ئاژەڵی سیاسی" لە بنەڕەتدا تایبەتمەندییەكی دەستەبژێرانەی هەبوو: "ئاژەڵی سیاسی"ی ئەرەستو تاكێكی نێرینە، هاووڵاتی و دەوڵەمەند بوو. ئیتر حەشیمەتەكەی دیكە هەر لە ژنانەوە بگرە هەتا كۆیلەكان سەر بە **ئۆیكوس** یان جیهانی تایبەتی بوون. ئۆیكوس بە مانای چوارچێوەی تایبەتی و بەدەر لە كۆمەڵگای سیاسی بوو، بەڵام دژوارە بكرێ وەك فۆرمی بەرایی كۆمەڵگای مەدەنی ناو ببرێت، چونكە ئۆیكوس چوارچێوەیەكی پلە دوو بوو و كەسانێكی لەخۆ دەگرت كە لە تایبەتمەندیەكانی هاووڵاتیی بێبەش بوون. هەروەك دواتر دەبینین، لە فۆرمەكانی دواتردا، كۆمەڵگای مەدەنی خودی هاووڵاتیان دەگرێتەوە و لەجیاتی ئەوەی لە چاو كۆمەڵگای سیاسی، چوارچێوەیەكی پلەدوو بێت، چوارچێوەیەكە كە لەوێدا گرنگترین چالاكییەكانی كۆمەڵگا ڕێكدەخرێن. لە كۆمەڵگای یۆنانیدا هیچ وێنایەك لە ئازادی تاك وەك مافی زاتی و مافێك كە قابیلی لێ سەندنەوەش نییە، لە ئارادا نەبوو، ئەوە لە كاتێكدایە كە ئەو مافە یەكێك لە بەرچاوترین توخمەكانی لێكدانەوە بەراییەكانی كۆمەڵگای مەدەنی بووە.[٢٥]

---

٢٥- جان گری (٦٠) بەو ئاكامە دەگات كە سەرچاوەی ئەندێشەكانی لیبراڵی دەبێ لە جەخت كردنەوەی سوفیستەكانی وەك پروتاگوراس، گورگیاس و دێموكریتوس لە سەر یەكسانی و ئازادی، دا بدۆزرێتەوە. بە بڕوای ناوبراو ئەو مەیلە بوو كە بە باشترین شێوە لە قسەوباسی بەخاك سپاردنی پریكلس دا ڕەنگی دایەوە. گری، ئەفلاتون و تا رادەیەك ئەرەستوشی بە دژە لیبراڵ دەزانی (هەمان سەرچاوە، ل٣-١). كەسانی وەك مەك نینتایر (١٠٦) و لیۆشتراوس (١٧٧) ئەو جۆرە لێكدانەوەیان ڕەتكردەوە. شتراوس باسی ئەوە دەكات كە مافی سروشتی لە سەردەمی كۆندا، لە سەر ئەساسی ئەرك راوەستابوو و بە مانای مافی ئازادیی تاك نەبوو. بەدڵنیاییەوە چەمكی ماف لە سیستەمی سیاسی یۆنانی كۆن دا هیچ جێگایەكی نەبووە. مافە تاكەكەسیەكان لە یۆنان بە هیچ شێوەیەك ــ چ بە شێوەی یاسا یان لە چوارچێوەی دامەزراوەكاندا ــ بنەڕەتی

رۆمەكانیش چالاكیی سیاسیان بە گرنگترین چالاكی تاك و رەمزی خودسازی ئەو دەزانی. بە بڕوای رۆمەكان دەوڵەت بە مانای كۆمەڵگای هاوولاتیان بوو. بەو حاڵەشەوە، بە گەشەكردنی یاسای رۆمی كە گەرەنتی مافی تاكەكەس و بە تایبەت مافی خاوەندارێتی دەكرد، شێوازێكی بەرایی لە لێك جیاكردنەوەی چوارچێوەی تایبەتی لە چوارچێوەی گشتییەوە پێكهات. مافە تایبەتیەكان رووی لە خێزان و بەڵێنەكانی خاوەندارێتی و میرات بوو. لە راستیدا سەرهەڵدانی سیستەمێكی یاسایی تاكگەرایی لە رۆمای كۆندا لەگەڵ چەمكی خاوەندارێتی تایبەتی و مافی پاوانكراوی خاوەندارێتییەوە لە پەیوەندی دابوو (١٨٨). بە بەیاسایی بوونی خاوەندارێتی تایبەتی، هەڵاواردنێكی واتایی لە نێوان لایەنی گشتی ژیانی تاك لە لایەك و پێداویستیە تایبەتیەكانی ئەو ـــ كە ئێستا چوویوە پاڵ مافێكی جیاوازەوە ـــ لە لایەكی دیكەوە، هاتە ئاراوە و ئەو كارە بە فەرمی ناسێندرا كە تاك مافی ئەوەی هەیە ژیانێكی سەربەخۆ لە كۆمەڵگای سیاسی هەبێت. ئەو جیاكردنەوەی بواری تایبەتی لە بواری گشتی، بوارێكی واتایی پێویستی بۆ سەرهەڵدانی مانای كۆمەڵگای مەدەنی دابین كرد.

كۆمەڵگای مەدەنی وەك چەمكێكی بەگشتی نوێ، لە سەدەی حەڤدەوە هەتا سەدەی نۆزدە پێكهات. سەرهەڵدانی ئەو چەمكە بەرەوپێشچوونێكی گرنگ بوو لە بواری مافەكانی تایبەت بە تاك، پەیوەندیی ئەو لە گەڵ دەوڵەت، و پەیوەندیی ئەو لەگەڵ تاكەكانی دیكەی كۆمەڵگا. كۆمەڵگای مەدەنی چەمكێكی نوێیە، چونكە سەرچاوەی لێك جیاكردنەوەی بەرچاوی ژیانی مەدەنی و سیاسی لە یەكترە، ئەو لێك جیاكردنەوەیەی كە دەكرێ بگوترێ لە رابردوودا تا رادەیەكی زۆر نەناسراو بوو. یەكەمین نیشانەكانی ئەو چەمكە نوێیە لە فۆرمەكانی هۆبز و لۆك ـــ بیرمەندانی بەرایی مۆدێرنیتە ـــ دا دەبینینەوە.

سەرەڕای ئەوەش، جیاكردنەوەی كۆمەڵگای مەدەنی لە كۆمەڵگای سیاسی هێشتاش روون نەبوو، چونكە هۆبز و لۆك دوو تایبەتمەندی مەدەنی و سیاسیان لە جیاتی یەكدی بەكار دەبردن: بۆ نموونە، لۆك باسی "كۆمەڵگای سیاسی یان مەدەنی" و رووبەڕووبوونەوەی "دۆخی مەدەنی" و "دۆخی سروشتی" دەكرد (١٠٥، ل٧٨-١٥٤). گومانێك كە لە بەكارهێنانی چەمكی كۆمەڵگای مەدەنی دابوو، بەگشتی بەرەنجامی ئەوە بوو كە ئەو چەمكە بە ئەنقەست

---

نەكرایەوە. و هەروەك هیگڵیش دواتر ئاماژەی پێكرد، یۆنانیەكان لێكدانەوەیەكی ئەوتۆیان لە سەر زەینی تاك نەبوو.

بۆ ئەو مەبەستە دەکار دەکرا کە شێوازێکی تایبەتی لە رێکخراوی کۆمەڵایەتی و سیاسی لە دۆخە سروشتیەکەی جیا بکاتەوە. یەکەم، بە بڕوای ئەو بیرمەندانە، کۆمەڵگای مەدەنی لە بواری واتاییەوە خاڵی بەرامبەری دۆخی سروشتی بوو. دووەم، لە تیۆرەکانی گرێبەستی کۆمەڵایەتیدا، کۆمەڵگای مەدەنی دیاردەیەکی دەسکردە، بەواتایەکی دیکە، ئەوە دۆخی سروشتییە کە چواردەوری سروشتی تاکی گرتوەتەوە و کۆمەڵگای مەدەنی ئەو شتەیە کە دەبێ بونیات بنرێت.

دۆخی سروشتی هەڵقوڵاوی زەینی بیرمەندانی گریبەستی کۆمەڵایەتی بوو. بۆ پیشاندانی ئەوەی کە تاك بەشێوەیەکی ئازادانە دەوڵەت قبوڵ دەکات و هەروەها بۆ نیشاندانی ئەو پرسە گرنگترە کە دەوڵەت بە پێی رەزایەت پێك دێت، بیرمەندانی گرێبەستی کۆمەڵایەتی بیریان لەوە کردەوە کە ئەگەر ویست و حەزەکانی مرۆڤ کۆنترۆڵ نەکرێن، ژیان چی لێ بەسەردێت؟ ئەوان ئەو دۆخەیان نێو لێنا دۆخی سروشتی. بە بڕوای هۆبز، ئەو دۆخە هەم پێش سیاسی بوو و هەم پێش مەدەنی. بە بڕوای ناوبراو تایبەتمەندی ئەو دۆخە، شەڕی هەمووان لە دژی یەکتری بوو. لەو بارودۆخەدا، ویست و حەزە هەوسارپچڕاوەکانی مرۆڤ، مافی ژیانی تاکەکان دەخەنە مەترسیەوە. لە ئاکامدا ئاشتی و تەناهی مادی کاتێك مەیسەر دەبێت کە ویست و حەزی تاکەکان لە لایەن دەسەڵاتدارێکی بەهێزەوە کۆنترۆڵ بکرێت. تاکەکان بۆ گەرەنتی مافی ژیانی خۆیان، واز لە ئازادیە سروشتیەکانی خۆیان دێنن و پێکهێنانی کۆمەڵگایەکی یاسامەند قبوڵ دەکەن. هۆبز ئەو کۆمەڵگا یاسامەند و ئاشتیخوازە کە بە رەزامەندییەوە بونیات دەنرێت، بە کۆمەڵگای مەدەنی دەزانێت. بەم جۆرە، گرێبەستی کۆمەڵایەتی دەبێتە هۆی پێکهاتنی کۆمەڵگایەکی مەدەنی و سیاسی کە هەردووکیان لە بواری واتاییەوە دەکەونە لایەنی بەرامبەری دۆخی سروشتیەوە.

لە لێکدانەوەی لۆك دا، دۆخی سروشتی دۆخێکی توندوتیژ نەبوو، بەڵکو دۆخێکی کۆمەڵایەتی بوو کە پەیوەندییە مەدەنییەکانی نێوان تاکە دەوڵەمەندە ئازاد و سەربەخۆکان لە تایبەتمەندییەکانی ئەو بوو. دۆخی سروشتی وەك دۆخێك کە تێیدا تاکەکان بە پێی یاسای سروشتی هەڵسوکەوت دەکەن، دۆخێکی پێش سیاسی بوو نەك دۆخێکی پێش کۆمەڵایەتی. بەوحاڵەشەوە، بە پێی لێکدانەوەکەی لۆك، ئەگەر ناوەندێکی رێکخستن نەبێت کە بتوانێ گەرەنتی بەکردەوە دەرهاتنی بەڵێن و گرێبەستەکان بکات، پەیوەندیی تاکەکان پێش بینی ناکرێت و لە ئاکامدا مەترسیدار دەبێت. نەبوونی ئاسایشی گیانی و ماڵی بووە هۆی ئەوەی

تاکەکان پەی بە پێویستی هەبوونی ناوەندێکی دادوەری بکەن و لە ئاکامدا دۆخی مەدەنییان پێك هێنا کە تێیدا ئاسایشێکی زۆرتریان هەبێت. لۆك بەڵگەی ئەوەی دێنایەوە کە کۆمەڵگا لە سروشتی مرۆڤەوە دروست دەبێت، بەڵام ئەو کۆمەڵگایە دەبێ لە لایەن بەڵێنە کۆمەڵایەتییەکان و لە لایەن دەوڵەتەوە رێك بخرێت. تەنیا کاتێك کە دەوڵەت و کۆمەڵگای مەدەنی پێك هاتن، ئازادیەکانی دۆخی سروشتیش وەدی دێن. لۆکیش هەروەك هۆبز، لە بواری واتاییەوە دۆخی مەدەنی بە خاڵی بەرامبەری دۆخی سروشتی دەزانی.

کۆمەڵگای مەدەنی و سیاسی کە لە لایەن گرێبەستە کۆمەڵایەتییەکانەوە پێك دەهات، گەرەنتی مەدەنییەتی دەکرد، چونکە ئەم کۆمەڵگایە ـــ بە پێچەوانەی دۆخی سروشتی هەوسارپچڕاو ـــ ئازادییەکی شیاو، ئاسایشی گیانی و ماڵی، و ژیانی عەقڵانی دابین دەکرد. ئێستا تاکەکان دەچوونە نێو رایەڵ و پۆیەکی پەیوەندییە بەردەوامەکانەوە و مافەکانی یەکتریان بە فەرمی دەناسی و رێزیان لێ دەگرتن. بەم جۆرە، کۆمەڵێك پێکهات کە بە تەنیایی کۆمەڵگایەکی سیاسی راستەقینە بوو و تاکەکان تێیدا لە رێگەی بەڵێنە بەرامبەرەکانەوە لە گەڵ یەکتری لە پەیوەندی دابوون. رەزایەت یان گرێبەستی کۆمەڵایەتی هەروەها کۆمەڵگایەکی یاساییشی پێکهێنا کە تێیدا ژیانی تاك، داراییەکان و ئاسایشی ئەو دەپارێزرا. مەدەنییەت یانی رێزگرتنی بەرامبەر لە لایەن دەوڵەتی یاسایی و مافەکانەوە دەپارێزرا. بەم جۆرە، کۆمەڵگای مەدەنی لەگەڵ کۆمەڵگای سیاسی یەکسان بوو، بەڵام کۆمەڵگای سیاسی تەنیا کاتێك دەکرا بوونی هەبێت کە مەدەنییەت لە پەیوەندیی مرۆڤەکاندا لە لایەن گرێبەستێکەوە گەرەنتی دەکرا. لە بەرامبەردا، مەدەنییەتیش تەنیا لە رێگای باڵادەستیی سیاسییەوە دەپارێزرا.

جەخت کردنەوەی هەر دوو بیرمەندەکە کە لە سەر پێکەوە هەڵکردنی کۆمەڵایەتی و سیاسی دارێژراوە، دەرخەری ئەوەیە کە تێپەڕین لە دۆخی سروشتی یان **سوکیەتاس ناتۆرالس** (کە تاکەکان تێیدا ئازاد و یەکسان بوون)ەوە بەرەو کۆمەڵگای مەدەنی یان **سوکیەتاس کیویلیس** (کە تاکەکان تێیدا ئازادانە هێندێك بەربەستیان بۆ ئازادیی خۆیان قبوڵ کردبوو)، کارێکی لۆژیکی و تەنانەت پێویستیش بوو. بە پێچەوانەکەی تاکەکان دەبوایە بەهایەکی قورس بدەن. ئەگەر ئەو رێسا و بەربەستانە پێك نەهاتبانایە، لاوازی و گومان زاڵ دەبوو. تاکەکان یان دەبوایە ئازادی رەها بەڵام نادڵنیای دۆخی سروشتیان هەڵبژاردبایە و یان ئازادی بەرتەسك بەڵام دڵنیای کۆمەڵگای مەدەنی. ئەوان راشکاوانە ئەوەی دووهەمیان هەڵبژارد.

ئێستا، لەو رووەوە کە بیرمەندانی گرێبەستی کۆمەڵایەتی، کۆمەڵگای مەدەنییان بە خاڵی بەرامبەری دۆخی سروشتی دەزانی، کۆمەڵگای مەدەنی و کۆمەڵگای سروشتیان ئاوێتەی یەکتری دەکرد. بە بڕوای ئەوان، تاکەکان هەرکە لە دۆخی سروشتی هاتنە دەرەوە، دەچنە نێو هەردووك کۆمەڵگای مەدەنی و سیاسییەوە. ئاوێتەبوونی کۆمەڵگای مەدەنی و سیاسی لە بەرهەمەکانی بیرمەندانی دیکەشدا دەبینرێن. بۆ نموونە، بۆدن دەیگوت کە "دەوڵەت، کۆمەڵگای مەدەنییە". و ئیمانوێل کانتیش دەیگوت: "مرۆڤ دەبێ لە دۆخی سروشتی کە تێیدا هەموو کەس پەیڕەوی لە حەز و ویستەکانی خۆی دەکات، بێتە دەرێ و بە ئەوانیترەوە پەیوەست بێت... ملکەچی بەربەستێکی یاسایی دەرەکی و گشتی بێت... و بەواتایەکی دیکە دەبێ لە قۆناغی یەکەمدا بچێتە ناو بارودۆخێکی مەدەنییەوە" (١٥، ل٣٥).

پرسیەکی دیکە ئەوەیە کە لە تیۆرەکانی گرێبەستی کۆمەڵایەتیدا، کۆمەڵگای مەدەنی وەك خاڵی بەرامبەری دۆخی سروشتی، چەمکێکی هەڵبەستراوە. لە تیۆری لۆك دا کۆمەڵگا لە سروشتی مرۆڤەوە سەرچاوە دەگرێت، بەڵام کۆمەڵگا بۆ ئەوەی بەردەوام بێت دەبێ کۆمەڵگایەکی مەدەنی بێت، یانی کۆمەڵگایەك کە لە سەر بنەمای مەدەنییەت و کردەوەی بەرامبەر راوەستاوە. کۆمەڵگایەکی یاسامەند کە تێیدا تاکەکان، بەربەستەکانی سەر رێگای مافەکانی خۆیان قبوڵ دەکەن، و بارودۆخێکی سیاسی کە تێیدا تاکەکان پەیڕەوی یاسای مەدەنییەت و بەڵێنی بەرامبەر دەبن، شتێکە کە دەبێ بە ئاگاییەوە پێك بێت. بەم جۆرە، چەمکی ئەرەستویی **کوینونیا پولیتیکە** (یان کۆمەڵگای سیاسی) بە تەواوی پێچەوانە دەبێتەوە. بە بڕوای یۆنانیەکان، کۆمەڵگای مەدەنی/سیاسی، شتێکی سروشتی بوو، چونکە:

بە تەواوەتی لەگەڵ سروشتی کۆمەڵایەتی مرۆڤ (ئاژەڵی سیاسی) دەهاتەوە. بەڵام هەر ئەو کۆمەڵگا مەدەنییە بە بڕوای هۆبز (لەبەر ئەوەی کە خاڵی بەرامبەری دۆخی سروشتییە و لە رێگەی رێککەوتنی تاکەکانەوە بۆ چوونەدەر لە دۆخی سروشتی پێك دێت) کۆمەڵگایەکی بونیات نراو یان هەڵبەستراوە. (١٥، ل٣٥).

کەوابوو، قبوڵی ئەو کارە کە تاکەکان بە ئەنقەست کۆمەڵگایەکی مەدەنی و کۆمەڵگایەکی سیاسی پێکدێنن، ئاکامی گرنگ و دیاریکراوی هەیە. لە تێگەیشتنی ئەرەستو لە **کوینونیا پولیتیکە**، پێداویستیەکانی تاك لە بەرامبەر کۆمەڵگای سیاسیدا کەمن، چونکە هۆگریەکان و حەزەکان و عەقڵ و بیری مرۆڤ بە شێوەی سروشتی دەبێتە هۆی سەرهەڵدانی کۆمەڵگایەکی سیاسی. بەڵام کاتێك کە تاکەکان بەشێوەی ئازادانە و وشیارانە کۆمەڵگایەکی

دەستکرد بونیات دەنێن، لەو حاڵەتدا ئەوان لە پێداویستیەکانی سەربەخۆ لەو کۆمەڵگایەش کەڵك وەردەگرن. رازی بوونی تاکەکان ئەو گرنگیەی هەیە کە توانایی کەسانێك دەردەخات کە رازی دەبن. لە تیۆرەکانی گرێبەستی کۆمەڵایەتیدا تاك تایبەتمەندییەکی عەقڵانی هەیە و دەتوانێت پەی بەو پرسیە بەرێت کە ئەگەر یاسا باوەکان نەبن، پەیوەندیی نێوان مرۆڤەکان لاواز دەبێت و ئاسایش نامێنێت. رازیبوون، دەسەڵاتێکی سیاسی و کۆمەڵایەتی بە تاك دەبەخشێت، چونکە وردبینی و یەکسانیی سیاسی پێدەبەخشێت. لەوەش گرنگتر ئەوەیە کە، پێکهێنانی کۆمەڵگایەکی مەدەنی/سیاسی دەستکرد دەبێتە هۆی ئەوەی ئەو تاکانەی کە رازی بوون، تا رادەیەك کۆنترۆڵیان بە سەر ئەو شتە دەسکردەی خۆیاندا هەبێت. هەر بۆیەش دەتوانن کۆنترۆڵیان بە سەریدا هەبێت چونکە تاك بە پێی یاسای سروشتی، مافی سروشتیی خۆی هەیە.

بیرمەندانی گرێبەستی کۆمەڵایەتی گۆڕانکارییەکی یاسایی گرنگیان پێك هێنا. ئەوان مافی سروشتی دەسەڵاتیان لە دەسەڵاتدار وەرگرتەوە و مافی سروشتییان بە پێی یاسای سروشتی بە تاکەکان بەخشی. ئەوان ئەو مافە سروشتیانەیان بە هەتاهەتایی و نەگۆڕ دەزانین و پێیانوابوو کە قابیلی راگواستن نین. لە هەر کۆمەڵگا و بارودۆخێکدا، تاکەکان بەهۆی مرۆڤ بوونی خۆیانەوە ئەو مافانەیان هەبوو. ئەو کارە پێشهاتێکی گرنگی بۆ چەمکی کۆمەڵگای مەدەنی بەدواوە بوو. تاکەکان بە دەستی بەتاڵەوە نەدەهاتنە نێو کۆمەڵگای مەدەنییەوە، بەڵکو لەگەڵ خۆیان ئەو مافانەشیان دێنا. یەکێك لەو مافانە، مافی دیاریکردنی شێوازی حکومەتی خۆی بوو. بەڵام لەوەش گرنگتر، کاتێك حکومەت پێکهات، ئەرکی حاکم ئەوە بوو کە بارودۆخی پێویست بۆ وەدیهاتن و بەردەوامبوونی مافی تاکەکان دابین بکات. لە راستیدا، ئامانجی گرێبەستی کۆمەڵایەتی، پێکهێنانی کۆمەڵگایەك بوو کە تێیدا مافەکانی تاك بتوانرێت لە رێگای بەڵێنێکی بەرامبەرەوە بپارێزرێت و وەدی بێت. بەم جۆرە، ئەو مافە دەسەڵاتی حاکمی سنووردار کردەوە. نەتەنیا ئەو دەوڵەتە مەرجدارەی کە بە پێی لێکدانەوەی لۆك لە لایەن تاکەکانی خاوەن مافەوە پێکدەهات، بەڵکو دەوڵەتێکی بەهێزیش کە بە پێی لێکدانەوەی هۆبز، لە لایەن تاکەکانەوە پێك دەهات، ئاستەنگی خۆیانیان هەبوون. ئەو دەوڵەتانە لە رێگای مافە سروشتیەکانی تاکەکانەوە بەرتەسك دەکرێنەوە. بەواتایەکی دیکە پاراستنی مافی تاکەکان بوو بە ئەرکی دەوڵەت و بەم جۆرە هەندێك ئاستەنگی بۆ دەوڵەت دروست کرد.

هەڵبەتە ئەو ئاستەنگیانە لە تیۆر لۆك دا تۆزێك زیاترن. ناوبراو کەهەر خێرا دوای "راپەڕینی بەشکۆی" ساڵی ١٦٨٨، بۆچوونەکانی خۆی دەنووسینەوە، مافی جۆراوجۆری ــــ بۆ وێنە مافی خاوەندارێتی و راگواستنی کەلوپەلەکان و مافی ئازادی ــ بۆ تاك دانا. بە بڕوای لۆك تاکەکان، بۆ پاراستن و وەدیهێنانی ئەو مافانە دەچنە نێو کۆمەڵگای مەدەنییەوە. لۆك ــ دوای ئەویش هیگڵ ــ لە سەر ئەو باوەڕە بوو کە ئەو مافانە تەنیا لە کۆمەڵگایەکدا دەپارێزرێن کە ئەو مافانەی بە فەرمی ناسیوە و پشتیوانەیەکی یاساییش بۆ ئەوان دابین بکات. ئەو مافانە لە رێگای گەرەنتیە سیاسی و کۆمەڵایەتییەکانەوە دەستیان بە پیرۆزیی ئەخلاقی و یاسایی رادەگات. کەوابوو، دەوڵەتی جێی پەسندی لۆك هەر لە هەمان سەرەتاوە دەوڵەتێکی مەرجدارە.

بەڵام تەنانەت هۆبزیش بە پێچەوانەی راڤە باوەکان، کۆمەڵێك ئاستەنگی بۆ دەوڵەت لەبەرچاو گرتوون. ئەگەر وردتر کتێبەکەی ئەو بخوێنینەوە، دەتوانین ئەو ئاستەنگانە دیاری بکەین. بە بڕوای هۆبز، تاك لە دوو بواردا مافی هەیە کە دەوڵەت دەبێ رێزیان لێ بگرێت. یەکێکیان ئەوەیە کە دەوڵەت ناتوانێت مافی ژیانی تاك پێشێل بکات. هۆبز دەنووسێت: "ئاکامی ملکەچی، پاراستنە" (٧٣، ل٢١٢). بە بڕوای هۆبز، مافی ژیان نەتەنیا مافی زیندوو مانەوە بەڵکو مافی دەست پێڕاگەیشتن بە ئامرازەکانی دابینکردنی بژیو لەوانە دەست پێڕاگەیشتن بە مەوادی خۆراکی و ئاو و دەواودەرمانیش دەگرێتەوە.

ئەگەر حاکم بە کەسێك ــ هەرچەندە بە شێوەیەکی دادوەرانەش سزا درابێت ــ فەرمانی ئەوە بدات کە خۆی بکوژێت، یان خۆی بریندار و نوقسان بکات، یان لە بەرامبەر پەلامار و زیانی ئەوانیتردا خۆڕاگری نەکات، یان لە خواردن، هەوا، دەوا و دەرمان و یان هەرشتێکی دیکە کە بۆ زیندوومانەوە پێویستە، خۆی ببوێرێت، ئەو تاکە دیسانەوە مافی سەرپێچی هەیە.

ئەگەر تاکێك سەبارەت بە تاوانێك کە تووشی بووە، لە لایەن حاکم یان نوێنەری ئەوەوە لێپێچینەوەی لەگەڵدا بکرێت، ئەو تاکە بە بێ دڵنیابوون لە عەفو و بەخشش ناچار نییە دان بە تاوانەکەی خۆیدا بنێت، چونکە ناکرێ هیچ کەسێك... بە رێککەوتن و بەڵێندان رازی بەوە بکەی کە خۆی تاوانبار بکات. (هەمان سەرچاوە، ل١٠-٢٠٩).

ئەو مافە تایبەتیە، ئاستەنگی نەرێ یان پۆزەتیڤ بۆ دەسەڵاتی حاکم پێك دێنێت.

بە بڕوای هۆبز، تاکەکان مافێکی نگەتیڤیشیان هەیە، یانی ئەو مافانەی کە لە کاتی بێدەنگ بوونی یاسادا بەتاك دەدرێن: "ئازادیەکانی دیکە پەیوەندییان بە بێدەنگی یاساوە

هەیە. لەو بوارانەدا کە حاکم هیچ یاسایەکی دیاری نەکردوە، تاك سەربەستە لەوەی کە چی پێ خۆش بوو بیکات" (هەمان سەرچاوە، ل۲۱۱). لە هەمووانیش گرنگتر ئەوەیە کە بە بڕوای هۆبز، گوێڕایەڵیش سنوورێکی هەیە: "گوێڕایەڵی پێڕەوان بۆ حاکم تەنیا تا کاتێك درێژەی دەبێت کە هێشتا حاکم هێزی پێویستی بۆ پاراستنی پێڕەوانی خۆی هەیە، چونکە تاکەکان بە شێوەی سروشتی مافی ئەوەیان هەیە کە پارێزگاری لە خۆیان بکەن و کاتێك کە هیچکەسی دیکە ناتوانێت پارێزگاریان لێ بکات، ئەو مافە بە هیچ بەڵێن و گرێبەستێك بە کەسانی دیکە ناسپێردرێت" (هەمان سەرچاوە، ل۲۱۲).

کین دەڵێت، "بە دڵنیاییەوە هۆبز لایەنگری بەکارهێنانی **سەرەڕۆیانەی** دەسەڵات نەبوو، بە بڕوای ئەو حاکم هەمیشە دەبێ دەسەڵاتی خۆی بە پێی (یاسا سروشتی)ە گشتییەکان بەکار بێنێت، ئەو یاسایانەی کە پێشێلکردنی ژیان و ئەستاندنەوەی ئامرازەکانی دابینکردنی بژێوی ژیان تاوانبار دەکەن. وە ئەوەش راستە کە هۆبز پێداگری لە سەر بوارێکی تایبەتی لەنێو کۆمەڵگای مەدەنیدا کرد، چوارچێوەیەك کە تاکەکان تێیدا دەتوانن هەندێك لە ئازادیە نیگەتیڤەکان لەوێدا بەکردەوە دەربێنن." (۸۳، ل۳۸). سەرەڕای ئەو لێکدانەوانە، کین بەو ئاکامە دەگات کە ئەو ئاستەنگای دەسەڵات، زیاتر شتێکی رواڵەتین نەك راستەقینە. بە بڕوای کین، هۆبز دڵی بە دەوڵەتێکی ئاسایشی خۆش کردوە.

کین بەهایەکی ئەوتۆ بەو ئاستەنگانە نادات کە بنەمای گرێبەستی کۆمەڵایەتی و یاسا سروشتیەکان بۆ "مرۆڤی دەسکرد" پێکی دێنن. لە لایەکەوە دەکرێ بگوترێت کە چونکە تاکەکان بۆ پێکهێنانی دەوڵەتێك لە دەوری یەکتری کۆ دەبنەوە، خودی ئەو کارە نیشانەی کۆمەڵێك چاوەڕوانی تایبەتە سەبارەت بە ئەرکەکانی حاکم. لە روانگەی بیرمەندانی گرێبەستی کۆمەڵایەتییەوە، ئەرکی حاکم پێکهێنانی کەشێکی یاسامەندە بۆ وەدیهێنانی راستەقینەی مافە سروشتیەکان. ئێستا لەو رووەوە کە ئەو مافانە ئەوەندە گرنگن کە تاکەکان بۆ وەدیهاتنیان چاوپۆشی لە ئازادیەکانی دیکەیان دەکەن کە لە دۆخی سروشتیدا هەیانبوە، کەوابوو حاکم دەبێ رێز لەو مافانە بگرێت. ئەو مافانە لە پێشەوەی دەوڵەتن و هەر لە بەر ئەو هۆیە دەبێ رێزیان لێ بگیرێت. وە ئەگەر دەستدرێژی بکرێتە سەر ئەو مافانە، دەکرێ ئەوان لە دژی دەوڵەت بەکار ببرێن. لە راستیدا مافەکانی تاك بوونەتە ئەرکی حاکم و دەسەڵاتی حاکم بەرتەسك دەکەنەوە. دەوڵەتی پارێزراوی هۆبز بەهیچ شێوەیەك دەوڵەتێکی سەرەڕۆ نییە، بەڵکو دەوڵەتێکی سنووردارە.

ناوێتـەکردنی کۆمـەڵگای مـەدەنی و کۆمـەڵگای سیاسـی لـە تیۆرەکـانی گرێبەسـتی کۆمەڵایەتیدا بـە ئاشـکرا دەبینـدرێ، چـونکە کۆمـەڵگای مـەدەنی و کۆمـەڵگای سیاسـی هەردووکیان لە لایەنی بەرامبەری دۆخی سروشتیدان و کۆمـەڵگای مـەدەنیش لـە بەرامبـەر کۆمەڵگای سیاسـیدا نییـە، بـەڵکو لەگەڵیشـی دەگونجێـت. لـەو تیۆرانـەدا، جیاکردنـەوەی کۆمەڵگای مەدەنی لە کۆمەڵگای سیاسی، شێوازێکی راشکاوانەی نییە، چـونکە تـاك مـافی سەربەخۆ لە حاکمی هەیە. تاکی خاوەن ماف لـە کەشـێکدا بەسـەر دەبـات کـە تـا رادەیـك سەربەخۆ لە دەسەڵاتی سیاسییە. ئەو کەشـە، کۆمـەڵگای مەدەنییـە. ئاشـکرایە کـە بـە چ شێوەیەك دەسـەڵاتی سیاسی لـە بـواری مـەدەنی کـە کەشـی تایبـەتی ئـەو مافانەیـە، جیـا دەبێتەوە. ئەو شـتەی کـە لـە نێـوان دۆخـی سروشـتی، پێکهێنـانی کۆمـەڵگای مـەدەنی و کۆمـەڵگای سیاسـی، و جیاکردنـەوەی لاوەکـی یـان بـە ئامـاژەی کۆمـەڵگای مـەدەنی لـە کۆمەڵگای سیاسی، پەیوەندییەك دادەمەزرێنێت، چەمکی مافە سروشتییە هەتاهەتاییەکان و ئەو مافانەن کە قابیلی ئەستاندنەوە نین. لە ئاکامدا کۆمەڵگای سیاسی لە لایەن کۆمـەڵگای مەدەنییەوە بەرتەسك دەکرێتەوە. کۆمەڵگای مەدەنی کەشی هاووڵاتیانی خـاوەن مافـە. بـەم جۆرە، وێناکردنی دۆخی سروشتی کە هەڵقوڵاوی زەینی بیرمەنـدانی گرێبەسـتی کۆمەڵایـەتی بوو، دوو رۆڵی گێڕا: لە لایەکەوە پێویستیی هەبوونی حـاکمێکی بـەهێزی پاسـاو کـرد و لـە لایەکی دیکەشەوە لە رێگای مافە سروشتیەکانەوە، هەندێك ئاستەنگی بۆ ئەو حاکمە بەهێزە پێکهێنا.

هەرچـەندە نـاکرێ بـە تـەواوەتی بیرمەنـدانی گرێبەسـتی کۆمەڵایـەتی وەك بیرمەنـدانی کۆمەڵگای مەدەنی هەژمار بکرێن، بەڵام ناوەرۆکی زۆربەی فۆرمە لیبراڵیەکانی دواتر لە مەڕ کۆمەڵگای مەدەنی، بە شێوەیەکی سەرەتایی لە تیۆرەکانی گرێبەستی کۆمەڵایەتیـدا بەرچـاو دەکەون. یەکێك لەو ناوەرۆکانە، چەمکی تاکێکی خۆویستە کـە بەشـوێن بەرژەوەندییـەکانی خۆیدا دەگەڕێت. لە راستیدا مەك فرسون لە سەر ئەو باوەڕەیە کە هۆبز یەکـەمین و دیـارترین وتەبێژی تاکگەراییی نوێ بووە (١٠٧). و تاکگەرایی شتێك بوو کە بـوو بـە پـێش گریمانـەی بنەڕەتیی ئەندێشەی کۆمەڵگای مەدەنی، چونکە چەمك، سـەربەخۆیی، و باڵادەسـتیی تـاکی عەقڵانی و بیرمەندن کە بنەمای داخوازیەکانی سەربەخۆبوون لە دەوڵەتیان پێك دێنا.

ناوەرۆکێکی دیکەی، ئەو ئەندێشەیە بوو کە تاك مافێکی هەیە کـە ئـەو مافـە هـەم لـە پێشەوە و هـەمیش سـەربەخۆ لـە دەوڵەتـە. لێـرەدا گـرنگترین پـرس، ئەندێشـەی پیرۆزیـی

خاوەندارێتی تایبەت بوو کە لۆك ئاماژەی پێکردبوو. لە راستیدا لۆك پرسیەکی هێنایە ئاراوە کە بوو بە یەکێك لە بنەما سەرەکییەکانی لیبرالیزم: پێکهاتەی هەرچەشنە ئازادییەك لە مافی خاوەندارێتی و راگواستنی ئامرازەکانەوە پێك دێت. مافی خاوەندارێتی لەگەڵ ئازادی یەکسان بووە و لە راستیدا بوو بە پێکهاتەی هەرچەشنە مافێك.

سێیەمین ناوەرۆکێك کە بیرمەندانی گرێبەستی کۆمەڵایەتی بە ئەندێشەی کۆمەڵگای مەدەنیانەوە زیاد کرد، ئەو ئەندێشەیە بوو کە پەیوەندیی تاکەکان لەگەڵ یەکتری و پەیوەندیی تاکەکان لەگەڵ دەوڵەت، پەیوەندییەکی گرێبەستییە. ئەوان شێوەکارێکیان بۆ پێکەوە هەڵکردنی کۆمەڵایەتی نێوان تاکەکان و نێوان تاك و دەوڵەتدا پێشکەش کرد.

چوارەمین یارمەتیی بیرمەندانی گرێبەستی کۆمەڵایەتیش هێنانەئارای چەمکی حکومەتێکی سنووردار بوو، حکومەتێك کە لە لایەکەوە بەو کارە بەرتەسك دەکرایەوە کە خولقێنەری دەستی مرۆڤ بوو و لە لایەکی دیکەشەوە بەهۆی ئەوەکە ئەرکی سەرەکیی ئەو پاراستنی مافێك بوو کە تاك ئەوانی لە دۆخی سروشتییەوە لە گەڵ خۆی هێنابوو. بیرمەندانی سەرەتای مۆدێرنیتێ لە لایەکەوە بە کردنی تاك بە گرنگترین تۆخمی گوتاری سیاسی و لە لایەکی دیکەشەوە بە هێنانەئارای ئەو ئەندێشە کە چوارچێوەی مەدەنی مەڵبەندی هاووڵاتیانی خاوەن مافە، چوارچێوەی پێویستی بۆ گوتارێك دابین کرد کە پێشێتییەکی بۆ تاك داناوە و باوەڕی بە توانایی ئەو لەمەڕ دیاریکردنی چارەنوسی خۆی هەبوو. تیۆر سیاسی لە فۆرمی نوێخوازانەی ئەودا چەمکی دەوڵەتی وەك خاوەنی هەموو مافەکان رەتکردەوە و ئەو مافانەی راگوێزی تاك کردنەوە و بیرمەندانی گرێبەستی کۆمەڵایەتی یەکەمین بنەمای ئەو فۆرمانەیان دەرخست.

سەرەڕای ئەوەش، تیۆری بناغەدارێژەرانی گرێبەستی کۆمەڵایەتی لە بواری مێژووییەوە کۆمەڵێك کەموکوڕی هەیە. هۆبز و لۆك لە جیاتی تیۆری یاسای خواوەندی زاڵ، تیۆری یاسای سروشتییان هێنایە ئاراوە، بەڵام تاکی حاکم لە چەقی تیۆرەکەی ئەواندا مایەوە. بە بڕوای ئەوان کۆمەڵگا توانای بەڕێوەبردنی خۆی نەبوو و لە راستیدا سەرهەڵدان و مانەوەی کۆمەڵگا بەسترابووەوە بە لڤیاتان و حاکمەوە. بیرمەندانی گرێبەستی کۆمەڵایەتی بەئاشکرا لە مەڕ توانایی خۆبەڕێوەبەریی کۆمەڵگا رەشبین بوون. لە راستیدا، پێویستیی هەبوونی دەوڵەتێك وەك دەسەڵاتێکی سیاسی رێکخراو، لە رەخنەی قوڵی کۆمەڵگاوە سەرچاوە دەگرێت. بە بێ هەبوونی حاکمێکی بەهێز، کۆمەڵگا تووشی بشێوی و کێشمەکێش دەبێت. تاکەکانی ئەو

کۆمەڵگایە پەیڕەوی گەلالەیەکی خودسازیی بەربلاو بە واتا هیگلیەکەی ـــ یانی تێپەڕین لـە بەرژەوەندییە بەرتەسکەکان بەرەولای بەرژەوەندییە گشتییەکان ـــ نین. "هۆبز... هیچ چەشنە چاوەڕوانییەکی ئەخلاقی یان عەقلانی گەورەی لە مەڕ کەڵك وەرگرتنی تاکـەکان لـە ئـازادیی خۆیان لە زەیندا نەبوو" ( ٥٢، ل٤٤). بیرمەندانی گرێبەستی کۆمەڵایەتی، تاکی گۆشەگیریان هێنایە ناو کۆمەڵگاوە، بەڵام واتادان سـەبارەت بـەو گەلالەیـە یـانی سـەبارەت بـەتوانایی و ناوەرۆکی خودی کۆمەڵگا بە لیبراڵەکانی دواتر سپێردرا.

هەرچەندە بیرمەندانی گرێبەسـتی کۆمەڵایـەتی ناسـاندنێکی عـەقلانی و رازیکەرانـەیان سەبارەت بە دەوڵەت و کۆمەڵگا هێنایە ئـاراوە، بـەڵام هەوڵـەکانی ئـەوان تایبەتمەندییـەکی تاکەکەسی هەبوو. دەکرێ چۆنیەتی پێناسەکردنی یاسای سروشـتی و مافـە سروشـتیەکان بـە یەکەمین وگرنگترین پرس لە تیۆرەکانی گرێبەستی کۆمەڵایەتیدا بزانین. بە بڕوای هۆبز و لۆك، مافە سروشتیەکان لە یاسـا سروشـتیەکانەوە سەرچـاوەیان دەگـرت. و بـە پێـی لێکدانـەوەی ژمارەیەك کەسی وەك جان دان (٤٠)، بە بڕوای لۆك، ئەو یاسا سروشتیە جیلوەیەك لـە زاتـی خواوەندی بوو. جان گری بە قبوڵکردنی ئەو راڤەیە دەنووسێت:

بەبڕوای لۆك، مافە سروشتیەکان گەرەنتی بارودۆخێك دەکەن کە بە پێی یاسـا سروشـتیەکان بـۆ پاراسـتنی ژیانمـان پێویسـتیمان پێیانـە. بـە پێـی ئـەو یاسـایانە، ئێمـە مـافی ئـازادی و خاوەندارێتیمان هەیە و هیچ کەس ناتوانێ پێشێلیان بکات، بەڵام چونکە ئێمـە سـەر بـەخواین، ئێمە ناتوانین بەتەواوەتی و بۆ هەمیشە دەستبەرداری ئازادی و خاوەندارێتی خۆمان بین... یان بە خۆکوشتن کۆتایی بە ژیانمان بێنین... ئەو دەزگا فیکریە کە تێیدا مافە لیبراڵیەکانی خاوەندارێتی لە چوارچێوەی خواناسیی مەسیحیدا رەوایی پێـدەدرێت، لـە بـەریتانیا هـەتا سـێ سـەدە دوای بڵاوبوونەوەی بەرهەمە سیاسییە سەرەکییەکانی لۆك، ناوێتەی لیبراڵیزم بوو (٦٠، ل١٢).

بیرمەندانی یاسای سروشتی لە سەر ئەو باوەڕە بوون کە بەو ئەندێشەوە دەکرێ بەرامبەرکێ لەگەڵ پاشایەتیی رەهادا بکرێت کە تاکەکان بە پێی یاسای سروشتی مـافی تایبـەت بـەخۆیان هەیە، و ئەو یاسا سروشتیانە لانیکەم بە بڕوای لۆك، شتێکی خوایی بوون. بـەڵام بیرمەنـدانی یاسای سروشتی ئەو یاسایانەیان بە شتێکی "بەڵگەنەویست و سەلمێنراو" دەزانین. ئەو یاسایە تایبەت بە کۆمەڵگایەکی تایبەتی نەبوو و بەشێك لە مرۆڤایەتی هـەر تاکێـك بـوو. رەوایـی بوونی چەمکی یاسای سروشتی لە ئیمانێکی بێ ئـەملا و ئـەولا بـە چەشـنە فێرخوازییـەکی

نامێژوویی سەبارەت بە یاساکانی سروشت سەرچاوە دەگرێت. چەمکەکانی یاسا و مافەکان، چەمکێکی دڵخوازن، چونکە خولقاوی زەینەکانن.

تیۆرەکانی گرێبەستی کۆمەڵایەتی لە لایەکی دیکەشەوە تایبەتمەندییەکی تایبەت و دڵخوازانەیان هەبوو. پێویستیی هەبوونی کۆمەڵگای مەدەنی و دەوڵەت لە گریمانە و تێگەیشتنێکی تیۆری لە ناخی مرۆڤەوە سەرچاوەی دەگرت و ئەو تێگەیشتنە لە تیۆرەکەوە بۆ تیۆرەکی دیکە جیاوازی هەبوو. باوەڕ بە بنەچەی خواوەندیی ئەو یاسایە و باوەڕ بە کۆمەڵگا و دەوڵەتێکی دەستکرد و خۆکرد، ماوەیەك دواتر سەبارەت بە گەشەی کۆمەڵگا مرۆڤایەتیەکان جێگاکەی خۆی بە ناساندنە "زانستی"یەکان بەخشی و "زانست" جێگای فەلسەفەی تیۆری گرتەوە کە تێیدا چەمکی یاسای هەتاهەتایی و نەگۆڕی خوایی جێگای نەبوو.

سەرەنجام ئەو لێکدانەوە تایبەتە لەمەڕ پێکهاتەی دەوڵەت و پێکهاتنی کۆمەڵگا نەتەنیا تێگەیشتنێکی تاکەکەسی و دڵخوازانە بەڵکو نامێژووییش بوو. ئەو تێگەیشتنە لەو رووەوە نامێژوویی بوو کە ئەو دەوڵەت و کۆمەڵگایەی پێك دەهات، لە بواری زەمەن و جێگاوشوێنەوە جێگایەکی دیاری نەبوو. دەرخستنی مێژوویی دەوڵەت و کۆمەڵگای مەدەنی، پێویستیی بە تێگەیشتنێکی وردتر هەبوو، ئەو تێگەیشتنەی کە لە بواری مێژووییەوە بتوانێت دەوڵەتەکان لە هەناوی کۆمەڵگاکاندا جێ بکاتەوە. ئەو تێگەیشتنە بۆ تاوتوێکردنی گەشەی کۆمەڵگا و دەوڵەتە جۆراوجۆرەکان و دەرخستنی جیاوازیەکانیان پێویست بوو. ئەو تێگەیشتنە کە هەم وردتر بوو و هەمیش سەرنجی لایەنە مێژووییەکەشی دەدا، لە لایەن ئابووریی سیاسیی کلاسیکەوە هاتە ئاراوە. هەربەوچەشنەی کە دواتر دەیبینین، ئابووریی سیاسیی کلاسیك، زانستی لە جیاتی فەلسەفەی تیۆر، ئەندێشەی خۆبەڕێوەبەریی کۆمەڵگای لە جیاتی ئەندێشەی پێکهاتنی کۆمەڵگا لە لایەن دەوڵەت، و ئەندێشەی پەیوەندیی مافەکانی تاك بە رادەی گەشەی مێژوویی کۆمەڵگای لە جیاتی ئەندێشەی پەیوەندی مافەکانی تاك بە یاسایەکی سروشتیی هەتاهەتایی و جیهانی دانا.

## ئابووریی سیاسیی کلاسیك و کۆمەڵگای مەدەنی:

رێبازی ئابووریی سیاسیی کلاسیك کە لە سەدەی هەژدەدا سەریهەڵدا،[26] بەرهەمی سەردەمی رۆشنگەری بوو و هەر لە بەر ئەو هۆیە سەرجەم پێناسە باوەکانی سەبارەت بە دەوڵەت و کۆمەڵگای تووشی ململانێ کرد. کلارك دەڵێت:

"بزووتنەوەی رۆشنگەری" راشکاوانە بنەما بنەڕەتیەکانی رەوایی سیاسی و ئەخلاقی لە سیستەمی رەهادا بردە ژێر پرسیارەوە. (بزووتنەوەی رۆشنگەری) لە جیاتی خواوەند، عەقڵ و سروشتی وەك بنەمای رێنوێنیکەری سیستەمی ئەخلاقی و کۆمەڵایەتی و سیاسی لە قەڵەم داوە، لە جیاتی پەیامی ئیلاهی، لێکۆڵینەوەی زانستی بە سەرچاوەی راستیەکان زانیوە و لە جیاتی قەشە، فەیلەسوف و بیرمەندەکانی بە سەرچاوەی دیاریکردنی راستی و ناڕاستی دانا (٢٨، ل١٤).

بزووتنەوەی رۆشنگەری بە ئیمان بە عەقڵی مرۆڤ و بە پشت بەستن بە یاسامەندیی جیهانیی کۆمەڵایەتی هەروەك جیهانی فیزیکی، ژیانی کۆمەڵایەتی بە شتێکی سەربەخۆ لە زەین و ئەندێشەی مرۆڤ هێنایە ئەژمار. بە بڕوای بیرمەندانی رۆشنگەری، ئەرکی زانست و مەعریفە، ناسینی ژیانی کۆمەڵایەتی بوو لە رێگای عەقڵی مرۆڤەوە. دەستڕاگەیشتن بە ناسین و زانستی جێی باوەڕیش بۆیە مەیسەر بوو چونکە جیهان یاسامەند بوو. هۆکاری هەبوونی زانستی کۆمەڵایەتی، دۆزینەوەی ئەو یاسایانە بوو. زانستە نوێیەکان تا رادەیەکی زۆر بە شوێن دۆزینەوەی نهێنییە بنەڕەتیەکانی پشتەوەی دیاردە رواڵەتیەکانەوە بوون. لە زانستە نوێیەکاندا هەوڵێکی زۆر بۆ دۆزینەوەی شێوەکارە ئاڵۆز و پێداچوونەوەکانی ئەم ئەرکە بەڕێوە چوو و چونکە ناسینەکە مەیسەر بوو، دەستڕاگەیشتن بە زانستێکی پڕبایەخیش کە توانایی راڤە و پێش بینیی وردی هەبێت، هەر بەو رادەیە مەیسەر بوو. بەو پێیە، زانستی کۆمەڵایەتیی نوێ بە یارمەتی ئەو ئامرازە نوێیانەی پێداچوونەوە دەیانتوانی دەست بدەنە راڤە و پێداچوونەوەی مێژوو و رەوتی گۆڕانەیی کۆمەڵگای مرۆڤایەتی پێش بینی بکەن.

---

٢٦- رێبازی ئابووریی سیاسیی کلاسیك کە لە بەرهەمەکانی ئادام فرگۆسن (١٨١٦-١٧٢٣)، ئادام سمیت (١٧٩٠-١٧٢٣)، ژان ـ باپتیست (١٨٣٢-١٧٦٧)، مالتوس (١٨٣٤-١٧٦٦)، بنتام (١٨٣٢-١٧٤٨)، ریکاردۆ (١٨٢٣-١٧٧٢)، جیمز میل (١٨٣٦-١٧٧٣) و جۆن ستیوارت میل (١٨٧٣-١٨٠٦) باسکراوە.

بە پێچەوانەی فەلسەفەی تیۆری، ئابووریی سیاسیی بانگەشەی بەزانستی بوونی خۆی دەکرد. ئابووریی سیاسیی تێگەیشتنێکی مێژوویی وردی لە جیاتی تێگەیشتنە باوەکان سەبارەت بە سەرچاوەی دەوڵەت و کۆمەڵگاکان هێنایە ئاراوە. ئەو تێگەیشتنە ئیتر پێویستی بە گریمانەکان یان بەو ئەندێشەیە نەبوو کە یاسایەکی سروشتیی جیهانگیری لە تەواوی قۆناغەکانی مێژوودا و بە سەر تەواوی مرۆڤەکانەوە حاکم دەکرد. ئەو تێگەیشتنە دەیتوانی دەست بداتە راڤە، پێش بینی، و دیاریکردنی کۆمەڵگایەکی دڵخواز بە پێی ئەو بنەمایانەی کە زیاتر سەرنجی لایەنی مێژوویان دەدا.

ئابووریناسانی سیاسیی کلاسیك لە ژێر کاریگەری بۆچوونی رۆشنبیریدا، گۆڕانێکی بەرچاویان لە شێوازناسی یان شێوازی ناسینی کۆمەڵگاکاندا دروست کرد. تێگەیشتنی ئەو ئابووریناسانە، پوختەی تێگەیشتنێکی نوێخوازانە بوو کە بە پێی ئەو، کۆمەڵگا مرۆڤایەتییەکان بە پێی ئەو یاسا بنەڕەتیانەوە بەرەوپێش دەچن کە سەربەخۆ لە ویست و ئیرادەی مرۆڤن. ئەو ئابووریناسانە لە سەر ئەو باوەڕە بوون کە رووداوە مێژووییەکان نە بەرهەمی یاساکانی خواوەندین و نە بەرهەمی ئامانجە مرۆڤایەتییەکانیشن. ئادام فرگسۆن دەیگوت: "تەنانەت لە سەردەمی رۆشنگەریدا، جموجۆڵی هەر کۆمەڵگایەك، هەر بە یەك رادە هاوکاتە لەگەڵ بێ ئاگایی لە داهاتوو و نەتەوەکان بەشێوەیەکی نەخوازراو رێکخراوێك دادەمەزرێنن کە لە راستیدا بەرەنجامی کاری مرۆڤ بووە، بەڵام بەرهەمی هیچ گەڵاڵەیەکی مرۆڤانەی لەپێشداداڕێژراو نییە" (٤٦، ل١٢٢). ئەرکی زانستی کۆمەڵایەتی، دۆزینەوەی یاساکانی زاڵ بەسەر گەشەی کۆمەڵگا مرۆییەکاندا بوو.

گەڕان بەدوای ئەو یاسایانەدا بووە هۆی ئەوەی ئابووریناسانی سیاسیی نەریتی، روو بکەنە تێگەیشتنی ماتریالیزمی مێژوویی. بە پێی ئەو رێبازە، کۆمەڵگاکان لەو رێگایەوە کە، میك (١٢٥) بە "چوار قۆناغ"ی گەشەی (راوچێتی، ئاژەڵداری، کشتوکاڵی و بازرگانی) ناوی دەبرد، بەرەو پێشکەوتن و پێگەیشتن دەچوون. کۆمەڵگای بازرگانی، هێمای دوایین یان پێگەیشتووترین قۆناغی گەشەی مرۆڤ بوو. هۆکاری تێپەڕین لە قۆناغێکەوە بۆ قۆناغێکی دیکە دەبوایە لە گۆڕانکارییە ماددیەکاندا بدۆزینەوە، چونکە هەر قۆناغێك دەبووە هۆی سەرهەڵدانی دابەشکردنی کارێکی ئاڵۆز کە پێشکەوتن و هەڵاواردنی کۆمەڵایەتی لێدەکەوتەوە. ئەوەش زێدەکارەکانی کۆمەڵگای دەبردە سەر و رێگای چوون بەناراستەی قۆناغێکی پێشکەوتووتری خۆش دەکرد.

شێوازی بەرهەمهێنان نەتەنیا گرنگترین هۆکاری دیاریکەری هەموو قۆناغەکانی گەشەی کۆمەڵگا بوو، بەڵکو وەك هۆکاری دیاریکەری خاوەندارێتی، حکومەت، بنەما ئەخلاقیەکان، و دامەزراوە کۆمەلایەتی و سیاسییەکانیش هەژمار دەکرا. ڕێکخراوی ماددی کۆمەڵگا واتە چۆنیەتی بەرهەمهێنان و گۆڕینەوە و دابەشکردنی کالاکان لە کۆمەڵگادا، بووە هۆی سەرهەڵدانی فۆرمە کۆمەلایەتی و بنەما ئەخلاقیە گونجاو و تەواوکەرەکانیش. هەربۆیە، تێگەیشتنی ماتریالیستی یان مادەخوازانە لە مێژوو بۆ ناسینی ژیانی کۆمەلایەتی و دەسکەوتەکانی لە بوارەکانی ئەخلاقی، کۆمەلایەتی، کلتوری و پێشکەوتندا پێویست بوو. بەواتایەکی دیکە، هەر قۆناغێك لە گەشەی کۆمەڵگایەك دەکرێ بە پێی چۆنیەتی ڕێکخستنی سیستەمی بەرهەمهێنان و دابەشکردنی ئەو کۆمەڵگایە بناسرێتەوە و هەڵسەنگێندرێت.

ئێستا، ئەگەر کۆمەڵگاکان قۆناغێك لە بەرەوپێشچوونی ئابووری، کۆمەلایەتی و ئەخلاقییان وەپشت سەر ناوە و هەرکام لەم قۆناغانەش پێشکەوتووتر لە قۆناغەکانی پێشوون، کەوابوو دەکرێ کۆمەڵگاکان بە پێی قۆناغێك کە تێیدان، پۆلێن بەندی بکرێت. ئابووریی سیاسیی کلاسیك وەك تێگەیشتنێکی نوێ لە کۆمەڵگا نەتەنیا زانستێکی سەبارەت بە کۆمەڵگا پێك هێنا، بەڵکو شیمانەی ئەوەش دەکرا کە ئەم زانستە فۆرمە جیهانگیریەکانیشی پێك هێناون. عەقڵ، پێشکەوتنی ماددی، و پێشکەوتنی ئەخلاقی پۆلێنبەندی کراون و تەواوی ئەو پێوەرانە لە چەمکی کۆمەڵگای مەدەنیدا کۆ دەبنەوە. بەواتایەکی دیکە، چەمکی کۆمەڵگای مەدەنی، بوو بە پێوانەیەك بۆ هەڵسەنگاندنی ڕادەی پێشکەوتنی کۆمەڵگای مەدەنی و کەسانی وەك ئادام فرگسۆن بەو ئاکامە گەیشتن کە کۆمەڵگا پێشکەوتووەکان، خاوەنی کۆمەڵگای مەدەنین بەلام کۆمەڵگا بەراییەکان لێی بێبەرین.

لێرەدا وەرچەرخانێکی مێژوویی سەرنجڕاکێش بەرچاو دەکەوێت. کۆمەڵگای مەدەنی ئیتر خاڵی بەرامبەر دۆخی سروشتی نییە (بەو چەشنەی کە بیرمەندانی گرێبەستی کۆمەلایەتی وێنایان دەکرد) بەڵکو خاڵی بەرامبەری سەرەڕۆیی خۆرهەلاتی و خۆرئاوایی و فیۆدالیزم یان دەرەبەگایەتییە. کۆمەڵگا بەراییەکان لە ژێر سەروەری سەرەڕۆکان دابوو، بەلام کۆمەڵگا مەدەنییەکان کەشێك بۆ ململانێی ئازاد و هاوکاریی ئاشتیخوازانەی کۆمەلایەتی دەڕەخسێنن. بە بڕوای شارەزایانی ئابووریی سیاسیی کلاسیك، کۆمەڵگا پێشکەوتووەکان ئەو بەشە لە کۆمەڵگا خۆرئاواییەکان بوون کە گەیشتبوونە قۆناغی گەشەی بازرگانی.

بەم پێیە، بە پێچەوانەی بۆچوونی دامەزرێنەرانی تیۆری گرێبەستی کۆمەڵایـەتی، ئابووریناسـانی سیاسـیی کلاسیك، کۆمەڵگای مەدەنییان بە دیاردەیەکی دەستکرد نـەدەزانی و لـە سـەر ئـەو بـاوەڕە بوون کە گەشە و بەرەوپێشچوونی کۆمەڵگاکان دەبێتە هۆی سەرهەڵدانی کۆمەڵگایەکی بازرگانی. لـە ڕاستیدا، بە بڕوای ئەوان، کۆمەڵگای مەدەنی دوایین و پێشکەوتووترین قۆناغی مێـژوو بـوو و باسـی قۆناغێکی باشتر لە گەشە و بەرەوپێشچوونی دەکرد. بۆ نموونە، فرگسۆن لە کتێبەکەی خۆیدا سـەبارەت بە مێژووی کۆمەڵگای مەدەنی، گەشەی کۆمەڵگای لە فۆرمە خاو و بەراییەکانی پێکەوە هـەلکردنی مرۆڤەکانەوە بۆ قۆناغێکی باشتری گەشەکردن، تاوتوێ کردوە. فرگسۆن ئەوە بەڵگەمەنـد دەکـات کـە کۆمەڵگای مەدەنی لەگەڵ پێشکەوتنە ئەخلاقی و کلتورییەکان، دابەشکردنی کار بەشێوەیەکی ئـاڵۆز، پابەندبوونی حکومەت بە یاسا، و چەشنێك زیندوویەتی گشتی هاوڕێیە. ئادام فرگسۆن زۆر بە ڕوونـی وێنەی کۆمەڵگایەکی بازرگـانی دەخـستە ڕوو، ئـەو کۆمەڵگایـە هێمـای دوایـین و پێگەیشـتووترین قۆناغی گەشەی مرۆڤ بوو. بە بڕوای فرگسۆن "سەرهەڵدانی حکومەتی یاسـامەند و بەرەوپێشچـوونی بازرگانی و بەرهەمهێنانی پیشەیی، لە سەریەك دەبێتـە هـۆی سـەرهەڵدانی جموجـۆڵ لـە کۆمـەڵگا مەدەنییە نوێیەکاندا. لە (سەردەمی جیاواز)یەکاندا، چەشنێك زیندوویەتی و (ڕوحی بەرزی داهێنـان) بوونی هەیە کە پێشووتر لە (سەردەمی دڕندەیی) یان ڕاوچێتی و (سـەردەمی دوور لـە شارسـتانیەت) یان ئاژەڵداری و کشتوکاڵیدا بوونی نەبوو" (٨٢، ل٤٠). ڕێك لەو ڕوانگەوەیە کە دەکرێ لەو قسـەیەی مارکس تێبگەین کە دەڵێت: "لە بەرهەمەکانی ئابووریناسانی سیاسـیی کلاسـیك دا، سـەرمایەداری تەنیا خاوەنی مێژووی ڕابوردوویە نەك مێژووی داهـاتوو. لـەم ڕوانگەیـەوە، سـەرمایەداری لووتکـەی هەوڵ و پێشکەوتنەکانی مرۆڤ بوو".

ئەو تێگەیشـتنە لـە مێـژوو و ئـەو بـاوەڕە کـە کۆمـەڵگا بـە پێـی یاسـاکان و پرۆسـە سەربەخۆکان لەجووڵە دایە، گەلێك پێشهاتی قوڵی بۆ ڕاڤەکردنی دەوڵەت و کۆمەڵگا گرتەوە. ئەو تێگەیشتنە، هەڵاواردنی ئـابووری و سیاسـەت، باڵادەسـتیی کۆمـەڵگای مـەدەنی و لـە ئاکامدا کەمبوونەوەی گرنگیی سیاسەتی لێکەوتەوە. دواتر ئەو پرسیە بوو بە بنەمای ناوەندی زۆریەك لە تیۆرە لیبراڵەکان.

## باڵادەستیی کۆمەڵگای مەدەنی:

فرگسۆن، ستیوارت و ئادام سمیس، گـۆڕانێکی گرنگیـان لـە پێناسـەکردنی کۆمـەڵگادا دروست کرد. ئەگەر بە پێی ڕێبازی کلاسیك، بەرەوپێشچوون و گەشەی کۆمـەڵگا پەیوەنـدیی بـە گۆڕانکارییـەکانی مـاددی ئـەوەوە هەبووایـە، کەواتـە دەبووایـە لـە ئابووریـدا بەشـوێن بونیادەکانی ژیانی کۆمەڵایەتیـدا بگەڕاینایـە. ئەگـەریش ژیـان و فۆرمـە کۆمەڵایەتییـەکان ڕەنگدانەوەی لۆژیکی ئابووریی کۆمەڵگا بوایەن، کەوابوو دەبوایە بـۆ ناسـینی کۆمـەڵگاکان، دەستمان بدابایە بە تاوتوێکردنی چالاکییە ناسیاسی یـان ئابووریـەکانیان. لێـرەدا دابڕانێکـی تەواو لە چەمکی ئەرەستویی کوینونیا پولیتیکە بەرچاو دەکەوێت: ئەوە کۆمەڵگای ئابوورییە کە دۆخی سروشتیی مرۆڤ پێك دێنێت نەك کۆمەڵگای سیاسی. لێـرەدا کۆمـەڵگای مـەدەنی وەك چوارچێوەی بەتاڵکردنەوەی داخوازیە تایبەتیەکان، دەبێتە فۆرمێکی ئاسـایی لـە ژیـانی ڕۆژانەی تاك دا. بەو پێیە، لە ژیانی تاکەکەسی و کۆمـەڵایەتیـدا، ئـابووری دەکەوێتـە پلـەی یەکەمەوە و سیاسەتیش لە پلەی دووهەمدا جێی دەبێتەوە.

کاتێك دەتوانین دەرك بە مانای ئـەو تێگەیشـتنە بکـەین کـە بـزانین لـە چ بـارودۆخێکی ماددیدا هاتـە ئـاراوە: سـەرهەڵدانی ئـابووریی سـەرمایەداری وەك چوارچـێوەیەکی پێکـەوە هەڵکردنی سـەربەخۆ. هەروەك کارل پـولانی (١٥٢، ل٧١) ئامـاژەی پێکـردوە، شـێوازەکانی پێشووی بەرهەمهێنان، پەیڕەوی دامەزراوە نائابوورییەکان بوون ـــ هـەر لـە خێزانـەوە بگـرە هەتا دامەزراوە کۆمەڵایەتییەکانی دیکەی وەك کۆمەڵگای ئایینی یان خـۆجێی. کاتێـك کـە خێزان، یەکەی سەرەکی بەرهەمهێنانـە، خێـزانش هێـزی کـار دابـین دەکـات و سـەرلەنوێش بەرهەمی دێنێتەوە، بەڵام ئەو هێزی کارە لە ڕێگای بـەها و فۆرمـەکانی خێزانـوە سـنووردار دەکرێتەوە. ئامانجەکان و ڕادەی بەرهەم هێنانیش لە ڕێگای بەهاکان و فۆرمـەکانی خێزانـەوە بەرتەسك دەکرێنـەوە. ئـەو بەربەسـتانە لەوانەیـە بەشـێوەی گوێڕایـەڵی بـۆ دایـك و بـاوك، پێویستیی فێرکردن و پەروەردەی منداڵەکان، یان پرۆسەکانی گونجانە کۆمەڵایەتییەکان خۆیان دەربخەن. بەڵام لەوەش گرنگتر ئەوەیە کە کاتەکانی کار و پشوودان لە خێزانـدا، چـەندایەتی و چۆنایەتی بەرهەمەکە دیاری دەکەن. لێرەدا، پەیوەندیی بەرهـەم هێنـەران و ئـاڵوگۆڕی ئـەوان لەگەڵ یەکتر فـۆرمێکی تایبـەت بـە خۆیـەوە دەگرێـت و هـیچ پەیوەندییـەکی دەرەکـی وەك گرێبەسـت لە ئارادا نییە. بەم جۆرە، ئابووری کە بە هۆی پەیڕەوی نەکردن لە ویسـتی قـازانج

پەرەستی، بە ئابووریی ئەخلاقی ناسراوەتەوە، تووشی کۆمەڵێك گوشار دەبێت کە لە بنەڕەتدا ئابووری نین.

کاتێك وەك سیستەمی مامەڵەخوازانە، ئابووریی پەیڕەوی داواکارییەکانی دەوڵەتە، سەروەت و سامان دەبێتە ئامرازێك بۆ دامرکاندنەوەی خواستەکانی حاکم. سەروەت و سامان لەوانەیە بۆ بردنەسەری دەسەڵاتی تایبەتیی پاشا، بۆ بەکردەوە دەرهێنانی گەڵاڵە سەربە گێچەڵەکانی یان تەنها وەك ئاماژەیەك بۆ پلەوپایەی بەرزی پاشا بەکار ببرێت. بەرهەمهێنان و بەکاربردنی ئەو داراییەی کە لە کۆمەڵگادا بەرهەم دێت، لە لایەن داواکارییەکان و پێداویستیەکانی ناوەندی سیاسییەوە بەرتەسك دەکرێتەوە. ئەو کارە دەبێتە هۆی بەرتەسك بوونەوەی توانایی داهێنەرانەی بەرهەم هێنەرانیش، چونکە ئەوە دەوڵەتە کە چارەنوسی بەرهەمی کارەکەی ئەوان دیاری دەکات. لێرەشدا پرۆسە ئابوورییەکان پەیڕەوی دامەزراوە نائابووریەکانن.

کاتێك کە بەرهەم هێنان لە چوارچێوەی خێزان دەچێتە دەر و پانتاییەکەشی پەرە دەستێنێت، تاك لە مەرجەکانی پێداویستیی خێزان دەربازی دەبێت. بەڵام ئەوەی زیاتر گرنگە ئەوەیە کە بەرهەمهێنەران ئیتر لە ڕێگای خێزان یان کۆمەڵگاوە لە گەڵ یەکتری لە پەیوەندیدا نابن، ئەو جێگایەی کە بەرهەمهێنەر ڕاستەوخۆ لەگەڵ بەرهەمهێنەرانی دیکە و لەگەڵ سەرمایەداران لە پەیوەندی دا دەبێت، خودی چوارچێوەی ئابووری یانی چوارچێوەی بەرهەم هێنان و ئاڵوگۆڕ و دابەشکردنە. ئیتر ئەوە خێزان یان ناوەندێکی سیاسی نییە کە پەیوەندی لە نێوان تاکەکاندا دادەمەزرێنێت. تاکەکان تەنیا لە ڕێگای ئاڵوگۆڕەکانی بازاڕ و شێوازە کۆمەڵایەتی و یاساییەکانی ئەوەوە ــ وەك گرێبەست ــ لەگەڵ یەکتری لە پەیوەندی دان. کارل پولانیی بە باشی باسی ئەو پرسەی کردوە: "... سروشتییە... کۆمەڵگایەك کە لە سەر بنەمای گرێبەستەکان ڕاوەستاوە، دەبێ خاوەنی کەشێك بێت بۆ ئاڵوگۆڕە ئابوورییەکان بۆ ئەوەی سەربەخۆییەکی دامەزراوەیی هەبێت و هەڵگری هۆگرییەکی جیاوازیش بێت، ئەویش بازاڕە" (١٥٢، ل٧٠). کاتێك کە کاراکتەرە جۆراوجۆرەکانی بوارە جیاوازەکانی چالاکییە ئابووریەکان، لە ڕێگای گرێبەستەوە لەگەڵ یەکتری لە پەیوەندی دا دەبن، چوارچێوەی ئابووریی دەبێتە کەشێك کە تێیدا چالاکییە ئابوورییە بەربلاوەکان یەکانگیر دەبن، بەم جۆرە ئابووری دەبێتە چەقی ژیانی تاکەکەس.

جیاواز لەمە، تاك وەك بەرهەمهێن و بەکارهێن، ئیتر پەیڕەوی بەها و فۆرمەکانی ژیانی خێزان نییە، بەڵکو تەنیا ملکەچی تێبینییە ئابووریەکانە ــ واتە پەیڕەوی خۆپەرەستی،

زێدەخوازی و قازانج پەرەستیە لە تیۆری ئابووریدا، ئەو تاکەکەسێکە کە دەزانێ چی دەوێت، دەزانێ بەچ شێوەیەك بە خواستەکەی خۆی بگات و دەتوانێ بە خواستەکەی خۆی بگات. بەڵام گرنگتر لەوەش ئەوەیە کە، ئەو تاکە هیچ پاڵپشتێکی بێجگە لە خۆی نییە. هەربۆیە، ئەو دەبێتە بوونەوەرێکی خۆویست و خودتەوەر، ئەو تایبەتمەندییەی کە هەوڵ و ماندووبوونێکی زۆری بۆ هیگڵ پێك هێنا. ئەو تاکە خۆویستەی کە لە داوی بەها ئەخلاقیەکانی کۆمەڵگا و خێزان دەرباز بووە، بۆیە خۆویستە چونکە ناوەندی جیهانی خۆیەتی، و بۆیە بوونەوەرێکی عەقڵانیشە چونکە دەتوانێت بەرژەوەندییەکانی خۆی دەست نیشان بکات. ئابووریی سیاسیی کلاسیك وەها تاکێکی عەقڵانی و خۆویستی بەرز کردەوە. ئەو تاکە ــ رابینسۆن کرۆز و ئابووریناسانی سیاسی ــ خۆی لە جیهانێکدا دەبینێتەوە کە تێیدا پەیوەندیی ئەو لەگەڵ ئەوانیتر تەنیا پەیوەندییەکی کارییە و ئەوەی ئەوی بە ئەوانیترەوە پەیوەند داوەتەوە، گرێبەستە. لە ئابووریی سیاسی کلاسیك دا، ئەو جێگایەی کە تاکەکان کۆ دەبنەوە بۆ ئەوەی پێویستیەکانی خۆیان دابین بکەن، پێی دەگوترێت کۆمەڵگای مەدەنی.

کۆمەڵگای مەدەنی چوارچێوەی خۆویستییەکی گشتییە، ئەو شوێنەیە کە لەوێدا من هەموو کەسێك وەك ئامرازێك چاو لێدەکەم بۆ گەیشتن بە ئامانجەکەی خۆم. دیارترین شێوەکەشی ژیانی ئابوورییە کە من تێیدا خەریکی کڕین و فرۆشتن دەبم، ئەویش نەك بۆ دابینکردنی پێداویستیەکانی کەسانی دیکە، بەڵکو بۆ کەڵك وەرگرتن لە پێویستیەکانی کەسانی دیکە لە پێناو دامرکاندنەوەی پێداویستیەکانی خۆمدا. ئامانجەکانی من لە لایەن پێداویستیەکانی کەسانی دیکەوە دابین دەکرێن: بە هەر رادەیەك بەستراوەیی کەسانی دیکە بەو پێویستیەی کە من دەتوانم دابینی بکەم، زیاتر بێت، من پێگەیەکی باشترم دەبێت. ئەوە بوارێکە کە تێیدا هەرتاکێك بە پێی بەرژەوەندییەکانی خۆی کار دەکات (٥، ل١٣٤).

بەڵام کۆمەڵگای مەدەنی لەوەدا کورت ناکرێتەوە، چونکە بە بڕوای ئابووریناسانی سیاسیی کلاسیك، کۆمەڵگای نەریتی تەنیا رێکخراوێکی ئابووری نەبوو و گەلێك زیاتر لە تێگەیشتنی بیرمەندانی کلاسیکی نوێی دواتر ئەولاوە دەچوو. ئابووریناسانی سیاسیی کلاسیك لە ژێر کاریگەریی بۆچوونی رۆشنگەریدا باسی ئەوەیان دەکرد کە کۆمەڵگای مەدەنی چوارچێوەیەکە کە تێیدا تاکەکان حەز و ویستەکانی خۆیان لە رێگای عەقڵ و تواناکانی خۆیانەوە کۆنترۆڵ کردووە. هەر بۆیە، نەتەنیا گۆڕەپانی کاراکتەرە ئابوورییەکان بەڵکو گۆڕەپانی کاراکتەرە عەقڵانی و کۆنترۆڵ کراوەکانیش بوو. توانایی عەقلانیەت و کۆنترۆڵی حەز و

ویستەکان دەبووە هۆی ئەوەکە تاکەکان توانایی ناسینی ویستەکانی خۆیان و چۆنیەتی دەست پێڕاگەیشتنیان بە شێوەیەکی جێی پەسندی کۆمەڵگاش هەبێت. سەرەڕای ئەوەش کۆمەڵگاخوازی بەهایەك نەبوو کە لەگەڵ بەرژەوەندییەکانی تاك لە دژایەتی دابێت. بە سەرنجدان بە هەبوونی بەستراوەییەکی بەرامبەر و چەشنێکی ئاڵۆز لە دابەشکردنی کار، کۆمەڵگاخوازی یەکێك لە تایبەتمەندییە کاریەکانی تاکەکان بوو. تاکەکان لە کۆمەڵگا ئاڵۆزەکاندا دەرك بەوە دەکەن کە بە بێ یارمەتی کەسانی دیکە ناتوانن بەرژەوەندییەکانی خۆیان دابین بکەن و هەر لە بەر ئەوە ئەوان نەریتەکانی کۆمەڵگا قبوڵ دەکەن.

بە پێچەوانەی هۆبز کە فۆرمەکانی تیۆری خۆی بە تاکی پەراوێزخراو دەست پێدەکرد و دواتر دەستی دەدایە تاوتوێکردنی بارودۆخی پێویست بۆ ژیانی بەکۆمەڵی تاکەکان لە سەر بنەمای مەدەنییەت و کۆمەڵگاخوازی، ئادام سمیس لە تیۆری هەستە ئەخلاقیەکاندا (١٧٤) لە سەر ئەو باوەڕە بوو کە تاك لە بنەڕەتدا بوونەوەرێکی کۆمەڵایەتی و کۆمەڵگاخوازە، چونکە دەتوانێ هەست بەوە بکات کە بۆ گەیشتن بە پێداویستیەکانی پێویستی بە کەسانی دیکە هەیە. هەڵسوکەوتی تاك لەگەڵ ئەوانیتر لە سەر بنەمای هەستی" شیاوی یان لێوەشاوەیی "ڕاوەستاوە. ئەو هەستە، ئاسوودەیی هەموو کۆمەڵگای ئاسان دەکردەوە.

سەرەڕای ئەوەش، سمیس باسی ئەوەی دەکرد کە هەستی لێوەشاوەیی کە لە سەر بنەڕەتی هاودڵی دامەزراوە، خۆی لەخۆیدا ناتوانێت تاکەکان ناچار بە کەمکردنەوە یان بردنەسەری خۆپەرەستی بکات، چونکە ئەو هەستە دیاردەیەکی زەینیە. ئەوەی بەراستی دەبێتەهۆی چوونەسەریی هەماهەنگی و سۆلیدارێتی کۆمەڵایەتی، ئەو لێکدانەوە گونجاوەیە کە بە هێنانەدی ویستی کەسانی دیکەیە کە دەکرێ لە سەر یارمەتیەکانی ئەوان حساب بکرێ. بەواتایەکی دیکە، بەستراوەیی بەرامبەریەکی کۆمەڵایەتی نێوان تاکەکان لەگەڵ دابەشکردنی کارێکی ئاڵۆز کە لە سەر بنەمای ڕێکخستنی ئابووریی کۆمەڵگا پێکهاتووە، ناوێتە بووە. و دەرك کردنی ئەو بەستراوەییە ڕاستەوخۆیەیە کە پێکهاتەی کۆمەڵگا پێك دێنێت.

لە ئابووریی سیاسیی کلاسیك دا، کۆمەڵگای مەدەنی نەتەنیا بواری هێنانەدی خواستەکان، بەڵکو مەنوای تاکی خودوشیاریشە. ئەو تاکە بوونەوەرێکی خۆویستە بەلام لە هەمانکاتدا دەزانێت کە دابین کردنی بەرژەوەندیەکانی ئەو بەستراوەتەوە بە دابین کردنی بەرژەوەندیەکانی کەسانی دیکەوە. بەو پێیە، سمیس بەو ئاکامە دەگات کە بەدواداچوونی عەقلانیی بەرژەوەندییە تایبەتیەکان دەبێتە هۆی چوونەسەریی هەماهەنگی کۆمەڵایەتی،

پەرەسەندنی دابەشکردنی کار، و هاندانی بەرهەم هێنان. سمیس لەو بنەما ساکارە کە مرۆڤ لە ناخی خۆیدا هۆگری باشتربوونی بارودۆخی خۆیەتی، بەو ئاکامە دەگات کە هەر ئەو بنەما ساکارە ئەوەندە بەهێزە کە بە تەنیایی دەتوانێت کۆمەڵگا بەرەو سامان و پێشکەوتن بەرێت. ئەو دەڵێت: "هەوڵی نەگۆڕ و بەردەوامی هەمووان بۆ باشتربوونی بارودۆخی خۆیان، یانی ئەو بنەمایەی کە سەروەت و سامان و ئاسایشی گشتی و تایبەتی هەردووکیان لەوەوە سەرچاوە دەگرن، بەگشتی وەها بەهێزە کە دەتوانێت گەرەنتی جموجۆڵی کەرەستەکان بەرەولای باشتربوون و پێشکەوتن بکات" (١٧٣،ب١، ل٣٤٣).

لە راستیدا بەبڕوای ئادام سمیس، سەرهەڵدانی کۆمەڵگای مەدەنی، بەرەنجامی قازانج پەرەستی تاکەکان بوو نەك بەرەنجامی خواست و بەرنامەڕێژیی دەسەڵاتداران. هەر لە سەر ئەو بنەمایە، سمیس باسی ئەوەی دەکرد کە ئەو حەزە سروشتیە دەبێ ئازاد بکرێت، چونکە هەرچەشنە دەست تێوەردانێك لەو ویستە سروشتییەدا بەر بە پێشکەوتنی کۆمەڵگا دەگرێت. پێویست بە دەست تێوەردان ناکات، چونکە تاکەکان دەتوانن ژیانی خۆیان بەرێوە بەرن، و لە راستیدا بە سەرنجدان بە تایبەتمەندییەکانی کۆمەڵگایەکی خۆبەڕێوەبەر، دەستێوەردان کارێکی نائەخلاقی و لەکران نەهاتوویە. هەربۆیە، سمیس لە سەر ئەو بنەمایە کە تاکەکان بە کەوتنە شوێن بەرژەوەندییە تایبەتیەکانی خۆیان دەبنە هۆی دابین کردنی بەرژەوەندییەکانی کۆمەڵگا، دەیتوانی کۆمەڵگایەکی مەدەنی خۆبەڕێوەبەر و رەوشت بەرز بێنێتە ئاراوە. ئەو کۆمەڵگا مەدەنییە لەو رووەوە خۆبەڕێوەبەر بوو کە پێشکەوتنی تاکێك دەبووە هۆی پێشکەوتنی هەمووان. لە ئاکامدا هیچ دژایەتییەك لە نێوان بەرژەوەندییەکانی تاك و کۆمەڵدا بوونی نەبوو.

ئابووریناسانی سیاسیی کلاسیك هیچ دژایەتییەکیان لە نێوان خۆویستی تاکەکەسی و هەماهەنگی کۆمەڵایەتیدا نەدەدیتەوە، چونکە لە سەر ئەو باوەڕە بوون کە هەڵسوکەوتی تاکەکان لە سەر بنەمای عەقڵ دامەزراوە و لە رێگای عەقڵیشەوە کۆنترۆڵ دەکرێت. خوازەی "دەستی نادیار"ی ئادام سمیس تەنیا شتێکی خەیاڵی نەبوو و لە پشتەوەی ئەو، لێکدانەوەکان و هەڵسوکەوتی عەقلانی و کۆنترۆڵ کراوی تاکەکان مەڵاس درابوو. ئەو ئەندێشەیە کە پێی وابوو هەڵسوکەوتی کۆنترۆڵکراو دەبێتە هۆی هەماهەنگی و پێشکەوتنی بەکۆمەڵ، بە شێوەیەکی لۆژیکی ئەو بۆچوونە دێنێتە ئاراوە کە ئەو کۆمەڵگایەی دستی تێوەرنەدراوە، دەتوانێ لە رووی ماددی و ئەخلاقی و کۆمەڵایەتییەوە پێش بکەوێت. کاتێك کە عەقڵ،

جیهانی دەروونیی مرۆڤ و عەقڵی کاریش ـــ واتە زانست ـــ دەستی بە سەر جیهانی سروشتیدا گرت، مرۆڤ بەتەواوی دەتوانێ کاروباری خۆی و هاوچەشنەکانی خۆی بەڕێوە بەرێت. لێرەدا ئابووریناسانی سیاسیی کلاسیك خاڵێکی گرنگ زیاد دەکەن: تاکە وشیار و عەقڵانیەکان تەنیا لە کۆمەڵگایەکی بازرگانیدا دەتوانن تواناکانی خۆیان وەدی بێنن. کۆمەڵگای بازرگانی بە پێچەوانەی شێوازەکانی تری ڕێکخستنی کۆمەڵایەتی، ئەو ئازادییە بە تاکەکان دەبەخشێت کە کەسایەتی خۆیان بار بێنن. کۆمەڵگای مەدەنی یەکێك لە تایبەتمەندییەکانی کۆمەڵگای بازرگانییە.

ئادام سمیس ئەوەی دەخستە روو کە ئازادی لە کۆمەڵگای دەرەبەگایەتیدا ناتوانێ بوونی هەبێ. کۆمەڵگای دەرەبەگایەتی لە سەر بنەمای بەستراوەیی و لە ئاکامدا کۆیلەتی تاکەکەسی راوەستاوە. لە بەرامبەردا، کۆمەڵگای بازرگانی نەتەنیا بە پێشکەوتنی هێزە بەرهەم هێنەرەکان بەڵکو لەوەش گرنگتر ئاوێتەی نەزاکەت و ئەخلاق و یاسا و عەقڵیشە. ئادام سمیس لە سەر ئەو باوەڕە بوو کە گەشەی سەروەت و سامان و پەرەسەندنی ئازادی تەنیا لە کۆمەڵگای بازرگانیدا وەدی دێت، چونکە خاوەنکارەکان لە ژێر سەیتەرەی هێزە نائابووریەکاندا نین. لەو رووەوەیە کە کۆمەڵگای مەدەنی یەکێك لە تایبەتمەندییەکانی نەتەوە پێشکەوتووەکانە، واتە ئەو نەتەوانەی کە مەیدان بۆ گەشەکردنی عەقڵیەتی تاکەکان ئاوالا دەکەن، چونکە بەتەواوی لە سەر ئەو باوەڕەن کە خۆویستی و خۆبەزل زانی و ویست و حەزە تایبەتیەکان لە ڕێگای عەقڵ و وشیارییەوە لە بەستراوەییەکی بەرامبەریەکەوە دادەبڕێن. وە لەو رووەوە کە کۆمەڵگای مەدەنی مەیلی بەرەولای خۆبەڕێوەبەری و پێشکەوتن هەیە، دەبێ بە ئازادی بهێڵرێتەوە. ئەو لێکدانەوەیە بووە هۆی باڵادەستیی کۆمەڵگای مەدەنی و هاتنە خوارەوەی سیاسەت.

## پەیوەندیی کۆمەڵگای مەدەنی و کۆمەڵگای سیاسی:

ئەو ئاڵوگۆڕە گرنگانە لەمەڕ ناوەڕۆکی کۆمەڵگا بووە هۆی سەرهەڵدانی گۆڕانکارییەکی قوڵ لە پەیوەندیی نێوان کۆمەڵگای مەدەنی و کۆمەڵگای سیاسیدا. ئەو گۆڕانکاریانە لەو گریمانەیەوە سەرچاوەیان دەگرت کە کۆمەڵگا لە سەر بنەمای یاسا و پرۆسەکانی تایبەت بە خۆیەوە دەچێتە پێشەوە. کەوابوو، کۆمەڵگا دەبێ لە دەستێوەردانی سیاسی بێبەری بێت. کۆمەڵگا لەو بوارەوە دەبێ بە ئازادی بهێڵرێتەوە کە سیستەمی سیاسی بە پێچەوانەی بۆچوونی هۆبز لە حەز و ویستەکانی مرۆڤەوە سەرچاوە ناگرێت بەڵکو لە گۆڕانکارییەکانی

ئابووری و ئەخلاقیی کۆمەڵگای مەدەنییەوە سەرچاوە دەگرێت. ئەو هۆگرییە سیاسییەی کە لە پشتەوەی ئەو تێگەیشتنەوە هەبوو، بەرتەسك کردنەوەی دەسەڵاتی دەوڵەت بوو، هۆگرییەك کە بەرچاوترین فۆرمی لە بەرهەمەکانی ئادام سمیس دا دەبینین.

لە چەقی تیۆری ئادام سمیس دا، چەمکی ئابووری و کۆمەڵگای خۆبەڕێوەبەر لە ئارا دایە. ئەندامێتی لەو کۆمەڵگایە دایە کە خودسازی و لە هەمانکاتدا بەشداربوون لە سیستەمی کۆمەڵایەتی بۆ تاکەکان مسۆگەر دەکات. بەڵام ئەو کارە تەنیا کاتێك مسۆگەرە کە ئەو مەڵبەندە لە دەست تێوەردانی سیستەمی سیاسی لە ئەمان دابێت. ئادام سمیس لە سەر ئەو باوەڕە بوو کە تاکەکان لە هەماهەنگی لە گەڵ ئەوانیتردایە کە دەتوانن بە بەرژەوەندیەکانی خۆیان بگەن. ئەوان پێویستییان بە ناوەندێکی ڕێکخستنی وەك لڤیاتانی هۆبز نییە بۆ ئەوەی بەر بە ناکۆکییەکانی نێوانیان بگرێت. ئازاد هێشتنەوەی تاکەکان و دەستێوەرنەدان لە چالاکییە ڕۆژانەکانی ئەواندا، دەبێتە هۆی سەرهەڵدانی کۆمەڵگایەکی بەرهەمهێنەر، داهێنەر و پێشکەوتوو.

لە ڕاستیدا ئادام سمیس لە سەر ئەو باوەڕە بوو کە دەست تێوەردانی دەوڵەت دەبێتە هۆی لەناو بردنی داهێنانی کاراکتەرەکان، چونکە ئەو دەوڵەتی بە نوێنەری بەرژەوەندییە تایبەتیەکان دەزانی. ناوبراو سیاسەتوانانی بە "ئاژەڵە فێڵبازەکان"ناو دەبرد و ڕەخنەی لێیان دەگرت: "وا پێدەچێت کە لە تەواوی قۆناغە مێژووییەکاندا، دروشمی جێگای شەرمی دەسەڵاتدارانی مرۆڤ ئەوە بووە کە هەموو شتێك بۆ خۆمان و هیچیش بۆ خەڵکی". لە مشتومڕێکی توندا لەگەڵ دەوڵەتی مامەڵەچی و خاوەنانی دەسەڵاتی سیاسی کە پارەیان نەك وەك سەرمایە بەڵکو وەك سەروەت و سامان چاو لێدەکرد و ئەو سامانەی کە خەڵك بەرهەمی دێنا، بۆ ئامانجە تایبەتیەکانی خۆیان دەستیان بە سەر دادەگرت، ئادام سمیس باسی ئەوەی دەکرد کە ڕەنگە بکرێ باسی ئەوە بکەین کە ئەو یاسایانەی کە بازرگانەکان و خاوەنکارەکان بە سەر دەزگای یاسادارێژییان داسەپاندبوو، وەك یاساکانی دراکۆن (DRACON/DRACO: یاسادانەری یۆنانی سەدەی حەوتی بەر لە زایین کە یاسای زۆر دژوار و بێبەزەییانەی دانابوو) بەخوێن نووسراوە.

ئادام سمیس سەبارەت بە زیانی دەستێوەردانی دەوڵەت بۆ بەرهەمهێنان و قازانج لێ وەرگرتن ئاوای دەگوت:

دەوڵەتێك بۆ ئەوەی لە داوێنی کۆیلەدارییەوە بە لووتکەی سامان و فراوانی بگات، بێجگە لە ئاشتی، باجی کەم، و چەشنە دادپەروەرییەکی باو پێویستییەکی ئەوتۆی بە شتێکی دیکە نییە و ڕەوتی سروشتی کاروباری دیکەی شتەکان دابین دەکات. هەر حکومەتێك کە بەری بەو

ڕەوتە سروشتییە گرتووە، کاروبارەکەی بەرەو لایەکی دیکە پاڵ پێوەناوە، یان هەوڵ بدات بۆ ئەوەی لە خاڵێکی تایبەتیدا بەر بە پێشکەوتنی کۆمەڵگا بگرێت، حکومەتێکی ناسروشتییە و بۆ مانەوەی خۆی هیچ ڕێگاچارەیەکی بێجگە لە پشت بەستن بە سەرکوت و سەرەڕۆیی نییە. (١٢٥، ل٢٦).

تیۆرەکانی ئادام سمیس یارمەتی بە هاتنە خوارێی بەهای سیاسەت کرد. لە ڕاستیدا، ئەو هەر لە بنەڕەتەوە سیاسەتی بە دیاردەیەکی نیگەتیف دەزانی. ئەو کارە کۆمەڵێك پێشهاتی گرنگی بۆ تیۆری دەوڵەت هەبوو. ڕۆڵی دەوڵەت بەلانیکەمی خۆی دەگەیشت. دەوڵەت نەتەنیا دەبوایە لە دەست تێوەردان لە کۆمەڵگای مەدەنیدا خۆی ببواردبایە، بەڵکو دەبوایە ئەو ڕێگایەی بپێوایە کە کۆمەڵگای مەدەنی نیشانی دەدا. دەوڵەت چوارچێوەیەکی یاسامەندی پێك دێنا کە خەڵك تێیدا دەیانتوانی دەست بدەنە کار و ژیان و ئاڵوێر و گرێبەست. بەرپرسیارێتی سەرەکیی دەوڵەت پارێزگاری لە ژیان و ئازادی و کەلوپەلی هاوولاتیانی خۆی لە بەرامبەر دەست درێژیی دەرەکی و بشێوی نێوخۆیی دابوو. دەوڵەت دەبوایە دەستی بدایە بە پێکهێنانی دادپەروەری و دامەزراندن و پێداویستیە گشتییەکان (١٧٣، ل٥). دەوڵەت بێجگە لەوە بەرپرسیارێتییەکی دیکەی لە ئەستۆ نەبوو. دەوڵەت نەیدەتوانی پێوانەی ژیانی باش دیاری بکات، بەرژەوەندیی گشتی مانا بکاتەوە، نوێنەری داخوازیەکانی کۆمەڵێك کەس بێ، یان ڕۆڵ بۆ تاکەکان دیاری بکات.

ئابووریناسانی سیاسیی کلاسیك ئەو ئەندێشەیان ڕەتدەکردەوە کە دەوڵەت سەرچاوەی ئیرادە و داخوازیی کۆمەڵ یان گشتییە. ئەو شتەی کە ئادام سمیس لە بەرامبەر دەوڵەتخوازیدا دەیهێنایە ئاراوە، بەناوبانگە: "تاکەکان تەنیا بەشوێن بەرژەوەندییەکانی خۆیانەوەن و لەو بوارەشەوە وەك زۆربەی بوارەکانی دیکە لە لایەن دەستێکی نادیارەوە یارمەتی بە وەدیهاتنی ئامانجێك دەکەن کە بەهیچ شێوەیەك جێی پەسندی ئەوان نییە". بەواتایەکی دیکە، نهێنی بەرەوپێشچوون و پەرەسەندن لە کۆمەڵگای مەدەنی دایە نەك لە دەوڵەتدا. لە کۆمەڵگای مەدەنی، "دەستی نادیار" دەبێتە هۆی ئاوێتەبوونی بەرژەوەندییە تایبەتیەکان و بەرژەوەندی گشتی ــ جا چ سامان بێت و چ هەماهەنگی کۆمەڵایەتی. لەو ڕوانگەیەوە دەوڵەت بە تەواوەتی گرنگیی خۆی لە دەست دەدات. لە ڕاستیدا دەوڵەت دەست تێوەردەری تۆخمێکی دەست هەڵنەگرە، چوونکە توانای داهێنانی خەڵك لەناو دەبات.

بەم جۆرە، ڕێبازی ئابووریی سیاسیی کلاسیك هەم سەبارەت بە ناوەرۆکی کۆمەڵگا و هەم سەبارەت بە پەیوەندیی دەوڵەت و کۆمەڵگا، گۆڕانکارییەکی فیکریی گرنگی پێك هێنا. ئەو ڕێبازە لە سەر کۆمەڵگای مەدەنی وەك چوارچێوەی ئاڵوویێری تاکەکەسی و سەرچاوەی بەختەوەری و پێشکەوتن جەختی کردۆتەوە بەڵام گرنگیی دەوڵەت و سیاسەتی هێنایە خوارەوە. لەمەوبەدوا، ئەوە کۆمەڵگای مەدەنی ـــ نەك دەوڵەت ـــ بوو کە بە پێی گوتەی مارکس دەبوو بە "گۆڕەپانی مێژوو".

بە بڕوای ئابووریناسانی سیاسیی کلاسیك، کۆمەڵگایەکی مەدەنی پێگەیشتوو، لانیکەم لە سێ توخم پێکدەهات: تاکگەرایی، خاوەنداریتی و بازاڕ. ڕێك هەر ئەو سێ توخمە بوون کە وەك بەهای ڕەها لە تیۆری لیبراڵی دا قبوڵ کران. لە ڕاستیدا ئەو سێ توخمە بوون بە ناوەرۆکی سەرەکیی ئەندێشەی لیبراڵی. ئارمانی سەربەخۆیی تاك لە ئاڵوویێرە ئابوورییەکاندا لە بواری سیاسییەوە بوو بە مافی ئازادی و یەکسانی لە چوارچێوەی سیاسیدا، چەمکی گرێبەستەکان بوو بە نموونەی ڕێککەوتنە کۆمەڵایەتییەکان، و باڵادەستیی ئەخلاقیی تاك وەك ناوەندی هێز و دەسەڵاتیش وەك سەنگەری سەرەکیی خەڵك لە بەرامبەر دەوڵەتە تۆتالیتێر و دامەزراوە سەروو تاکیەکاندا ناسرایەوە. بەم جۆرە، ئابووریناسانی سیاسیی کلاسیك، ناوەرۆکی بەرنامەی لیبراڵەکانیان دیاری کرد. و لە ئەندێشەی هەردووك گروپە ناوبراوەکەدا، چەمکی کۆمەڵگای مەدەنی وەك چوارچێوەی مێژوویی ماف و ئازادییە تاکەکەسیەکان پێگەیەکی ناوەندی هەبوو، ئەو چوارچێوەیەی کە تێیدا تاکەکان بۆ بەدواداچوونی هۆگرییە تایبەتیەکانی خۆیان، دەستیان دەدایە ململانێ لەگەڵ یەکتری.

## تاکگەرایی:

ستانیلند دەڵێت، "سمیس تاکی لە جیاتی حاکم دانا" (١٧٥، ل١٣-١٢). شیمانەی سەرەکیی ئابووریی سیاسیی کلاسیك و لیبراڵیزمی کلاسیك بریتییە لە زاڵبوونی ئەخلاقیی تاك. لەو ڕوانگەیەوە تاك وەك یەکەی سەرەکی ژیانی کۆمەڵایەتی هەژمار دەکرێت و کۆمەڵگاش وەك ئامرازێك بۆ دابینکردنی بەرژەوەندییەکانی تاکەکەسی. کۆمەڵگا و دامەزراوەکانی ئەو شوناسێکی گشتگیریان نییە کە تاك بکەنە پەیڕەوی چەمکی ئەبستراکتی خواست و ئیرادەی گشتی یان بەکۆمەڵ. بە بڕوای لیبراڵەکان، شورا کۆمەڵایەتییەکان، کۆمەڵێك ئیرادەی تاکەکەسین و تاك بۆ پەیوەست بوون یان جیابوونەوە لەو شورا کۆمەڵایەتیانە ئازادە. بڕیارەکانی ئەو شورایانە بۆ ئەندامەکانیان پێویست نییە. ئەو شورایانە هیچ چەشنە سەروەرییەکی ئەخلاقی سەروو

تاکەکەسیان نییە. لە راستیدا تاکگەرایی لیبرالّی، هەرچەشنە کۆمەلگایەکی ئایینی و هەرچەشنە سەرەتییەکی دەرەبەگایەتی کە شەرت و مەرج بۆ تاك دادەنێت، رەت دەکاتەوە.

دەبێ ئەوە وەبیر بێنینەوە کە لیبراڵەکان باسی تاکێکی عەقلانی دەکەن کە تا رادەیەکی زۆر توانیبووی حەز و ویستەکانی خۆی کۆنترۆڵ بکات. هەربۆیە ئەوان بە پێچەوانەی بیرمەندانی گرێبەستی کۆمەلایەتی نیگەرانی ئەوە نەبوون کە ئەگەر تاکەکان بە ئازادی بێلینەوە، کۆمەلگا تووشی بشێوی دەبێت. کۆمەلگا دەتوانێ پێك بێت و سەرلەنوێ خۆی بەرهەم بێنێتەوە، چونکە تاك دەتوانێت دەرك بەوە بکات کە تەنیا بە هاوکاری لەگەڵ ئەوانیتردا دەتوانێ دەستی بە بەرژەوەندییەکانی خۆی رابگات، ئەوە تێگەیشتنێکە بۆ ژیانی کۆمەلایەتی کە تاك لە چەقەکەی دایە. بەم جۆرە، کۆمەلگای مەدەنی دەبێتە چوارچێوەیەك کە تێیدا تاك دەتوانێت بەشوێن بەرژەوەندییە تایبەتیەکانی خۆیەوە بێت، ئەو چوارچێوەیەی کە تاك تێیدا دەبێ لە دیاریکردنی بەرژەوەندییەکانی خۆی و لە پێداوچوونەوە بە بیروباوەڕەکانی خۆیدا سەربەست بێت.

جیاواز لەوەش، تاك لە تیۆری لیبراڵیدا لە بنەڕەتدا تاکێکی تایبەتییە. لێك هەلاواردنی راشکاوانەی دوو چوارچێوەی گشتی و تایبەتی لە یەکتری، یەکێك لە تایبەتمەندییەکانی جیاوازی دونیای نوێ و بۆچوونی زاڵ بەسەریدا یانی تیۆری لیبرالّییە. تاك مافی ژیانی تایبەتی هەیە. ئەو مافی ئەوەی هەیە پەنا بۆ شوێنێك بەرێت کە هیچ کەس مافی چوون بۆ ئەوێی نەبێت، جا ئەو پەناگەیە چ ماڵەکەی ئەو بێت و چ جیهانێ بیروبۆچوون و هەستەکانی ئەو. تاك وەك ناوەندێکی خودوشیاری سەربەخۆ دێتە ئەژمار. ئەو سەر بە شتێکی دیکە نییە و رەسەنایەتیی خۆی هەیە. ئەو لەگەڵ ئەوانیتر جیاوازیی هەیە و مافی ئەوەی هەیە کە تێگەیشتن و هەستە تایبەتیەکانی خۆی لە بەرامبەر ئەوانیتردا بپارێزێت. هەر لە سەر ئەو بنەمایە، ژیانی تایبەتی بەو مانایەیە کە تاك بۆی هەیە لە بەلێنە گشتییەکان دوور بکەوێتەوە و پەنا بۆ جیهانیی تایبەتی خۆی بەرێت، ئەو جیهانەی کە پیرۆزە و هیچکەس و تەنانەت دەولّەتیش بۆی نییە دەستدرێژی بکاتە سەری.

تاکگەرایی لە سەر ئەو بنەمایە راوەستاوە کە تاکەکان توانای بڕیاردانی سەربەخۆ و هەلبژاردنی ئازادانەیان هەیە و دەبێ رێز لەو تایبەتمەندییە تایبەتییەی ئەوان بگیردرێت. هەر بەمشێوەیە، تاکەکان مافی پێداچوونەوە بە بیروبۆچوون و شێوەی ژیانی خۆیشیان هەیە. بارودۆخی گونجاو بۆ وەدیهاتنی ئەو مافانە کاتێك دابین دەبێت کە تاك ئازاد بێت. هەربۆیە، یەکێك لە بنەما سەرەکییەکانی گوتاری سیاسیی لیبرالّی، مافی ئازادییە، چونکە هەر

تاکێکیش بەدەر لە پێگە کۆمەڵایەتییەکەی، تایبەتمەندییەکی عەقڵانی و خۆویستانەشی هەیە، یەکسانیی تاکەکان دەبێتە دووهەمین بنەمای سەرەکیی تیۆری لیبراڵی. تەواوی ئەولەویەتەکان گرنگییەکی یەکسانیان هەیە، نەك بەو مانایە کە چەشنە رێککەوتنێکی گشتی لە ئارادایە کە لە سەر ئەو بنەمایە تەواوی تێگەیشتنەکان جێگا و شوێنێکی یەکسانیان هەیە، بەڵکو بەو مانایە کە ئەوان هەر لەبواری گرنگییەوە هەڵناسەنگێندرێن. کەوابوو، دەوڵەت دەبێ بەقەدەر یەك سەرنجی هەموو تاکەکان بدات. بەواتایەکی دیکە، تەواوی تاکەکان لە بەرامبەر یاسادا یەکسانن.

لەو فۆڕمەدا، دەوڵەت رۆڵێکی بێ لایەنانەی هەیە، ئەو بێ لایەنییە دوو بواری هەیە. لە لایەکەوە، دەوڵەت دەبێ رێز لە مافی هەڵبژاردنی ئازادانەی هاووڵاتیان و تێگەیشتنی ئەوان لە مەڕ ژیانێکی باش بگرێت. هەر لەبەر ئەوە، دەوڵەت تێگەیشتنێك لەمەڕ ژیانی باشی لە تێگەیشتنێکی دیکە پێ باشتر نییە. لە لایەکی دیکەوە، دەوڵەت لێکدانەوەی خۆی لەمەڕ ژیانێکی باش بە سەر خەڵدا ناسەپێنێت. دەوڵەت هەوڵ نادات بۆ ئەوەی کاریگەری لە سەر لێکدانەوەکانی خەڵك یان بەهاکانی زاڵ بەسەر بیروبۆچوونی ئەواندا دابنێت. بەشێوەیەکی زۆر سادە، هیچ چەمکێك لەمەڕ بەرژەوەندی گشتی لە ئارا دانییە کە بکرێ لە رێگایەوە لێکدانەوەی تاکەکان سەبارەت بە ژیانی باش هەڵسەنگێندرێت. بە سەرنجدان بەوەها لێکدانەوەیەك لەمەڕ کۆمەڵگا و خوخدەی مرۆڤ، جێگای سەرسوڕمان نییە کە بە بڕوای لیبراڵەکان، رۆڵی دەوڵەت لە چوارچێوەی کارە رێکخراوەکاندا بەرتەسك دەبێتەوە. کاری سەرەکیی دەوڵەت، دابینکردنی بارودۆخێکە کە تێیدا تاکەکان بەشێوەیەکی ئازادانە بتوانن، لێکدانەوەی خۆیان سەبارەت بە ژیانی باش پێناسە بکەن و بەشوێنیان بکەون. لیبراڵە کلاسیکەکان لەسەر ئەو باوەڕە بوون کە ئەگەر تاکەکان لە دیاریکردنی شێوەی ژیانی خۆیاندا ئازاد بن، دەکرێ بەرژەوەندییە تاکەکسیەکان وەدی بێن.

لیبراڵەکان ئازادی و یەکسانیان بەمافێك دەزانی کە تاکەکان لە چوارچێوەی ئەو یاسامەندییەی کە لە لایەن دەوڵەتەوە پێکهاتبوو، پێی گەیشتبوون. کۆمەڵگای مەدەنی ئەو شوێنە بوو کە دەکرا ئەو مافانە کەڵکیان لێ وەربگیرێت و پشتیوانییان لێ بکرێت. گوتاری لیبراڵیزم لە پێویستیی ناساندنی چوارچێوەیەك بەناوی کۆمەڵگای مەدەنی واتە لە گوتارێك کە پێگەیشتووترین فۆڕمەکەی لە رێبازی ئابووریی سیاسیی نەریتیدا دەرکەوت، تا ئاستی گوتارێك لەمەڕ کۆمەڵگای مەدەنی چووە سەرێ، کە تێیدا تاکی عەقڵانی بوو بە هاووڵاتیی خاوەن ماف.

## خاوەندارێتی:

بە پێی بەڵگەی کلارك، "ئابووریناسانی سیاسیی کلاسیك هەوڵیاندا بۆ ئـەوەی شـێوازێك لە کۆمەڵگای هەماهەنگی ئایدیالی پێشکەش بکەن کە تێیدا هەموو شێوەکانی خاوەندارێتی جێگای تایبەتی خۆیان هەبێت" (٢٨، ل١٣). ئەو رێبازە جەختی لـە سـەر بـازارِ دەکـردەوە: بازارِ وەك بوارێك کە تێیدا پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان ــ بەشێوەی گرێبەست ــ لـە نێـوان تاکی تا رادەیەك نامۆدا دروسـت دەبـن. کەسـانێك گرێبەسـت واژۆ دەکـەن کـە پێگەیـەکی یەکسـانیان لە مامەڵەکاندا هەیە و بەرژەوەندیی پێویستیشیان بـۆ ئـاڵوگۆڕ هەیـە. ئـەوان بـۆ ئەوەی بتوانن شتێك وەربگرن دبێ شتێکیش بدەن. بەواتایەکی دیکە، گرێبەستەکە لـە نێـوان کەسـانێکدا دەنووسرێت کە مـالیکن یـان خـاوەنی شـتێکن. خاوەنـدارێتی بـەمانای خـاوەنی ئامرازەکانی بازرگانی، کەرەستەکانی بەرهەمهێنان ـــ زەوی، سـەرمایە، تەکنـەلۆژیا ـــ و گرنگتر لە هەمووان هێزی کارە.

داکۆکی لە خاوەندارێتی لە تیۆری لیبراڵیدا هاوکاتە لە گەڵ کۆمەڵێك گریمانەی فەلسـەفی. هەروەك چۆن باب فاین دەنووسێت:

ئێستا زۆر دژوارە بتوانی هەست بە روحـی بزووتنەوەیـەك بکـەی کـە بـۆ ئـەو رزگـاریی خاوەندارێتیی تایبەتی هەر وەك ئایدیالی کۆمەڵگایەکی ئازاد و دەربازبوون لە فۆرمی نەریتی ئیمتیازاتەکان، پاشکۆیی تاکەکەسی و... (خاوەندارێتی تایبەتی) لەگەڵ ئازادیی تاکەکەسی، مافی کەڵك وەرگرتن و بەخراپی کەڵك وەرگرتن لە کەلوپەلەکانی خۆی، مافی کـڕین و فرۆشـتن بەشێوەیەکی ئازادانە، مـافی گواسـتنەوەی ئازادانـە لـە شـوێنێکەوە یـان لـە مەڵبەنـدێکی بەرهەمهێنانەوە بۆ شوێن یان مەڵبەندێکی دیکە و مافی لەسەرکار دامەزراندنی کەسانی دیکە یان فرۆشتنی هێزی کاری خۆیان بەهەر خاوەنکارێك وەك یەك هـەژمار دەکـرا. خاوەنـدارێتی تایبەتی، چوارچێوەی مافە تایبەتیەکانی دەگرتەوە، واتە ئەو جێگایەی کە هەڵبژاردن و ویست و داخوازیەکانی تاکەکان حکومەت دەکات (٤٨، ل١١).

بۆ کەسانی لیبراڵی سەرەتایی، مانای خاوەندارێتی شتێکی زیاتر لە خاوەندارێتی کەلوپەلە ماددی و هێزی کاری خۆیان بوو. لە روانگەی بیرمەندانی سەرمایەداریی تازە پێگەیشـتووەوە، خاوەندارێتی و مافی راگواستنی ئەو کارێکی رزگاریدەرانە بوو. ئەو کارە تـاکی لـە شـەرت و مەرجەکانی کۆمەڵگایەك دەرباز دەکرد کە لە سەر بنەمای دیاریکردن و پێگەی کۆمەڵایـەتی

دانرابوو. ئـەو شـەرت و مەرجانـە تاكـەكانيان كردبـووە ئـەو كۆيلانـەی كـە هـيچ چەشـنە كۆنترۆلێكيـان بە سـەر جەسـتە و هێزی كاری خۆياندا نەبوو. ئەو مەرجانە تاكـەكانيان دەكـردە كۆيلەی وەهم و حەزەكانی كەسانی دیکە، دەربازبوون لە باڵادەستيی كۆمەڵايەتی يان سياسی، تەنيا لە رێگای مافی خاوەندارێتی و گواستنەوەی ئەوەوە دەكرا وەدی بێت. لـەو روانگەيـەوە، خاوەندارێتی موژدەدەری ئازادی و ئاسايش بوو.

جياواز لەوەش، خاوەندارێتی باسی توانايی و لێهاتوويی و داهێنانی تاكەكەسيشی دەكرد. گرنگی تاك لە پارمەتيدانی بە كۆمەڵگادا بەشێوەی دانانی سەرمايە و كار و داهێنان بوو. بە بڕوای ليبراڵەكانيش، تاك لە قەباڵ ئەو پارمەتييەی كە بە كۆمەڵگای دەكرد، دەبوایە بەرهەمی كـار و داهێنانەكـەی خۆيشـی لـە كۆنترۆڵی خۆيدا بوايە. ئەو كارە بەتەنيايی تاكی لە ژێر چاودێری كەسانی دیكەدا دەرباز دەكرد. بەم جۆرە، خاوەندارێتی لەگەڵ ئازاديی يەكسان بوو و تاكی لە چەوسانەوە دەپاراست.

داكۆكی لە خاوەندارێتی تايبەتی هۆكارێكی ديكەشـی هـەبوو. ئابووريناسـانی سياسـيی كلاسيك لە سەر ئەو باوەڕە بوون كـە مـافی خاوەنـدارێتی و گواسـتنەوەی ئـەو دەبێتـە هـۆی چوونەسەرێی داهێنان و بەرهەمهێنانی سامان بۆ كۆمەڵگا. بە بڕوای ئەوان، لـە نێـوان مـافی خاوەنـدارێتی تـاك لـە لايـەك و بەرژەوەنـدی و قـازانجی كۆمـەڵگاش لـە لايـەكی دیكـەوە، دژايەتييەكی ئەوتۆ لە ئارادا نەبوو، چونكە بەرهەمهێنانی سامانە كە بنەمای كۆمەڵگايەكی باش پێك دێنێت. كاتێك سامان بەرهەم دێت، دابەشكردنيش خۆی لە خۆيدا بەڕێوە دەچێت.

مافی خاوەنـدارێتی و راگواسـتنی ئـەو لـە بـواری سياسـييەوە وەك ئازاديـيـە سياسـی و كۆمەڵايەتييەكانی لێهات. لە بواری فەلسەفيەوە، بۆ نموونە لە بيرۆدزيی جۆن لـۆك دا، مـافی خاوەندارێتی بوو بە بنەمای مافەكانی ديكە. ئازادی هەڵبژاردنی پيشە، ئازاديی رۆيشـتن لـە شوێنێكەوە بۆ شوێنێكی دیكە، و ئازاديی هاتوچۆ لەگەڵ كەسانی دیكـە، لەگـەڵ ئيختيـار و هێزی كاری تاكەوە گرێ درايەوە. خاوەندارێتی يەكێك لە پێكهاتە بنەڕەتيەكانی ئازادی بـوو. بەڵام خاوەنـدارێتی تايبـەتی وەك يـەكێك لـە دۆخـەكانی پێويسـت بـۆ كـەڵك وەرگـرتن لـە مافەكانيش دەهاتە ئەژمار. خاوەندارێتی تايبەتی ئەو دەرفەتەشی بۆ تاكەكان دەرەخساند كە بۆخۆيان بڕيار بدەن و لە زانيارييەكانی خۆيان بۆ خۆيان و لەو رێگايەشەوە بۆ كۆمەڵگاش كەڵك وەربگرن. خاوەندارێتی تايبەتی ئەو تواناييەی بە تاكەكان دەبەخشی كە دەست بدەنـە دانـانی سـەروەت و سـامان و قبولكردنی مەترسی و داهێنان. لە هەمووانيش گـرنگتر ئـەوە بـوو كـە

خاوەنـدارێتی تایبـەتی ئـەو توانایـەی بـە تاکـەکان بەخشـی بـۆ ئـەوەی بەرپرسـیارێتی کاروکردەوەکانی خۆیان لە ئەستۆ بگرن.

## بازاڕ:

ئادام سمیس لە لێکدانەوەی خۆیدا سەبارەت بە پێکهاتەی چینایەتی کۆمەڵگای بازرگـانی بەو ئاکامە دەگات کە ناکرێ بەرپرسیارێتی کۆمەڵگای مەدەنی بە هیچ کام لە چینەکانی ئەم جۆرە کۆمەڵگایانە ـــ سەرمایەداران، خاوەن زەوی و زارەکان و کرێکاران ـــ بسپێردرێت. ئەوە تەنیا بازاڕە کە دەتوانێت لە نێوان بەرژەوەندییە دژبەیـەك و جۆراوجۆرەکانـدا هاوسـەنگییەك دامەزرێنێت و رایەڵ و پۆیەکی پەیوەندی و هاوکاری دروست دەکات، هەربۆیە بازاڕ دەبێ بـە ئازادی بهێڵرێتەوە بۆ ئەوەی بە قازانجی کۆمەڵگا بێت.

بە رواڵەت وادیارە کە بـازاڕ دامەزراوەیـەکی ئابوورییـە کـە ئـاڵوێری کاڵاکـانی ئاسـان کردۆتەوە و لە نێوان خواسـت و خـستنەڕوو هاوسـەنگی دێنێتـە ئـاراوە. بـەڵام لێکدانـەوەی لیبراڵەکان بۆ داکۆکی لە بازاڕ، لە سەر بنەمای تێبـینی فەلسـەفیی ڤـولتێر راوەسـتابوو. لـە لایەکەوە بازاڕ وەك دامەزراوەیەکی ناتایبەتی کە پاداشت و بەرژەوەندییەکان دیـاری دەکـات، بە پێی تێبینیە نائابووریەکان، جیاوازییەك لە نێـوان بەشـداربواندا دانانێـت. کـەوابوو بـازاڕ فۆرمە تایبەتی و دیاریکراوەکانی دەسەڵات و سەرەتیەکان لەناو دەبات. بە پێچـەوانە، بـازاڕ دەست دەداتە دابەشکردنی بەرژەوەندییەکان لە نێو بەشداراندا و ئەویش بە پێی بەشـی ئـەوان لە ئاڵوێرەکانی بازاڕدا. جیا لەوەش، بازاڕ لە نێوان داخوازی و بەرژەوەندییە جۆراوجۆرەکاندا هاوسەنگییەك دێنێتە ئاراوە و بەم جۆرە هـەروەك ئالییـەت (میکانیزم)ێـك بـۆ رێککـەوتنی نێوان گروپە رەکەبەرەکان کار دەکـات. بـەو پێیـە، بـازاڕ هـەم بەدواداچـوونی بەرژەوەندییـە تایبەتیەکان و هەم پێکهێنانی هەماهەنگی کۆمەڵایەتی مەیسـەر دەکـات. بـازاڕ سـێ کـار بەڕێوە دەبات: بەدواداچوونی بەرژەوەندییە تایبەتیەکان بۆ تاك دابین دەکات، بوار بۆ هاوکاریی کۆمەڵایەتی و ئاڵوێر دەڕەخسێنێت و بە بردنەسەری دابەشکردنی کـار و تایبـەتی بوونـەوەی شارەزاییەکان، دەبێتە هۆی بردنەسەری بەرهەمهێنان و کۆکردنەوەی قازانج.

ئابووریناسانی سیاسیی کلاسیك لە سەر بنەمای ئەو هۆکارانەی کە باسکران، داکۆکییـان لە بازاڕ دەکرد. ئەوان وەك بیرمەنـدانی سیسـتەمی تازەپێگەیشـتووی سـەرمایەداری، هـیچ زانیارییـەکیان سەبارەت بە پرسەکانی بازاڕ نەبوو. ئەوان نەیانـدەزانی کـە بـازاڕ هێنـدێك لـە

کارەکان بەڕێوە نابات. بـازاڕ خـۆی لەخۆیـدا تـەواوی پێداویـستیەکان دابـین ناکـات و هـیچ بەرپرسیارێتیەکیش سەبارەت بەو کەسانەی کـە نـاتوانن لـە پرۆسـەی ئـاڵوویردا بەشـداربن، بەنەستۆ ناگرێت. بازاڕ تەنیا کەشێك دەخوڵقێنێت کە تێیدا ئەو کەسانەی کە یەکتری ناناسـن و پەیوەندییەکیان پێکەوە نییـە، بتـوانن لـە سـەر بنـەماکانی ئـازادی و یەکسـانی پێکـەوە هەڵبکەن. بازاڕ تەنیا ئالییەتێکی کۆمەڵایەتی بۆ ئاسانکاریی ئەو چەشنە ئاڵوویرانەیە.

پشتیوانانی کۆمەڵگای بازاڕی، گریمانەی تایبەت بە خۆیان هەیە: تاکەکان دێنە بازاڕ بۆ ئەوەی شتێك بفرۆشـن و ئەو فرۆشتنەش توانای کڕینیان پێ دەبەخشێت و هەربۆیە تاکـەکان دەتوانن لەو شتە رزگاریان بێـت کـە نایانـەوێت و دەشـتوانن ئـەو شـتەی کـە دەیانـەوێت دەستەبەری بکەن، هەر تاکێك دەتوانێ لەوە تێبگات کە پێویستی بە چ شـتێك هەیـە و چ شتێك دەتوانێ لە بەرامبەریدا بدات، تاکەکان توانای دیاریکردن و بەدواداچوونی بڕیارەکانی خۆیانیـان هەیـە، و ئاکـامی تـەواوی ئەوانـە چوونەسـەرێی سـەروەت و سـامانی هـەموو کۆمەڵگایە. بەو پێیە بازاڕ جێگای ئەو کەسانەیە کە شتێکیان ـــ هەر لـە هیـزی کـارەوە بگرە هەتا کەرەستەکانی بەڕێوەبردنی ژیان و ئامرازەکانی نوێبوونـەوەی سـەرمایە ـــ بـۆ فرۆشتن هەیە.

لایەنگرانی ئەو رێبازە سەرنجی ئەو پرسیە نادەن ئەو کەسانەی کـە شـتێکیان بـۆ فرۆشـتن نییـە و ئەگەریش هەیانبێت خوازیاری نییە، لە بازاڕدا جێگایان نابێتەوە. هیچ گەرەنتییەك بۆ ئەوە نییـە کـە هەر فرۆشیارێك کڕیارێك بدۆزێتەوە یان ئەوەی ئەو کەسـانەی کـە کاڵاکانیـان کڕیاریـان نییـە، بۆیـان قەرەبوو بکرێتەوە. ئابووریناسانی سیاسیی کلاسیك هەرگیز سـەرنجی ئـەو پرسـیان نـەداوە کـە بـازاڕ دەتوانێت یارمەتیدەری سەرلەنوێ بەرهەم هاتنەوەی سیستەمێکی نایەکسان بێت. تـاوتوێکردنی ئـەو تایبەتمەندییانە و کەموکوڕیەکانی بازاڕ بە مارکس و مارکسیستەکانی دواتر سپێردرا.

بازاڕ دەتوانێت جێگایەك بۆ ئاڵوویر دابـین بکـات بـەڵام ناتوانێـت پێداویـستیەکان دابـین بکات. لایەنگرانی بازاڕ پێیانوایە کە تاکەکان بەچەشنێك کاڵاکانی خۆیان دەخەنە بازاڕەوە کە داخوازیی هەبێت. بەرپرسیارێتی شکست یان سـەرکەوتنەکە لـە ئەسـتۆی تـاك دایـە. بـازاڕ ناتوانێت شکست بخوات و هەروەك ژان ـ باپتیست سە (بە پێی فـۆرمی خـۆی کـە دواتـر بـە یاسای سە ناوبانگی دەرکرد) دەیگوت، شکستەکانی تاك نابنە هۆی شکستی بازاڕ. بـە پێـی لێکدانەوەی ئەو، ئەگەر بازاڕ شکست بخوات، ئەو شکسـتە بـەرەنجامی هۆکارەکـانی دەرەوەی بازاڕ وەك نەبوونی ئەو هۆگرییە لەتاکەکاندا کە پارەکەی خۆیان بکەن بە کـاڵا و یـان ئـەوەی

کرێکاران نەیانهەوێت هێزی کاری خۆیـان بفرۆشـن. بـەڵام ئـەو هەڵسـوکەوتانە ناعـەقڵانین. کاراکتـەرانی ئـابووریی عـەقڵانی ئـاوا کـار ناکـەن، چـونکە ئـەوان دەزانـن بـۆ ئـەوەی پێداویستییەکانیان دابین بێت، دەبێ پێویستیی کەسانی دیکە دابین بکەن. بازاڕ دەبێتە هـۆی خۆبەڕێوەبەری و ئاگاداربوون لە پێداویستیەکانی کەسانی دیکە.

فەلسەفەی بازاڕ وەك خوازەیەکی بەهێز بۆ کۆمەڵگایەکی خۆبەڕێوەبەر دەکار کراوە. بازاڕ دامەزراوەیەکی ئابوورییە بەڵام ئایدۆلۆژیای بازاڕ لە ڕێکخسـتنی تـەواوی بوارەکـانی ژیانـدا ڕۆڵێکی زۆری دەستەبەر کـردوە. بنـەمای ئـاڵوێری کـاڵا بووەتـە بنەمایـەکی گشـتی بـەو مانایانەی خوارەوە: (١) تاکەکان لە سەر بنەمای ئـەو گرێمانەیـە لەگـەڵ یـەکتری پەیوەنـدی دەبەستن کە ئەو هاوکارییە بە قازانجی هەمووانە. (٢) وەدیهاتنی داخوازیـەکانی کەسـێك بـە وەدیهاتنی داخوازیەکانی کەسانی دیکەوە بەستراوەتەوە. (٣) بەرژەوەندییە تایبەتیەکانی تـاك دەبێتە هۆی دنەدانی بۆ دابینکردنی پێداویستیەکانی کەسانی دیکـە. کەواتـە، بەرژەوەندییـە تاکەکەسیەکان لەگەڵ بەرژەوەندییە گشتییەکانی کۆمەڵگا دژایەتییەکی نییە، بە مەرجێك کە یەکەم، تاك بە شێوەیەکی ئازادانە دەست بداتە ئاڵوێر، دووهەم، لەگەڵ لایەنە بەرامبەرەکانی گرێبەستەکەی لە ئاستێکی یەکسان دابێت و سێیەمیش ئەوەیە کە بتوانێت لـە بـەڕێوەبردنی ئەو چەشنە ئاڵوێرانە خۆی ببوێرێت.

تاکگەرایی، خاوەندارێتی، و بازاڕی ئازاد وەك توخمە پێکهێنەرەکانی کۆمەڵگای مەدەنی، بنەمای گشتیی ئابووریی سیاسیی کلاسیك و سـەرجەمی نەریتی لیبراڵیان پێك دێنـا. دەکـرێ ڕەخنەی زۆر لەو نەریتە بگیرێت، بەتایبەت لەو بوارەوە کە ئابووریناسانی سیاسـیی کلاسـیك تەنیا داکۆکییان لە کۆمەڵگای مەدەنی دەکرد و سەرنجیان بـە زوڵـم و دەسـتدرێژیەکانی ئـەو نەدەدا. ئەوان لەم ڕێگایەوە ڕاشکاوانە دەستیان دایە پاساوکردن و ڕەوایـی دان بـە دەسـەڵاتی کۆمەڵگای بورژوایی.

سەرەڕای ئەوەش، ئابووریناسانی سیاسیی کلاسـیك بـە پێچـەوانەی لایـەنگرانی ڕێبـازی ئابووریی کلاسیکی نوێی دوای خۆیان، ئاگاداری لایەنە نەرێیەکانی ویست و حەزەکانی مرۆڤ، کاولکاری وارسکەی زێدەخوازی و دابەشکردنێکی نەخوازراو بوون.[27] بۆ نموونە، ئـادام سـمیس

---

٢٧ - بۆ نموونە، ژان ـ باتیست سە کە دەیگوت بازاڕ هەرگیز شکست ناخوات، لە هەمانکاتدا ئاماژەی بەوەش دەکرد کە "لە هەموو شوێنێك توندیی هەژاریی لە پاڵ نەرمیی ساماندا، هەوڵ و تێکۆشان لە پاڵ

ناکۆکیەکانی کۆمەڵگای مەدەنی دەناسی و ئەوەی قبوڵ کردبوو کە بەرژەوەندییەکانی تاك دەتوانێت بە سەر بەرژەوەندیی کۆمەڵایەتیدا زاڵ بێت. ریکاردۆ نیگەرانی کاریگەریی سیاسەتەکانی ئابووری لە سەر چینی کرێکار بوو، ئەو چینەی کە بە گرنگترین چینی کۆمەڵگای دەزانی. مالتۆس لە سەر ئەوە جەختی دەکردەوە کە دەبێ حەقدەستێکی باش بە کرێکاران بدرێت، "بە هۆکارێکی زۆر گرنگتر لە هەر شتێك کە بتوانێت لەگەڵ سەروەت و سامان لە پەیوەندیی دابێت: شادمانی جەماوەری خەڵك" (٥٤، ل١٨٥). ئابووریناسانی سیاسیی کلاسیك بەتوندی داوای ئەو خاڵانەی خوارەوەیان دەکرد: دادپەروەری بۆ هەمووان، رێزگرتن لە بەهای هێزی کار، و کۆمەڵگایەکی هەماهەنگ کە بۆ هەمووان دەرفەتی بردنەسەرێی توانایی و داهێنان برەخسێنێت.

ئەوان سەرەڕای جەخت کردنەوە لە سەر بەرژەوەندییە تایبەتیەکان، چەمکی بەرژەوەندیی گشتییان لەبیر نەکرد. هەڵبەتە بەرژەوەندی گشتی بەمانای زۆری و فراوانیی بەکۆمەڵ ــ واتە نرخی پەرەسەندنی بەرهەمهێنانی نیشتمانی ــ لێك درایەوە. بەڵام لێرەدا گرفتێکی زاتی لە بەرهەمەکانی ئەواندا هەبوو: هەرچەندە چەمکی بەرژەوەندی گشتی پارێزرا، بەڵام بەرپرسیارێتی وەدیهاتنی ئەو بەرژەوەندییە گشتییە نیتر لە ئەستۆی دەسەڵاتی گشتیی دەوڵەتدا نەبوو. پێناسەکردن و وەدیهاتنی بەرژەوەندی گشتی لە بنەڕەتدا بە خوازیارانی بەرژەوەندییە تایبەتیەکان لە کۆمەڵگای مەدەنی سپێردرا.

ئەو ئامانجانەی کە ئەو بیرمەندانە بۆ سیستەمی کۆمەڵایەتی لە بەر چاویان بوو، ئاسایش و ئاسوودەیی هەمووان ــ چ بەشێوەی چوونەسەریی سەروەت و سامان یان بە شێوەی پێکهێنانی رایەڵ و پۆی هاوکاری بەرژەوەندییە تایبەتیەکان ــ بوو. لە راستیدا گاوس بەو ئاکامە دەگات کە ئابووریناسانی سیاسیی کلاسیك زۆر زیاتر لەوەی بە گشتی وێنا دەکرێت، خوازیاری دەست تێوەردانی دەوڵەت بوون بۆ ئەوەی کە سیستەمێکی کۆمەڵایەتی دادپەروەرانە بێتە دی. زۆربەی لایەنگرانی ئەو رێبازە ئاماژەیان بە دەست تێوەردانی دەوڵەت بۆ یارمەتیدان بە بێکاران و هەژاران، داڕشتنی یاسا و رێساکان، و گەرەنتی کردنی دادپەروەری کردووە. "بەم جۆرە، بە روونی دیارە کە بەناو دەوڵەتی پاسەوانی شەوی بیرمەندانی لیبراڵی نەریتی، جیاواز

---

تەمبەڵی و تەوەزرلی، کەلاوەکان لە پاڵ بینا رازاوەکاندا و بە کورتی فراوانییەکی بێهۆ لە پاڵ پێداویستییە هەنووکەییەکاندا دەبینرێ" (٥٤، ل١٩٠).

لە هەرشتێکی دیکە کە دەیتوانی ببێت، بەدڵنیاییەوە دەوڵەتێك نەبوو کە ئابووریناسانی سیاسیی کلاسیك دەیانەویست" (٥٤، ل١٩٣).

باب فاین دەڵێت، ئەوە راستە کە سمیس هەوڵیدا بۆ ئەوەی دەستێوەردانی دەوڵەت کەم بکاتەوە، بەڵام ئەو پرسیە دەبێ لە چوارچێوەی رەخنەی ئەو سەبارەت بە دەستێوەردانی مامەڵەگەرایانە لە بەر چاو بگیرێت" (٤٨، ل٤٣). ئەو نوقسانیەی کە لە کاری ئابووریناسانی سیاسیی کلاسیك دایە ئەوەیە کە ئەوان بەرژەوەندی گشتییان لەبەرچاو گرتووە بەڵام بەرپرسیارێتی و بەرەوپێش بردنی ئەو بەرژەوەندییە گشتییەیان بە دامەزراوەیەکی گشتیی وەك دەوڵەت نەسپارد.

هەر ئەو رەخنەیە بوو کە بووە هۆی ئەوەی میراتی ئابووریی سیاسیی کلاسیك بە دوو لادا بڕوات. لە لایەکەوە مارکس توانی خۆی لە چوارچێوەی نەریتی تیۆری ئەو ئابووریناسانە دابنێت و بەرنامەی سیاسی و رێگەپێدراوی خۆی بۆ کۆمەڵگا لە سەر بنەمای ئەندێشەکانی ئەوان دابڕێژێت. لە لایەکی دیکەوە، ئابووریناسانی کلاسیکی نوێش لە بۆچوونەکانی ئەو ئابووریناسانە کەڵکیان وەرگرت. ئابووریناسانی کلاسیکی نوێ، تێگەیشتنی گشتیی ئابووریناسانی سیاسیی کلاسیکیان لە مەڕ کۆمەڵگای مەدەنی بەتوندی هێنایە خوارەوە. کۆمەڵگای مەدەنی لە دەستەواژە ئابوورییەکان دەرهاویشترا و بازاڕ جێگاکەی گرتەوە. بەم جۆرە، داگەران(مەیل)ە رێگەپێدراوەکانی ئابووریی سیاسیی کلاسیك خرانە پەراوێزەوە و چەمکی کۆمەڵگای مەدەنی لە ژێر سەرنجی گشتیدا هاوسەنگ بووەوە.

چارەنووسی دواتری چەمکی کۆمەڵگای مەدەنی لە تیۆری ئابووریدا، بەشی سیاسیی ئابووریناسانی کلاسیك لە دەوڵەمەندکردنی ئەو چەمکەدا کەمڕەنگ ناکاتەوە. بۆچوونەکانی ئەو ئابووریناسانە کاریگەرییەکی گرنگیان لەسەر لیبرالیزم و مارکسیزمی هیگڵی دانا. لە ئابووری سیاسیی کلاسیك و تیۆری لیبرالیدا، کۆمەڵگای مەدەنی بوو بە چوارچێوەیەکی یاسامەند، سەربەخۆ لە دەوڵەت و لە هەمانکاتدا لە لایەن دەوڵەتیشەوە پشتیوانی لێدەکرا. کۆمەڵگای مەدەنی وەك مەڵبەندی پەیوەندیی گرێبەستەکان کە تێیدا تاکەکان بە پێی هاوکاریی ئازادانە لەگەڵ یەکتری دەجووڵێنەوە، بوو بە گۆڕەپانی مێژوو. هەرچەشنە داهێنانێك لە دەوڵەت ستێنرایەوە و بە کۆمەڵگا سپێردرا و دەوڵەت لە بنەڕەتدا رۆڵی رێکخستنی گرتە ئەستۆ. ئەوە نیشانەی دابڕانێکی واتایی گرنگ بوو لە نەریتی ئەندێشەی سیاسیدا، نەریتێك کە تا ئەو کات جەختی لە سەر دەوڵەت و مافناسیی دەوڵەت دەکردەوە.

## کۆمەڵگای مەدەنی وەك چوارچێوەی ئەنجومەنە کۆمەڵایەتییەکان:

ئابووریی سیاسیی کلاسیك و لیبرالیزمی سەرەتایی لە پێکهێنانی کەشێکی تیۆری و پرکتیکیدا سەرکەوتوو بوون کە بتوانێت ئازادی تاك دابین بکات. بەو حاڵەشەوە کۆمەڵگای مەدەنی شتێك نییە کە جارێك و بۆ هەتاهەتایە سەرهەڵبدات، واتە شتێك کە ئەگەر پێکهات بتوانێ پارێزگاری لە خۆی بکات. لیبراڵەکانی دواتر لەوە تێگەیشتن کە ئازادیەکانی کۆمەڵگای مەدەنی سست و لەرزۆکن و لە بەرامبەر هەرچەشنە دەستدرێژییەك بۆ سەر بنەمای سەربەخۆیی کاردا دەبێ پشتیوانییان لێ بکرێت. لیبراڵەکانی سەرەتایی گونجاوبوونی دەوڵەتێکی سنووردار و داخوازیان نیشان دا. لیبراڵەکانی دواتر لەوانە جۆن ستیوارت میل و ئالێکسی دۆ تۆکڤیل لەوە تێگەیشتن کە دەوڵەت زیاتر لەوەی چاوەڕوان دەکرا بەهێز بووە و دەسەڵاتی بەدەستەوە گرتووە. لە راستیدا دەوڵەتی نوێ بە دەزگای سەپاندنی دەسەڵات و چاودێری ئەو لەچاو دەوڵەتەکانی پێشوو کە وەها هێز و ئالییەتێکیان نەبوو، مەترسییەکی زیاتری بۆ ئازادیی مرۆڤ هەبوو. دەسەڵاتی دەوڵەت ــ هەرچەندە هەوڵیش دەدرا بۆ ئەوەی لە رێگای گریمانە رێگە پێدراوەکانی تیۆری سیاسیی لیبراڵەوە بەرتەسك بکرێتەوە ــ دەیتوانی تاك و ئازادیەکەی ئەو سەرکوت بکات، هەروەك زۆرجارانیش ئەوکارەی دەکرد.

دۆ تۆکڤیل لە **دیموکراسی لە ئەمریکادا** ئاماژەی کرد بەو مەترسیانەی لەگەڵ دەوڵەتە دیموکراتیەکان دێنەئاراوە. گوتی دیموکراسی شێوازێکی تایبەت لە ستەمکاری دەخولقێنێت. ئەو دەوڵەتانەی کە لە رێگای هەڵبژاردنەوە شەرعییەت وەردەگرن، هەر بە سەر هەمان ئەو کەسانەدا سەروەری دەکەن کە دەنگیان پێداون. لە ئاکامدا دامەزراوە کۆمەڵایەتییەکان لە لایەن دامەزراوە سیاسییەکانەوە کپ و بێدەنگ دەکرێن و مەیلە دیموکراتیەکانی کۆمەڵگا لە رێگای چەقبەستنی دەسەڵات لە دەست دەوڵەتی بەڕێوەبەردا، کۆنترۆڵ دەکرێن. کۆمەڵگای مەدەنی ئەو دەسەڵاتەی بە دەوڵەت بەخشیوە بەڵام دەبێتە قوربانیی ئەو دەسەڵاتەش.

حکومەت تەنیا دەتوانێ چالاکییە پیشەییەکانی بەرهەمهێنان ئیدارە بکات و ئیتر ناتوانێت یارمەتی بە خولاندنەوەی بیروباوەڕ و هەستەکانی نێو کۆمەڵێکی بەرین بکات. کاتێك کە حکومەت تێدەکۆشێت بۆ ئەوەی لە قەڵەمڕەوی سیاسیی خۆی ئەولاوەتر بچێت و پێ بنێتە ئەو رێگایەوە، هەرچەندە بەشێوەیەکی نەخوازراویش بێت دەست دەکات بە سەرەڕۆییەکی رێگە پێنەدراو. لەو رووەوە کە حکومەت تەنیا دەتوانێت یاسا وردبینیەکان

داسەپێنێت، ئەو فیکر و بیروباوەڕانەی کە ئەو پشتیوانییان لێدەکات، بە ڕێکی بەڕێوە دەچن و هەرگیز بە ئاسانی ناکرێ داواکاری و بڕیارەکانی لێك جیا بکرێتەوە (٣٧،ب١، ل١١٧).

توانایی و داهێنانی کۆمەڵگا لەناو دەچێت و کۆمەڵگا بۆ دابینکردنی پێداویستییە بنەڕەتییەکان و سەقامگیرکردنی نەزم و یاسا بە دەوڵەتەوە دەبەسترێتەوە. بەم جۆرە، دەسکەوتەکانی شۆڕشێکی دیموکراتی لەناو دەچن. بەڵام دۆ تۆکڤیل لە هەمانکاتدا بەو ئاکامە دەگات کە ناکرێ دەسەڵاتی دەوڵەتی لەناو بچێت و یان تەنانەت بۆ لانیکەمی خۆیشی دابەزێت. کۆمەڵگا ئاڵۆز و نوێیەکان بۆ پاراستنی نەزم و یاسا پێویستییان بە دەوڵەتە، بەڵام ئەو دەوڵەتە دەبێ سنووردار بێت.

دۆ تۆکڤیل ئەوەی بەڵگەمەند دەکرد کە کۆمەڵگای مەدەنی دەبێ ئامرازێك بۆ بەرتەسك کردنەوەی دەسەڵاتی دەوڵەت و وەڵامدەرەوەبوونی ئەو بدۆزێتەوە. یەکێك لەو ئامرازانە، دابەشکردنی دەسەڵاتە لە نێوان دامەزراوە جۆراوجۆرەکانی دەوڵەتدا، ئەو شتەی کە دواتر بە تیۆری جیاکردنەوەی دەسەلاچتەکان ناوبانگی دەرکرد. ئامرازێکی دیکە، خولی هەڵبژاردنەکانە کە دەبێتە هۆی ئەوەی دەسەڵات دەست بە دەست بگەڕێت و دەتوانێت پێش بە پاوانخوازی دەسەڵات بگرێت. بەڵام بە بڕوای دۆ تۆکڤیل، گرنگترین ئامرازی کۆنترۆڵی دسەڵات، بوونی ئەنجومەنە کۆمەڵایەتییەکانە. ئەو ئەنجومەنە کۆمەڵایەتی، فەرهەنگی، پیشەگەری و ئایینیە لە کۆمەڵگای مەدەنیدا، دەتوانن دەسەڵاتی دەوڵەت کۆنترۆڵ بکەن. ئەو ئەنجومەنە بەرین وبەربڵاوانە بە گوتەی دۆ تۆکڤیل "چاوی سەربەخۆ"ی کۆمەڵگا پێك دێنن. ئەو ئەنجومەنانە بە سەرنجدانی خۆیان بە چالاکییە ڕۆژانەکان و نەتەنیا ڕووداوەکانی وەك هەڵبژاردنەکان، بەشداریی لە ڕەهەندە بەربڵاوترەکانی کۆمەڵگا مەیسەر دەکەن. ئەو ئەنجومەنانە بە سەرنجدان بە پرسە بچوکەکان دەبنە هۆی چوونە سەرێی وشیاری و وەخەبەرهاتنی کۆمەڵگا. ئەوان بەم جۆرە ڕێز لە دەسکەوتەکانی بزووتنەوە دیموکراتیەکان دەگرن. بە پێی لێکدانەوەی دۆ تۆکڤیل یەکێك لە مەرجە پێویستەکانی دیموکراسی، بوونی کۆمەڵگایەکی مەدەنی فەرەچەشن یان فرەچەشنخوازییە: "هیچ کۆسپێکی دیکە ناتوانێت بەر بە ستەمکاری بگرێت".

بەڵام تیۆری لیبراڵی لێرەدا لەگەڵ گرفتێك بەرەوڕوو دەبێتەوە. نەریتی لیبراڵی تووشی دژایەتییەکی توندی نێوان مافەکانی تاکەکەسی ـــ لەوانە مافی گۆشەنشینی یان چوارچێوەی تایبەتی و مافی بەشداری نەکردن لە هەر چەشنە چالاکییەکی کۆمەڵایەتی ـــ پێویستیەکانی

پانتاییەکی گشتی بەشداریخوازانەیە. بەرتەسك بوونەوەی دەوڵەت کە یەکێك لە داواکارییە سەرەکییەکانی لیبراڵەکان بوو، پێویستیی بە هەبوونی کۆمەڵگایەکی مەدەنی چالاك و بزێو هەبوو، یانی چەشنێك لە کۆمەڵگای مەدەنی کە هەمیشە سەربەخۆیی خۆی لە دەوڵەت بپارێزێت و تایبەتمەندییەکەشی پێکهێنان و خولاندنەوەی بیرورای گشتی، هۆشیاری، و چالاکیی سیاسی بێت. بەڵام ئەوەش پێویستی بەوە هەیە کە تاکەکان هان بدرێن بۆ ئەوەی بۆ بەرێوەبردنی وەها گەلاڵەیەك بە ئەوانیترەوە پەیوەست بن. چونکە تێکهەڵچوون لەگەڵ دەوڵەتیش ناوەرۆکێکی سیاسی هەیە، تاکەکان دەبێ ببنە بوونەوەرێکی سیاسی، ئەو بوونەوەرانەی کە ئامادەن خۆیان بۆ ئازادیی کۆمەڵگای مەدەنی تەرخان بکەن. بۆ پاراستنی ئەو چوارچێوەیەی ماف و ئازادییەکان کە ئابووریناسانی سیاسیی کلاسیك بە توندی داکۆکییان لێ دەکردن، تاکەکان دەبێ لەگەڵ ئەوانیتردا لە چالاکییە ئەنجومەنیەکاندا بەشداری بکەن. بەڵام ئەو کارە لەوانەیە بەرژەوەندییەکانی تایبەتیی تاك و مافی گۆشەنشینی ئەو تووشی خەسارەت بکات. بەواتایەکی دیکە، ئەو گرفتەی کە لە تیۆری لیبراڵیدا پێکهات، بەرەورووبوونەوە لەگەڵ پرسی رێککەوتنی نێوان بەرژەوەندییەکانی تاکەکەسی و پێویستیی بەهێزکردنی بەردەوامی کۆمەڵگای مەدەنی بوو.

ئابووریناسانی سیاسیی کلاسیك لە سەر ئەو باوەڕە بوون کە بازاڕ ئالییەتێکە کە دەتوانێت بەرژەوەندییە تاکەکەسی و کۆمەڵایەتییەکان پێکەوە گرێ بدات. بەڵام کاتێك کە لە بۆچوونی بەربلاوتری لیبراڵەکاندا جیاواز لە پرسە ئابوورییەکان سەرنجی پرسە سیاسییەکانیش درا، مافی گۆشەنشینی تاکەکان و پێویستیەکانی کۆمەڵگای مەدەنی کەوتنە لایەنی بەرامبەری یەکترەوە. کەسێك کە لە مافی گۆشەنشینی خۆی کەڵك وەردەگرێت، دەتوانێت تاکێکی ناسیاسی بێت، بەڵام ئەگەر ئەو ناسیاسی بێت ــ واتە لە بەرنامەکانی بەرتەسکردنەوەی دەوڵەتدا بەشداری نەکات ـــ مافی گۆشەنشینی ئەو دەتوانێت بکەوێتە مەترسیەوە. لە لایەکی دیکەوە، ناکرێ هیچ کەس بەوە ناچار بکەی کە لە ژیانی گشتیدا بەشداری بکات، چونکە ئەو کارە کاریگەری نیگەتیڤی لە سەر ئازادیە بنەڕەتییەکەی دەبێت. دەبوایە رێگاچارەیەك بۆ چارەسەری دژایەتی نێوان مافی هەڵبژاردنی ئازادانەی تاك و پێویستیی کۆمەڵگای مەدەنی بە چالاکیی و بەشداریی بدۆزرابایەوە.

ڕێگاچارەیەك كە بۆ ئەو گرفتە دۆزرایەوە، پێكهێنانی ئەنجومەنە كۆمەڵایەتی و سیاسی و ئیرادیەكان بوو. ئەو ئەنجومەنانە لە سەر بنەمای سەرەكیی هەڵبژاردنی ئازادانە راوەستابوون و نەیاندەتوانی كەسێك ناچار بكەن كە بە ئەنجومەنێك پەیوەست بێت. بەو حاڵەشەوە، كاتێك كە ئەنجومەنەكان پێكهاتن، لە بەرژەوەندییە تایبەتیەكانی تاكەكان ئەولاوەتر چوون، چونكە تاكەكانیان لە چوارچێوەی بەرنامە كۆمەڵایەتییە بەربڵاوترەكاندا لە دەوری یەكتری كۆ دەكردنەوە. جۆن ستیوارت میڵ بەم چەشنە باسی ئەو پرسیەی كردوە:

ئەوەی گرنگترە، پرسە ئەخلاقییەكانی سەرچاوەگرتوو لە بەشداریی هاووڵاتیانی تایبەتی لە چالاكییە گشتییەكاندایە هەرچەندە بەشێوەیەكی بەرتەسكیشە. كەسێك كە بەشداری دەكات داوای لێدەكرێت كە سەرنجی بەرژەوەندییەكی جیا لە بەرژەوەندیی خۆی بدات، بە پێی پێوانەكانی بەدەر لە هۆگرییە تایبەتیەكانی خۆی سەبارەت بە داواكارییە دژەبەرەكان بڕیار بدات، و هەمیشە پەیڕەوی لەو بنەما و یاسایانە بكات كە بەرژەوەندیی گشتیان لەبەر چاوە. بۆیە ئەو هەستە تێیدا پێك دێت كە سەر بە كۆمەڵە و هەر شتێكیش كە بە قازانجی كۆمەڵ بێت، بە قازانجی ئەویشە. كاتێك كە ئەو روحە گشتییە بوونی نییە، بەدەگمەن ئەو هەستە پێك دێت كە ئەو تاكە تایبەتیانەی كە پێگەیەكی كۆمەڵایەتیی باشیان نییە، لە بەرامبەر كۆمەڵگادا ئەركێكی دیكەیان بەدەر لە بەستراوەیی بە یاساكان و پەیڕەوی لە حكومەت هەبێت. هیچ چەشنە هەستێكی لە خۆبوردن و سۆلیدارێتی لەگەڵ كۆمەڵگا بوونی نییە. هەرچەشنە ئەندێشە و هەستێك لە پەیوەند لەگەڵ بەرژەوەندیی یان ئەركەكاندا، بە تاك و خێزان كۆتایی پێ دێت (١٢٨، ل٢١٧).

ئەنجومەنەكان تاكە گۆشەنشینەكان لەدەوری یەكتری كۆ دەكەنەوە و بەم جۆرە هەروەك دۆ تۆكڤیل دەڵێت، یارمەتی بە ژیانی سیاسی و ژیانی مەدەنی دەكەن. دۆ تۆكڤیل دەڵێت، "ئەنجومەنێك دەبێتە هۆی ئەوەی تاكە پەرتەوازەكان لێك نزیك ببنەوە و بەرەولای یەك ئامانج جوولە بكەن" (٣٧،ب١، ل١٩٢). بەم جۆرە ئەنجومەنەكان ژیانی گشتی رێكدەخەن، كەشی مەدەنی پتەو دەكەن، و بەها دیموكراتیەكان سەقامگیر دەكەن. "تەنیا بە كاریگەریی بەرامبەری تاكەكان لە سەر یەكترییە كە هەست و ئەندێشەكان گەشە دەكەن و روانگەی مرۆڤ بەربڵاوتر دەبێت" (هەمان سەرچاوە،ب٢، ل١١٧). ئەنجومەنە

کۆمەڵایەتییەکان ئەو ئامرازانەن کە لە ڕێگای ئەوانەوە ئەو تاکانەی کە بیر لە بەرژەوەندییە تایبەتیەکانی خۆیان دەکەنەوە، فێری ئەوە دەبن کە هەست بە سۆلیدارێتی لەگەڵ کۆمەڵ بکەن. بەمچەشنە ئەنجومەنە کۆمەڵایەتییەکان تاکە گۆشەنشینەکان لەگەڵ گروپ و هۆگرییە بەرینترەکاندا گرێ دەدەن.

لیبراڵەکان زۆربوونی ئەنجومەنەکانیان هەم بە ئامرازێك دەزانی بۆ ڕێککەوتنی بەرژەوەندییە تایبەتی و گشتییەکان و هەم وەك کۆسپێکیشیان ناو دەبرد لە سەر ڕێگای سەپاندنی دەسەڵاتی هەوسارپچڕاوی دەوڵەت. دۆ تۆکفیل لە **دیموکراسی لە ئەمریکادا** دەڵێت کە فراوانی باشترین گەرەنتییە بۆ دیموکراسی.

بەبڕوای دۆ تۆکفیل، ئەنجومەنە کۆمەڵایەتییەکان دەبنە هۆی پەیوەندیی تاکەکان لەگەڵ یەکتری و داکۆکی لە ئازادی و سەربەخۆیی مەڵبەندی مەدەنی دەکەن. گرنگتر ئەوەیە کە ئەو ئەنجومەنانە بۆ پشتیوانی لە تاك لە بەرامبەر دەسەڵاتی دەوڵەتدا پێویستن. دۆ تۆکفیلیش هەروەك هیگڵ نیگەرانی دامەزراوەکانی ڕێکخستنی پەیوەندییەکان لە کۆمەڵگا نوێیەکاندا بوو. لە کۆمەڵگای دەرەبەگایەتیدا، چینی دەوڵەمەند هەروەك قەڵغانێك لە نێوان تاك و دەوڵەتدا بوو. هەربۆیە، چینی دەوڵەمەند لە بەرامبەر دەسەڵاتی هەوسارپچڕاوی پاشادا، وەك بێژینگێك کاری دەکرد. دۆ تۆکفیل باسی ئەوەی دەکرد کە لە وڵاتانی دیموکراتیی نوێدا، ڕێکخراوە کۆمەڵایەتییەکان جێگای چینی دەوڵەمەندیان گرتەوە. ئەو ڕێکخراوانە هەم لە بەرامبەر دەسەڵاتی زۆرینەدا و هەم لە بەرامبەر دەوڵەتیشدا پشتیوانی لە تاك دەکەن. ئەوان ڕوحێکی مەدەنی زاڵ دەکەن و یارمەتی بە سەرهەڵدانی کۆڕا یان هاودەنگی دەکەن. دۆ تۆکفیل دەیگوت کە زانستی ئەنجومەن ناسی دایکی زانستە، چونکە لە ڕێگای ئەنجومەنە کۆمەڵایەتییەکانەوە دەکرێ دەستت بە نرخ و گرنگیی مەدەنی و سیاسی ڕابگات.[28] لە کۆمەڵگایەکدا کە "ڕۆڵ"ەکان

---

۲۸ - "لە وڵاتانی دیموکراتی، زانستی ئەنجومەنناسی دایکی زانستە و پێشکەوتنی تەواوی زانستەکانی دیکە بەستراوەتەوە بە بەرەوپێشچوونی ئەو زانستە. لە نێو ئەو یاسایانەدا کە بە سەر کۆمەڵگا مرۆڤایەتیەکاندا دەسەڵاتدارێتی دەکەن، واپێدەچێت کە یەکێك لەوان وردتر و ڕۆشنتر لەوانی دیکەیە. ئەگەر بڕیار وایە کە مرۆڤەکان پێشکەون یان بە پێشکەوتوویی بمێننەوە، هەر بەو ڕادەیە کە یەکسانیی بارودۆخەکە دەچێتەسەرێ، چالاکیی ئەنجومەنەکانیش دەبێ بچێتە سەرێ" (۳۷،ب۲، ل۱۱۸).

لێك جیاكراونەتەوە، ئەنجومەنەكان ئەو ئالییەتە دیارانەن كە تاكەكان لە دەوری یەكتر كۆ دەكەنەوە و یارمەتی بە كۆنترۆڵی دەسەڵاتی دەوڵەت دەكەن.

دۆ تۆكڤیل میراتێكی جێگای سەرنجی لە ئەندێشەی سیاسیدا بەجێهێشت. ناوبراو دوانێتی نەریتیی دەوڵەت و كۆمەڵگای بژار كرد و مەڵبەندێكی سێیەمی هێنایە ئاراوە كە روحی بەشداریی سیاسی بە زیندوویی دێڵێتەوە. ئەو كۆمەڵگای بەسەر سێ بەشدا دابەشكرد: ١ــ دەوڵەت بە سیستەمە فەرمیەكەیەوە كە لە ئەنجومەنی نوێنەران، دادگاكان، بەرێوەبەرایەتیەكان و هێزە سەربازیەكان پێك دێت ٢ ــ مەڵبەندی چالاكییە ئابوورییە تایبەتیەكان ٣ــ كۆمەڵگای مەدەنی كە لە سەر بنەمای هونەری ئەنجومەن و كۆڕوكۆبوونەوە راوەستاوە. لە مەڵبەندی سێیەمدا، پارتەكان، بیرورای گشتی، كەنیسەكان، بزووتنەوە ئەخلاقیەكان، كۆڕوكۆمەڵە ئەدەبی و زانستیەكان، و ئەنجومەنە پیشەگەر و شادیەكان "هێزێكی لەرادە بەدەر"یان هەیە. لە رێگەی ئەو ئەنجومەنانەوە دەكرێ زێدەرۆییە گریمانەییەكانی دەوڵەتە چەقبەستوەكان بەتایبەت لە كۆمەڵگا دیموكراتیەكاندا كەم بكرێنەوە.

دەكرێ هێماكانی ئەو میراتە لە مەڕ كۆمەڵگای مەدەنی لە ئەندێشەی سەردەمدا ببیندرێن. كۆمەڵگای مەدەنی بەشێوەیەكی روو لە زیادبوون، وەك مەڵبەندێك مانا دەكرێتەوە كە تێیدا ئەنجومەنە فرە و بەربڵاوەكان، تاكەكان لە دەوری هۆگریی هاوبەش لە دەوری یەكتری كۆ دەكەنەوە. ئێستا بێجگە لە دەوڵەت و سیستەمی ئابووری، مەڵبەندێكی سێیەمیش كە لە ئەنجومەنەكان پێك دێت، وەك یەكێك لە توخمە سەرەكییەكانی كۆمەڵگا دیموكراتیەكان هەژمار دەكەن و هەر ئەو مەڵبەندەیە كە قەڵغانێك لە بەرامبەر دەوڵەتە سەرەڕۆكاندا دروست دەكات.

بینیمان كە بەچ شێوەیەك وردە وردە لێك جیابوونەوەی دوو مەڵبەندی مەدەنی و سیاسی كامڵ بوو. دوای ئەندێشەی كەسانێكی وەك بیرمەندانی گرێبەستی كۆمەڵایەتی كە لە سەر ئەو باوەڕە بوون تاكەكان هەردووك كۆمەڵگای مەدەنی و سیاسی پێك دێنن، لە بیرۆدزیی سیاسییدا ئەو ئەندێشەیە زاڵبوو كە مەنوای راستەقینەی تاكەكان، كۆمەڵگای مەدەنییە. ئەو ئەندێشەیە پێشهاتی تیۆری گرنگی لەگەڵدابوو. لیبراڵەكان باسی ئەوەیان كرد كە چونكە لە كۆمەڵگای مەدەنی دایە كە تاك دەتوانێت وەك بوونەوەرێكی داهێنەر و بەرهەمهێنەر خوخدەی خۆی وەدی بێنێ، ئەو مەڵبەندە دەبێ بە

ئازادی بهێنێتەوە بۆ ئەوەی خودی کۆمەڵگا بتوانێ گەشە بکات. ئەو لێکدانەوەیە لە ڕێگای ئەم ئەندێشەوە پاساوی ئەخلاقیی بۆ کرا کە بەدواداچوونی بەرژەوەندییە تایبەتیەکان دەتوانێت بە قازانجی هەموو کۆمەڵگا بێت. ئەو لێکدانەوەیە لە لایەکەوە یارمەتی بە پێویستیی بەرتەسك کردنەوەی دەوڵەتیش کرد. لیبراڵەکان لە سەر ئەو باوەڕە بوون کە دەسەڵاتی دەوڵەت دەبێ بەرتەسك بکرێتەوە، چونکە کۆمەڵگا دەتوانێ هەم ڕێنوێن و هەم بەڕێوەبەری خۆی بێت. دەست تێوەردانی دەوڵەت دەبێتە هۆی لەناوچوونی توانایی و داهێنانەکانی مرۆڤ.

تیۆری سیاسی لێرەدا بە تەواوی وەرسووڕا، بیرمەندانی سیاسیی پێشوو گرنگیان بە دەوڵەت دەدا، بیرمەندانی گرێبەستی کۆمەڵایەتی وەك هۆبز باسی ئەوەیان دەکرد کە بۆ دروست بوونی کۆمەڵگا، دەوڵەتێکی بەهێز پێویستە. بەڵام لیبراڵەکان لە سەر ئەو باوەڕە بوون کە چونکە کۆمەڵگا بەخۆیدا دەچێتەوە و دیسانەوە خۆی بەرهەم دێنێتەوە، دەسەڵاتی دەوڵەت دەبێ بە لانیکەمی خۆی بگات. بەم جۆرە، سەرنجی بیرمەندانی سیاسی لە دەسەڵاتی دەوڵەتەوە بەرەولای کۆمەڵگای مەدەنی وەرسووڕا.

لیبراڵە سەرەتاییەکان هەر لە بنەڕەتدا کۆمەڵگای مەدەنییان بە پانتاییەکی نیگەتیڤ دەزانی واتە بوارێك کە دەوڵەت کاری بەسەریەوە نەبوو. بەڵام کاتێك کە دەسەڵاتی مەترسیداری دەوڵەتی نوێ خۆی دەرخست، لیبراڵەکانی دواتر کۆمەڵگای مەدەنییان وەك مەڵبەندێکی چالاك و بزێو گەڵاڵە کرد. کۆمەڵگای مەدەنی بوو بە بوارێك کە تێیدا تاکەکان بۆ بەرتەسك کردنەوەی دەسەڵاتی دەوڵەت دەستیان دەدایە ڕێکخستنی بەکۆمەڵی خۆیان. بە بڕوای جۆن ستیوارت میل و دۆ تۆکڤیل، ئەنجومەنە کۆمەڵایەتییەکان ئامرازێك بوون کە تاکەکان بە کەڵك وەرگرتن لەوان گوتارێکی سیاسیان پێك دێنا. ئەو ئەنجومەنانە پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان بەهێز دەکەن و سەرهەڵدان و مانەوەی گوتاری سیاسی سەبارەت بە چوارچێوە و ناوەرۆکی دەسەڵاتی دەوڵەت مەیسەر دەکەن. بەم چەشنە، کۆمەڵگای مەدەنی دەبێتە هۆی سەرهەڵدانی سنوورێك لە نێوان تاك و دەوڵەتدا.

لەو قۆناغە لە گەشەی لیبراڵیزم، چەمکی کۆمەڵگای مەدەنی بەگشتی بۆ ڕێکخستنی پەیوەندییەکانی دەوڵەت و کۆمەڵگا دەکار دەکرا. بەڵام ئەو پرسیە بە باشی دەرکی پێ کرا کە پەرەسەندنی دەوڵەت دەبێتە هۆی پاشەکشەی بواری مەدەنی. دەسەڵاتی دەوڵەتی تەنیا بە پەرەپێدانی کۆمەڵگای مەدەنی بەرتەسك دەکرێتەوە. لیبراڵەکان لە هەوڵەکانی

خۆیاندا بۆ پێکهێنانی مەڵبەندێك بۆ ئـازادیی تاکەکەسـی، سـەرنجێکی زۆریـان نەدایـە پرسەکانی نێوخۆی کۆمەڵگای مەدەنی. ئەوان دەیانەویست گوتاری سیاسی لە دەوڵەتەوە بەرەولای کۆمەڵگا وەرسوڕێنن. بەڵام چیرۆکی کۆمەڵگای مەدەنی هێشتا نوقسـان بـوو، چونکە لیبراڵەکان باسی پرسە نێوخۆییەکانی کۆمەڵگای مەدەنییان نەکردوە و دەرکیان بە لاوازیی ئەو مەڵبەندە نەکردوە کە پشتی بە تاکە خۆویست و خودتەوەرەکان بەستبوو. ئەو پرسیە دەرك نەکرا کە خودی کۆمەڵگای مەدەنی لەگەڵ مەترسی لێك هەڵوەشان و شـەڕ بەرەوڕوویە و بۆ چارەسەری ناکۆکییەکانی خۆی پێویستیی بە بنەمایەکی سەرەکی هەیە. باس کردنی ئەو پرسیە بە هیگڵ، مارکس و گرامشی سپێردرا و ئێستا تیۆرەکانی ئەوان تاوتوێ دەکەین.

## کۆمەڵگای مەدەنی: نەریتی هیگڵ و مارکس و گرامشی:

چەمکی کۆمەڵگای مەدەنی هیچ مانا یان سنوورێکی وردی بەدەست نەهێنا تا ئەوەی شارەزایانی ئابووریی سیاسیی کلاسیك بۆ دیاریکردنی سنووری راستەقینەی پانتایی ئابووری و جیاکردنەوەی لە چوارچێوەکانی دیکە دەستیان بە بەڵگەمەندکردنی کارەکانیان کرد. ئەوان ئەو چوارچێوەیان بە کۆمەڵگای مەدەنی ناوزەد کرد. لە لای ئابووریناسانی سیاسیی کلاسیك، کۆمەڵگای مەدەنی لە تایبەتمەندیەکانی کۆمەڵگای پیشەیی بوو کە لە حاڵی سەرهەڵدان دابوو و هێماکانیشان دابەشکردنی ئاڵۆزی کار، چەقبەستن لە سەر بەرهەمهێنان، و ئاڵوێری ئابووری بوو. کۆمەڵگای مەدەنی لە بەرهەمەکانی شارەزایانی ئابووریی سیاسیی کلاسیکدا، رۆشنی، ناوەرۆك و وردبینی واتایی پەیدا کرد. ئەوە تا رادەیەکی زۆر لەو راستییەوە سەرچاوەی دەگرت کە ئەو بیرمەندانە لە کۆمەڵگای خۆیاندا لە گەڵ هەمان ئەو گۆڕانکارییانە بەرەوڕوو بوون کە ببووە هۆی سەرهەڵدانی ئابووری وەك مەڵبەندێکی چالاکیی جیاواز و زاڵ. ئالن مایسکنز ڤود باسی ئەوە دەکات کە ئەو تێگەیشتنە نوێیە لە "کۆمەڵگای مەدەنی":

ئەو تێگەیشتنەی کە ویستی گەیشتن بە سامانی ئەو یەکەمین جار لە سەدەی هەژدەهەم دابوو ــ شتێکی تەواو جیاوازە لە چەمکەکانی پێشووتری "کۆمەڵگا": کۆمەڵگای مەدەنی نوێنەری مەڵبەندێکی بەدەر لە پەیوەندیەکان و چالاکییە کۆمەڵایەتییەکانە، کە لە دەوڵەت جیا بووەتەوە بەڵام نە گشتییە و نە تایبەتی، رەنگە لە یەك کاتدا هەردووکیان بێت، و نەك تەنیا پانتاییەکی تەواوی کارە بەرامبەرە کۆمەڵایەتییەکانی جیا لە چوارچێوەی تایبەتیی خێزان و چوارچێوەی گشتیی دەوڵەت، بەڵکو تایبەتیتر لەوەش، رایەڵ و پۆیەك لە پەیوەندییە جیاوازە ئابوورییەکان، مەڵبەندی بازاڕ، بواری بەرهەم هێنان و دابەشکردن و ئاڵوێر، لە خۆیدا وێنا دەکات (١٨٠، ل٦١).

ئابووریی سیاسیی کلاسیك لەو رووەوە سەرەتی بەو مەڵبەندە دەبەخشێت کە وەفادارەکانی پێیانوابوو لە ئابوورییەکی پیشەیی لە حاڵی سەرهەڵداندا، هێزی بزوێنەر بۆ گەشە و پەرەسەندن، بۆ گۆڕانی کۆمەڵگا، لە راستیدا بۆ گەیشتنی کۆمەڵگا بە ماناکەی خۆی، لە قەڵەمڕەوی ئابووریدا جێی دەبێتەوە. لەوەها کۆمەڵگایەکدا نەتەنیا، هەر بەو شێوەیەی کە ئادام سمیس وەبیری هێناوەتەوە و قسەی لە بارەیەوە کردووە چالاکیی ئابووریی بە سەر

چالاکیی سیاسیدا زاڵە، بەڵکو لایەنە کۆمەڵایـەتی و سیاسـییەکانیش کـە بەرهـەم هێنـان و ئاڵوویر رێك دەخەن، یانی مافی خاوەندارێتی و ئەسـتاندنەوەی ئـەو، بەتایبـەت هێـزی کـار، هەروەها ئازادیی کەوتنەشوێن پیشەیەك کە تاکەکە شیاویەتی لە جیاتی ئـەو پیشـەیەی کـە تێیدا لەدایك بووە، ئازادیی کەوتنەشوێن ئەو ئامانجانەی کە تاك بۆخۆی دیاری کردوون، ئـەو گریمانەیە کە ئاڵوویر لە سـەر بنـەمای یەکسـانییە، و بنـەمای بەدواداچـوونی رێگەپێـدراوی بەرژەوەندییەکانی خود، هەم لە بواری ئایدۆلۆژیەوە و هەم لە بواری دامەزراوەییەوە بـە سـەر کۆمەڵگادا زاڵ دەبن. ئەم دامەزراوە و ئایدۆلۆژیانە، بە فەرمی هـەلی دەربـازبوون لـە رۆڵـە تایبـەتی و ئـەو رۆڵانـەی کـە بـە مـیرات بـۆی ماونـەوە و ئـازادیی کەوتنـە شـوێن ئـەو بەرژەوەندییانەی کە بۆ تاك بۆ خۆی دیاری کردوون، پێشکەش بە تاك دەکەن. ئەو کەشەی کە شارەزایانی ئابووریی سیاسی پێیانگوت کۆمەڵگای مەدەنی، دەخولقێندرێت، کەشێك کـە لـە ناخی خۆیدا نوێیە و لە کۆمەڵگاکانی پێشوودا نەناسراو بوو. لەو کەشەدا تاك دەتوانێـت بـە هاوڕێیەتی ئەوانیتر بە شوێن ئـەو ئامانجانـەوە بێـت کـە بۆخـۆی دیـاریکردوون. شـارەزایانی ئابووریی سیاسی باسی ئەوەیان دەکرد کە لـە بـەر ئـەو هۆکارانـە دەبـێ خودموختـاری بـەو مەڵبەندە بسپێردرێت. لە ئاکامدا دەوڵەت و کۆمەڵگای مەدەنی لە یەکتری جیا بوونەوە و بۆ هەرکام لەوان رۆڵی جیاواز دیاری کرا و ئەوە کۆمەڵگای مەدەنی بوو کە لە ریزی پێشەوە جێی بووەوە.

رێبازی ئابووریی سیاسیی کلاسیك بارمەتییەکی جیـاوازی بـە تیـۆری سیاسـی کـرد چـونکە هەروەك لە بەشی پێشوودا ئاماژەی پێکرا، گوتاری سیاسی لە دەوڵەتەوە بەرەو کۆمەڵگای مەدەنی راگواست. ئەوان بە حەز وتاسەوە خوازیاری ئازادیی کۆمەڵگای مەدەنی بوون، چونکە لە سەر ئـەو باوەڕەبوون، کۆمەڵگا کە لە چالاکانی هۆگریـیە لۆژیکیەکان پێك دێت، بۆ خۆی رۆڵـی رێکخسـتنی هەیە. بەمجەشنە بەشێوەیەکی بەرچاو بارمەتیان بـە گەڵاڵـەی لیبراڵـی دیـاریکردنی چوارچـێوەی دەوڵەت گەیاند. شارەزایانی ئابووریی سیاسیی کلاسیك کە نیگەران بوون لە سەلماندنی ئەوەی ئایـا ئەم مەڵبەندە دەتوانێت بەرژەوەندییە تاکەکەسی و گشتییەکان رێکبخات، هێز و توانایی کۆمەڵگای مەدەنییان بۆ گەیشتن بە هەماهەنگی زێدە لە پێویست لە بەرچاو گرت. هەر لەو بوارەوە وەك چـۆن کارل مارکس دواتر بۆچوونی خۆی دەربڕی، دەکرێ ئەندامانی ئەو رێبـازە وەك یەکـەمین وتەبێـژانی سیستەمی لە حاڵی سەرهەڵدانی سەرمایەداریدا ناوبەرین.

بەلاّم وا نییە کە شـارەزایانی ئـابووریی سیاسـیی کلاسـیك ئاگایـان لـە تالاّنکەریـەکانی کۆمەڵگای مەدەنی نەبووبێت. لە راستیدا لە نێو لێکدانەوەکانیاندا لـەو پێنـاوەدا کـە نـابێ دەست لە کۆمەڵگای مەدەنی وەربدرێت، و ئەوەی ترسیشیان لە سەربەخۆیی وەها قەڵەمڕەوێك لە بواریی مرۆییەوە هەلگری بەهایەکی قورس بێت، ناکۆکییەکی قوڵە. بەلاّم هەرگیز بەرادەی پێویست لە سەر ئەو ناکۆکییە کار نەکرا بەگشتیش لە بەر ئەوەی کە گەلاّڵەکەیان گەلاّڵەیەکی بەرتەسك بوو. پێویستییان بە دانانی کۆمەڵگایەکی مەدەنی سـەربەخۆ لـە دژی دەوڵـەتێکی بەهێز و دڕندەی مامەڵەچی (مرکانتیلیست)، ئەوی سـنووردار دەکـردەوە. بەوشـێوەیەی کـە ئەوان لە بیری بەرتەسك کردنەوەی دەوڵەتدا بـوون، سـەرنجێکی ئـەوتۆیان نەدایـە ئـەوەی کـە کەسانی فرەخوازی جێگای باسی ئەوان دەتوانن بە پێی بەرژەوەندیی خۆیان لـە رێگـای کـاری خۆپەرستانەوە کۆمەڵگای مەدەنی نابوت بکەن. هیگڵ و مارکس کە لـە سـەریەك لـە بـیری کۆمەڵێکی جیاواز لە پرسەکاندا بوون، ئەوەیان کەوتە ئەسـتۆ کـە ئـەو کۆمـەڵگا مەدەنییـە تایبەتییەی کە شارەزایانی ئابووریی سیاسی بەهایان بۆ دانابوو، لە قـاو بـدەن و نهێنیـەکانی دەرخەن و لێپرسینەوەی ئەوان لە کۆمەڵگای مەدەنی لێکدابڕانێکی واتایی بەرچاوی لە تیۆری لەمەڕ ئەو بابەتەدا پێکهێنا. ئەو لێکدابڕانە، نەریتێکی بەدیل یـان جێگـرەوەی لـە گوتـاری کۆمەڵگای مەدەنیـدا هێنایـە ئـاراوە، ئـەو نەریتـەی چارەنووسـی ئـەوە بـوو کـە لـە گـەڵ چەمکەکانی لیبراڵی ئەو مەڵبەندە بۆ هەمیشە لە شەڕی ناوخۆیی دابێت و ئێستا باسـی ئـەو نەریتە بەدیلە دەکەین.

## چەمکی هیگڵی کۆمەڵگای مەدەنی:

بەهای داهێنانی تیۆری بە هیگڵ دەدرێت چونکە بەگشتی ئەو بە یەکەمین بیرمەند دەزانن کە بە پێچەوانەی ئەو بیرمەندانەی کە بواری سیاسی و مەدەنییان وەك وتەزا هاوواتاکان بەکار دەبرد، دەوڵەتی لە کۆمەڵگای مەدەنی جیا کردەوە. ئەو ئاماژەی بە BURGERLICHE GESELLSCHAFT (کۆمـەڵگای مـەدەنی) وەك قەڵـەمڕەوێکی تایبـەتی، جیـاواز لـە DER STAAT (دەوڵەت، ولاّت) وەك قەڵەمڕەوێکی گشـتی ـــ واتـە "دەوڵـەتێکی بـە تەواوی سیاسی" کرد. ئەوە جیاوازییەك بوو کە رەنگدانەوەی رووداو و جیاوازیەکانی جیهـانی ئەورووپی بوو. هەروەك مانفرد ریدل باسی کردوە.

ئەوەی هیگڵ کۆمەڵگای مەدەنی بە وشیاریی سەردەمی خۆی گەیاند شتێك نەبوو کە لە ناکامی راپەڕینێکی نوێ کەمتر بێت، یانی سەرهەڵدانی کۆمەڵگایەك کە لە رێگای چەقبەستنی سیاسەت لە دەوڵەتی شەهریاری یان شۆڕشگێڕانەدا، ناسیاسیی بووە و راگواستنی چەقی ئەو بۆ ئابووری، گۆڕانێك کە ئەو کۆمەڵگایە هاوکات لە شۆڕشی پیشەسازیدا تێپەڕی کرد و لە ئابووریی "سیاسی" یان "نەتەوەیی" باسکرا، لەو پرۆسەیەی نێوخۆی کۆمەڵگای ئەورووپیدا بوو کە بارودۆخی "سیاسی" و "مەدەنی" بۆ یەکەم جار لە یەکتری جیا بوونەوە، ئەو بارودۆخەی کە پێشووتر، لە جیهانی کلاسیکی سیاسەتی کۆندا، وەك یەك شت لە قەڵەم دەدران، بە وتەی تۆماس ئاکویناس "کمونیتاس کیویلیس" و بە وتەی جۆن لۆك "کۆمەڵگای مەدەنی یان سیاسی" (١٦٠، ل١٤٨).

بەڵام هەروەك دیتومانە ئەو بیرمەندانەی کە بۆ یەکەم جار کۆمەڵگای مەدەنیان لە دەوڵەت جیا کردەوە، شارەزایانی ئابووریی سیاسی بوون. هیگڵ لەو دیمەنەوە، بەتایبەت لە گۆشەنیگای جیمز ستیوارت و ئادام سمیس، کە واپێدەچێت بە تایبەت لە قۆناغی "یەنا"دا لەگەڵ بەرهەمەکانیان ئاشنا بووبێت، کاریگەرییەکی بەرچاوی هەبوو و هەروەك ئەو بیرمەندانەش، لە بنەڕەتدا کۆمەڵگای مەدەنی بە دەسکەوتی جیهانی نوێ دەزانی. لە راستیدا "بەشی تایبەت" (ئەوەی لە لۆژیکی فۆرماڵ شتێك لە هاوچەشنەکانی جیا دەکاتەوە) جیهانی خۆی لەو پانتاییەدا دۆزیەوە. هیگڵ دەنووسێت ئەوە قەڵەمڕەوە کە تاکی ئەو هەستی ئازادیی چالاکانەی تێیدا دەدۆزێتەوە کە چاوگەکەی لە یاسای رۆمانی و مەسیحیەت و رۆشنگەری دایە. کۆمەڵگای مەدەنی وەك بوارێکی خودیی، کە تێیدا تاك دەتوانێت بەچەشنێکی مەشروع بەشوێن ئەو بەرژەوەندییە تایبەتییانەوە بێت کە خۆی بۆ خۆی دیاری کردوون، پێشکەوتوو، رۆشنگەر، و رزگاریدەرە. کەوابوو بوار بۆ وەدیهاتنی توانا بێ سنوورەکانی تاك دەڕەخسێنێت.

کۆمەڵگای نوێ هەروەك شارەزایانی ئابووریی سیاسیی کلاسیك دیاریان کردبوو، هەستێکی بایەخ دانان بۆ خود و هەروەها دوورە دیمەنێك بە تاك دەبەخشێت کە تێیدا تاك دەتوانێت خۆی وەك چەقی چالاکییەکان دابنێت. کردنەوەی ئەو کەشە، هەلێکی زێڕین بۆ گەشاندنەوەی تواناییە بێ ئەوپەڕەکانی تاك بڕەخسێنێت. وە ئەوە ئەو کەشەیە کە لە فۆرمەکانی پێشووتری کۆمەڵگادا، کە نیشانەکانیشیان سەرەتییە خزمایەتیەکانن، نادۆزرێتەوە. تەنیا لە کۆمەڵگای نوێ دایە کە گوتاری سەرەتیە خزمایەتیەکان جێگای خۆیان

دەدەن بە تاکی هەڵگری مافەکان. هیگڵ دەنووسێ، بارودۆخی مافی رەها، پێناسەی تاکە. بەڵام هەروەك دواتر دەبینین هیگڵ بە شێوەیەکی دوانێتی سەبارەت بەو ئازادییە قسە دەکات کە کۆمەڵگای مەدەنی دەرفەتەکەی بۆ تاك دەڕەخسێنێت.

هیگڵ بەشوێن ئەو ناوەرۆکانە کەوت کە شارەزایانی ئابووریی سیاسیی کلاسیك هێڵە سەرەکییەکانیان دیاری کردبوون، بەڵام پارمەتیدانی ئەو بەو تەوەرە لە سێ لایەنی تایبەتییەوە لە بۆچوونەکانی پێشووی جیاواز بوو و لێك جیا دەکرایەوە: یەکەم، ئەو پەرەی بە چەمکی کۆمەڵگای مەدەنی دا و ئەوی لەو بوارەوە کە لەگەڵ ئابووری بەچاوێك سەیری بکرێت، دەرباز کرد. لە لای هیگڵ کۆمەڵگای مەدەنی کۆمەڵێك لەو کردارە کۆمەڵایەتییانەیە کە لۆژیکی ئابووریی سەرمایەداری پێکی دێنێت و رەنگدانەوەی سرووش و خوخدەی بازاڕن، بەڵام بوونێکی جیاواز لە ئابوورییان هەیە. ناوبراو ئەو کردەوە کۆمەڵایەتییانەی لە نێو خێزان ودەوڵەتدا جێ کردەوە و مانایەکی مێژوویی پێ بەخشین. چونکە کۆمەڵگای مەدەنی بەشێوەیەکی مێژوویی قۆناغێکی گرنگە لە تێپەڕین لە خێزانەوە وەك شێوازێك لە رێکخراوی کۆمەڵایەتی، بۆ دەوڵەت وەك فۆرمی سەروو و کۆتایی وەها رێکخراوێك.

هیگڵ کۆمەڵگای مەدەنی بە یەکێك لە قۆناغەکانی ژیانی ئەخلاقی SITTLICHKEIT دەزانێ، کە ژیانی تاك رێکدەخەن و دوو قۆناغەکەی تریشی خێزان و دەوڵەت بوون. کۆمەڵگای مەدەنی جیاوازە لە هەر دووی پانتایی خێزان و دەوڵەت. هیگڵ دەنووسێت لە خێزاندا بەرژەوەندییە تایبەتییەکان، دەگەنە یەکێتییەکی سروشتی و پێدانەچووەوە و بەرژەوەندییە تایبەتییەکان یەکدەگرن و ئەوە خۆشەویستی و حەزە کە پەیوەندیی نێوان ئەندامەکان رێنوێنی دەکات. کۆمەڵگای مەدەنیش هەر بەو رادەیە لە دەوڵەت جیاوازە  کە وەك بەرزترین فۆڕمی ژیانی ئەخلاقی و لە راستیدا وەك "بکەری ئایدیای ئەخلاقی"، گشتییەتی تێیدا بنەڕەتی دەکرێتەوە. بە پێچەوانەوە، کۆمەڵگای مەدەنی قەڵەمڕەوی هەندەکی و قەڵەمڕەوی تاکی خۆویستە کە لەبیری دابینکردنی پێداویستییە تایبەتییەکانی خۆی دایە. لەو قۆناغەدا رەفتاری خێزان یانی خۆشەویستی و ئەوانیترخوازی سروشتی، بەش بەش دەبێت. بەڵام هەر لێرەدایە کە بنەمای گشتی، کە دواتر دەوڵەت وێنای ئەو دەبێت، لە فۆرمێکی دەڵەمەیدا دەدۆزرێتەوە. کۆمەڵگای مەدەنی قۆناغێکی گرنگە بۆ تێپەڕین لە خێزانەوە بۆ دەوڵەت، چونکە شانۆیەکە کە تێیدا دوو بنەمای کۆمەڵگای نوێ ــ گشتەکی و هەندەکی ــ دەکەونە بەرامبەری یەکتریەوە و رێك هەر لێرەدایە کە لە سەر

ناکۆکییەکانی نێوانیان کار دەکرێت. هیگڵ پەیوەندییەکی دیالکتیکی لە نێوان یەکێتیی پێدانەچووەوەی خێزان، هەندەکیی بکەرانەی کۆمەڵگای مەدەنی و دەوڵەت کە هاودامەزراوەی هەندەکی و هەمەکی دێنێتە ئاراوە. هەر بەو پێیە لە فۆرمەکانی هیگڵ دا، کۆمەڵگای مەدەنی بەوچەشنەی کە لە بەرهەمی لیبراڵە کلاسیکەکاندا دەبینرێت، بەشێوەیەکی نیگەتیڤ، وەك بوارێکی ئازاد و یاسایی کە دەوڵەت نابێ کاری بە سەریەوە بێت، پێناسە ناکرێت. بەڵکو قۆناغێکی چالاکە کە دیالکتیکی نێوان هەندەکی و هەمەکی تێیدا دەتوێتەوە. کۆمەڵگای مەدەنی (بە بڕوای هیگڵ، سیستەمی پێداویستیەکانە) تەنیا بەشێك لە چەمکی هیگڵیی کۆمەڵگای مەدەنییە.

بەڵام هیگڵ ناکۆکییەکی واتایی لە نێوان ڕەفتاری تاکخوازانەی کۆمەڵگای مەدەنی و سەرلەنوێ بەرهەم هێنانەوەی کۆمەڵ وەك بوونەوەرێکی ئەخلاقی دیاری دەکات و ئەوە دووهەمین پارمەتیی ئەو فەیلەسوفە بە چەمکی کۆمەڵگای مەدەنییە. لە کاتێکدا کە هاندەری تاکەکان بەرژەوەندیی تایبەتی و خۆگەورەکردنەوە بێت، "کۆمەڵگای مەدەنی دیمەنێك لە زێدەخوازی و ویست و هەروەها داڕمانی فیزیکی و ئەخلاقی دیاری دەکات کە ئەو دووانە تێیدا هاوبەشن" (٦٧،ب١٨٥). بە پێچەوانەی ئادام سمیس کە ئەرك بە پێی بەرژەوەندیی و حەزە تایبەتیەکان بە بنەمای کۆمەڵگای پێشکەوتنخواز دەزانێ، هیگڵ گومانی گریمانەیەکی ئەوتۆ هەیە. هیگڵ لە سەر ئەو باوەڕەیە کە ئەرك بە پێی بەرژەوەندییە تایبەتیەکان، خۆویستی، خودتەوەری، و تێگەیشتنی ئامرازخوازانەی لە کاری کۆمەڵایەتی لێدەکەوێتەوە. هەربۆیە ژیانی ئەخلاقی لەناو دەبات.

هیگڵ بۆ ئەو ڕاستییە بەداخ بوو کە کۆمەڵگای نوێ تواناکانی خۆی بۆ وەدیهاتنی ژیانی ئەخلاقی لەدەست داوە. کاتێك لەو داخە تێدەگەین کە وەبیر ستایشی قوڵی ئەو لە شار (پۆلیس)ی یۆنانی بکەوینەوە کە ئەوی بە فۆڕمی تاقانەی ژیانی کۆمەڵایەتی دەزانی. پلچینسکی دەنووسێت **فەلسەفەی ماف** (بەرهەمی هیگڵ) "بونیاتنەرەوەی فەلسەفی ژیانی ئەخلاقی (SITTLICHKEIT)نوێ ـــ تەواوی ئەندێشە، کردار، هەستەکان و ئەو پەیوەندییانەیە کە نەتەنیا لە ڕاستیدا زاڵن، بەڵکو مرۆڤی نوێ ئەوان بە چەمکێکی ڕێگەنیشاندەری پڕبایەخ ــ هەژمار دەکات" (١٤٨، ل٧). بەڵام هەستی لە دەست چوونی کۆمەڵە سیاسییە کۆنەکانی پۆلیسی یۆنانیش بە قوڵی لەو بەرهەمەدا دیارە. هەستی نۆستالژی هیگڵ بۆ ئەو جیهانە لەناوچووە، لە حەزی ئەودا دەردەکەوێت سەبارەت بەوەی

باشترین شتی جیهانی یۆنانی، واته SITTLICHKEIT بۆ کۆمەڵگای نـوێ بگەڕێنێتـەوە. هەروەها لەوەدا کە ئەو ژێربینای ئەخلاقیەت بۆ ژیانی نوێ دابـین دەکـات، و لـە جیهـانێکی نامۆدا کە تێیدا دابەشکردنی کار دەخوازێت کە کاری پەیوەندیداری کۆمەڵایەتی شتێك نـەبێ بێجگە لە ئامرازێك بـۆ ئـاڵوویر، ئـاوبراو کۆمـەڵێکی کۆمەڵایـەتی و سیاسـی لەسـەر پـێ رادەگرێـت. سـەرووتر لـە هـەمووان، ئـەو ئاگـاداری قەڵغانـەکان لـە دژی کاریگەریـیـە کارەساتبارەکانی مۆدێرنیتێ بـوو کـە تـاکی ئەوەنـدە لـە بەرامبـەر دەوڵـەت یـان ملـهوری خێڵ(MOB)، ئەدەپاراست. ئەو لە لێکدانەوەیەکی هەروەك لێکدانەوەکـەی دۆ تۆکفیـل دان بەوە دادەنێت کە تاك لە پێکهاتەکانی پشتیوانیی نەریتیی ژیانی کۆمەڵایەتی بێبەش کـراوە، یان بێ ریشەیە. ئامانجی گەلاڵەی فەلسەفی هیگڵ ئەوە بوو کە بۆ ئەو تاکە بێ ریشەیە ماڵێك دابین بکات، ماڵێك کە تەنیا کۆمەڵێکی ئەخلاقی دەتوانێت دابینی بکات.

هیگڵ دەنووسێت ژیانی ئەخلاقی لە کۆمەڵگایەکدا دەدۆزرێتەوە کە ئەندامانی لە ئایـدیا هاوبەشەکاندا بەشدارن و ئەو ئەخلاقەی کە رێگە بە ئەخشەکانیان دەدات، ئـەوانی یـەکگرتوو کردوە. ئەو ستایشەی کە لە پۆلیسی یۆنانی دەکات، ستایشی ئەوەیە ـ یۆنانیەکان دامەزراوە سیاسییەکانی خۆیانیان بە زۆردارانە نەدەزانین ـ و ئەخشەکانیشیان هـەر بـەو شـێوەیەی کـە رێگـەیان پێـدرابوو، بـەڕێوە دەبـردن. هیگـڵ دەڵێـت مەبەسـت لـە دەسـتەواژەی SITTLICHKEIT ئەوەیە. لە "کۆمەڵێکی ئەخلاقی"دا بە ئاسانی دەکرێ بڵێیت کە مرۆڤ دەبێ چی بکات و ئەو ئەرکانەی کە دەبێ بە مەبەستی گەیشتن بە فەزیلەت جێبەجێیان بکات کامانەن: بەئاسانی دەبێ لە یاسا و رێسا ناسراو و راشکاوەکانی جێگاوشوێنی خۆی پـەیڕەوی بکات (٦٧،ب١٥٠). ناکۆکییەك لە نێوان تاك و کۆمەڵگادا لە ئارادا نییە. ئـەوە جێگـای سەرسوڕمان نییە کە هیگڵ قۆناغی گەشەی خودی، بـە قۆنـاغی هەڵوەشـاندنەوەی پۆلیسـی یۆنانیش دەزانێت (هـەمان سەرچـاوە،ب١٨٥ ئـەلف). یاسـای رۆمـا، کـە ئـازادیی تـاکی سنووردار کرد، یارمەتییەکی دیکەی بە لە دەستدانی هەمەکیەت کرد. وەفاداریەکانی تاك بۆ کۆمەڵە گەورەترەکان لێك هەڵوەشا و بەڵێنی ئـەو بـۆ بینـای کۆمـەڵێکی ئـەخلاقی کۆتـایی پێهات و تاکگەرایی خۆویستانە جێگای ژیانی ئەخلاقی گرتەوە.

هیگڵ لە سەر ئەو باوەڕە بوو کە هەمان ئەو کەرت کەرت بوونە، بناغەی ژیانێکی نوێیە. پانتاییەکی هەندەکی، واتە کۆمەڵگای مەدەنی، ئەو ئیزنە بە تاکی ئازادبوو دەدات کە تـەنیا لە رێگای خواست و ویستی خۆیـەوە رێنـوێنی بکرێـت و خـۆی لـە سـەرجەم کـۆت و بەنـدە

ئەخلاقیەکان دەرباز بکات. کەوابوو تا "ئاستی تەماعکاری و پێویستیی فیزیکی" دادەبەزێت (هەمان سەرچاوە،ب١٨٢). کاری بەرامبەری ڕەنگدانـەوەی ڕەفتـاری کۆمەڵایـەتیی بـازاڕ، تەنیا کارێکی ئامرازییە و هەموو کەسێکی دیکە وەك ئامرازێك بۆ دابینکردنـی مەیلـەکانی خۆی چاو لێدەکات. کۆمەڵگای مەدەنی جێگاوشوێن و قەڵەمڕەوی تاکی پێوەلکاوە، کە خۆی تەوەری ئامانجە تایبەتیەکانی خۆیەتی (هەمان سەرچاوە،ب١٨٢). کەوابوو بوارێکە کە تێیدا "بەرژەوەندی تایبەتی هەرکەسێك لەگەڵ بەرژەوەندیی کەسـێکی دیکـە بـەرەوڕوو دەبێتـەوە" (هەمان سەرچاوە،ب٢٨٩) و تاکخوازانە و خودتەوەرانە، خۆویستانە و چەندین بەشە. هیگڵ لە بیری لە دەستچوونی ئەخلاقیات بوو لە کۆمەڵگای نوێ دا و بە قوڵی بیری لەوە دەکـردەوە کە لە نەبوونی ژیانی ئەخلاقیدا، ئەگەر کۆمەڵگای مەدەنی هەروا بەرەڵڵا بکرێت خۆی نـابود دەکـات: "هەنـدەکی خـۆی لـە خۆیـدا، ئەگـەر لـە هـەر ئاقارێکـدا، دەسـەڵاتی تـەواو بـە دامرکاندنەوەی حەز و چاوچنۆکییە هەڵکەوتەکان و حەزە زەینیـەکانی خـۆی بـدات، خـۆی و چـەمکی بنـەڕەتیی خـۆی لـە پرۆسـەی دامرکاندنـەوەدا نـابود دەکـات" (هـەمان سەرچاوە،ب١٨٥).

سێیەمین یارمەتی هیگڵ بە چەمکی کۆمەڵگای مەدەنی، دەرککردنی ئەوەیە کـە نـاکرێ هەروا لێی گەڕێی، چونکە ئەگەر وابێ لـەناو دەچـێت و پارچـە پارچـە دەبێـت. کۆمـەڵگای مەدەنی دەبێ هەم لە بواری فێرکاری و هەم لە بواری دامەزراوەییەوە ڕێکبخرێت. کۆمەڵگای مەدەنی کەشێکی مێژووییە کە تاك تێیدا دەتـوانێ کۆمەڵایـەتیی ببێتـەوە بـۆ ئـەوەی لـەوە تێبگات ــ بەواتای هیگڵ پەروەردە بێت ــ کە کۆمەڵی ئەخلاقی تەنیا ڕێگایەکە کە هەستی ئازادیی ئەو لەوێدا بەکردەوە دەردێت. مافی تاکەکان بۆ ئەوەی ئازادیی ئەوان بـدرێت، کاتێـك دابین دەبێت کە سەر بە سیستەمێکی کردەکیی ئەخلاقی بن... نەزمێکی ئەخلاقی کە تێیـدا بەکردەوە خاوەنی زاتی خۆیان یان دەروونی خۆیانن" (هەمان سەرچاوە،ب١٥٣).

هیگڵ خاوەنی چەمکێکی زۆر ئاڵۆزی ئـازادی بـوو، ئـازادی لای ئـەم فەیلەسـوفە تـەنیا سەربەخۆییەکی تاك یان نیگەتیڤ نییە، بەڵکو خودی جێبەجێ بوون لە نـەزمێکی عاقڵانـە، گونجاو و کۆمەڵایەتی دایـە، لـەو نەزمـەدا کـاری بەرامبـەر بـە پێـی بنـەمای دانپێـدانانی بەرامبەری ماف و ئازادییەکان بەڕێوە دەچێت: "تاکەکان تەنیا تا ئـەو جێگایـە دەتـوانن بـە ئامانجەکانی خۆیان بگەن کە تێگەیشتنی خۆیان، خواست و کاری خۆیان بەشێوەیەکی گشـتی دیاری بکەن و خۆیان بکەنە ئاڵقەیـەك لـە زنجـیری پەیوەندیـە کۆمەڵایەتییەکانـدا" (هـەمان

سەرچاوە،ب١٨٧). بەڵام تاکەکان بەشێوەیەکی دڵخوازانە لەوە تێنەگەیشتن بۆ گەیشتن بە مانای تەواوی ئازادی دەبوایە پەروەردە بکرێن و کۆمەڵایەتی بن و بگەن بە مانای تایبەت و پۆزەتیڤی ئازادی، هەمووی ئەوانەش پێویستیی بەوە هەیە کە کۆمەڵگای مەدەنی رێکبخرێت.

لە سیستەمی ئەندێشەی فەلسەفی هیگڵدا، سەرنجێکی فەلسەفی قووڵ جێگیر بووە. ئەو سەرنجدانە لە دەوری پەیوەندییەکی کەرت کەرت بوو و گشتی و ئەوەی کە بۆ هیگڵ پەیوەندیی دڵخوازانەی ئەو دوانەیە، دەخولێتەوە: "هەندەکی خۆی لە خۆیدا ناتوانێ لە رێژە و ئاستی دیاریکراوی خۆی زیاتر بچێتە سەرێ. هەموو سیستەمەکە دەبێ لە هەمانکاتدا دەسەڵاتێکی تەواو بپارێزێت بۆ ئەوەی هەندەکی لە گەڵ ژیانی ئەخلاقیدا هەماهەنگ بکات" (هەمان سەرچاوە،ب١٨٥ ئەلف).[٢٩] هیگڵ مافی هەندەکی بە تاك دەبەخشێ، لە راستیدا هەندەکی لۆژیکی جیهانی نوێ و هێمای پێشکەوتنە، بەڵام خۆی لەخۆیدا کۆمەڵگا بەرەو نابودی دەبات. کەوابوو دەبێ هەمەکییەت لەو نێوەدا نێوبەندی بکات. هەندەکی مافی ئەوەی هەیە کە بەرەو پێش بچێت و لە هەموو ئاقارەکاندا گوورزی خۆی بوەشێنێت، هەمەکییەت مافی ئەوەی هەیە نیشانی بدات کە نەتەنیا بوار و فۆرمی پێویستی هەندەکی، بەڵکو ئامانج و دەسەڵاتی سەرووی ئەو، ئامانجی یەکجارەکییە (هەمان سەرچاوە،ب١٨٤). کۆمەڵگای مەدەنی وەك قۆناغێکی گرنگ لە تێپەڕین لە وشیاریی خێزانییەوە کە بۆ پێداچوونەوە نابێت بەرەولای ژیانێکی ئەخلاقیی وشیار، دەبێتە شوێنگەیەك کە سەرنجی فەلسەفەی هیگڵ سەبارەت بەوەی هەندەکی دەبێ لە لایەنی هەمەکییەتەوە نێوبەندی بۆ بکرێت، لەوێ دەتوانێ وەدی بێت.

لە ئاکامدا کۆمەڵگای مەدەنی کەشێکە کە هیگڵ گەلاڵەی مێژوویی خۆی بۆ رێکخستنی هەمەکی و هەندەکی لە کۆمەڵێکی ئەخلاقی لەوێدا دەگونجێنێت. وەها کۆمەڵێك لەو رووەوە

---

٢٩- والتزن باسی ئەوە دەکات کە ناکۆکی نێوان بەشی هەندەکی و بەشی هەمەکی هێمای سەردکیی فەلسەفەی هیگڵ نەبوو: "لە روانگەی هیگڵەوە... ئەوانە دوو روانگەی سەربەخۆ نین کە هەرچی ئۆرگانیکە تەنیا تەواوکەری ئەوەیە کە تاکەکەسییە، بە پێچەوانەوە ئەو دوو روانگەیە پەیوەندییەکی بەرامبەریان هەیە کە کاتێك بە رێکی کاربکەن، بەتایبەتی کلیلی دەرککردنی رێکوپێك و گشتیی کۆمەڵگا بە گشتی و چەمکە هەمەکییەکان دابین دەکەن (١٧٥، ل٢٤٩).

بۆ هیگڵ گرنگ بوو کە ئەندێشەی ئەو لە ژێر دەسەڵاتی پێویست بە گەڕاندنەوەی هەستی گشتی و پێگەیشتنی کەسایەتی مرۆیی بێت و سەرنجی لای ئەوە بوو کە کۆمەڵگا دەبێ لە سەر بنەمایەکی دوولایەنەی هەماهەنگ ڕێکبخرێت کە هێماکەی هەستی بەکۆمەڵە (١٥١، ل٦٠). بەڵام ئەوکات پرسیەك بۆ ئەو فەیلەسوفە دێتە پێشەوە و ئەویش ئەوەیە کە سەرچەشنی ئەو هەماهەنگیە لە چ شتێکدا دابین دەکات؟ خێزانی کاتی، ئەخلاقییە چونکە هەر ئەندامێکی بە روونی رۆڵی خۆی دەزانێت، بەڵام خێزان بە هەست و سۆزە پێدانەچووەکانی ناتوانێت سەرچەشنی کۆمەڵگایەکی بەرینتر بێت. بۆ هیگڵ ژیانی ئەخلاقی نابێ ژیانێکی پێدانەچووەوە بێت و تاك دەبێ بە وشیاریەوە لەوە تێبگات کە بەرژەوەندیی راستەقینەی ئەو دەتوانێت لە رێگای هەمەکییەوە گەرەنتی بکرێت و دانیشتوانی کۆمەڵگای مەدەنی دەبێ بە وشیاریەوە لە هەندەکییەوە تێپەڕ بن و بە ئاراستەی هەمەکییەتەوە بچن.

پۆلیسی یۆنانی سەرچەشنێکی تری ئەم چەشنە هەمەکییەتە دابین دەکات، بەڵام بیرمەندەکەی ئێمە لەوە تێگەیشت کە بە گەڕانەوە لە زەمەندا ناکرێ بە کۆمەڵگایەکی ئەوتۆ بگەی. پلچینسکی ئەوە وەبیر دێنێتەوە کە بەرهەمی پێشوتری هیگڵ، واتە **دیاردەناسی روح**، رەنگدانەوەی هەستی نۆستالژی و ستایشی هیگڵە بۆ شاری یۆنانی، " سەرەڕای هەموو ئەمانە، تێگەیشتن لەوەی لەم جیهانە نوێیەدا ناکرێ دەست بەو ئارمانجانە رابگات، دایدەبەزێنێت، هەوڵی قارەمانانە بۆ بونیاتنانی کۆمەڵێکی دیموکراتی سیاسی لە سەر بنەمای یەك SITTLICHKEIT ی شۆڕشگێڕانە کە بە تەواوەتی لەگەڵ نەریتی ئەخلاقی، فیکری، و سیاسیی شارستانیەتی نوێی ئەوروپا نامۆ بوو، بە بڕوای هیگڵ ریسواییەکی گەورەی لێکەوتەوە" (١٤٨، ل٦). نەدەکرا وەرەی پۆلیسی یۆنانی لەم جیهانە نوێیەدا بدۆزرێتەوە، چونکە بنەمای هەندەکی کە هێمای تایبەتیی جیهانی نوێیە، بۆ یۆنانیەکان نەناسراو بوو. "لەو فۆرمە جەوهەریە دەگمەنەدا کە ئەفلاتون پێشکەشی کرد، مافی بنەڕەتیی کەسایەتی خۆڕاگر و بێکۆتایی تاك، بنەمای ئازادیی بکەرانە، حاشای لێکراوە" (٦٧،ب١٨٥ أ). کەوابوو نە پۆلیس و نە خێزانی یۆنانی، ناتوانن سەرچەشنێك بن بۆ گەڵاڵەی هیگڵی گەیشتن بە هەمەکییەت.

جیهانی نوێ دەبوایە خاوەنی کۆمەڵگایەکی نوێ بێت و هیگڵ لە سەر ئەو باوەڕەیە کە بە پشت بەستن بە بەستراوەییەکی پەیوەندیدار کە لە تایبەتمەندییەکانی کۆمەڵگای پیشەسازییە، دەکرێ دەست بەو هەستە بەکۆمەڵە رابگات. ئەو بە پەیڕەوی کردن لە ئادام سمیس دەیتوانی

لە پەیوەندییەکی بەرامبەر ئەوتۆدا قۆناغێکی بەکۆمەڵ دیاری بکات. مرۆڤەکان بەشوێن دامرکاندنەوەی خۆیانەوەن و خۆویستانە هەڵسوکەوت دەکەن و سەرەڕای هەموو ئەمانەش پێداویستییەکانی ئەوانیتریش دابین دەکەن کە ئەوانیش لە دابەشکردنی کارێکی ئاڵۆز و پەیوەندییەکی کۆمەڵایەتی لێکبەسراودا دەرگیرن. دابینکردنی پێداویستییەکانی خۆیان ــــ بەتایبەت پێویستی کەرەستە خەملێنەرەکان ــ پێویستیی بە هاوکاریی کەسانی دیکە هەیە و کارێك دەکات کە ئەوانیش بە نۆرەی خۆیان پێویستیەکانی کەسانی دیکە لە بەر چاو بگرن. ئەوە بەشێوەیەکی نائاگایانە، هەستێکی بەکۆمەڵ دروست دەکات.

هیگڵ بۆ دەرخستنی ئەوەی بەچ شێوەیەك پەیوەندیی بەرامبەری تاکەکان گەرەنتی هەستێکی بەکۆمەڵ دەکات، سێ بەڵگە دەخاتەڕوو. یەکەم، ئەو ئەرکانەی کە تاك بەشوێن بەرژەوەندییەکانی خۆیەوە و لە چالاکییە رۆژانەکانیدا و بەتایبەت لە کاتی کاردا بەڕێوەی دەبات، کۆمەڵایەتین. هیگڵ لە دەست نیشان کردنی ئەوە کە کار، کارێکی کۆمەڵایەتییە لە پێش مارکسەوە بوو، کار وادەکات کە تاکەکان لەگەڵ یەکتری لە پەیوەندی دابن. گەرچی کار بە تەنیایی بۆ دابینکردنی پێداویستییەکانی تاك بەڕێوە دەچێت، بەڵام پەیوەندییەکی پەیوەندیداری کۆمەڵایەتی لێدەکەوێتەوە. هیگل لەو کارەدا تایبەتمەندیی کۆمەڵگاکەی خۆی دەناسێتەوە، چالاکییە ئابوورییەکانی رۆژانەی تاکەکان لە کۆمەڵگای بورژوایی دایە کە پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانی نێوان تاکەکان دەخولقێنێت، کە ئەگەر وا نەبوایە تاکەکان سەربەخۆ و نەناسراو دەبوون.

دووهەم، بە بڕوای هیگڵ بەرژەوەندییە تاکەکەسیەکان تەنیا لە کۆمەڵگادا مانا پەیدا دەکەن، بەرژەوەندییە تایبەتیەکان تەنیا لە رێگای مانا هاوبەشەکانەوە شەرعیەتی خۆیان بەدەست دێنن. چونکە هەر مافێك لە هەمانکاتدا داخوازییەکیشە لە کۆمەڵگا، مافەکان تەنیا لە رایەڵ و پۆیەکی بەڵێنە دوولایەنەکاندا دەتوانن هەبن. ئەو گرێبەستانە داوای ئەوە دەکەن کە تاکەکان رێز لە مافی ئەوانیتر بگرن. شەڕی ئەو لە سەر مافی خاوەندارێتی، ئەو خاڵە روون دەکاتەوە. ئەو باسی ئەوە دەکات کە کەڵەکەکردنی خاوەندارێتی کارێکی تایبەتیکردنەوەیە، هەربۆیە کارێکی دەست بە سەرداگرانە و تاکخوازانەیە. بەڵام ئەو مافە تەنیا لە کۆمەڵگایەکدا کە دان بە مافی خاوەندارێتی دانرابێ و وەك بەهایەکی هاوبەش هەژمار بکرێت، گەرەنتی هەیە. دەست بەسەرداگرتنی خاوەندارێتی خۆی لە خۆیدا بەس نییە، دەبێ لە لایەن ئەو کەسانەوە کە لێی بێبەشن وەك کارێکی باش لە قەڵەم بدرێت. "من نە

تەنیا لە ڕێگای شتێکەوە و داخوازیی خودی خۆم خاوەنی شتێکم، بەڵکو لە ڕێگای داخوازیی کەسێکی دیکەوە خاوەنی ئەوم و کەواتە بە هۆی بەشداریی خۆم لە داخوازییەکی هاوبەشدا خاوەنی ئەوەم" (٦٧،ب٧١).

سێیەم، پێگەیشتنی ئابووریی ئاڵۆزتر دەبێتە هۆی بەرزبوونەوەی فۆرمەکانی کاری بەرامبەر، سۆلیدارێتیی و پەیوەندیی بەکۆمەڵ: "کارە بنەڕەتییەکانی کۆمەڵگای بورژوازیی نوێ توخمەکانی بەرهەم هاتنەوەی خۆیان دابین دەکەن. کۆمەڵگای بازرگانی نوێ، لە ژێر ئاستی گەمەی نۆستالژی و لێکدابڕاندا، دامەزراوەکان، کارەکان، بنەماکان و بەهاکان دابین دەکات کە فۆرمەکانی سۆلیدارێتی کۆمەڵایەتی پێك دێنن، و بەم چەشنە لەگەڵ سەرچەشنەکانی یۆنانی جیاوازن، بەڵام بەو حاڵەشەوە بۆ حاڵ و هەوای گۆڕدراوی جیهانی نوێ گونجاوترن" (١٥١، ل٦٩). کەواتە کۆمەڵگای مەدەنی، خاوەنی مەیلی بەرامبەر بە سەر تاکگەرایی و فرەخوازیدایە، چونکە مرۆڤەکان بە یەکتریەوە بەستراونەتەوە و لە ڕێگای کارەکەیانەوە پەیوەندییەکی دوولایەنەیان هەیە. بە وتەی بەناوبانگی هیگڵ:

لە کاتی وەدیهاتنی هەنووکەیی ئامانجە خۆویستەکاندا... سیستەمێکی پەیوەندیی دولایەنەی تەواو دروست دەبێت، کە تێیدا ژیان، بەختەوەری، و پێگەی یاسایی هەرکەسێك لەگەڵ ژیان، بەختەوەری و مافەکانی هەمووان پێکەوە بەستراونەتەوە... ئەو سیستەمە لەوانەیە لە یەکەم نیگادا وەك دەوڵەتێکی دەرەکی بێتە ئەژمار، دوڵەتێك کە پشتی بە پێداویستییەکان بەستووە، دەوڵەت بە چەشنێك کە دەرککردنەکەی ئەو دەبینێت (٦٧،ب١٨٣).

ئەو مەیلە یەکسانەی کۆمەڵگای مەدەنی ڕووی لە دوو لایە کە ڕێگاکە بۆ ئەوە دەکوتێت کە گشتەکی خۆویستی کەم بکاتەوە و بەسەریدا زاڵ بێت.[30] کەوابوو یەکەمین بنەمای

---

٣٠- بە بڕوای هیگڵ " کاتێك کە مرۆڤەکان بەم جۆرە لە کارەکانیان و لە دابینکردنی پێداویستیەکانیاندا بە یەکتریەوە بەستراونەتەوە، خۆویستی بکەرانە دەبێتە یاریدەدەرێك بۆ دابینکردنی پێداویستیەکانی کەسانی دیکە. واتە خۆویستی بکەرانە، بەهۆی بەرەوپێش چوونی دیالکتیکیەوە لە ڕێگای هەمەکییەوە دەبێتە نێوبژیوانی هەندەکی و ناکامەکەشی ئەوەیە کە هەموو کەسێك لە دەستەبەرکردن و بەرهەمهێنان و شتە تایبەتیەکانی خۆی، هەر بە پێی ئەو کارە بۆ دابینکردنی پێویستیەکانی کەسانی دیکەش بەرهەم دێنێت. ئەو

کۆمەڵگای مەدەنی "تاکێکی پێوەلکاوە کە هەمووی داخوازیەکان و ناوێتەیەك لە چاوچنۆکی و پێویستی فیزیکیە". بەڵام " کەسێکی تایبەت لە بنەڕەتدا بە چەشنێك لەگەڵ کەسێکی تایبەتی دیکە لە پەیوەندی دایە کە هەر کامیان لە ڕێگای کەسانی دیکەوە جێ پێی خۆیان پتەو دەکەن و پێویستیەکانی خۆی دەدۆزێتەوە" (٦٧،ب١٨٢). یەکەمین بنەمای کۆمەڵگای مەدەنی تاکگەرایە، دووەمیش قۆناغێکی بەکۆمەڵە. بەڵام هیگڵ باسی ئەوە دەکات کە ئەو بنەمایە خراپە نەك ڕاشکاوانە و لاوەکییە نەك باسکراو و دان پێدانراو، هەربۆیە پێویستی بە پتەوبوون و بنەڕەتی بوونەوە هەیە.

هیگڵ کە کاریگەریی تیۆری شارەزایانی ئابووریی سیاسیی کلاسیك وەك جیمز ستیوارت و ئادام سمیس بە سەریەوە بوو توانی بزێوی کۆمەڵگای نوێ هەم بە تاکگەرایی و هەم بە پێکهاتنی کۆمەڵەکان بزانێت. بەڵام بە پێچەوانەی ڕێبازی کلاسیك، هیگڵ لەوە دڵنیا نەبوو کە کۆڕ و کۆمەڵەکان لە ڕێگای "دەستی نادیار"ی ئاڵوێرەکانی بازاڕ بە سەر تاکگەراییدا زاڵ دەبێت. لە ڕاستیدا بەقوڵی ڕەخنەگری کاریگەرییە زیانبارەکانی بازاڕ بوو: بازاڕ بووە هۆی لەخۆنامۆبوونی مرۆڤەکان چونکە کەسی دیکە دەست بە سەر بەرهەمەکانیاندا دەگرن، پێشهاتە کۆمەڵایەتییەکانی ئەو لە کاروباری ڕۆژانەی کاری نوێی کۆمپانیاکاندا دیارە و ئەو پێشهاتانە لە لەخۆنامۆبوون و ڕەنجاندنی قوربانیانی سیستەمی بازاڕ واتە دەستکورتەکانیشدا بەرچاوە، چونکە ئەوان لە بەشداریکردن لە دەوڵەمەندکردن و پێگەیشتنی ژیانی ئەخلاقی بێبەش بوون.[31]

ناچارییەی کە دەبێتە هۆی ئەو کارە، ڕیشەکەی لە پەیوەندیی ئاڵۆزی تاك لەگەڵ ئەوانیتر دایە و ئێستا هەرکامێکیان بەشێوەی سەرمایەی هەتاهەتایی هەمەکی خۆی دەنوێنێت (٦٧،ب١٩٩).

٣١ - هیگڵ لە یەکێك لە حەماسیترین شتەکاندا کە سەبارەت بە هەژاری نووسیویەتی، سەبارەت بە بەرهەمە خراپەکانی دەنوسێت: "لە کاتێکدا کە ئاستی ژیانی توێژێکی بەرینی خەڵك بکەوێتە خوار هێڵی هەژارییەوە ــ ئەو ئاستەی کە بەشێوەیەکی ئۆتۆماتیك بۆ ئەندامی کۆمەڵگا پێویستە ــ ناکامەکەی سەرهەڵدانی خێڵی هەژاران دەبێت" (٦٧،ب٢٤٤). مرۆڤەکان لە پێداویستیەکانی دیکەی کۆمەڵگا، لەوانە فێرکردن و پەروەردە، ئایین، دادپەروەری و ئەو تواناییانەی کە مرۆڤەکان بە نەزمی کۆمەڵایەتیەوە گرێ دەدەنەوە، دادەبڕێن. بەو پێیە لەم ڕووەوە هەژاران زۆر دەبن کە سوکایەتی پێکراو، نامۆ و دوژمنن.

هیگڵ بەتوندی لە سەر ئەو باوەڕە بوو کە بازاڕ دەبێ ڕێکبخرێت، ئەویش نەتەنیا بۆ قەرەبووکردنەوەی پێشهاتە ئابوورییەکان، بەڵکو لەوەش گرنگتر بۆ قەرەبووکردنەوەی پێشهاتە کۆمەڵایەتی و ئەخلاقیەکان کە بەشێکی بەرینی خەڵکیان لە بەرژەوەندییەکانی ژیانی نوێ بێبەش کردوە. بازاڕیش هەروەها ئەوان لە ئازادیی کۆمەڵگای مەدەنی، ئازادی کەوتنە شوێن ئاسایش و تەناهی، کاڵاکان، دەسەڵاتەکان و تواناکان بێبەش دەکات.[٣٢] بازاڕ جێگای پرسیار بوو و بە هیچ شێوەیەك نەیدەتوانی ڕێگاچارە بێت. لە لایەکی دیکەوە پێکهاتەی چاودێری و بەرێوەبەریش دەبوایە بدۆزرابایەوە، چونکە دەبوایە ڕواڵەت و جەوهەرێك بەو بەستراوەیە بەرامبەرە بدرایە. هیگڵ ئەو فۆرم و جەوهەرەی لە پانتاییەکی سەربەخۆ لە دامەزراوەکانی پەیوەندیدا دۆزیەوە کە ورەی هاوڕێیەتی شوراییان یاسامەند دەکرد. دەوڵەت لە لوتکەی ئەو دامەزراوانەدا بوو. هیگڵ باسی ئەوەی دەکرد کە ئەو دامەزراوانە لایەنە هەندەکییەکان کەم دەکەنەوە و لایەنە گشتەکیەکان بنەڕەتیی دەکەنەوە. لە فەلسەفەی هیگڵ دا ئەو پێشێتی بەخشینە بە لایەنی گشتی ڕێکخستنی ئەستوونی کۆمەڵگای مەدەنی لێدەکەوێتەوە کە دەوڵەت وەك باسی کۆتایی ئەخلاقیەت بە لووتکەی خۆی دەگات.

بەگشتی کۆمەڵگای مەدەنی هیگڵ چەمکێکی ئاڵۆزە کە لە پانتاییەکی بەرینی پرۆسەکان پێك دێت. ئەو پرۆسانە پێگەیەکی مێژووییان هەیە چونکە سەر بە کۆمەڵگای نوێن. ئەو کۆمەڵگای مەدەنی بە بەرهەمی کۆمەڵگای بورژوازی دەزانێت و پێیوایە کە لە لایەن ئەوەوە دامەزراوە. هەربۆیە کۆمەڵگای مەدەنی کۆمەڵێك پەیوەندیی کۆمەڵایەتی دەگرێتەوە کە لۆژیکی ئابووریی سەرمایەداری دزەی کردوەتە ناویان. بەرهەمەکانی دزەکردنی پەیوەندییەکانی بازاڕ پێکەوە دژایەتییان هەیە. لە لایەکەوە کۆمەڵگای مەدەنی هەندێك ڕێگەچارە پێشکەش دەکات بۆ ئەوەی تاك لە کەشێك لە ئازادی و یەکسانیی ڕێژەییدا خۆی پێناسە بکات. لە لایەکی دیکەوە چونکە ڕەنگدەرەوەی لۆژیکی بازاڕە، قەڵەمڕەوی کارەکەی

---

٣٢ - هیگڵ دەنوسێت: "لەم ساتەوەختەدا قازانج ــ ئەو قازانجەی کە ئەندامانی کۆمەڵگای مەدەنی لێی ئاگادار نین ــ لە پرۆسەیەکدان کە تاکبوون و ناوەرۆکی سروشتیی ئەوان، لە ناکامی پێویستییە سەپێنراوەکان لە ڕێگای سروشتە و پێداویستیە دڵخوازانەکانەوە، بەرەو ئازادیی ڕواڵەتی و گشتییەتی ڕواڵەتی زانین و ویستی ئەوان بەرز دەکاتەوە ــ ئەو پرۆسەیەی کە هەندەکیی ئەوان بەرەو بکەری بەرزدەکاتەوە" (٦٧،ب١٨٧).

له خزمەت خۆی دایە. بەڵام هیگڵ لێرە راناوەستێ، ئەو بوارەی کە بە بواری خۆویستی و کاری خۆویستانەش ناو دەبرێت، هەڵگری تۆوەکانی کۆمەڵن، هەستی کۆمەڵ لە پەیوەندیی بەرامبەری کۆمەڵایەتی و ئابوورییەوە سەرچاوە دەگرێت.

لێرەدا هیگڵ لە قۆناغێکی شیکارانەوە بەرەو قۆناغی نۆرمدانان دەڕوات. هیگڵ چونکە لە بیری گەڕاندنەوەی ئەخلاقیەت دایە بۆ پەیوەندییە مرۆڤایەتیەکان و بۆ کۆمەڵگا، کە بە تەواوەتی بەمانای پۆلیسی یۆنانی نییە چونکە بارودۆخی کۆمەڵایەتی ـ ئابووری جیاوازە، بەڵام لەگەڵی دێتەوە، بە ناسینی لاوازیی قۆناغی کۆمەڵایەتی، بە شێوەیەکی بەرین رێکخراوەکان رێکدەخات بۆ ئەوەی نێوبەندیی مەڵبەندی هەندەکی بکەن و لەگەڵ مەڵبەندی گشتی بیگونجێنن. ئەگەر چەمکی کۆمەڵگای مەدەنی هیگڵ باسێکە سەبارەت بە تەماعکاری و خۆویستی، باسەکەی سەبارەت بە کۆمەڵگای مەدەنی دڵخواز، باسی ئەوەیە کە بە چ شێوەیەك دەکرێ بە سەر ئەو کۆسپانەدا سەرکەوی؟ بە بڕوای هیگڵ، ناکرێ هەروا لە کۆمەڵگای مەدەنی گەڕێین، دەبێ رێکبخرێت، و چۆنیەتی رێکخستنەکەشی بەمشێوەیەی خوارەوەیە.

## نێوبەندی کۆمەڵگای مەدەنی:

دەکرێ هەوڵەکانی هیگڵ بۆ رێکخستنی کۆمەڵگای مەدەنی بە شێوازێك بزانین کە لە رێگای ئەوەوە دەوڵەت لە کۆمەڵگای مەدەنیدا جێی دەبێتەوە و بۆبیو لە سەر ئەو باوەڕەیە. ناوبراو باسی ئەوە دەکات کە ئەو دامەزراوە نێوبەندانە، فۆرمی بچوکتری دەوڵەتن و کۆمەڵگای مەدەنی یەکێکە لە قۆناغەکانی دروست بوونی دەوڵەت (١٥، ل٣٢).[٣٣] بەڵام سیستەمی هیگڵیی نێوبەندییە سیاسییەکان، سەرنجی لە لای کاری هەندەکی و رێگاکانی کەمکردنەوەی بەرهەمە زیانبارەکانی هەندەکییە. بە بڕوای هیگڵ هەموو ئەو شتانەی کە سەر

---

٣٣- بە بڕوای بۆبیۆ، "کۆمەڵگای مەدەنی هیگڵ نوێنەری یەکەمین قۆناغی دروست بوونی دەوڵەتە ــ دەوڵەتی یاسایی و ئیداری کە ئەرکی رێکخستنی پەیوەندییە دەرەکییەکانی لە ئەستۆیە ئەوەش لە کاتێکدا کە بەواتایەکی وردتر دەوڵەت نوێنەری قۆناغی ئەخلاقی/سیاسییە کە ئەرکەکەی دامەزراندنی پەیوەندییەکی ناوخۆییە لە نێوان هاووڵاتی و لایەنی گشتیدا کە ئەوان بەشێکن لێی ــ تا ئەو جێگایەی کە دەکرێ دەوڵەت، بە دەوڵەتێکی ناوەکی یان نێوخۆیی ناودێر بکرێت" (١٥، ل٣٢).

بە لایەنی هەندەکین، لە دەرەوەی دەوڵەتن: "ئەو بەرژەوەندییە تایبەتیانەی کە بۆ هەمووان هاوبەشن، لە نێوخۆی کۆمەڵگای مەدەنیدا جێگایان دەبێتەوە و لە دەرەوەی هۆگرییە گشتییەکانی دەوڵەت لە مانا تایبەتیەکەی دان" (٦٧،ب٢٨٨). نابێ هیچ خاڵێکی لایەنی هەندەکی بە دەوڵەتی هیگڵییەوە دیار بێت، چونکە وەدیهاتنی ئەخلاقیەتە ـــ نەك ئەخلاقییەتێکی پێدانەچووەوەی خێزان، بەڵکو ئەخلاقییەتێکی رەسەن کە لایەنی هەندەکی لە نێو خۆیدا هەڵدەگرێت، چونکە دەیگرێتەوە و لە رێگەی ئەوەوە خۆی بەرز دەکاتەوە.

سیستەمی نێوبەندییە سیاسییەکانی هیگڵ لەو رووەوە لە کۆمەڵگای مەدەنیدا جێگایان بۆتەوە کە ئەرکی گرێدانی تاك بە دەوڵەتیان لە ئەستۆیە. ئەوەی گرنگترە ئەوەیە کە سیستەمی نێوبەندییەکان، تاکەکان بە یەکتری و لەو رووەوە بە خودی کۆمەڵگاشیانەوە گرێ دەداتەوە. ئەم بیرمەندە لەو رووەوە ئەو دامەزراوە نێوبەندیانەی پێ گرنگە کە تاك وەك ئەندامی ئەو ئەنجومەنانەیە کە هاورێیەتی ئەوانیتر دەکات، تاك لە رێگای ئەو دامەزراوانەوەیە کە دەچێتە ناو ژیانی سیاسییەوە.

هیگڵ وەك دۆ تۆکفیل باسی ئەوە دەکات کە کۆمەڵگای نوێ، دامەزراوەی خوڵقاندنی سۆلیدارێتی تێدا نیین کە بتوانن بەرژەوەندییە تاك و کۆمەڵایەتییەکان هەماهەنگ بکەن و هەروەها ئەو قەڵغانانەشی نییە کە بتوانێ لە بەرامبەر دەسەڵاتی بەهێزی دەوڵەتدا پارێزگاری لە تاك بکات. سیستەمە نەریتی ترەکانی کۆمەڵگا وەها قەڵغانێکیان دابین دەکردن، بەڵام کۆمەڵگای نوێ بەشێوەیەکی بەرچاو ئەوەی نییە. ئەوە ئەو دامەزراوە نێوبژانەن کە لە بەرامبەر دەسەڵاتی گشتگیری دەوڵەتدا پارێزگاری لە تاك دەکەن و بەرژەوەندییەکانی ئەو لەگەڵ کۆمەڵگا دەگونجێنن. هیگڵ بە دیاریکردنی نەخۆشیی جیهانی نوێ، باسی ئەوە دەکات کە بەرژەوەندییە تایبەتیەکانی تاك دەبێ لە رێگای ئەندامێتی لە شوراکاندا کەم بکرێنەوە، و پەیوەندیی تاك لەگەڵ دەوڵەت دەبێ لە رێگای ئەو شورایانەوە بێت:

ئاڵقە شوراییەکان لە کۆمەڵگای مەدەنیدا وەك کۆڕ و کۆمەڵ هەژمار دەکرێن، هەر بە پێی ئەو کارە، ئەگەر بە چەشنێك ئەو کۆڕ و کۆمەڵانە وێنا بکەین کە گۆیا هەر لەگەڵ ئەوەی پێیان نایە نێو گۆڕەپانی سیاسەتەوە، یانی ئەو گۆڕەپانەی کە باڵاترین لایەنی هاوپێچیی هەیە، بۆ جارێکی تر بە سەر تاکەکاندا دابەش دەبنەوە، بەمانای باوەڕبوون بە جیایی ژیانی مەدەنی و سیاسی لە یەکتریە و هەر دەڵێی بەمانای هەڵپەساردنی کاری سیاسییە، چونکە ئەگەر وابێت بناغەکەی تەنیا دەتوانێ تاکگەرایی چاوچنۆکانە و باوەڕ بێ، و بوارەکەشی بە رێکەوت دەرەخسێ نەك ئەوەی بەتەواوی بەردەوام و شیاوی پەسند کردنە (٦٧،ب٣٠٣).

سیستەمی هیگڵی نێوبەندییەکان بریتییە لە کۆمەڵێك چاودێری کە پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان چارەسەر دەکەن و ئەوان لەگەڵ یەکتری هەماهەنگ دەکەن. ئەو کۆنترۆڵ کردنانە حاڵەتێکی خۆ ڕێکخەرانە و دیار بە فۆرمە کۆمەڵایەتییە سۆلیدارێتییەکان دەبەخشن. سیستەمی کۆنترۆڵەکان دوو ڕیزە. سەرەتا ناوەندە گشتییەکانی وەك دادگاکان، ناوەندە خزمەتگوزاری و شارەوانیەکان گەرەنتی مافی تاکەکان دەکەن. هیگڵ ئەو دامەزراوانە کە بەگشتی بە دامەزراوەی دەوڵەت هەژمار دەکرێن، لە کۆمەڵگای مەدەنیدا جێگایان دەکاتەوە چونکە ئالۆویرەکان ڕێکدەخەن. ئەوان بوونیان هەیە بۆ ئەوەی بتوانن پارێزگاری لە ژیان و خاوەندارێتییەکان بکەن، و مافی هەر تاکێك بۆ ژیان و ئاسوودەیی دابین بکەن. پۆلیس و سیستەمی دادپەروەری، ئەو ئامرازانەن کە لە ڕێگای ئەوانەوە (أ) ئاسوودەیی تاك و خاوەندارێتییەکەی گەرەنتی دەکرێت و (ب) نەزمێکی کۆمەڵایەتی پشت ئەستوور بە دانپێدانانی بەرامبەریەکی بەرژەوەندی و مافەکان، بەتایبەت گەرەنتی مافی خاوەندارێتی دەکرێت. کاری تایبەتیی ئەوان پاراستنی ئەرکەکانی بازاڕ و گەرەنتی مافی ژیان و ئاسوودەیی هەموو تاکێکە. بەواتایەکی دیکە، ئەوانە چوارچێوەیەکی دەربەست بە ڕێساکان دابین دەکەن کە ئەو پەیوەندیی و بەڵێنە بەرامبەرانە لە نێو ئەو چوارچێوەیەدا کار دەکەن.

دووهەمین فۆرمی ئەو چاودێریانەی کە هیگڵ پێش بینی کردوە، چاودێریی چینەکان و ئەو پیشانەیە کە لایەنی گشتیی کۆمەڵگای مەدەنی پێك دێنن، و نێوبەندی کاری تاکەکان دەکەن و کەمی دەکەنەوە. هیگڵ دەنووسێت، تاك لە پێشەوەی هەموو شتێك لە ڕێگای لەدایك بوون و پیشەوە ئەندامی چینێکی کۆمەڵایەتییە.[٣٤] و ئەوە ئەندامێتی چینە کە تاك لە بەرژەوەندییە هاوبەشەکان ئاگادار دەکات. هیگڵ لەسەر ئەو باوەڕەیە کە هەرچەندە چینەکان فۆرمی بەرتەسك و هەندەکین بۆ خۆگونجاندن لەگەڵ کۆمەڵگا، چونکە تایبەت بەو گروپ

---

٣٤- هیگڵ کە دابەشکردنی کاری دەناسی، لە کۆمەڵگای مەدەنیدا سێ چینی لەیەکتری جیا دەکردەوە ــ یەکەم، چینێکی کشتوکاڵی کە ئەندامێتی لەواندا لەگەڵ لەدایکبوون رادەگوازرێت، ئەوە چینێکی گشتییە، چونکە ئەندامەکانی ئاگاداری ئەرك و ڕۆڵەکانی خۆیانن. هەربۆیە بە بڕوای هیگڵ دەبێ یەکێك لە بنەماکان "کۆمکاری چینەکان" بن. دووهەمین چین کە دەیناسێنێت، چینی کاسبکارە، هێماکەشی هەندەکی و کاری خۆخوازانەیە و هەربۆیە دەبێ لە ڕێگای ئەندامێتی لە پیشەیەکدا فێری ڕاهێنانی گشتی بکرێت. سێیەمین چین خزمەتگوزاری مەدەنییە کە بەهۆی پیشەکەی خۆیەوە، چینێکی گشتییە.

بەندییە پیشەییە تایبەتیەن، بەلام لە چاو تاکگەراییی پەتیدا وەك پێشکەوتنێك لە قەڵەم دەدرێن. چینەکان و گروپ بەندییە سیاسییەکانی پشت ئەستوور بە چین، لە زمانی ئەڵمانیدا هەردووکیان بە وشەی (STANDE) ناو دەبرێن. کەواتە زمان "هێشتا ئەو یەکانگیربوونەی کە ئەو دووانە لە رابردوودا بوویانە، پاراستوە" (هەمان سەرچاوە). ئەوانە بناغەی بالاترین دامەزراوەی نوێنەرایەتی، یانی "کۆمکاری چینەکان" پێك دێنێت.

فۆرمی سیاسیی چینەکان، کاری بەڕێوەبەرایەتی ولاتیشیان گرتوەتەوە: چاودێری بەسەر کاروباری دەسەلاتی گشتی لە رێگای بەڕێوەبەرانی دەوڵەت لە ئاستێکی روکەشیانەدا، لە هەمانکاتدا ئەوان ئامرازێکن کە بیروڕای گشتی لە لایەن ئەوانەوە کار دەکاتە سەر کاروباری گشتی و نوێنەری تاك و شوراکانن لە دەوڵەتدا. هەر بەو پێیە، پەیوەندیی نێوان تاك و دەوڵەتن.[٣٥] کەواتە ئامرازێکن کە رێککەوتنی نێوان بواری هەندەکی و هەمەکی لە نێو ئەواندا بەڕێوە دەچێت: "لایەنی بکەرانەی ئازادیی گشتی ــــ دادوەریی تایبەتی و ئیرادەی تایبەتی، ئەو مەڵبەندەی کە لەم کتێبەدا پێی دەگوترێت "کۆمەڵگای مەدەنی" ــــ لەگەڵ پەیوەندییەکی یەکپارچە لەگەڵ دەوڵەت سەر هەڵدەدات" (هەمان سەرچاوە،ب٣١).

بە بڕوای هیگڵ، پیشەکان لایەنی خۆگونجاندنی ئەخلاقی لە کۆمەڵگادان. لە کۆمەڵگای مەدەنیدا دوای خێزان، ئەوان دووهەمین "ریشەی ئەخلاقی"ی گرنگن. "جێی خۆیەتی کە وەك ماڵی دووهەم بۆ ئەندامانی خۆیان بێنە مەیدانەوە، ئەوە لە کاتێکدایە کە کۆمەڵگای مەدەنی تەنیا دەتوانێت چەشنێکی نادیاری خێزان بێت، چونکە هەموو کەسێك دەگرێتەوە و هەربۆیە لە تاك و نیاز و پێویستیە تایبەتیەکانیان دورترە" (هەمان سەرچاوە،ب٢٥٢). پیشەکان بەتایبەتی راهێنانی ئەخلاقی ئەندامانی ئەو چینانەی کە پشتیان بە هەندەکی بەستوە، لە رێگای چینی کاسبکارەوە دابین دەکەن.

پیشەکان سێ رەهەندیان هەیە. یەکەم ، ئەو ئامرازانەن کە لە رێگای ئەوانەوە تاکی بچوك کراوە، شوناس و هەستی ئینتیما بە دەست دێنێت.

---

٣٥- چینەکان ئەگەر وەك ناوەندێکی نێوبژیوانی لەبەرچاو بگیرێن، لە نێوان حکومەت بەگشتی لە لایەکەوە و میللەتێك دان کە بە سەر خەڵك و شوراکاندا دابەش بووە. کاری تایبەتیان ئەوان ناچار دەکات هەر بەو رادەیەی کە هەستێکی بەرژەوەندیی تاکەکان و گروپە تایبەتیەکانی تێدایە، ببنە خاوەنی هەست و خوییەکی بەڕێوەبەرایەتی" (٦٧، ل٣٠٢).

تاك وەك شایەتحالّی لیّزانی و داهاتی ریّکوپیّك و بژیّوی خۆی، یانی شـایەتیی ئـەوەی وەك کەسیّك هەژمار دەکریّت، پیّویستییەکی بە نیشـانەیەکی دەرەکی زیاتر لە هـەمان ئەنـدامیّتی خۆی نییە. ئەوەش پەسند کراوە کە ئەو بە کۆمەلّیّکەوە بەستراوەتەوە کە بۆ خۆی ئۆرگانیّکی هەموو کۆمەلّگایە و ئەو چـالاکانە سـەرنجی لـە لای بـەەرویپیّش بردنـی ئامـانجی تارادیـەك نابەرژەوەندیخوازانەی ئەو گشتەیە. کەواتە ئەو ریّزی شیاوی کەسیّکی هەیە کـە لـە پلەوپایـە کۆمەلاّیەتییەکەی ئەودایە (هەمان سەرچاوە، ل۲۵۳).

دووهەم ئـەوەی ئـەو فۆرمـە سیاسـییانەی چـینەکان وەك لایـەنی ئاویّتـەکردنی زۆریـەی بەرژەوەندیی رەکەبەرەکە کار دەکات. پیشەکان دیسیپلین بەسەر ئەندامانی خۆیاندا دەسەپیّنن و لە ریّگای دیاریکردنی ئەرك بۆ ئەوان، بەرژەوەندییە تایبەتیەکانیان کەم دەکەنەوە. سەرەڕای ئەوە گەرەنتی ئەوش دەکەن کە ئەو قازانجانەی کە بـە ئەندامـەکانیان دەبریّـت، بەشـیّوەیەکی یەکسان دابەش بکریّت. سیّیەم، بەرژەوەندیی تەواوی ئەندامەکانی خۆیان لە کۆمەلّگادا بەرەو پیّش دەبەن، کەواتـە وەك گروپیّکـی گوشـارهیّنانیان لیّـدیّت، هەرچـەندە بـە بـڕوای هیگـلّ ویّکچوون لەگەلّ پیشەکانی سەدەکانی ناوەڕاست کە توانایی و بەرژەوەندیی ئەندامـەکانی لـە دژی کەسانی دەرەکی دەپاراست، زیاترە.

تاك وەك ئەندامیّکی پیشەیی جلوبەرگی ئەخلاقیەت و ناسین دەستەبەر دەکـات. "تـاك" ئەگەر ئەندام نەبیّت، "پلەوپایەکی نییە، بەجیّمانی ئەو کارەکەی هـەتا ئاسـتی خۆدۆزینـەوە دیّنیّتە خواریّ، و ژیان و دابین بوونی ئەو دەکەویّتە مەترسییەوە" (هەمان سەرچـاوە). چـینە کۆمەلاّیەتییـەکان، فـۆرمی سیاسـیی چـینەکان، و پیشـەی خۆگونجـان لـە گـەلّ کۆمـەلّگا (BILDUNG) دابین دەکەن و تاك بەو قەناعەتە دەگەیەنن کە رزگاریی ئەو لـە هاوڕیّیـەتی لەگەلّ ئەوانیتردایە و هەندیّك دامەزراوە بۆ ئەو چەشـنە هاوڕیّـیەتیانـە دابـین دەکـەن کـە بـە تەواوەتی لە ریّگای ئەوانەوە سەر هەلّدەدات.

## کۆمەلّگای مەدەنی ـ ریّکخراو یان سەرکوت؟

هیگلّ وەك فەیلەسوفیّکی سـەردەمی نویّ دەیتوانی بە لیّکدانەوەیەکی بەرچاو هەست بـەو مەترسیانە بکات کە ئەم شیّوە کۆمەلّگایانـە لـە سـەر دەروونـی تـاك هەیانـە. کۆمـەلّگای پیّشکەوتوو لە رۆلّە دیاریکراو و سەرەتییە دیاریکراوەکان دەربازبووە. بۆ وەدیهاتنی "خود" و وەدیهاتنی ئاواتەکان، هەتا ئیّستاش ریّگەچـارەی دژوار دەخاتـەڕوو. بـەلاّم کۆمـەلّگای نـویّ

نائارام، خۆویست و خۆپەسندە و هەتا کۆتایی بەشوێن بەختەوەریدا، بەشوێن ئەو قازانجانەوەیە کە بتوانن بێبەش بوون لەو پێبڕانە قەرەبوو بکەنەوە. مرۆڤەکان روو لە ناوخۆ دەکەنەوە و کۆمەڵگا دەبێتە کۆمەڵێك لە بکەرە رەکەبەر، خودتەوەر و خودپەرستەکان. دارمانی هێژمۆنی نەریتی بەو مانایەیە کە داهاتووی پەنگراو(بالقوە) مەترسیدارە، چونکە هیچ مەرجێك بۆ پێکەوە سازان لە سەر کار و هیچ سنوورێکیش بۆ داخوازیەکان لە ئارا دانییە.

سەردەمی نوێ تەنیا تێپەڕکردنی ئەزموونێکی بکەرانەی خۆش نییە، دوور کەوتنەوە لەوەی ئاشنایە دەتوانێت لەخۆنامۆبوون، بێ لانەیی و ترسی لێبکەوێتەوە، ئەو تایبەتمەندییانەی کە بیرمەندانی دواتری سەردەمی نوێ، کارل مارکس، گیۆرگ زیمل و فرۆید وەك لایەنی نیگەتیڤی ئەو ئەزموونە ئاماژەیان پێکردوە. کۆمەڵگای مەدەنیی هیگڵ، کە لە لایەن تاکە خۆپەرستەکانەوە ئاخندراوە، کۆمەڵگایەکی داشکاوی هەمان حاڵەتی سروشتیی هۆبزە. بەڵام لە کاتێکدا کە حاڵەتی سروشتیی هۆبز بەرەو کۆمەڵگای مەدەنی و سیاسی هەڵدەکشێت، باڵادەستیی کۆمەڵگای مەدەنی هیگڵ لە دەوڵەت دایە.

وەڵامی هیگڵ بۆ پرسەکانی کۆمەڵگای مەدەنی، رێکخستنی ئەستوونی کۆمەڵگای مەدەنییە کە تێیدا دەوڵەت لە لووتکەی سیستەمی نێوبەندیی سیاسی دایە. ئەو ئەوە قبوڵ دەکات کە تۆوی کۆڕوکۆمەڵەکان لە کۆمەڵگای نوێدا ماوەتەوە، بەڵام لە هەمانکاتدا بەتوندی گومانی هەیە لەوەی تاك بتوانێت بەشێوەیەکی کۆنترۆڵکراو کار بکات و ئەو شێوازە بوو کە کۆڕوکۆمەڵەکانی پێدەگەیاند. کەوابوو مەڵبەندی بچووککراو و لەبەریەك هەڵوەشاوی تاکگەرایی دەبوایە لە رێگای سیستەمێکی دەست تێوەردانی گونجاو و گەلاڵەرێژی کراوەوە فێر بکرایە بۆ ئەوەی بەو باوەڕە بگەیشتبایە کە قازانجی یەکجارەکی لە چوارچێوەی گشتی دایە. ئەوە راستە کە بە بڕوای هیگڵ هەندەکی و گشتی بوونی وتەزاکان نەیاری یەکتری نین ــ ئەوەی یەکەمیان لە رێگای ئەوەی دووهەمیانەوە وەدی دێت و گشتییەتی بە سەر هەندەکیدا زاڵ دەبێت (١٨٢). بەڵام گەلاڵەی ئاوێتەکردن کە بیرمەندەکە دیاری کردوە، لەئاکامدا ئەوەی لێدەکەوێتەوە کە سەرەتیەکان بە لایەنی "گشتی" بدرێن و لە ئاکامدا لایەنی "هەندەکی" لەناو دەچێت. لە هەر قۆناغێکی کۆمەڵگای مەدەنیدا، چالاکییەکانی تاك، بەشێوی ئەستوونی رێکدەخرێن و لە دەوڵەتدا ــ پێگەیشتنی ئایدیای لەبار ــ کامڵ دەبێت و بە سەر هەموو شتێکی دیکەدا زاڵ دەبێت.

دەوڵەت وەك لوتكەی سیستەمە نێوەندییە سیاسییەكان، شوێنی كۆبوونەوەی كۆمەڵێكی عەقڵانی، خاوەنی دەسەڵاتدارێتی سیاسی و ئەخلاقییە. دەوڵەتی هیگڵ ورەی تەواوی ئەو بەستراوەییە كە دامەزراوەكانی كۆمەڵگای مەدەنی تەنیا تا رادەیەك دابینی دەكەن، بۆ تاكی دەرەخسێنێت.[٣٦] هیگڵ لە رێگای شیكاریی كۆمەڵگای مەدەنییەوە، وەك بەیانی كۆتایی مەعقولیەت لە دەوڵەت تێدەگات ــ هەرچەشنە تایبەتمەندییەكی كۆمەڵگای مەدەنی پێویستیی بە چەشنێكی تایبەتی دەوڵەت هەیە. توانجەكە لێرەدایە كە هیگڵ وەك پێشمەرجی دەوڵەت بە كۆمەڵگای مەدەنییەوە دەست پێدەكات، بەڵام دواجار ئەوە دەوڵەتە كە دەبێتە پێشمەرجی كۆمەڵگای مەدەنی. مەدەنییەتی كۆمەڵگای مەدەنی پەیوەندیی بەوەوە هەیە كە بە چەشنێكی ئەستوونی وەك دەوڵەت رێكبخرێت. بەم جۆرە لە ئاكامدا كۆمەڵگای مەدەنی دەبێتە پەیرەوی دەوڵەت و تاكیش پەیرەوی لە گشت دەكات. لە ئاكامدا لە ریزبەندی هیگڵیدا ناكرێ دەوڵەت و بەرنامەی گشتیی ئەو یان مەعقولییەتەكەی ببرێتە ژێر پرسیارەوە. چارەسەری ناكۆكیی كۆمەڵگای مەدەنی لە دەوڵەت دایە و هەر بۆیە لە نێوان خەڵك و دەوڵەتدا هیچ دووانێتییەك لە گۆڕێ دانییە، تەنیا شەرعییەتە و قبولكردن. هیچ سنوورێك بۆ دەوڵەت دیاری نەكراوە، بە ئاسانی دەتوانێ و لە راستیدا دەبێ، بە بنەڕەتیی كردنەوەی ژیانی ئەخلاقی، كۆمەڵگای مەدەنی بەدوای خۆیدا بەرێت. بۆ تاك یان ئەنجومەنەكان ئازادییەكی ئەوتۆ بۆ ململانێ لەگەڵ دەوڵەت لە پێش چاو نەگیراوە. دەوڵەت وەك بنەمای یەكانگیربوونی بەشی كۆتایی، وەك "بت"ی لێدێت و كەوابوو یەكپارچەبوونی كۆمەڵگای مەدەنی لە لایەن دەوڵەت و لە ناوخۆی دەوڵەتدا بەرێوە دەچێت.

كۆمەڵگای مەدەنی وەك بوونەوەرێكی خودوشیار سەرهەڵئابرێت بۆ ئەوەی بتوانێ بە دۆزینەوەی بنەمای یەكانگیربوونی بەشێك لە دەروونی خۆی، خۆی رێكبخات یان بە دووركەوتنەوەی وشیارانەی دەوڵەت، گوتارێكی بەدیلی گشتی بێنێتە ئاراوە و پارێزگاریشی لێ بكات. كۆمەڵگای مەدەنی لە چاو دەوڵەت دەكەوێتە پەراوێزەوە و بەم چەشنە رێك هەر ئەو بنەمایانەی كە هیگڵ لەوێوە دەستی پێكردبوو، پێچەوانە دەبنەوە. چەمكی كۆمەڵگای مەدەنی هیگڵ لە جیاتی ئەوەی ببێتە شانۆی

---

٣٦- هیگڵ لە نێوان دەوڵەت وەكو نمونەی ئەخلاقیی تێكەڵاو لە سێ قۆناغی ــ خێزان، كۆمەڵگای مەدەنی، دەوڵەتی سیاسی ــ و دەوڵەتی سیاسیش جیاوازی دادەنێت. لە دەوڵەتی سیاسی و دەستووری ئەو دا، گەیشتن بە باڵادەستیی وشیارانەی بەرژەوەندیی تایبەتیی تاك و لەگەڵ كەوتنی نمونەی ئەخلاقی ئیمكانی هەیە. وێكچوونی عەقڵانیەت لەگەڵ دەوڵەتی گشتی، خۆی لە خۆیدا، خۆبەخشانە و وشیارانەیە.

مێژوو، به دەوڵەتەوە دەلکێنرێت. کۆمەڵگای مەدەنی تەنیا تا رادەیەك دەتوانێت ناکۆکییەکان رێکبخات و ئەوە دەوڵەتە کە بەرپرسیارێتی کۆتایی راگەیاندنی وەها رێککەوتنێکی پێ سپێردراوە.

ئەوەی پلانی سیاسیی هیگڵ بۆ ئاشتبوونەوەی ناکۆکییەکان لە کۆمەڵگای مەدەنیدا، سەرکوت و خستنە پەراوێزی لێ دەکەوێتەوە، هۆکارێکی دیکەشی هەیە. ئەگەر لایەنی گشتی، لایەنی کەمەکە لە خۆیدا دەتوێنێتەوە، کەواتە لایەنی گشتی دەبێ نوێنەری هەموو لایەنە "کەمەکان"ی کۆمەڵگای مەدەنی بێت. بەڵام فەیلەسوفەکەی ئێمە متمانەی بە بوونی ئەو شتە نییە کە پێی دەگوترێ خەڵك و یان ئەو وتەزایەی کە پێی دەگوترێت بیروڕای گشتی. هیگڵ کە ئەزموونی ژاکۆبینی فەرانسای دوای راپەڕینی بەچاوی خۆی بینیبوو، زۆر رەشبین بوو بەرامبەر فۆرمەکانی دیموکراسیی راستەوخۆ کە لەوانەیە ئاژاوە، یان گوێڕایەڵبوونی تاکی لێ بکەوێتەوە.[37] هیگڵ زۆر بە پارێزەوە لە بەرامبەر ئەو بیروڕا بێ مەرجانەی کە لەوانە بوو هیچ شتێك نەبن بێجگە لە کەژاوەیەك بۆ سیاسەتی ناشارەزایان و نەدەرکان و سەرۆك خێڵەکان کە هەرەشەی لە تاك دەکرد، دەنوسێت: "زانینی ئەوەی کە چیت دەوێ، لەوەش گرنگتر زانینی ئەوەیە کە خواستی رەها، عەقڵ، چی دەوێت، بەرهەمی تێڕامانێکی قوڵە، واتە رێك ئەو شتانەی کە لە ناو خەڵکدا باو نین" (٦٧،ب٣١).

بە بڕوای هیگڵ ئەوەی پێی دەگوترێت چەمکی خەڵك، ناتوانێت لە پرۆسە سیاسییەکاندا دەرگیر بێت: "خەڵك" رێك نوێنەری ئەو بەشەی کۆمەڵە کە نازانێت چی دەوێ. بێ بڕوایی هیگڵ بە رای گشتی و بێ ئەملاو ئەولا، لێکدانەوەیەکی زۆر بەرتەسکی بەشداریی لێدەکەوێتەوە.

باوەڕ بەوەیکە هەموو تاکەکان دەبێ لە بیرکردنەوە و بڕیاردان سەبارەت بە مەسایلی سیاسی پەیوەندیدار بە هەمووانەوە بەشداریی بکەن، بۆ ئەو پاساوە کە تاکەکان ئەندامانی دەوڵەتن، پرسی ئەو، پرسی ئەوانیشە و مافی خۆشیانە کە هەرچی بەڕێوە دەچێت بە ئاگاداریی ئەوان و لەسەر خواستی ئەوان بەڕێوە بچێت، ئەوەش یەکسانە لەگەڵ ئەو پێشنیازە کە بە بێ

---

٣٧- دووربینای هیگڵ سەبارەت بەو توخمە رێکنەخراوانەی کە دێنە ناو ژیانی سیاسییەوە، ئاشکرایە: "ئاپۆرا، وەکو پێوانەیەك ـــ راڤەیەکی نزیکی "خەڵك" هەڵبەتە شتێکە کە پەیوەندیی هەیە، بەڵام تەنیا وەکو کۆیەك، جەماوەرێکی نارێکخراو کە ئاژاوە و چالاکییەکانیان تەنیا دەیتوانی کارێکی بەرایی، ناعەقڵانی، دڕندانە و مەترسیدار بێت" (٦٧،ب٣٠٣).

هیچ فۆرمێکی مەعقول توخمی دیموکراتی بخرێتە جەستەی دەوڵەتەوە (هەمان سەرچاوە، ل٣٠٨).

پرۆسەی سیاسی دەبێ لە ڕێگای پیشەکان و چینەکانەوە نێوبەندی بکرێت. ئەو ڕێکخراوانە و "کۆمکاری چینەکان" بەر بەوە ناگرێت کە تاك بە ڕواڵەت خێڵێك یان گروپێکی هەبێت، و بەم جۆرە خواست و مەرامێکی نارێکخراو پەیدا بکات و وەك لایەنێکی بەهێزی دژایەتی لەگەڵ دەوڵەتی ڕێکخراو ڕەنگ بداتەوە (هەمان سەرچاوە،ب٣٠٢). بەڵام هیگڵ لێکدانەوەیەکی بەرتەسکی سەبارەت بە پیشە (صنف) هەیە. ئەندامی پیشەیەك دەبێ توانا و لێهاتوو بێت و دەسەڵاتی خاوەندارێتی هەبێ. هەر بەو پێیە ئەو چینە کرێکاریانەی کە لە سەردەمی هیگڵدا خاوەنی هیچکام لەو تایبەتمەندییانە نەبوون، و بە دڵنیاییەوە دەستکورتەکانیش لە ئەندامێتی بێبەری بوون. ئەو چەشنە پەراوێز خستنانە پێویستییان بەوە هەیە کە ئەو چینانە نە تێکەڵی کۆمەڵگای مەدەنی بن و نە دەوڵەتیش، هەربۆیە لە دەرەوەی ئەزموونی گشتیی مرۆڤایەتی دەمێننەوە". ئاشکرایە کە هەر لە دەرەوەی ئەو لایەنە گشتییەش دەمێننەوە کە دەوڵەت دەیباتە قۆناغی جێبەجێ کردنەوە. لێرەوە دەتوانین بەو ئاکامە بگەین کەسانێك کە دەبێ لە ژیانی گشتی دەوڵەتدا بەشداربن و ئەو کەسانەی کە تێکەڵاوی دەبن، تەنیا چینی خاوەندار دەگرێتەوە.

پرسکە ئەوە نییە کە هیگڵ بیری لە هەژاری نەکردبێتەوە. ئەو لە سەر ئەو باوەڕەیە کە هەژاری بەلاڕێداچوون نییە، بەرهەمی کۆمەڵگای پیشەییە ــ بەرهەمی زێدە بەرهەم هێنان و بەکارهێنانی بەرهەمی کەمە. هێندێك لە جوانترین نووسراوەکانی ئەو باسی تاڵان و نەگبەتی هەژاری دەکەن. هەژارەکان لە بەرژەوەندییە ماددیەکانی کۆمەڵگای بورژوایی و ئەو سەرەتیانەی کە وەها کۆمەڵگایەك دەتوانێ دابینیان بکات، بێبەش دەبن. ئەوان بەشێك لە پێکهاتەی کۆمەڵگای مەدەنی هیگڵ و لە هەمانکاتدا قوربانیی ئەویشن، و ئەویش پێکهاتەی سیستەمی نیازەکانە. بەڵام سەرەڕای ئەو بۆچوونانەش، هەژارەکان بەشێك لە بەرنامەی ئەو بۆ خوڵقاندنی کۆمەڵێك یان زیندووکردنەوەی ئەخلاقیەت نین. ئەو ئاگاداری ئەو مەسەلانە هەیە کە ئەوان بۆ کۆمەڵگای مەدەنی دێننە پێشەوە ــ لەو ڕووەوە کە لە سەرەتییەکانی کۆمەڵگای مەدەنی بێبەشن، دەبنە جەماوەرێکی لێکدابڕاو، جەماوەرێکی بێ دەسەڵاتی عەقڵانی، دەسەڵاتێکی کوێرکوێرانە، جەماوەرێکی بەرین، جەماوەری خەڵك. ئەوان ڕاپەڕیو و ناڕازین چونکە هیچ جێگایەکیان پێ نەدراوە. چونکە ئەندامی پیشەکان نین، خاوەنی ئابروییەکی مەدەنی یان ڕەسمیەتێکی یاسایی نین. هیگڵ لە سەر ئەو باوەڕەیە کە ئەوە بارودۆخی هەژاریی

ئـەوان لـە رووی دارایـیـەوە نییـە کـە خێڵێکـی بـەرین لـەوان پێـك دێنێـت. تایبەتمەندییـە کۆمەڵایەتییەکانی پێویست بۆ هەژارییە کە ئەوان وا لێدەکات.

هیگڵ ئاگاداری خوخدەی نوقسانی ئەو ڕێگاچارانە بوو کە پێش بینی دەکـردن و ئەوەشـی قبوڵ بوو کە بۆ پێشگیری لە بشێوی، خەڵك دەبێ بچنە ناو دەوڵەتەوە: "کاتێك کە جەماوەری خەڵك وەك یەکێك لە ئەندامەکانی دەوڵەت، دەچنە ناو دەوڵەتەوە، لە ڕێگای ئامرازە یاسـایی و خـاوەن نەزمیەکانـەوە بەرژەوەندییـەکانی خۆیـان دەسـتەبەر دەکـەن. بـەڵام ئەگـەر وەهـا ئامرازگەلێك لە بەر دەستدا نەبن، جەماوەر هەمیشە بـەرەولای توندوتیـژی دەچـن" (١٦٧، ل٣-٢٩٢). بەڵام هەژارەکان وەك پارچەیەکی ئەتۆمی لە دەرەوەی کۆمـەڵگای مـەدەنی یـان سیاسـییەوە مانـەوە و لـە راسـتیدا چارەنووسـیان ئەوەیـە کـە لـە دەرەوەی چوارچێوەی ئەخلاقییەتەوە بمێننەوە.

لێرەدا دەگەینە ناکۆکییەکی بنەڕەتی لە ئەندێشەی هیگڵ دا، ئەگەر کۆمەڵگای مـەدەنی پانتایی کێشمەکێشی نێوان تاکەکان بێت و بانگەوازیی مێژوویی دەوڵەتیش زاڵبوون بێـت بـە سەر ئەو کێشمەکێشانەدا، بەشداری نەکردنی چینە کرێکارییەکان لـە کۆمـەڵگای مـەدەنی و سیاسیدا، وەدیهاتنی ژیانێکی ئەخلاقی لـە دەوڵەتـدا دەکاتـە کـارێکی لـە کـران نـەهاتوو. دەوڵـەتێکی پشـت نەسـتور بـە قەدەغـەکردن و گوشـارهێنان نـاتوانێ گشـتگیر بێـت و بەرنامەکەشی بۆ خستنەڕووی ئەخلاقیەت بە نوقسانی دەمێنێتەوە. دەوڵەتی هیگڵی سەرەنجام ناشتەوایـیەك لە نێوان چینە خاوەندارەکاندا پێك دێنێت، چـونکە بەگشـتی ئـەو چـینانە وەك گروپی چالاکی کۆمەڵگای مەدەنی دەناسێت.

هیگڵ لە دەرککردنـی واتـایی کۆمـەڵگای مـەدەنی و ناکۆکییەکانیـدا ئـەوە نابینێـت کـە ناکۆکییەکان، لە نێوان چینە داراکان و چینە نەدارەکان دایە. سەرەنجام لـە ریزبەنـدیی هیگڵیـدا ئەوە ململانێی نێوخۆیی چینە داراکانە کە دەبێ چاوەڕێی بەرەوپێش چوونیان لێ بکرێت و ئەوان ڕێکبخرێن. ئازادی و چالاکیی هاوولاتیە "نوێ"یەکان، کە دەتوانێ لە کۆمـەڵگای نوێـدا وەدی بێت و پێویستیی بەوە هەیە کـە لـە بەرامبـەر مەیلـە لێکدابڕاوەکانـدا بپارێزرێـت، ئـازادی و چـالاکیی هاوولاتیـانی دارایـە. بنـەمای یـەکانگیربوون کەسـانێك یـەکانگیر دەکـات کـە لـە پێشووترەوە بەهۆی خاوەندارێتیەکەیانەوە یەکانگیر بووبن. پرسی فەلسەفی هیگڵ کە ڕێکخستنی گشتی و هەندەکی لە دەوڵەتدا بوو، و گەلاڵەی ئـەو بـۆ بونیـات نـانی ژیـانێکی ئـەخلاقی لـە کۆمـەڵگای مەدەنیـدا، بـە بـێ چارەسـەر دەمێنێتـەوە. ئـەو دەوڵەتـەی کـە ئـەم نێوبەندییـە

کۆمەڵایـەتی و سیاسـیانە کامـڵ نـەکات، نوقسـانە، چـونکە دەوڵـەتی چـینە داراکانـە. خستنەپەراوێزی بەشە بنەڕەتییەکانی خـەڵك لـە نێوەندییـەکانی کۆمـەڵگای مەدەنیـدا، ئـەو نێوەندیانە تەنیا لە نێوان کەسـانێکدا دەهێڵێتـەوە کـە قازانجێکیـان لـە پاراسـتنی دەوڵـەت و کۆمەڵگای مەدەنیدا هەیە. ئەو کەسانەی کە هیچ قازانجێکیان لـە سـۆلیدارێتیی کۆمەڵایـەتیی کۆمەڵگای مەدەنیدا نییە، نە رۆڵێك دەنوێنن و نە لە چوارچێوەی مەدەنیشـدا ئامـادەن. چـینە کرێکاریەکان لە چوارچێوەی تیۆری ئەودا نین، هەرچەندە لە نێو بازنەی جێگای سەرنجی ئـەودان. بە سەرنجدان بەو راستیە کە ئامانجی هیگڵ زاڵبوون بە سەر هەموو کێشە و ناکۆکییەکاندا بـوو، دەتوانین بڵێین کە ئەم کەموکوڕیە بنەمای فەلسەفیەکەی دەخەنە مەترسیەوە.

هیگڵ فەیلەسوف و رووداونووسی سەردەمی خـۆی بـوو، بـەڵام بەشـێوەیەك لـە شـێوەکانیش یەخسیری بەهاکانی ئەو سەردەم ــ لەوانە بەهاکانی خاوەندارێتی ــ بوو، قبوڵی بێ ئەملاوئـەولای دەوڵەت، و هەرەشەیەکی بنەڕەتیی بۆ سەر دیموکراسی خەڵکی. ئەو هەڵوێستانەی بۆچوونی تیـۆری وردبینانەی ئـەو و بەرنامـە فەلسـەفی و سیاسـییە بـەرزەفڕەکانی ئـەوی دەخسـتنە مەترسـیەوە و بەرتەسکی دەکردنەوە. ئەو دەیتـوانی خێـرا لـە سـاتەوەختە سیاسـییەکان تێبگـات، بـەڵام لـەوە تێنەدەگەیشت کە ئەوە بـەرەولای بەرەورووبوونـەوەی راشـکاوانەی نێـوان چـینە دارا و نـەدارەکان دەچوو. هۆکارەکەشی ئەوە بوو کە چینە کرێکاریەکانی بـە شـێوەیەکی سـەربەخۆ بـە بەڕێوەبـەری سیاسـی و کۆمەڵایەتی نەدەزانی. ئەوە مارکس بوو کە چینی کرێکـاری لـەو دۆخـە رزگـار کـرد و ئەوانی لە ناوەندی گۆڕەپـانی مێـژوودا نیشـتەجێ کـرد. دووهـەم ئـەوەی هیگـڵ لایـەنگریی لـە خاوەندارێتی دەکرد چونکە پەرەسەندنی کەسایەتیی تاکی تێیدا دەدۆزیەوە، بـەڵام نەیـدەتوانی ئـەو دامەزراوەیە وەك دامەزراوەیەك سەیر بکات کە پشت ئەستور بە بێ بەشییەکانی تەواوی بەشێك لە خەڵکە و دەسەڵاتی رەها بە خاوەندارەکان دەبەخشێت.

سێیەم، ئەو دەیتوانی ململانێ وەك هێمای تایبەتی جیهانی ئەم سەردەمە بناسێت، بـەڵام نەیدەتوانی ئەوە ببینێت کە بنەماکانی ئەو نەتەنیا لە سـەر خۆویسـتی و قـازانج پەرەسـتی، بەڵکو پشت ئەستوور بە پێکهاتە بنەڕەتیەکانی چەوساندنەوەشـە. چـوارەم، دەوڵـەت لـە لای هیگڵ، ناتایبەتی، بەرژەوەندی هێنەر، بێلایەن و کانگای ئەخلاقیات بوو، ئەو نەیدەتوانی وەك دامەزراوەیەك چاوی لێبکات کـە نوێنـەری پێداویسـتیەکانی چـینە داراکانـە. لـە هـەمووی ئەوانەش زیاتر، سەرەڕای ئەوەی دەیتوانی دەرك بە سەرەتییە دولایەنـەکانی سـەردەمی نـوێ بکات، بەڵام نەیدەتوانی ئەو پرسە درێژماوانە ببینێت کە بەرهەمی دێنێت.

## ناشارستانی بوونی کۆمەڵگای مەدەنی: روانگەی مارکس:

هیگڵ کاریگەرییەکی زۆری هەبوو لە سەر ئەدەبیاتی روو لەگەشەی پەیوەندیدار بە کۆمەڵگای مەدەنییەوە. ئەو کۆمەڵگای مەدەنی ناساند و پێگەیەکی مێژوویی پێبەخشی، بەڵام نەیدەتوانی بۆ ئەو مەسەلانەی کە ئاوا بەباشی دەیناساندن، بەدەر لە چوارچێوەی دەوڵەت و کۆمەڵگا، رێگاچارەیەك بدۆزێتەوە. مارکس روانگەی کۆمەڵگای مەدەنی هیگڵی بە میرات پێگەیشت، بەڵام شیکاریەکەی زیاتر بەرەوپێشەوە برد بۆ ئەوەی خودی سیستەمەکە بەرێتە ژێر پرسیارەوە. مارکس لەو لێکدانەوەیەی هیگڵ کەڵکی وەرگرت کە باسی لەوە دەکرد تایبەتمەندیی کۆمەڵگای مەدەنی خۆویستانە، بەرژەوەندیخوازانە و جێگای ململانێیە و پێویستە لەو قۆناغە تێپەڕێت. بەڵام لە کاتێکدا کە هیگڵ دەوڵەتی وەك بنەمای باڵادەستیی دەناساند، مارکس لە سەر ئەو باوەڕە بوو ئەو بنەمایەی کە دەکرێ باڵادەستیی خۆی لە هەندەکییەکانی ژیانی مەدەنی وەربگرێت، دەبێ هەر لە ناوخۆی چوارچێوەی مەدەنیدا بەشوێنیدا بگەڕێین.

نەبوونی مەدەنییەت لە کۆمەڵگای مەدەنی، لە شیکاری مارکس دا رەهەندێکی تازەی بەخۆیەوە گرت. ئەو مەڵبەندە تەنیا بوارێك نییە کە تێیدا قازانجی خۆپەرەستانەی یەك کەس لەگەڵ قازانجی خۆپەرەستانەی کەسێکی تر رووبەڕوو دەبێتەوە، بەڵکو قەڵەمڕەوی چەوساندنەوە بە واتایەکی تایبەتییە. شوێنێکە کە تێیدا کاری زیادە دەستی بەسەردا دەگیرێت. لەو چوارچێوەیەدا ناکرێ هیچ رێککەوتنێك لە نێوان ئەو بەرژەوەندییانە لە ئارادابێت کە هەر لە بنەڕەتەوە لە ناکۆکی دان، چونکە خودی ئەو چوارچێوەیە، چوارچێوەیەکی لاوازە. دەبێ لەو قۆناغە مێژووییە تێپەڕ بێت. بەڵام مارکس بە پێچەوانەی هیگڵ ئەو ئەگەرە رەتدەکاتەوە کە یەکێك لە دامەزراوەکان بتوانێ کارێکی وەها بکات. کۆمەڵگای مەدەنی دەبێ لەناوخۆی خۆیدا کارگێڕی نوێ بدۆزێتەوە بۆ ئەوەی لە خۆویستی و بەرژەوەندیخوازی، چەوساندنەوە و نامرۆڤایەتی تێپەڕێت. مارکس لە رەتکردنەوەی تواناکانی دامەزراوە کۆمەڵایەتییەکان بۆ رێکخستنی بەرژەوەندییە دژ بەیەکەکان و دەرککردنی بنەمایەکی بەرزیخوازانەی نێوخۆی کۆمەڵگای مەدەنی، ئەو پێشێتییەی کە هیگڵ بە دەوڵەتی بەخشیبوو، پێچەوانەی کردەوە و کۆمەڵگای مەدەنی کردە شانۆی مێژوو: "... تەنیا کەسێکی خوڕافەپەرەستی ئەمڕۆیی پێیوایە ئەوە دەوڵەتە کە ژیانی مەدەنی

رادەگرێت، ئەوە لە کاتێکدایە کە لە راستیدا ژیانی مەدەنییە کە دەوڵەت رادەگرێت" (٨١، ل٣٩). پەیوەندیی نێوان مارکس و هیگڵ لە ئاستێکی شیکاری دایە و نەبەستراوەییشیان لە ئاستی فۆرماتیڤدایە. مارکس بەم شێوەیە دەیتوانی شێوازی لێکدانەوەی هیگڵ قبوڵ بکات، بەڵام لەو پێکهاتە و بایەخانەی کە هەیانبوون، سەرووتر بڕوات، چونکە هێندێك پرسیاری دێنایە ئاراوە کە چەندایەتییەکی جیاوازیان هەبوو و کۆمەڵێك لەو پرسە تایبەتیانەی هێنایە ئاراوە کە پەیوەندییان بە دۆزەکەوە هەبوو. لەم رووەوە لێکدانەوەی ئەو سەبارەت بە کۆمەڵگای مەدەنی، لە کردەوە سیاسییەکان و لە دەوڵەت، نیشانەی دوورکەوتنەوەی بنەڕەتیی ئەو لە سیستەمی ئەندێشەی هیگڵیە.

شیکاریی مارکس سەبارەت بە کۆمەڵگای مەدەنی لە دوو قۆناغدا باس کرا. لە یەکەمین قۆناغدا توانی لە رێگای رەخنە لە سیستەمی فەلسەفیی هیگڵەوە ئەوە دەربخات کە بانگەشە گشتی و هەمەلایەنەکانی دەوڵەت و بنەما سیاسییەکان، خەیاڵ پڵاون. کەواتە ناتوانن لە چوارچێوەی خۆپەرەستی ئەولاوەتر بچن. لە قۆناغی دووهەمدا مارکس لە رێگای بەکارهێنانی شێوازی ئابووریی سیاسی، دەستیدایە لێکۆڵینەوە لە خودی کۆمەڵگای مەدەنیدا. راڤەکەرانی سیاسی، بەرهەمەکانی مارکسیان بە سەر دوو قۆناغدا دابەش کردوە: مارکسی دێموکراتی توندڕەوی سەرەتا، سەرنجی لای دیموکراسی و نوێنەرایەتیی سیاسییە (٧٥و٩٣) و مارکسی دواتر زیاتر سەرنجی ئابووریی سیاسی دەدا و هەر لەو رووەوە هەموو شتێك دێنێتە ریزی ئابوورییەوە (٢٩،ف١). بە پێچەوانەی ئەوە، لە نێوان دوو قۆناغی ئەندێشەی مارکس دا، لێکدابڕانێکی ئەوتۆ بەرچاو ناکەوێت.[٣٨] یەکەمین

---

٣٨ - لوچیو کوللتی لە ناساندنی بەرهەمە سەرەتاییەکانی مارکس دا باسی ئەوە دەکات ئەو رەخنەیەی کە مارکس لە ساڵی ١٨٤٣ لە سەر هیگڵ نووسی "باسکردنی رۆشنی بەستراوەیی دەوڵەت بە کۆمەڵگاوە، شیکارییەکی رەخنەگرانە لە سیستەمی پەرلەمانی هاوڕێ لەگەڵ تیۆرییەکی بەرامبەرە سەبارەت بە نوێنەرایەتی جەماوەری، و گۆشەنیگایەکی دەرخەری پێویستی بۆ سەرکوتی یەکجارەکی خودی دەوڵەت" (١٢٤، ل٤٥) دەکرێ بدۆزرێتەوە. کوللتی بەو ئاکامە دەگات کە لە بواری سیاسییەوە ناکرێ لە نووسراوەکانی سەردەمی پوختەیی مارکس شتێکی ئەوتۆ بەوانەوە زیاد بکرێت. بە دڵنیاییەوە ئەو بابەتانەی کە بەرهەمەکانی دواتری مارکسیان پێك هێنا و لەو رەخنەیەدا جێیان بووەوە، بەڵام لێکدانەوەی قووڵتری کۆمەڵگای مەدەنی بەشێك لە لێکۆڵینەوەیەکی دواترە کە تێیدا مارکس بیردۆزییەکی سەبارەت بە زاڵبوون بەسەر کۆمەڵگای مەدەنیدا خستە روو.

قۆناغی تیۆری ئەو ناکۆکیی نێوان شتە باوەکانی جێی پەسندی دەوڵەت و هەموو ئەو شتانە ئاشکرا دەکات کە لە راستیدا هەن. دووهەمین بەشی تیۆرێکە دەست دەداتە لێکۆڵینەوەی راستیەکان لە ژێر دیاردە روکەشیەکان و لێکۆڵینەوە بۆ بەرێوەبەرێك کە بتوانێ گۆڕانکاریی لەو راستیەدا پێك بێنێت و لەو ئەولاوەتر بڕوات. یەکەمین قۆناغ، قۆناغی دەرخستن و ئاشکرا کردنە و پرسکە دەردەخات، دوومیشیان خوخدەی پرسکە تاوتوێ دەکات و بەشوێن رێگاچارەدا دەگەڕێت.

## مارکس و رەخنە لە هیگڵ: یەکەمین فۆرمی کۆمەڵگای مەدەنی:

رەخنەی مارکس لە هیگڵ نوێنەری یەکەمین نموونەی باسکردن و پێچەوانەکردنەوەی بابەتەکەیە. مارکس پێشەکییەکانی هیگڵ قبوڵ دەکات سەبارەت بەوەی دەڵێت، مەدەنییەت تایبەتمەندیی جیهانی نوێیە، ئەوەی قبوڵە کە کۆمەڵگای نوێ زۆر شتی بۆ خستنەڕوو هەیە چونکە دەتوانێ بنەمای سەربەخۆخوازیی تاك یاسامەند بکات، بە فۆرمەکانی هیگڵ رازییە و لە نیگەرانییەکانی هیگڵدا بەشدارە سەبارەت بەوەی کۆمەڵگای مەدەنی پانتایی خۆپەرستییە و کەوابوو دەبێ رێکبخرێت، بەوەش رازییە کە زاتی دەوڵەت فۆرمۆلبەندییەکی بنەمایی گشتیخوازانەیە کە نەیاری بەرژەوەندییە هەندەکیخوازانەی تاکەکان لە کۆمەڵگای مەدەنی دایە، بەڵام دیسانیش دەتوانێ لە رێگای رەخنەوە، جەخت کردنەوەی هیگڵ لە سەر دەوڵەت پێچەوانە بکاتەوە. ئەو بە پێشەکیەکانی هیگڵ دەستی پێکرد، بەڵام لۆژیکی شیکاریەکانی ئەو و هەروەها ئاکامەکانیشی رەتکردوە. هیگڵ لە پێشێتی کۆمەڵگای مەدەنییەوە دەستی پێکرد و بەرەوپێش چوو بۆ ئەوەی گوێڕایەڵی دەوڵەتی بکات. مارکس پێشێتی کۆمەڵگای مەدەنی زیندوو کردەوە و هەربۆیە دەوڵەتی کردە پەیڕەوی ئەو مەڵبەندە. لە فۆرمۆلبەندیی مارکسدا کۆمەڵگای مەدەنی بوو بە گۆڕەپانێك کە دیالکتیکی نێوان کاری کۆمەڵایەتی و کاری سیاسی، نێوان باڵادەستیی و خۆڕاگریی، نێوان سەرکوت و رزگاریی تێیدا بەکردەوە دەردێت. مارکس باسی ئەوەی دەکرد لەو رووەوە کە کۆمەڵگای مەدەنی شانۆی مێژوویە دەبێ بۆ رزگاربوونی چاو لە ناوخۆی خۆی بکات، دەبێ ئەکتەرێك بدۆزێتەوە کە لەناو ئەودا جێی ببێتەوە و گۆڕانکاریی تێدا پێك بێنێت، بە سیستەمێکی داسەپاوی نێوبەندییەکان ناکرێ رزگار بکرێت.

مارکس بە پێی پێشێتی کۆمەڵگای مەدەنی لە جیهانی نوێدا کارەکانی بەڵگەمەند دەکرد. ئەو دەیگوت تاکی نوێ، بە پێچەوانەی "ئاژەڵی سیاسی"ی دەوڵەتشاری یۆنانی، لە قۆناغی یەکەمدا سیاسی نییە، یانی هەر لە زاتی خۆیدا سەرقاڵی کاروباری دەوڵەتشار نییە.

هەروەك چۆن پێكهاتەكانی ئەمڕۆیی دەوڵەت كۆسپی سەر ڕێگای ئەون. دەوڵەتی نوێ بە ئامرازە تایبەتیەكانی خۆی، ژیانی سیاسی پاوان دەكات. بیرۆكراسی كە هیگڵ پێی دەگوت چینی گشتیی سەنا، بۆ ماركس فۆرمێكە كە ناهێڵێت تاك دەستی بە دەوڵەت رابگات. كەوابوو تاكی لە سیاسەت دابڕاوی نوێ دەبێ ژیانی خۆی لە كۆمەڵگای مەدەنیدا تێپەڕ بكات كە جێگاوشوێنی رەفتارەكانی كار و ژیانی هەموو رۆژێی ئەوە. ئەو دەڵێت ئەو چوارچێوە سەركوتگەرە چونكە راپەڕینی سیاسی كە قەڵەمڕەوە سیاسییەكەی گۆڕیوە، كاری بە سەر ئەوەوە نەبووە، چوارچێوەیەكە كە تێیدا چاوچنۆكی، خۆپەرەستی، و چەوساندنەوە هەروا بەڕێوەبەری ژیانی تاكەكەسین. گۆڕینی پانتایی سیاسی، كە چەمكەكانی ماف، دادپەروەری، ئازادی و یەكسانی لەگەڵدان، هاوڕێی گۆڕانكارییەكانی پانتایی مەدەنی نییە.

هەر بۆیە، ئەو شۆڕشە كە جیهانێكی سەربەست پێكدێنێت كە تێیدا تاكەكان لە چاوی یاسا و دەوڵەتەوە یەكسانن، پێشكەوتوو، بەڵام نوقسانە.ماركس لە **رەخنە لە فەلسەفەی مافی هیگڵ** (١١٦)دەنوسێت: "ئەوە یۆتۆپیایی شۆڕشێكی نوقسان و بە تەواوەتی سیاسییە، ئەو شۆڕشەی كە ناهێڵێت ستوونەكانی ماڵ بڕوخێن" (١١٦، ل٣١).

تاك لەو بازنە تەماعكارییە كە لە كۆمەڵگای مەدەنیدا بەسەر بارودۆخی ژیانی ئەودا زاڵە، بەداوەوە بووە، و ناتوانێ وەك تاكی هیگڵی لە نێو دەوڵەتدا پشتیوانییەك پەیدا بكات، چونكە دەوڵەت لۆژیكێكی جیا لە لۆژیكی كۆمەڵگای مەدەنی نییە و ناشتوانێ هەیبێت چونكە دەوڵەت بەرهەمی هەر ئەو رووداوە مێژووییەیە كە كۆمەڵگای مەدەنی پێك دێنێت. ئەم رووداوە مێژووییە، یانی شۆڕشی سیاسی دەتوانێ كەلەبەرێك لە نێوان كاری مەدەنی و كاری سیاسیدا پێك بێنێت. ئەگەر كاری سیاسی لە "دەستدرێژی"ی ژیانی مەدەنی رزگاری بوو، دەتوانێ وەك چوارچێوەیەكی ناتایبەتی گشتگیر سەرهەڵبدات. بەڵام بەهۆی سەرهەڵدانی چوارچێوەی تایبەتی كە تێیدا هەندەكی دەبێتە بنەمای گشتی، دەتوانێ ئەو كارە بكات.[٣٩] "بنەمای راپەڕینێكی نوقسان و بە تەواوەتی

٣٩ - ماركس لە پرسی یەهود دا دەڵێت: شۆڕشی سیاسی "روحی سیاسی كە دەڵێی لە خەرەندە تاریكە جۆراوجۆرەكانی كۆمەڵگای فیۆدالیدا بڵاوبۆتەوە، ئازادی كرد. بەشە پەرتەوازەكانی روحی سیاسی لە دەوری یەك كۆكردەوە، ئەوانی لە ئاوێتەبوونیان لەگەڵ ژیانی مەدەنی ئازاد كرد و ئەوی وەك پانتایی جەماعەت، جێگای سەرنجی گشتی خەڵك سەلماند كە سەربەخۆ لە توخمە تایبەتیەكانی ژیانی مەدەنییە. چالاكیی جیاواز و

سیاسیی چییه؟ ئەوەیە کە بەشێك لە کۆمەڵگای مەدەنی خۆی ئازاد بکات و دەستی بە بالاّدەستیی گشتی رابگات" (١١٦).

مارکس دوو راستی لەو فورموڵبەندییەدا دەسەلمێنێت، یەکێکیان ئەوەیە کە راپەڕینی بورژوا ئالوگۆڕی لە چوارچێوەی مەدەنیدا پێك نەهێناوە. لە راستیدا ئەو دەسەلاّتە بەرتەسکەی کە بورژوازی بەدەستی هێناوە سەرکوتەکانی ئەو چوارچێوەیە چڕتر دەکاتەوە. دووهەم ئەوەی بانگەشەکانی دەوڵەت سەبارەت بە گشتگیربوونەکەی شتێکی مایە پوچە. هەمووی ئەو شتەی کە روویداوە ئەوەیە کە هەندێك لەو دەسەلاّتانەی کە پێشووتر لە رێگای دەسەلاّتی سیاسییەوە دادەسەپان، تایبەتی بوونەتەوە ـ یانی ئەو دەسەلاّتانە بە چینە داراکان سپێردراوە. لۆژیکی چەوسانەوەی سەرمایەداری بە سەر هەر دووك قەڵەمڕەوەکەدا زاڵە. هەر بۆیە ئەو حاشا لەوە دەکات کە دەوڵەت بالاّدەست، بێ لایەن یان گشتگیرە. بەڵکو دامەزراوەیەکی سەر بە چینێکە کە بە پڕوپاگەندەیەکی بێناوەڕۆك باسی یەکسانی و مافەکان دەکات. دەوڵەت بە یاسا گشتییەکانی خۆی، بە رێکخستنی ئەو ناکۆکییانەی کە لە کۆمەڵگای مەدەنیدا هەن، لەو دەرباز نابێت، بەڵکو تەنیا ئەو ناکۆکییانە هەڵدەپەسێردرێت. دەوڵەت بەشێوەیەکی ئەبستراکت نوێنەرایەتی بەرژەوەندییە گشتییەکانی کۆمەڵگای مەدەنی دەکات یانی ئەو بەرژەوەندییانەی کە هەر تاکێك لە "یەکێك لە دژی هەمووان و هەمووان لە دژی یەکێك" ململانێی ئابووریی بازاڕدا، لەگەڵ ئەوانیتر تێیدا بەشدارە.

هەربۆیە دەوڵەت و کۆمەڵگای مەدەنی دووجیهانی جیاواز نین کە بەوشێوەیەی هیگڵ شیمانەی دەکرد، لۆژیك و سەرنجێکی عەقلاّنی جیاوازیان هەبێت، ئەوان "جەمسەرە نەیارەکانی یەك ناکۆکین... کۆمەڵگای مەدەنی لایەنی سەرەکیی ئەو ناکۆکییەیە" (١٥٠، ل١٠). بنەمای کۆمەڵگای سیاسیش هەر وەك کۆمەڵگای مەدەنی لەگەڵ هەموو بەشە ئابوورییەکانی ئەوە (١٢٤، ل٣٥).

مارکس بە فۆرمۆلبەندی هیگڵ رازییە کە دەڵێت کاری تایبەتی راستەقینەی دەوڵەت، کارێکی گشتییە، واتە دەربڕینی بەرژەوەندییە هەمەکییەکانە لە بەرامبەر بەرژەوەندییە

---

پێگەی جیاوازی تاك لە ژیاندا تا ئاستێکی تەنیا تاکەکەسی دابەزی. ئەوانە ئیتر بەگشتی پەیوەندیی تاك و دەوڵەتیان پێك نەدێنا. لە لایەکی دیکەوە، کاروباری سیاسی بوون بە کاروباری گشتیی هەر تاکێك و کاری تایبەتیی سیاسی بوو بە کاری تایبەتیی گشتیی هەر تاکێك (١٢١).

هەندەكی كۆمەڵگای مەدەنی. ئەوەی دەبیاتە ژێر پرسیارەوە ئەوەیە كە ئایا دەوڵەتی ئێستا دەتوانێ ئەو كارە بكات، ماركس ئەو لێكدانەوەیە بەرەو پێشتر دەبات ـــ ئەگەر رزگاریی مرۆڤ نوقسانە و ئەو لە كۆمەڵگای مەدەنیدا هێشتا هەر بێبەشە، بەشداریی هاووڵاتی لە ژیانی هاوبەشی دەوڵەت وەهم و روكەشیانەیە. مرۆڤ نەك وەك هاووڵاتییێك بەڵكو وەك بورژوا ـــ واتە تاكێكی سروشتی ـــ یە كە دەوڵەت گەرەنتی خوخدەی ئەو دەكات.

سەردەمی بورژوازیی ئەمرۆیی بۆ ماركس "لەو رووەوە تاقانەیە كە "جیایی" فۆرمە سیاسی و كۆمەلایەتییەكانی چینەكان دادەسەپێنێت. ئەو سەردەمە بۆ یەكەمین جار مرۆڤ بە سەر چینە كۆمەلایەتییەكاندا دابەش دەكات، پلەوپایەی یاسایی تاكەكان لە رۆڵی كۆمەلایەتیی ئابووریی ئەوان لە نێو كۆمەڵگای مەدەنیدا جیا دەكاتەوە و هەر تاكێك بە سەر دووبەشی خۆویستی تایبەتی و هاووڵاتییێكی گشتیدا دابەش دەكات" (٨٣، ل٣٧). بەلام ماركس باسی ئەوە دەكات كە تەنیا ئەوەی دەوڵەتی نوێ چینەكەی بۆ پانتاییەكی تایبەتی راگواستوە، نابێتە هۆكار بۆ ئەوەی ئیتر هیچ چینێك بوونی نییە. هەروا بوونی هەیە، بەلام ئێستا وەك ناكۆكییە كۆمەلایەتییەكان لەگەڵ جیاوازیە چینایەتیەكان هەڵسوكەوت دەكرێت، كە هۆكارێكی سیاسی نییە.[٤٠] هەر بەوچەشنە، ئەوەی ئیتر خاوەنداریتی بنەمای دەوڵەت نییە، بەو مانایە نییە كە خودی خاوەنداریتی هەڵوەشاوەتەوە. هەروا بوونی هەیە، هەروەك چۆن لە دەوڵەتی دونیایدا هەر هەیە.

دەوڵەتی سیاسی... هەر ئەو دژایەتییەی لە گەڵ كۆمەڵگای مەدەنی هەیە و هەر بەو شێوەیەش بە سەریدا سەردەكەوێت كە ئاین بە سەر سنوورەكانی جیهانی نائایینیدا سەر دەكەوێت، یانی دەبێ هەر بەو شێوەیە قبوڵی بكات، دیسانەوە سەقامگیری بكات، و ئیزنی ئەوە بدات كە بۆ جارێكی تر بچێتە ژێر سەروەریەكەیەوە (١٢٢، ل٦-٤٥).

لێكدابڕانی ئەو بنەما سیاسیانەی كە دەوڵەت رایگەیاندوە و ئەو بارودۆخە هەنووكەییەی كە تاك خۆی تێدا دەبینێتەوە، ئاشكرایە.

---

٤٠ - هەروەك ماركس و ئینگڵس لە بەشێكی بەناوبانگ لە مانیفێستی حیزبی كۆمۆنیست (١٨٤٨)دا رایان گەیاند: "كۆمەڵگای نوێی بورژوازی كە لە سەر كەلاوەكانی كۆمەڵگای دەرەبەگایەتی دامەزراوە، ناكۆكییە چینایەتیەكانی لەنێو نەبردوون، بەڵكو چینە نوێیەكان و بارودۆخی نوێی چەوسانەوە و شێوازی نوێی خەباتی لە جێی شێواز كۆنەكان داناوە".

ڕەخنەی مارکسیستی لە هیگڵ دەتوانێت پەردە لـە ڕووی دەوڵـەت هـەڵماڵێت سـەبارەت بەوەیکە خۆی بە شتێکی گشتی دەزانێت، و لـە شـەرعیەت و تواناکـانی بـۆ ناچـارکردن بـە پـەیڕەوی لێکردنـی پـەردە لادەدات. ئەگـەر دەوڵـەت نوێنـەری جـوڵێنراوی خودپەرسـتی و تالآنەکانی کۆمەڵگای مەدەنی بێت، کەواتـە ناتوانێـت ناکۆکییـەکانی کۆمـەڵگای مـەدەنی ڕێکبخات، بۆیە بە پێی پێویست سەرلەنوێ بەرهـەمی دێنێتـەوە. دەبـێ لـە یـەکانگیربوونی سەرلەنوێی دەوڵەت و کۆمەڵگادا بەشوێن چارەسەرەکەیەوە بین: مارکس لە **پرسـی یـەهود** دا دەنوسێت: "تەنیا کاتێك کە تاکی ڕاستەقینە هاوولاتیی ئەبستراکت لە خۆیدا بتوێنێتەوە"... تەنیا کاتێك کە مرۆڤ "هێزە تایبەتی"یەکانی خۆی وەك هێزە کۆمەڵآیەتییەکان ناسین و ڕێکی خستن و لە ئاکامدا ئیتر دەسـەڵآتی کۆمەڵآیەتی بەشێوەی دەسـەڵآتی سیاسـی لـە خـۆی جیـا نەکردەوە، تەنیا ئەوکاتەیە کە ڕزگاریی مرۆڤ کامڵ بووە" (١٢١، ل٥٧).

## کۆمەڵگای مەدەنی وەك نوێنگەی کارەکانی ڕۆژانەی ژیان:

ئێستا کە تاك لە بەشداریکردن لە دەوڵەتدا بێبەش بووە، لە ڕاستیدا ئێـستا کـە دەوڵـەت تەنیا کۆمەڵێکی خۆشباوەڕ دەخولقێنێت، کەواتە تاك ناچـارە ژیـانی خـۆی لـە چوارچـێوەی مەدەنیشدا تێپەڕ بکات. ناچارە لە چوارچێوەیەکدا بژیت کە بە کـارە دونیاییـەکانی ڕۆژانـەی ژیان پێکهاتووە. مارکس ئەو شیکارییـەی هیگڵ قبوڵ دەکات کە کۆمەڵگای مەدەنی هێندێك ڕێگا بۆ خودوەدیهـاتنی مرۆڤـەکان دابـین دەکـات. لێرەدایـە کـە مـرۆڤ دەتـوانێ هـەبوونی چەشنیەتی خۆی بدۆزێتەوە. و ئەو هەبوونی چەشنیەتە، بۆ مارکس، پشتی بە تواناکـانی ئـەو بۆ کاری پێداچوونەوانە و وشیارانە بەستووە. لە ناخی تێگەیشـتنەکەی مـارکس دا لـە مـەڕ هەبوونی مرۆڤایەتی، ئەو چەمکە هەیە کە تاك بەر لە هەر شتێك ئاژەڵێکی کارکەرە. کار لە ڕوانگەی مارکسەوە چالاکییەکی خۆشە و دەبێ هەبێت. ئامرازێکە کە تاك لە ڕێگەی ئـەوەوە خۆی وەدی دێنێت، هەروەها ئامرازێکیشە کە لە ڕێگای ئەوەوە لەگەڵ جیهـانی کۆمەڵآیـەتی پەیوەندی دەگرێت. ئەگەر مـرۆڤ وەك بوونـەوەرێکی خولقێنـەر هەنـدێك شـت دەخولقێنێـت، دووجار دان بەخۆیدا دەنێت.

(١) من لە بەرهەم هێنانی خۆمدا، تاکەکەسی و تایبەتی بوون (هەندەکی)ی خـۆم وەدی هێناوە، و لە ڕەوتی چالاکییەکانی خۆمدا، ژیانێکی تاکە کەسـیم هـەبووە، لـە تێـڕوانین بـۆ

هەقیقەت (OBJECT) خۆشیی ناسینی کەسایەتی تاکی خۆم وەك دەسەڵاتێکی راستەقینە، شیاوی هەست پێکردن، و دوور لە گومانم ئەزموون کردوە.

(٢) لە کەڵك وەرگرتنی تۆ لە بەرهەم هێنراوەکانی من و دابین بوونی تۆ لە من، من ئەو دابین بوونە راستەوخۆ و وشیارانەم هەیە کە کارەکەی من پێویستییەکی مرۆیی دابین کردوە، خوخدەی مرۆڤایەتی وەراستی گێڕاوە، و راستیەکی خوڵقاندوە کە بۆ دابینکردنی پێداویستییەکانی بوونەوەرێکی مرۆیی دیکە پێویستە (١١٧، ل٣٩).

مرۆڤ لە بەکردەوە دەرهێنانی تواناکانی خۆی بۆ سەرقاڵبوون بۆ رەنگدانەوەی کارەکە بەرەولای خۆی، بەشێوەیەکی خودموختارانە و خولقێنەرانە، زاتی راستەقینەی خۆی و کۆمەڵایەتی بوونی خۆی وەدی دێنێت. کار رێگای پەیوەندیی ئەو لەگەڵ جیهانێکی بەربلاوە. کەواتە کار، ئازاد، خولقێنەر و هەستیارە لە مەڕ ئەو رێگایانەی کە تاك لە رێگای ئەوانەوە دان بە هەبوونی چەشنی خۆیدا دەنێت. بەڵام کۆمەڵگای بورژوا نیزن بە پشکووتنی ئەو هێزە نادات.

یەکەم لەبەر ئەوەی لە وەها کۆمەڵگایەکدا، کار بۆ هێزی کار کەم دەکرێتەوە، دەبێتە کاڵایەك کە کرێکار ناچارە لێی نامۆ بێت چونکە وای لێدەکات دەستی بە ئامرازەکانی ژیان و بەرهەمهێنان رابگات. بەڵام تێکهەڵچوون لە پرۆسەکانی بەرهەمهێنانی کۆمەڵگای سەرمایەداریدا، هیچ تاموچێژ و رەزامەندیك بە تاك نابەخشێت. مارکس، بە زایەڵەیەك لە شیکاریی ئادام سمیس لە نەگۆڕی و دووپات بوونەوەی کار لە کۆمپانیایەکی دروستکردنی دەرزی دا، بانگەشەی ئەوە دەکات کە تایبەتی بوونەوەی پیشە و ئەرکەکان، تاك دەکاتە یەخسیر و گیرۆدەی چوارچێوەیەکی باریك و بەرتەسکی دووپات بووەوە و رۆژانەی کارەکەی. تاك کە بەو چالاکییە تایبەتی کراوەیە بەرتەسك کراوەتەوە، بە گوێرەی کەسایەتیی مرۆیی و لە بواری توانایی پەیوەندییەوە وەك تاکێکی هاوسەنگی هەمەلایەنە لەگەڵ جیهان هەژار دەبێت. بەڵام لە لایەکی دیکەوە، هەر ئەو تایبەتی بوونەوەی پیشەکان بارهێنەری پەیوەندییەکی بەرامبەرە.

پێگەیەکی نەشیاوە: لە لایەکەوە کۆمەڵگا کەسایەتییە تایبەتییە بیرتەسکەکان پەروەردە دەکات و لە لایەکی دیکەوە تاکەکان پەیوەندییەکی راستەوخۆیان بە یەکەوە دەبێت. لە کۆمەڵگایەکی ئەوتۆ دا تاك دەبێ مامەڵە بە کاڵاکانی بکات و دەبێ بچێتە نێو گۆڕەپانی کارێکی کۆمەڵایەتییەوە. بەڵام ئەو ئاڵوێرانە لە سەر بنەمای کاڵایی دامەزراون. هەموو کەس بە چاوێك لە کەسی دیکە دەڕوانێت کە دەتوانێت پێویستییەکی تایبەتی دابین بکات.

مارکس لە لێکدانەوەیەکی هاوتەریب لەگەڵ لێکدانەوەکەی هیگڵ باسی ئەوە دەکات کە ئەو پێکهاتە کۆمەڵایەتییەی کە بە بنەمای ئاڵوویر پشت ئەستوورە، تووشی هەژاری بووە. "تەنیا زمانێکی لێك تێگەیشتن کە لەگەڵ یەکتری دەکاری دەکەین، شتەکانن ئەویش لە پەیوەندییان لەگەڵ یەکتریدا... ئەوەندە لە خوخدەی مرۆیی نامۆ بووین کە زمانی راستەوخۆی ئەو خوخدەیە گورزێکە کە لە متمانەی مرۆیی دەدرێت، ئەوە لە کاتێکدایە کە زمانی نامۆی بەها راستەقینەکان وەك متمانەی مرۆیی رێگەپێدراو، دڵنیا لە خود، و خۆ قبوڵکراو، خۆی دەردەخات. (١١٧، ل٣٨). هەندێك دواتر هەر لەو بەشەدا دەنوسێت: "بەهای بەرامبەری ئێمە (بۆ یەکتری) بەهای شتەکانی بەرامبەرمانە بۆ ئێمە، کەواتە خودی مرۆڤ راستەوخۆ بۆ ئێمە بێ بایەخە (هەمان سەرچاوە).

بۆ وای لێدێت؟ بۆچی لە کۆمەڵگای بورژواییدا تاکەکان بێ بایەخ دەبن؟ [٤١] مارکس لە گرۆندریسە لە پەیجویی پێشینەی کۆمەڵگای مەدەنی، باسی ئەوە دەکات کە راپەڕینی بورژوایی سەرجەم پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان و پەیوەندییەکانی کۆمەڵە مرۆییەکان لێك دادەبڕێت، تاك لە دەستڕاگەیشتنی بە ئامرازەکانی بەرهەم هێنان بێبەش دەکات، مرۆڤ بەو کەسانەوە دەبەستێتەوە کە خاوەنی ئەو دەست پێڕاگەیشتنەن و خەڵك بۆ کار و کاڵا رەوانەی

---

٤١ - کۆمەڵگای مەدەنی لە لایەکەوە لە هەموو کۆمەڵگاکاندا هاوبەشە، مارکس لە ئایدۆلۆژیای ئەڵمانی (١٨٤٥-٤٦) دەنووسێت: "ئەو شێوە پەیوەندییەی کە هێزە بەرهەم هێنەرەکان لە سەرجەم قۆناغەکانی پێشووتری مێژوویدا دیاریان کردوون، کۆمەڵگای مەدەنییە... دەزانین کە ئەو کۆمەڵگا مەدەنییە ناوەندی راستەقینە و شانۆی هەموو مێژوویە، و زۆر بێ بایەخە ئەو خوێندنەوەیە بۆ مێژوو کە هەتا ئێستا باو بووە و پەیوەندییە راستەقینەکان لەبەر چاو ناگرێت و هەر بە رووداوە سەرنجڕاکێشەکانی مێژوو رازی دەبێت (١١٨، ل٩٩-٩٨). سەرەوژێر کردنەوەی مێژوو لە لایەن خودی مارکسیشەوە سەرنجڕاکێشە، مێژوو گێڕانەوەیەکی رووداوە گەورەکان و رووداوە رواڵەتیەکان نییە. چیرۆکی خەڵکێکی ئاساییە کە بە پێی نۆرمە باوەکانی کۆمەڵایەتی و رۆژانەی کاری تاك و کۆمەڵ دەژین. دەکرێ تەواوی خوخدەی قۆناغێکی مێژوویی لەو چالاکییانەدا دەرك بکرێن و بریاریان لە سەر بدرێت. بەڵام ئەو نۆرمە باوانە لە بۆشاییدا کار ناکەن، ئەوەیکە خەڵك چۆن کار دەکەن، خەرج دەکەن، بەرهەم دێنن، و مامەڵەی پێوە دەکەن، ئەوەیکە بەچ شێوەیەك لەگەڵ یەکتری لە ژیان و گوزەرانی رۆژانەدا، کاردانەوەی بەرامبەریان هەیە، پەیوەندیی بە گەشەی هێزەکان و پەیوەندییەکانی بەرهەم هێنانەوە هەیە.

بازاڕ دەکەن. ئاکامەکەی ئاشکرایە ـــ تاکگـەرایی، ململانـێ، و خۆپەرەسـتی، پەیوەندییـە کۆمەڵایەتییەکان لە جێی پەیوەندییە سروشتیەکان دادەنێن: ئەو پەیوەندییەی کە "تـەنیا وەك ئامرازێك بۆ مەبەستە تایبەتیەکانی مرۆڤ، وەك پێویستییەکی دەرەکی لە رووبـەڕووی ئـەودا دادەنرێت" (١٢٠، ل٨٤).

کۆمەڵگای مەدەنی وەك گەندەڵی و لێك هەڵوەشانی پەیوەندییە سروشتییە مرۆییەکان کە لە پەیوەندییە کۆمەڵایەتییە ئامرازیەکانەوە سەرچاوە دەگرێت، گەشە دەکـات و بەرهـەمێکی سەرمایەدارییە. وەك بەرهەم، جیهانێك دەخولقێنێت کە تێیدا تاکی هـاووڵاتیی دنـەدراو بـە کەسانی دیکەوە بەستراوەتەوە، ئەوە بۆ بوونی رۆژانەی تاکەکان پێشهاتێکی بنـەڕەتی هەیـە. مارکس لە پێشەوەی هـەموو ئـەو بیرمەندانـەی جیهـانی ئەمڕۆیـە کـە بـاس لـە ملـهوڕیی فۆرمەکانی رۆژانە دەکەن: کەسانێك باس لەو ئەزموونانە دەکەن کە لە سـەر "تـالآنی گروپـە جۆراوجۆرەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی" (١٢٤، ل٤١٢) بونیات دەنرێت. کۆمـەڵگای مـەدەنی، وەك سەرچـاوە و جێگاوشـوێنی ملهوڕانـەی فۆرمـەکانی رۆژانـەی ژیـان، دەبێتـە هـۆی لـە خۆنامۆبوون و سەرکوت و شەڕ و رکەبەری لێدەکەوێتەوە.

بۆ مارکس، کۆمەڵگای مەدەنی بەو چەشنەی کە لە لای هۆبز و لۆك بوو، نـەیاری دۆخـی سروشتی نییە. ئـەو چەشـنەی کـە فرگسـۆن دەڵێـت، نیشـانەی پێگەیشـتوویی و ئەوپـەڕی شارستانیەتیش نییە. بەو چەشنەی کە دەکرێ لە وەسفی ئەو سەبارەت بە کۆمەڵگای مەدەنی تێبگەین، لەگەڵ دۆخی سروشتیش هاوواتا نییە.[٤٢] قۆناغێکی دیاریکراوی مێژووییە. مـارکس لە گەڵ شـارەزایانی ئـابووریی سیاسـیی کلاسـیك هاوڕایـە سـەبارەت بەوەیکـە کۆمـەڵگای مەدەنی، تایبەتمەندییەکی کۆمەڵگا پێشەییەکانە، بەڵام لە کاتێکـدا کـە ئـەوان ئـەوەیان بـە

٤٢ - بۆبیۆ (١٥، ل٢٨) باسی ئەوە دەکات کە چەمکی کۆمەڵگای مەدەنی مارکس، هەر ئەو دۆخەی هەیە کە دۆخی سروشتی بۆ نەریتی یاسای سروشتی هەیبوو، کەوابوو بە پێی لێکدانەوەی بۆبیۆ، مارکس ئەو نۆرمانەی کە کۆمەڵگای مەدەنیان بە نەیاری دۆخی سروشتی دەزانی، هەڵ دەگەڕێنێتەوە. ئەو لێکدانەوەیە جێگای پەسند نییە. کۆمەڵگای مەدەنی مارکس، بەرهەمی جیهانی نوێیە، خولقاوی راپەڕینی بورژوازییە و لەگەڵ شۆڕشێکی بێ وێنە لە زانست و فەن ناسیدا هاوڕێیە، کە پەیوەندیی مرۆیی بە عەقڵانیەتێکی ئامرازییەوە دەبەستێتەوە. جیاواز لەوەش، مارکس لێکدانەوەیەکی سەبارەت بەو مافانە نەبوو کە بەشێکن لە نەریتی یاسای سروشتی و بۆ ئەستاندنەوە نابن.

پێشکەوتن دەزانی، مارکس لەسەر ئەو پێشکەوتنە دوولایەنەیە قسە دەکات. سەبارەت بە فۆرمەکانی بەر لە سەرمایەداری کۆمەڵگا کە بە "دیموکراسی نائازادی" دیاری دەکرێن، بەرەوپێشچوونە، بەڵام هەروەها چوارچێوەیەکە کە تێیدا قسەی بێناوەرۆکی سیاسیی ئازادی و یەکسانی، بێدەسەڵاتی تاك لە پەیوەندییەکانی بەرهەمهێناندا دادەپۆشێت. لە بواری جێخستنی شتەکانەوە، کۆمەڵگای نوێ لە سەر بنەمای خودموختاری و بکەریی تاك، و لە سەر بنەمای مافی ئەو سەبارەت بەوەیکە خۆی بە چاودێری کاروباری کۆمەڵ بزانێ، پێك هاتووە، بەڵام نە کۆمەڵگای مەدەنی و نە دەوڵەت کە بنەماکانی ژیانێکی نوێ دادەڕێژن ناتوانن بارودۆخی پێویست بۆ ئەو کارە دابین بکەن.

مارکس دوای سڕینەوەی پیرۆزیی دەوڵەت بەرەولای سڕینەوەی پیرۆزیی کۆمەڵگای مەدەنی دەچێت کە لە بەرهەمی لیبراڵەکان و هیگڵ دا باسی مافەکان و ئازادیەکان نوێنەریەتی، و مارکس ئێمە بۆ دەرککردنی ئەوە هاندەدات کە کاتێك دەتوانین بە باشی لە خوخدەی راستەقینەی کۆمەڵگای مەدەنی تێبگەین کە گۆڕەپانی رواڵەتی یەکسانی، خاوەنداریتی و بنتام بەجێ بێڵین و بچینە ناو "پانتایی شاراوەی بەرهەم هێنانەوە". مارکس لە بەشێکی گرنگی سەرمایە۱ دا دەنوسێت:

ئەو چوارچێوەیەی کە هەمانە بەجێی دێڵین و کڕین و فرۆشتنی هێزی کار لە نێو خۆی سنوورەکانیدا بەرەو پێش دەچێت، لە راستیدا وەك حوکمی باخی بەهەشتی مافە زاتییەکانی مرۆڤە. تەنیا لەوێیە کە ئازادی، یەکسانی، خاوەنداریتی و بنتام دەسەڵاتدارن. بە بەجێهێشتنی ئەم چوارچێوەیەی وەگەڕخستنی ساکار یان ئاڵوگۆڕی کالاکان، پێمانوایە دەتوانین گۆڕانێك لە رواڵەتناسی کەسایەتیەکانی شانۆکەی خۆماندا هەست پێبکەین. ئەو کە پێشووتر خاوەنی پارە بوو ئێستا وەك سەرمایەدارێك دەچێتە سەر شانۆ، خاوەنی هێزی کار وەك کرێکاری ئەو بە شوێنیدا دێت. یەکێکیان بە حاڵ و وەزعێکی گرنگ، گەشاوە و ئامادەی بەدەست هێنان، ئەوی دیکەش ترساو و لەدواوە راگیراو، هەروەك کەسێك کە پێستەکەی خۆی دێنێتە بازاڕ و هیچ چاوەڕوانییەکیشی بێجگە لە پێست داماڵینەکەی نییە (۱۲۲، ل۱۷۲).

ئێستا ئەگەر تاکێك نەتوانێ بەڵێنەکانی جیهانی نوێ لە مەڵبەندی مەدەنی یان سیاسیدا بدۆزێتەوە، دەبێ لە سنووری هەردووکیان تێپەڕێ. مارکس لە گەڵ هیگڵ هاوڕایە سەبارەت بەوەیکە ناکرێ ئەو مەڵبەندە هەروا کاریان بەسەریەوە نەبێت، دەبێ ئەویش تێپەڕ بکرێت و بارودۆخی ژیان بۆ تاك دەبێ گۆڕانی تێدا پێك بێت. گۆڕانی کۆمەڵگای مەدەنی پێشمەرجی بنەڕەتیی گۆڕانکاریەکانی

قەڵەمڕەوی سیاسییە، کەواتە هەندێك پرس دێنە ئاراوە. کێ دەتوانێ ئەو گۆڕانکارییە بە ئەنجام بگەیەنێت؟ ئەو بەڕێوەبەرەی کە لەم مەڵبەندە تێدەپەڕێت لە کوێ دەدۆزرێتەوە؟

## بوژاندنەوەی مەدەنییەتی کۆمەڵگای مەدەنی:

شیکار و هەڵسەنگاندنی دیاردەیەك، جەخت کردنەوە لە سەر ئەو پرسی کە تێیدا بەرچاو دەکەوێ و دواتریش گەڕان بەدوای رێگاچارەدا، پەیوەندیی بە روانگەی تیۆری شیکارەکە، نیگەرانییە فیکری و سیاسییەکان و بەهاکانی بیرمەندەکە و بنەمای گەڵاڵەکردنی بابەتی گوتارەکەوە هەیە. هیچ شتێك لە رەخنەی مارکس لەمەڕ کۆمەڵگای مەدەنی ئەمە باشتر روون ناکاتەوە. مارکس لە روانگەی بێبەشان و پەراوێزخراوەکانەوە سەیری کۆمەڵگای مەدەنی دەکات، هەربۆیە خوێندنەوەی ئەو بۆ ئەو پانتاییە بەتەواوەتی لەگەڵ خوێندنەوەی هیگڵ جیاوازە، بەڵام ئەم رەخنەیە لە کۆمەڵگای مەدەنی تەنیا تێکهەڵچوونێکی تیۆری لەگەڵ فەلسەفەی هیگڵی نییە، بەڵکو تاوانبارکردنی کۆمەڵگایەکە کە هەر ئەم بکەرانە دەخاتە پەراوێزەوە کە بەر لە هەمووان هەلیان بۆ وەدیهاتنی ئەو کۆمەڵگایە رەخساند. رووی رەخنەکانی ئەو لە کۆمەڵگایەکە کە هەل بۆ ژیان لەگەڵ ئەو بێبەشی و خستنەپەراوێزانە دەڕەخسێنێت. مارکس بە بەدەستەوەگرتنی روانگەی چینی کرێکار، بە ئاکامی زۆر جیاواز دەگات سەبارەت بە کۆمەڵگای مەدەنی. هەر ئەوەی روانگەکە بگۆڕێت، گرفتی تیۆرەکە بەتەواوەتی بەشێوەیەکی جیاواز خۆی دەردەخات.

هێمای ئەوە لە بەرهەمە سەرەتاییەکانی (١٨٤٢)دا دەکرێ بدۆزرێتەوە کە مارکس لە بڵاوکراوەی کاتی راین دا سەبارەت بە مافە نەریتییەکانی نەداران بۆ هەڵگرتنەوەی درەختی کەوتوو بە بێ سەرنجدان بە خاوەندارێتییە تایبەتیەکەی نووسیوویەتی. مارکس نەدارەکانی وەك چینێکی بنەرەتی لە کۆمەڵگای مەدەنیدا وەسف کرد، چونکە نەبوونی خاوەندارێتی، ئەوان لە تێگەیشتنە ساختە و دەسکردەکانی کۆمەڵگای مەدەنی رزگار دەکات. ئەوان بوونەوەرە ماددییە نامۆکان ناپەرستن و لەم رووەوە وشیارییەکی مرۆیی تەواویان هەیە. لە روانگەی هیگڵەوە هەژارەکان ئەندامی کۆمەڵگای مەدەنی نین، چونکە نەبوونی خاوەندارێتی لە قازانجەکانی ئەو پانتاییە بێبەشیان دەکات. بە بڕوای مارکس، ئەوە ئیمتیازێکە و نەبوونی خاوەندارێتی بەو مانایەیە کە

نەدارەکان گەندەڵیی ژیانی مەدەنییان نییە، ئەو رەخنەیە سەبارەت بە کۆمەڵگای مەدەنی بە ئاماژە دەڵێت کە هەژاری لە فۆرمێکی تایبەت لە کۆمەڵگای مەدەنیدا پێك دێت.

بە بڕوای هیگڵ، نەدارانی پەراوێزخراو لە کۆمەڵگا، تەنیا تا ئەو ئاستە گرنگن بۆ کۆمەڵگای مەدەنی، کە هەڕەشە لە سەقامگیرییەکەی دەکەن، بەڵام بە بڕوای مارکس پرسکە بریتییە لە هەبوونی نەزمێکی کۆمەڵایەتی کە هەژارەکان لە ئەندامێتی لادەدات. هیگڵ لە روانگەی کۆمەڵگای مەدەنییەوە باسی هەژارەکان دەکات، بەڵام مارکس لە روانگەی نەدارەکانەوە رەخنە لە کۆمەڵگای مەدەنی دەگرێت. بۆ مارکس ئەم راستییە کە هەبوونی نەداران، رێورەسمێکی تایبەتیی کۆمەڵگای مەدەنییە، ئەوەش بۆخۆی رەخنەیەکە لەو کۆمەڵگایە، رەخنەیەکە لە پێوانە گشتی و عەقلانی و مرۆییەکانی(١١١، ل٢٥-٢٤).

ئەو روانگەیەی کە مارکس دەیخاتەڕوو، هەر لە بنەڕەتدا ئەو شێوازانە دەگۆڕێت کە لە رێگایانەوە دەکرێ رووداو و دیاردەکان، ئایدۆلۆژیا و بانگەشەکانی پێ هەڵسەنگێندرێت:

لە روانگەی مارکسەوە ئەو راستیە کە نەدارەکان ئەندامی کۆمەڵگای مەدەنی نین بەو مانایەیە کە لە ئەزموونی ئەوەی پێی دەڵێن "نەبوونی بەرژەوەندیی ئیمتیازە کۆمەڵایەتییەکان" یان "دژە ئیمتیازاتەکانی ئیمتیازات"، بووراون. دژە ئیمتیازاتەکانی ئیمتیازات بەو چەشنەی کە مارکس لە بابەتەکانی خۆیدا وەسفی دەکات، تایبەتن بە دەرەنجامە زیانبارەکانی بەرژەوەندییە تایبەتیەکان لە سەر تایبەتمەندییە ئەخلاقیەکان و وشیاریی ئەخلاقیی خەڵك. بەواتایەکی دیکە بە بڕوای مارکس، ئەوە تەنیا نەندامانی کۆمەڵگای مەدەنین کە ئەزموونی دژە ئیمتیازاتی ئەندامێتی لە نەزمی کۆمەڵایەتیدا دەستەبەر دەکەن کە لە ژێر دەسەڵاتدارێتی بەرژەوەندییە تایبەتیەکان دایە (هەمان سەرچاوە، ل٣١).

هێنانی نەدارەکان بۆ ناو گوتاری کۆمەڵگای مەدنی، کە هیگڵ بە شێوەیەکی هاوشێوە لەگەڵ لیبراڵەکان لە چوارچێوەی چینە داراکاندا بەرتەسکی دەکاتەوە، چەمکی دژایەتی هەڵدەگەڕێنێتەوە. دژایەتی نێوخۆیی کۆمەڵگای مەدەنی لە دژایەتی نێوان چینەکانەوە دەبێتە دژایەتی نێوان چینە دارا و نەدارەکان. ئەو ئاوەژووکردنەوە مێژووییە، کاری مارکسە و خاڵێکی وەرچەرخانە لە مێژووی مشتومڕەکان لەمەڕ کۆمەڵگای مەدەنی.

بەڵام مارکس لەم قۆناغەدا هەموو نەدارەکان تووشی حاڵەتێکی رۆمانتیك دەکات، چونکە پرسیاری پێ دروست ناکرێت. ئەو بۆ چینێك بە پێی جێگاوشوێنەکەی، کە لە دەرەوەی

کۆمەڵگای مەدەنییە، تایبەتمەندییەکی تایبەتی تەرخان دەکات، نە پێیوایە کە وشیاریی سیاسیی ئەو چینە جێگای پرسیارە و نە پێشیوایە کە لەوانەیە نەدارەکان لە بەهاکانی کۆمەڵگای مەدەنیدا بەشدار بن، هەرچەندە لە بەرژەوەندییە ماددییەکانی کۆمەڵگایەکی ئەوتۆشدا بەشدار نەبن. لە راستیدا لە بەرهەمەکانی پێشووی مارکسدا سەبارەت بە پرۆلیتاریا، هەر ئەو رۆمانتیزمە خۆی دەردەخات. ئەو لە پێشەکیی رەخنە لە فەلسەفەی مافی هیگڵدا گەلاڵەیەکی گشتی خستەڕوو سەبارەت بەوەی پرۆلیتاریا چینێکی گشتییە. لە گەڕان بەشوێن بکەرێکدا کە بتوانێت شۆڕش لە بارودۆخی سیاسیی دواکەوتووی ئەڵمانیادا بەرەوپێش بەرێت، هیچ کام لەو چینە کۆمەڵایەتیانەی کە هەن، پێیانوانییە کە ئەڵمانیا بۆ ئەو کارە گونجاوە. هیچ کام لەو چینانەی کە هەن، خاوەنی دوو چەندایەتیی بنەڕەتیی پێویست بۆ راپەڕینی سیاسی نین. ئەوان خاوەنی توانایی هەڵسەنگاندنی بارودۆخی راستەقینەی شۆڕش و بەکارهێنانی ویژدانێکی پێویست بۆ چالاکی شۆڕشگێڕانە نین. تەنیا چینێك کە ئەو تایبەتمەندییانەی هەبێت، ئەو چینەیە کە لە کۆمەڵگای مەدەنی بێتە دەرێ:

چینێك لە کۆمەڵگای مەدەنیدا کە لە چەشنی کۆمەڵگای مەدەنی نییە، ئەو چینەی کە هەڵوەشانەوەی هەموو چینەکانە، پانتاییەکی کۆمەڵگا کە بەهۆی کوێرەوەریی گشتی ئەو، تایبەتمەندییەکی گشتی هەیە و داوای هیچ مافێکی تایبەتیش ناکات چونکە نەك هەڵەیەکی تایبەتی بەڵکو هەڵەیەکی بێ مەرجیشی دەرهەق کراوە، پانتاییەك کە نەك رەوابوونی نەریتی بەڵکو تەنیا رەوابوونی مرۆیی هەیە، نەك بەشێوەیەکی بەرتەسك نەیاری ئاکامەکانی سیستەمی سیاسی ئەڵمانیا، بەڵکو بەتەواوەتی نەیاری پێشەکییەکانیەتی ، سەرەنجام ئەو مەڵبەندەی کە ناتوانێت خۆی رزگار بکات بێ ئەوەی لە هەموو مەڵبەندەکانی دیکەی کۆمەڵگا رزگاری بێت، و هەر بەم شێوەیە ئەوانیش رزگار بکات، بەکورتی چوارچێوەیەك کە لەدەستچوونی کامڵی مرۆڤایەتییە و تەنیا لە رێگای رزگاریی تەواوی مرۆڤایەتییەوە دەتوانێت خۆی دەرباز بکات. ئەو هەڵوەشاندنەوەیەی کۆمەڵگا وەك چینێك تایبەتە بە پرۆلیتاریا (١١٦، ل٣٣).

پرۆلیتاریا، ئەندامێکی "دیکە"ی کۆمەڵگای مەدەنییە، بونیادی دنیای بورژوازی بۆیە دروست بووە کە لە سەر شانی ئەم ئەو چینە بونیات نراوە و سەرەڕای هەمووی ئەوانەش هەروا پێگەیەکی پەراوێزکەوتوو لە ناوخۆی ئەو کۆمەڵگایەدا داگیر دەکات. مارکس لەو قۆناغەدا سەرنجێکی ئەوتۆ ناداتە رۆڵی بکەریی ئەو چینە، هەرچەندە کاری چینەکانی دیکەی ئەڵمانیا

تاوتویٚ دەکات، تا رادەیەك وا دەنوێنێت کە پرۆلیتاریا پێویستی بە گەشەپێدانی بکەریی خۆی نییە، چونکە پێشووتر دەرباز بووە، هەر لەبەر ئەوە رزگاریی کۆمەڵگای مەدەنی لە لایەن ئەو چینەوە بۆ مارکس جێگای پرسیار نییە.

تەنیا دواتر، ئەو کاتەی کە مارکس بۆ پاریس دوورخرایەوە و لەگەڵ بزووتنەوەی رێکخراوی چینی کرێکار و حیزبە کۆمۆنیستەکان پەیوەندیی گرتووە، پرۆلیتاریا بە توخمێکی چالاك دەزانێت کە تێگەیشتنێکی زیاتری لە مەڕ سیاسەت هەیە. ئەوە شێوازی ئابووریی و سیاسی بوو کە بووە هۆی ئەوەی ئەو لەوە تێبگات کە چینی کرێکار رۆڵێکی ناوەندێتی بۆ پرۆسەی بەرهەمهێنان هەیە. هەلی پرۆسەی کەڵەکەبوونی سەرمایە دەڕەخسێنێت، پەرەسەندن و گۆڕانکاریی شۆڕشگێڕانەی کۆمەڵگای بورژوا وەدی دێنێت و پرۆسەی بەرهەمهێنان پشتی بە پاوانکردنی کار بەستووە. مارکس باسی ئەوە دەکات کە کار سەرچاوەی هەموو بەهاکانە، بەڵام بەهەر رادەیەك بەهایەکی زیاتر بەرهەم دێت، کرێکار زیاتر تووشی نەداری دەبێت و بێ بایەخ دەبێت و لە مرۆڤایەتی دادەشۆرێت. هەر کارێکی بەرهەمهێنان دەسەڵاتێکی زیاتر بۆ سەرمایە دەخولقێنێت و چینی کرێکاری کرێگرتە بەرهەم دێنێتەوە. بەشداریی چینی کرێکار لە پرۆسەی بەرهەمهێناندا، بەشداریکردنە لە سەر لەنویٚ بەرهەمهێنانەوەی نەگبەتی و بێدەرەتانی خودی ئەو. چینی کرێکار دەبیٚ لەو پرۆسەیە واتە لە پرۆسەی سەرلەنویٚ بەرهەمهێنانەوەی خۆی رزگاری ببێت، دەبیٚ خۆی وەك چینێك هەڵوەشێنێتەوە.

کۆبوونەوەی چینی کرێکار لە دامەزراوە گەورەکاندا و کۆمەڵایەتی بوونەوەی پرۆسەی بەرهەمهێنان، ئەو کارە وەدی دێنێت. ئەو کارە دەرفەتی ئەوە بە کرێکاران دەبەخشێت کە بە تەواوەتی سیستەمی بەرهەمهێنان ئیفلیج بکەن. ئەو روانگە سیاسییەشیان پێدەبەخشێت کە بزانن بۆ ئەوەی چەوساندنەوە هەڵوەشێتەوە، خودی سیستەمەکە دەبیٚ هەڵوەشێتەوە. بەپێچەوانەی فۆرمەکانی پێشووی مارکس، ئەو چینە لە دەرەوەی کۆمەڵگای مەدەنیدا دانەنراوە. دەسەڵاتی چینی کرێکاری رێکخراو لە نێو کۆمەڵگای مەدەنیدا ئەو دەرفەتانە دەڕەخسێنێت کە ئەو چینە دەتوانێت هەم خۆی و هەم پانتایی مەدەنیش دەرباز بکات. کۆمەڵگای مەدەنی گۆڕەپانی سەرلەنویٚ بەرهەمهێنانەوەی پەیوەندییە زاڵەکانە، بەڵام دەشتوانیٚ شوێنێك بێت کە چینە بەشمەینەتەکان بتوانن تێیدا بۆ رزگاریی کۆمەڵایەتی و ئابووری ململانیٚ بکەن.

مارکس لە خوێندنەوەی خۆیدا بۆ ئابووریی سیاسی، لە هێنانی نەداران و مافەکانیان بۆ ناو گوتاری کۆمەڵگای مەدەنی، لە دیتنی نەدارەکان وەك چینێکی بنەڕەتی لە کۆمەڵگای مەدەنیدا بەهۆی ئەوەی گەندەڵ نەبووە، لە تێگەیشتنێکی ڕۆمانتیکەوە سەبارەت بە بکەریی نەدارەکان، بەو ئاکامە گەیشت کە نەتەنیا ناکرێ چاوپۆشی لە چینی کرێکار بکرێت، بەڵکو دەبێ دەرك بە تواناکانیشی بکات بۆ کردەوەی سیاسی. تاك بە مەبەستی ئەوەی پاڵێوراوی ئەندامێتی کۆمەڵگای رزگاریبەخش بێت، دەبێ خۆی بە کارەوە خەریك بکات، چونکە لە مەجالی بەرهەمهێنان دایە کە ناکۆکییەکانی کۆمەڵگای مەدەنی لە هەموو شوێنێکی دیکە ئاشکراترن. دەبینین کە مارکس بەچ شێوەیەك لە دیاریکردنی پرسیەکەوە لە کۆمەڵگای مەدەنیدا، ئەو پرسیەی کە ئەوی بەرەو رەتکردنەوەی ڕێگاچارەی هیگڵ رێنوێنی کرد، دەیەوێت پرسکە لە ڕێگای هەر ئەو بکەرانەوە چارەسەر بکات کە هیگڵ بە پرسی دەزانی.

هیگڵ پرسی کۆمەڵگای نوێی هێنابوە ئاراوە، مارکس رەهەندەکانی ئەو پرسیەی بە چەشنێك وەرگرت، کە هیگڵ هەرگیز نەیدەتوانی وێنای بکات. ناوکی عەقلانی ئەندێشەی هیگڵی، واتە خودموختاری و خودبڕیاردان، لە قاڵبی عیرفانیی دەوڵەت دەرکێشرا و لە چوارچێوەی کۆمەڵگای مەدەنیدا دۆزرایەوە. وادیار بوو کە مارکس بەو ئاکامە بگات کە ئەگەر بەشیی تایبەتیی جیهانی نوێ، کۆمەڵگای مەدەنییە، کۆمەڵگای مەدەنی دەبێ ڕێگاچارە و بکەرە تایبەتییەکانی خۆیشی بدۆزێتەوە. هەر ئەو کاتەی کە ئەوانە بە دەوڵەت بسپێرێت، مێژوو دەگەڕێتەوە بۆ قۆناغێك کە کۆمەڵگا وەك شوێنی قەدەغەکراوی دەوڵەت پێناسە دەکرا. مارکس ئەو توانایە بە ئێمە دەبەخشێت کە ئەگەر کۆمەڵگای نوێ هەندێك پێداویستی بۆ تاك دابین دەکات، بەرپرسیارێتی چارەسەری ئەو مەسەلانەش بەو دەسپێرێت. تاکی نوێ ناتوانێت لەو بەرپرسیارێتیانە پاشگەز بێتەوە، چونکە ئەوە بەمانای دەست کێشانەوەیە لە دەسکەوتەکانی سەردەمی نوێ.

شارەزایانی ئابووریی سیاسیی کلاسیك، کۆمەڵگای مەدەنییان هێنابووە ناو رەوتی سەرەکی تیۆری کۆمەڵایەتی. هیگڵ ئەوەی قبوڵ کرد، بەڵام کۆمەڵگای مەدەنی کردە بارمتەی دەوڵەتی دڵخوازی خۆی. مارکس، لە ئاوەژووکردنەوەی مێژوویی ئەو پێشەکییەدا، کۆمەڵگای مەدەنی وەك شانۆی مێژوو زیندوو کردوە. بەڵام مارکس لە سەر ئەو باوەڕە بوو کە کۆمەڵگای مەدەنی نەیتوانیوە، بەڵێنەکانی خۆی، واتە ئەفراندنی کەشێك کە تێیدا تاك بتوانێت دەستی بە ئازادی و خۆبڕیاردان رابگات، جێبەجێ بکات. دەبوایە لە ڕێگای

گۆڕانکاریی دیموکراتیی بنەڕەتییەوە ڕێك بخرایە و بە سەرنجدان بە خوخدەی ئەم پانتاییە، ئەو گۆڕانکاریە دەبوایە شۆڕشگێڕانە بووایە. تەنیا ئەو کات تاك دەیتوانی لەگەڵ کۆمەڵگا و دوڵەت یەکپارچە بێت. گۆڕانکاریی شۆڕشگێڕانە دەبێتە بنەمایەکی ڕێکخەرانە بۆ بەمەدەنی کردنی کۆمەڵگای مەدەنی.

## گرامشی و کۆمەڵگای مەدەنی:

هیگڵ **فەلسەفەی ماف** لە ساڵی ١٨٢١ و مارکسیش بیست ساڵ دواتر ڕەخنەکەی بڵاو کردەوە و لە ساڵی ١٨٦٧، مارکس شاکارەکەی خۆی واتە **سەرمایەی** نووسیبوو کە بە لووتکەی کارەکانی دێتە ئەژمار. کەواتە کەمتر لە چل و شەش ساڵ دوای ئەوەی هیگڵ چینی کرێکاری وەك هۆکارێکی کۆمەڵایەتی وەلا نا، مارکس توانی وەك هۆکارێکی گشتی بیناسێنێت کە سیستەمی زوڵم و زۆری باڵادەست لەناو بەرێت و کۆمەڵگایەکی مرۆیی لە جێگاکەی دابنێت. مارکس بۆیە توانی ئەو کارە بکات چونکە قۆناغێك لە خەباتی چڕوپڕی چینی کرێکار لە بریتانیا، فەڕانسە و ئەڵمانیا تێپەڕ ببوو. ئەو خەباتانە هەم ناکۆکییەکانی سیستەمەکەی لە قاودا و هەم تواناکانی پرۆلیتاریایان بۆ دەسپێکی گۆڕانکاری دەرخست. بەڵام هەر دوو فەیلەسوفەکە کەم تا زۆر لە قۆناغێکی مێژوویدا، کە قۆناغی سەرهەڵدان و پتەوبوونی سەرمایەداری بوو، ژیان و کاریان کرد.

لە مەودای نێوان مارکس و گرامشی دا (١٨٩١-١٩٣٧) قۆناغێکی دوور و درێژ و گرنگی مێژوویی بە سەرداهات، ئەویش نەك لە بواری زەمەنیەوە بەڵکو ئەو گۆڕانکارییانەی کە لە سیستەمی سەرمایەداریدا هاتە پێشەوە. سەرمایەداری چووبووە ناو قۆناغی پاوانخوازانە و ئیمپریالیستیەوە. شێوازەکانی کەڵەکەکردن، ڕێکخستنی سەرمایەداری گۆڕی بوو، بەچەشنێك کە نەتەنیا سیستەمی بەرهەمهێنان کەوتبووە سەر ڕەوتێکی ڕێکوپێك، بەڵکو دەکرا ژیانی کرێکارانیش بخاتە ژێر ڕکێفی خۆیەوە. ململانێکانی نێوان ئیمپریالیستەکان و سەرمایەدارەکان، ببووە هۆی سەرهەڵدانی یەکەمین شەڕی جیهانی و پێداچوونەوە بە سیستەمەکانی دەسەڵات لە ئەوروپادا. لە یەکێتی سۆڤیەتدا، شۆڕشی **١٩١٧** ڕژێمێکی دروست کردبوو کە چاوەڕوان دەکرا تیۆر و کردەوەی مارکسیستی پێکەوە گرێ بدات و وەدی بێنێت. خودی مارکسیزم لە ئەنترناسیۆناڵی دووهەمدا وەك شتێکی دوگمی لێهاتبوو و بۆ فۆرمێکی میکانیکی و ئاست نزم دابەزیبوو.

لەو نێوەدا لە وڵاتەکەی گرامشی واتە لە ئیتاڵیا، سێبەری فاشیزم کە لە دوورەوە بەرچاو دەکەوت، بزووتنەوەی چینی کرێکاری لەناوبربوو و مەترسی ئەوەی لە سەر بوو کە سەرجەم دەسکەوت و فۆرمەکانی خەباتی سیاسی لە ناو بەرێت. لێکۆڵینەوەی تیۆر ئیتاڵی لە مێژووی نەریت و کردەوەی مارکسیستیدا، ئاکامی هەوڵەکانی ئەو بوو بۆ دەرککردنی ڕێڕەوی مێژوویی کۆمەڵگای خۆی. تیۆری گرامشی تایبەت بە زەمەن و پێگەیەکی دیاریکراوە، بەڵام لەو لێکۆڵینەوەشدا دیسانەوە هەندێك ئەندێشەی تێدایە کە بە قوڵی کاریگەری لە سەر تیۆرەکانی سەرچاوەگرتوو لە زەمەن و شوێنەکانی دیکە دانا. ئەو لە قۆناغێکی مێژوویی زۆر تایبەتیدا شتی دەنووسی و باسی ئەزموونەکانی شۆڕشی روسیا و شکستی بزووتنەوەی چینی کرێکاری دەکرد لە ئیتاڵیا. هەروەها لە قۆناغێکی فیکریدا شتی دەنووسی کە سەرجەمی بڕیارە مارکسیستیەکانی ئەنترناسیۆناڵی دووهەم بە هەڵە دەرچووبوون. گێڕانەوەی مارکسیستی کە باسی لە گەشەی کۆمەڵگاکان بە پێی گەشەی قەڵەمڕەوی ئابووریيان دەکرد، بایەخی خۆی لە دەست دابوو و قەیرانە ئابووریيەکان قەیرانی سیاسییان لێ نەکەوتبووەوە. مارکسیزم لە چاوەڕوانی گێڕانەوەیەکدا بوو کە بتوانێ لە دەستێوەردانی ئایدۆلۆژیی بە ئەنقەست لە بوارەکانی کلتوری و ئایدۆلۆژیك قسە بکات. مێژوو، کۆمەڵناسی و سیاسەتی نەریتی سۆسیالیست پۆزیتیڤیست دەبووایە خوێندنەوەی بۆ بکرایەتەوە، گرامشی ئەو خوێندنەوەیەی بە ئەنجام گەیاند.

گرامشی پرسیاری ئەوەی لە خۆی کرد کە بۆچی لەو وڵاتانەدا شۆڕش رووی نەدا کە پێشمەرجەکانی کلاسیکی سۆسیالیزمیان دابین کردبوون و بۆچی لە هەندێ وڵاتدا رووی دابوو کە چاوەڕوانی لێنەدەکرا؟ لەم پرۆسەی پێداچوونەوەیەدا، چەمکە گرنگەکانی کۆمەڵگای مەدەنی و سیاسی، هێژمۆنی و رۆڵی رۆشنبیرانی بە تیۆری سیاسی بەخشی. ئاکامەکەشی ئەوەیە کە لە تیۆری سیاسیی گرامشی دا، پەرەسەندنێکی سێ لایەنە بەرچاو دەکەوێت: پەرەسەندنی تیۆری دەوڵەت، کە بۆخۆی لە پەرەسەندنی چەمکەکانی دەسەڵات و باڵادەستیەوە سەر هەڵدەدات، و پەرەسەندنی چەمکی شۆڕش، ئەوەی وەك ئاڵقەیەکی لێك هەڵپێکراو لە تەواوی ئەو پێناسانەدا بوونی هەیە، چەمکی کۆمەڵگای مەدەنییە. ئەو سێ پەرەسەندنە، لە سەرنجی باڵای ئەو بۆ رێگاچارەیەکی شۆڕشگێڕانەوە دەست پێدەکەن و بوارەکەشیان هەر لەو دایە. ئەو دەنوسێت: "کەم تێگەیشتن لە دەوڵەت بەمانای کەمبوونی وشیاریی چینایەتییە".

## دەوڵەت و کۆمەڵگای مەدەنی لە تیۆری گرامشی دا:

گرامشی لە پرۆسەی وەڵام بەو پرسیارە کە بۆچی شۆڕشەکان لە وڵاتانی پێشکەوتووی سەرمایەداریدا روویان نەداوە، تیۆری مارکسیستی دەوڵەت پەرە پێدەدات. لێکدانەوەی بەرچاوی ئەو ئەوەیە کە بە بێ تێگەیشتن لە کۆمەڵگای مەدەنی ناتوانین لە دەوڵەت تێبگەین. ئەو دەڵێت دەبێ "دەوڵەت" نەك تەنیا بەواتای دەزگای حکومەت، بەڵکو دەبێ بە واتای دەزگای "تایبەتیی هێژمۆنی یان کۆمەڵگای مەدەنی" لێك بدینەوە(٦١، ل٢٦١). ئەوە لە کۆمەڵگای مەدەنیدایە کە دەوڵەت قبوڵکردنی رێباز و بەرنامەکانی خۆی هەست پێدەکات. ئەو بۆچوونە چەمکی مارکسیستی دەوڵەتی پەرە پێدا.

ئەوە راستە کە تیۆری مارکسیخوازانە، خوخدەی دوالیزم و دژبەیەکی دەسەڵاتی دەوڵەتی وەها کێکداوەتەوە کە بەهۆی خوخدەی زۆرەملیّ و ناچاریەوەیە، بەڵام هەرچۆنێك بێت ئەوە مارکس بوو ئەو تیۆریەی هێنایە ئاراوە کە دەڵێت هزری چینی باڵادەستی هەر قۆناغێك، هزری زاڵی ئەو قۆناغەن. کەوابوو دانپێدانان بە دەسەڵاتی چینە باڵادەستەکان دەبێتە یەکێك لە بەشە پێکهێنەرەکانی وشیاریی کۆمەڵایەتی. ئەوەی گرامشی بەرێوەی دەبات ئەوەیە کە ئێمە لەو راستیە ئاگادار بکات کە لە کۆمەڵگای سەرمایەداریدا، دەسەڵات بە سەر تەوەری جۆراوجۆردا دابەش دەبێت و فۆرمی جۆراوجۆر بەخۆیەوە دەگرێت. ئەو شوێنی رازیبوون و هەر لەم رووەشەوە پێگەی باڵادەستیی چینە دەسەڵاتدارەکان دیاری دەکات.

ئەو جیاوازییەش کە ئەو لە نێوان کۆمەڵگای سیاسی و مەدەنیدا دایدەنێت، جیاوازییەکە لە نێوان هەڵویست و فۆرمەکانی دسەڵات. کۆمەڵگای سیاسی چوارچێوەیەکە کە تێیدا دەزگای زۆرەملێی دەوڵەت چەقی بەستوە ـــ زیندانەکان، سیستەمی دادوەری، هێزە چەکدارەکان و پۆلیس. کۆمەڵگای مەدەنی پانتاییەکە کە دەوڵەت تێیدا کار دەکات بۆ ئەوەی شێوازە نادیارەکان، هەست پێنەکراو و باریکەکانی دسەڵات لە رێگای سیستەمەکانی بارهێنان، کلتور و ئاین و دامەزراوەکانی دیکەوە داسەپێنێت. کۆمەڵگای سیاسی لە رێگای یاساکانی سزادان و زیندانەکانی خۆیەوە کۆمەڵگاکەی رێکوپێك دەکات، بەڵام کۆمەڵگای مەدەنی لە رێگای دامەزراوەکانیەوە زەین و دەروون رێك دەخات. گرنگتر ئەوەیە کە ئەگەر ئەوانەی دووهەم ئامادە بەکار بن،

ئەوەی یەکەمیان بێجگە لە کاتەکانی قەیراندا کە هەڕەشە لە خودی سیستەمەکە دەکرێت، پێویست نابێت.

هەڵبەتە جیابوونەوەی دوو فۆرمی دەسەلات، جیاییەکی شێوازناسانەیە، دەوڵەت دەتوانێ ئایدۆلۆژیا بلاو بکاتەوە، و خوێندنگەکانیش دەتوانن تەمێ بکەن. بەلام لە نێوان زۆرەملێ و رازیبوونەکەدا، گرامشی ئەوەی دووهەمیان لە پێشەوە دادەنێت. ئەو پانتاییە کە ئەرکی تایبەتی بەرهەمهێنانەوەی سیستەمەکەی لە ئەستۆیە. تیۆری داشکێنەرانەی مارکسیستی کە کەم تا زۆر دەوڵەتی وەك پێکهاتەیەکی زۆرەملێ سەیر کردبوو، چوە قالبێکی نوێوە بۆ ئەوەی نیشانی بدات بەکارهێنانی راشکاوانەی زوڵم و زۆر رەنگە پێویست نەبێت چونکە دەسەلات لە سەرتاسەری کۆمەڵگادا بەچەشنێك بلاوبۆتەوە کە خەڵك هەر لە خۆیانەوە پەیڕەوی لە بڕیارەکانی دەوڵەتی سەرمایەداری دەکەن.

لەم بارەیەوە قسەوباس زۆرە سەبارەت بەوەی چەمکی کۆمەڵگای مەدەنی گرامشی دەبێ لە کوێ دابنرێت. ئایا هەر وەك لە وتە بەناوبانگەکەی گرامشیدایە کە دەکرێ دوولایەنی سەرخان بە هاوتای کۆمەڵگای مەدەنی و سیاسی بزانین، وەك بەشێك لە سەرخان دێتە ئەژمار؟ یان ئەوەی ئەو ئاستێکی نوێی بە خوازەی بونیاتنەرانەی سەرخان و ژێرخان زیاد کردوە؟[43] خاڵی گرنگ ئەوەیە کە کۆمەڵگای مەدەنی، کە لە مارکسیزمی

---

٤٣ - گرامشی لانیکەم کۆمەڵگای مەدەنی بەدووشێوە راڤە کرد. لە راڤەی یەکەمدا، کۆمەڵگای مەدەنی لە بواری شیکارییەوە لە ژێرخانی ئابووریی کۆمەڵگا جیا دەبێتەوە و بەرەو سەرخان دەچێت و بەشوێن ئەوەدا بە سەر سەرخانی مەدەنی و سەرخانی سیاسیدا دابەش دەبێت. گرامشی کۆی ئەو رێکخراوانە بە کۆمەڵگای مەدەنی دەزانێت کە بەگشتی بە رێکخراوی تایبەتی هەژمار دەکرێن و کۆمەڵگای سیاسیش بە دەوڵەت دەزانێت. کۆمەڵگای مەدەنی لە رێگای دامەزراوەکانی ژیانی رۆژانەوە و کاروکردەوە فەرهەنگیەکانەوە، هێژمۆنی ئایدۆلۆژی بەرهەم دێنێتەوە. رازی بوون بە سەپاندنی دەسەلات لە رێگای دامەزراوەکان و کردارەکانی کۆمەڵگای مەدەنیەوە دەخولقێت. دەوڵەت لە رێگای ئامرازە بنەڕەتیەکانی زوڵم و زۆرەوە دەسەلاتی زۆرەملێی خۆی دادەمەزرێنێت. کەواتە کۆمەڵگای مەدەنی و کۆمەڵگای سیاسی یەکتری پتەو دەکەن و پێدەگەیەنن. کۆمەڵگای مەدەنی ئەو بوارەیە کە رێکخراوە بەناو تایبەتیەکانی وەك کەنیسە، یەکێتیە پیشەییەکان، و خوێندنگاکان تێیدا کار دەکەن و کەشێکی گرینگیشە کە هێژمۆنی چینە بالادەستەکان دروست دەبێت دێت و پتەو دەبێت و دەوڵەتیش لە رێگەی دامەزراوە زۆرەملێکانی خۆی لە بارودۆخە قەیراناویەکاندا خۆی تێوەردەدات بۆ ئەوەی بالادەستیی چینە زاڵەکان هەروا بپارێزێتەوە. بۆ بیرمەندانی وەك بۆبیۆ، داهێنەری تیۆری گرامشی لەوەدایە کە کۆمەڵگای مەدەنی کە مارکس و مارکسیستەکانی دواتر پێیانوابوو سەر بە ژێرخانە و هەر لەو رووەشەوە لەگەڵ هێزە

راسترەودا لەگەڵ کردەوە ئابووریەکانی پەیوەندییەکانی بەرهەم هێنان و ئاڵوویر وەك یەك شت لە بەر چاو گیراوە، بەو ئاستە گەیشت کە نوێنەری کۆمەڵێك لە پەیوەندییە کۆمەلایەتییەکان بێت کە لە نێوان دەوڵەت و تاك دا لە ئارادایە. کۆمەڵگای مەدەنی سەرخانییە، چونکە سەر بە مەڵبەندەکانی کردەوەی ئایدۆلۆژیك و سیاسییە، و ژێرخانیشە چونکە تەوەرێکە کە تێیدا چینە بنەڕەتیەکانی کۆمەڵگا، یانی سەرمایەدارەکان و پرۆلیتاریا، ئەزموونەکانی خۆیان لەو کردەوانەدا بەیان دەکەن.

بەواتایەکی دیکە، کۆمەڵگای مەدەنی وەك کۆمەڵێك کردەوەی کۆمەلایەتی، پێکهاتەکان (ژێرخانی)ی بەرهەم هێنانی سەرمایەداری و سەرخانە ئایدۆلۆژیەکان و دەوڵەت، رێك دەخات. بە دوو شێوە ئەوان رێکدەخات: کۆمەڵگای مەدەنی چوارچێوەیەکە بۆ رازیکردن، بەلام لە هەمان کاتدا پانتاییەکیشە کە تێیدا دەرفەتی حاشاکردن و نەهێشتنی ئەو رازیبونەش لە ئارادایە و دەتوانی بە فۆرمێکی نوێی رێکخراوێکی سیاسی رازی بیت و ئاگاداریشی لێ بکەیت. دوالیزمی توند لە نێوان ژێرخان و سەرخاندا چارەسەر دەبێت و ئەوە کۆمەڵگای مەدەنییە کە روخسەتی رێکخستنی ئەو دوالیزمە دەدات.

---

بەرهەمهێنەرە مادديیەکان وەك یەکیان لێ کردبوو، بەرەو سەرخانی هەلکشاند و دواتریش سەرخانی بە سەر لایەنە سیاسی و مەدەنیەکاندا دابەشکرد. بوبیۆ باسی ئەوە دەکات کە گرامشی، سەرەتا خوازیاری پێشێتی سەرخان، واتە ئایدۆلۆژیا بوو بە سەر ئابوریدا و دواتر باسی پێشێتی کۆمەلگای مەدەنی کرد لە چاو کۆمەلگای سیاسی (١٥، ف١).

گرامشی لە هەندێك شوێنی دیکەی بەرهەمەکەی خۆیدا، کۆمەلگای مەدەنی وەکو یەکێك لە توخمەکانی کۆمەلگای سیاسی وەسف دەکات: "توخمە پێکهێنەرەکانی دەوڵەت لە مانای بەرفراوانتری ئەندامەکانی ئەودا لە لایەکەوە دەوڵەت بەمانای تایبەتیی وشە و لە لایەکی دیکەشەوە کۆمەلگای مەدەنییە". بەلام جیاوازی ئەو دووانە میتۆدۆلۆژییە، چونکە دەوڵەت و کۆمەلگای مەدەنی وەکو بەشە پێکەوەبەستراوەکانی کۆمەلگای سیاسی پێکەوە گرێ دراون (٥٦، ل٢٥٣). گرامشی دەنوسێت: دەوڵەت هەم سیاسییە و هەم مەدەنی، بەواتایەکی دیکە، "هێژمۆنییەکی پشت ئەستوورە بە زۆرەملێ"(٦١، ل٢٦٣). بەو واتایەیە کە ئەو باسی دەوڵەتێکی یەکپارچە دەکات. دەوڵەت لەگەڵ حکومەت و کۆمەلگای سیاسی جیاوازە. دەوڵەت و کۆمەلگای مەدەنی لە رێگای ئەو کارە تایبەتیانەی کە دەیکەن لێك جیا دەبنەوە. بەلام دەکرێ ئەو کارە تایبەتیانە لە یەك چالاکییدا بگونجێندرێن کە ئەویش دەسەلاتە.

کۆمەڵگای مەدەنی لەم ڕووەوە ڕوخسەتی خۆڕێکخستنی ئەو دوالیزمە دەدات چونکە بوارێکە تێیدا ڕەزامەندی لەسەر بەرنامەکانی دەوڵەتی سەرمایەداری دەدرێت. بەڵام تاك بەشێوەی ناچالاك ڕەزایەت نادات، بەڵکو لە خولقاندنی ئەو ڕەزایەتەدا ڕۆڵی چالاکی هەیە. شەرعییەت شتێکە زۆر زیاتر لە قبوڵکردنی ناچالاکی دەسەڵاتی دەوڵەت. شەرعیەتی دەوڵەت و کردەوەکانی ئەو لەو ڕووەوە خۆی دەنوێنێت کە وشیاریی تاك بەشێوەیەك پەروەردە کراوە کە لە ڕووبەڕووبوونەوەی ڕاشکاوانە لەگەڵ دەوڵەت و دەزگاکانی پێشگیری دەکات. ئەگەر ئاوا بێت کەواتە شۆڕش زۆر بە دژواری بەڕێوە دەچێت. لە ساڵی ١٨٤٩ هێنری دەیڤید تۆرۆ، فەیلەسوفی ئەمریکی لە **یاخیبوونی مەدەنی**دا نووسی: "هەموو مرۆڤەکان باوەڕیان بە مافی ڕاپەڕین هەیە، ئەو مافەش ڕەتکردنەوەی وەفاداریە بەرانبەر حکومەت و بەرهەڵستی کردنییەتی، لە کاتێکدا کە ملهوڕی یان کارابوونەکەی زۆر و لە تەحەمول دا نەبێت. بەڵام دەکرێ بگوترێ کە هەمووان دەڵێن جاریَ وا نییە". گرامشی لەگەڵ ئەوە دەهاتەوە کە کاری تایبەتیی دەوڵەتە ئالۆز و ناڕوونەکان ئەوەیە خەڵکەکەی خۆیان بەو قەناعەت بگەیەنن کە هەر چەندە ئەم ساتەوەختەی تێیدان ئەگەر زۆریش قەیراناوی بێت، بەڵام کاتی دەست بردن بۆ ڕاپەڕین نییە. دەکرێ ئەوە بەو ڕاستیە شرۆڤە بکەین کە کۆمەڵگای مەدەنی بە دەزگای دەسەڵاتی ئایدۆلۆژی و کلتوریی خۆی لە نێوان تاك و دەوڵەتدا ڕاوەستاوە.

بەم پێیە، ئەو توانی بەو ئاکامە بگات کە لە ڕوسیادا دەکرا ڕاپەڕین سەر هەڵبدات، چونکە لە نێوان دەوڵەتێکی قەیسەری بەهێز و خەڵکی ڕوسیادا، کۆمەڵگای مەدەنی نەبوو کە بتوانێت پشتیوانی دەوڵەت بێت. لە نەبوونی ئایدۆلۆژیە بەهێزەکان یان پێکهاتەکانی ڕەوایی پێدان، کە بتوانن قەڵغانێك بن لە نێوان دەوڵەت و خەڵك دا، یان توانایەکی ئەخلاقی بە دەوڵەت ببەخشن، دەوڵەتی ڕوسیا بە ئاشکرا زۆروێژی دەکرد و سەر بە چینێك بوو. دەوڵەتێکی ناڕوون نەبوو و هەموو دەسەڵاتەکەی پاوان کردبوو،[٤٤]

---

٤٤ - گرامشی دەنووسێت: "لە ڕوسیا، دەوڵەت هەموو شتێك بوو و کۆمەڵگای مەدەنیش بەرایی و لەرزۆك بوو، لە خۆرئاوا پەیوەندییەکی دروست لە نێوان دەوڵەت و کۆمەڵگای مەدەنی لە ئارادابوو، و کاتێك کە دەوڵەت وەلەرزە کەوت، پێکهاتەی بیناوەرۆکی کۆمەڵگای مەدەنی بەجارێك ئاشکرا بوو" (٦١، ل٢٣٨).

هەربۆیە قۆناغی راپەڕین توانی دەسەڵاتەکە بەدەستەوە بگرێت.[٤٥] بە پێچەوانەی ئەو لـە ئەوروپا، کۆمەڵگای مەدەنی بە هەموو شێوازەکانی پێویست بـۆ دەسـەڵات و کـۆنترۆڵ، قەڵغانێکی بۆ دەوڵەت دابین کرد.

گرامشی شێوازێکی بـۆ دەرککـردن و پۆلێنبەنـدی کردنـی دەوڵەتـەکان لـە رێگـای کۆمەڵگاکانی مەدەنیی ئەوانەوە دابین کـرد. بـەبڕوای گرامشـی، سـەرجەم دەوڵەتـەکان پێکهاتەکانی دەسەڵاتێکی زۆرەملێن، بەڵام ئەو دەوڵەتانەی کـە کۆمـەڵگای مـەدەنییان نییە، دەوڵەتانێکی روونن.

تایبەتمەندیی دەوڵەتە ئاڵۆزە بورژواکان ئەوەیە کە نارِوونن، چونکە خاوەنی کۆمەڵگای مەدەنین و کۆمەڵگا مەدەنییەکانیش وەك پالێوێنەی پشتگیری کار دەکـەن. لـە خۆرئـاوا پەیوەندییەکی تایبەتی لە نێوان کۆمەڵگای مەدەنی و دەوڵەت لە ئارادابوو و کاتێك کـە دەوڵەت لاواز دەبوو، پێکهاتەی توندوتیژی کۆمەڵگای مـەدەنی بـەجارێك دەردەکـەوت، دەوڵەت تەنیا سەنگەرێکی دەرەوە بوو و لە پشتەوەشی سیستەمێکی بەهێز راوەستابوو" (٦١، ل٢٣٨).

ئەو لێکدانەوەیە بە دوو مانا ناوەڕۆوکردنەوەیەکی مێژوویی بەرێوە دەبەن. لە تیۆری لیبرالی وەك بەرهەمەکانی دۆ تۆکڤیـل، کۆمـەڵگای مـەدەنی لـە بەرامبـەر دەسـەڵاتی دانەبەزیوی دەوڵەتدا پارێزگاری لە تـاك دەکـات. لێرەدایـە کـە تـاك تەنانـەت لـە دژی دەوڵەتیش، هەندێك یاسا پەیرەو دەکات. کۆمەڵگای مەدەنی وەك پالێوێنەیەکی پارێزەرە بۆ تاك. لە فۆرمۆلبەنـدیی گرامشـیدا، کۆمـەڵگای مـەدەنی پاسـەوانی دەوڵەتـە و لـە سیستەمی سەنگەربەندیی شەڕەکانی ئەمڕۆ دەچێت. کۆمەڵگای مەدەنی نـەك قـەڵغانی تاك، بەڵکو قەڵغانی دەوڵەتە. وەك فۆرمۆلبەندی مارکس، نە دەوڵەت و نـە کۆمـەڵگای مەدەنی پارێزەری تاك نین. هەر دوو پانتاییەکە دەبێ گۆڕانیان بەسەر دابێت.

---

٤٥ - جێی تانەوتەشەرە کە دارمانی دەوڵەتەکانی خۆرهەڵاتی ئەوروپا و یەکێتی سۆڤیەت دەکرێ بەشێوەی شیکاریی گرامشی باس بکرێت. ئەو دەوڵەتانە بە قوتدانی کۆمەڵگای مەدەنی، خۆیان لاواز کرد و هیچ بەرگریەکیان بۆخۆیان نەهێشتەوە. کەشێك بوونی نەبوو کە تێیدا بە شێوازی جوان و رێکوپێك، بکرێ رەزایەتی پێ دابین بکرێ. هەربۆیە دەکرا ئەوان بەشێوازێك نابوت بکرێن کە دەوڵەتەکانی خاوەن کۆمەڵگای مەدەنی ئەو مەترسیەیان لە سەر نەبوو.

بەڵام گرامشی واتای مارکسیی کۆمەڵگای مەدەنیش پەرەپێدەدات. نەریتی راستڕەوانەی مارکسیستیی کۆمەڵگای مەدەنی لەگەڵ رێکخستنی ماددی کۆمەڵگا وەك یەك لە بەر چاو گرتبوو. گرامشی ئەوەی بە پێکهێنەری سیستەمی سەرمایەداری دەزانی، بەڵام شتێکی زۆر زیاتر لە چوارچێوەی ماددی. ئەوە قەڵەمڕەوی رەفتارە ئایدۆلۆژی و کلتوریەکان بوو کە خزمەتی بە چڕتربوونەوەی گوشاری چینە باڵادەستەکان و دەوڵەتی سەرمایەداری دەکرد. گرامشی لە نێودێرکردنی ئەو مەڵبەندەدا زیاتر لە هیگڵ نزیکترە نەك لە مارکس. بە بڕوای مارکس ئابووری دیاریکەر بوو. بە بڕوای گرامشی بنەمای ئابووری و بنەمای ئایدۆلۆژیکە کە گرنگی هەیە. بە بڕوای گرامشیش هەروەك مارکس، کۆمەڵگای مەدەنی شانۆی مێژوویە. ژیانی دەوڵەت "پرۆسەی هاوپەیوەندیی پێکهاتن و نەمانی هاوسەنگیە نابەردەوامەکان" لە کۆمەڵگای مەدەنیدایە.

گرامشی بە پەرەپێدانی واتای مارکسیستیی دەوڵەت، لە نێوان دەوڵەت وەك رێکخراوی سیاسیی کۆمەڵگا، و دەوڵەت وەك حکومەت جیاوازی دادەنێت. بۆ ئەوەی یەکەمیان دەستەواژەی دەوڵەتی یەکپارچە بەکار دەبات. ئەو دەوڵەتە فۆرمی سیاسیی دیاری کۆمەڵگای مەدەنییە کە تەنیا لە شیکاری و لێکدانەوەدایە کە دەکرێ جیا بکرێتەوە. لە تێگەیشتنی گرامشی دا، دەوڵەت بریتییە لە سەرجەمی ئەو چالاکییانەی کە چینی دەسەڵاتدار لە رێگای ئەوانەوە باڵادەستیی خۆی دەپارێزێت و هەموو ئەو شێوازانە دەگرێتەوە کە لە رێگای ئەوانیشەوە دەتوانێت رەزامەندی ئەو کەسانە بەدەست بێنێت کە بە سەریاندا سەروەری دەکات. بەو واتایە هەموو ئەو چالاکییانە دەگرێتەوە کە بەگشتی تیۆری سیاسی ئەوان لە چوارچێوەی قەڵەمڕەوی تایبەتیدا دادەنێت. دەوڵەتی یەکپارچە لە رێگای ئەو چالاکییانەوە کە لە کۆمەڵگای مەدەنیدا بەرێوە دەچن، خۆی لە رەفتاری ژیانی رۆژانەدا سەرلەنوێ بەرهەم دێنێتەوە. بەمشێوەیە وشیاریی تاك و کۆمەڵ پێك دێنێت. وشیارییەك کە مەبەستەکەی لە ئاکامدا هەر سەرلەنوێ بەرهەمهێنانەوەی دەسەڵاتی خودی سیستەمی سەرمایەدارییە.

گرامشی دابینکردنی رەزایەت لە رێگای بەکارهێنانی هێماکان و ئەفسانەکان، دامەزراوە و رەفتارەکانی وەك هێژموونی شی دەکاتەوە. هێژمۆنی لە روانگەی گرامشی دا کارێکی زۆر تایبەتی و بنەڕەتی هەیە. رێبەرایەتیەکی ئەخلاقی و فیکری بۆ رەفتارە بەکۆمەڵ و پەرتەوازەکانی کۆمەڵگای مەدەنی دابین دەکات. "لەو زۆربوونەی شورا

تایبەتیەکاندا... یەکێك یان چەنددانەی ئەوان بەشێوەی ڕێژەیی یان ڕەها زاڵە ــ دەزگای هێژمۆنی گروپێکی کۆمەڵایەتی بە سەر ئەوانیتردا (یـان کۆمـەڵگای مـەدەنی) دروسـت دەکات: بنەمای دەوڵەت بە مانای بەرتەسکی دەزگای زۆرەملیّ ــ حکومەتی (٦١، ل٥-٢٦٤).

لە پانتـایی بەکۆمـەڵ و جێگـای ململانێـی کۆمـەڵگای مەدەنیـدا، هێـژمۆنی وەك بنەمایەکی ڕێکخراوەیی خۆی دەردەخات کە ڕێکخەر و دابینکەری یەکێتیـە. هێـژمۆنی وەك ڕێبەرایەتیەکی ئەخلاقی و فیکری چینی باڵادەست، لایەنی ئەخلاقیی ژیانی سیاسی دابین دەکات، چونکە بنەمای کۆمەڵایەتی رازیبوون بۆ دەوڵەت دابین دەکات. دەسـەڵاتی دەوڵەت کۆکراوەی شتە بەرچاوەکان و یاسامەندبووی دەسەڵاتە. بەڵام لەوە گرنگتر ئەوەیە کە سـەپاندنی ئەو دەسەڵاتە، نە تەنیا بەشێوەی زۆرەملیّ، بەڵکو لە ڕێگای قبوڵکردنـەوە گـەرەنتی دەکرێـت. کۆمـەڵگا دەبـیّ ئامـادەگی ئـەوەی هـەبێت کـە دەسـەڵاتی چـینە باڵادەستەکان قبوڵ بکات. کۆمەڵگای مەدەنی لایەنێکی ئەخلاقییە کە تێیـدا ڕوانگـەی ئەخلاقی و پێش بینیی چینی باڵادەست، کۆمەڵگایەکی چەند پارچە پێکەوە گریّ دەدات و بە یەکەوەیان ڕادەگرێت.

گروپێکی کۆمەڵایەتی بەر لەوەی دەسەڵاتی حکومەتی بەدەست بێنێت، دەتوانێـت و لە ڕاستیدا دەبیّ "ڕێبەرایەتی"ی خۆی داسەپێنێت (ئەوە لە ڕاستیدا یەکێك لە مەرجـە سەرەکییەکانی دەستەبەرکردنی ئەو دەسەڵاتەیە). لە ئاکامدا کاتێـك کـە دەسـەڵاتەکەی بسەپێنێت، زاڵ دەبێت، بەڵام تەنانەت کاتێك کە بە توندی دەستی بە سەر دەسەڵاتەکەدا گرتووە، دەبیّ هەروا ڕێبەرایەتیش بکات (هەمان سەرچاوە، ٦٣-٥٧).

لەو شیکاریە واتاییەی کۆمەڵگای مەدەنیدا، کاریگەریی هیگڵ بە سەر گرامشی بـە ئاشکرا دیارە: کۆمەڵێك لە ڕەفتارە کۆمەڵایەتییەکان کە ڕەنگدانەوەی خوخدەی ئابوورین و لە ڕێگای ئەوەوە دابین دەبن، کۆمەڵێك لە ڕێکخراوەکان کە ئەو ڕەفتارانە ڕێك دەخەن، و هەڵوێستێك بۆ یەکانگیربوونی ئەو بەرژەوەندییە تایبەتیانـە، کـە بنـەمای ئـەخلاقیی دەوڵەت دابین دەکات. بەڵام بە پێچەوانەی هیگڵ، بە بڕوای گرامشی ئەوە دەوڵەت نییـە کە لە کۆمەڵگای مەدەنیدا بەرژەوەندییە تایبەتیەکان ڕێکدەخات، کۆمـەڵگای مـەدەنی دەبیّ ڕێگاچارەکانی خۆی بدۆزێتـەوە. پێناسـەکەی هیگڵییـە بـەڵام ڕێگـا چـارەی ئـەو

مارکسییه. ئەو بنەمایەی کە گۆڕانکاری لە کۆمەڵگای مەدەنیدا پێك دێنێت، دەبێ لە نێو ئەم چوارچێوەیەدا بدۆزرێتەوە.

دووهەم ئەوەی هێژمۆنی بۆ گرامشی پرۆسەیەکە کە دەوڵەت بە ئاوڕدانەوەی بەردەوام بۆ رووداوەکانی کۆمەڵگای مەدەنی، بەردەوام لەو رێگایەوە دیسانەوە پیلانی زاڵبوونی خۆی، دادەسەپێنێت، هاوسەنگ و رێکوپێکیشی دەکات. دەوڵەت تا کاتێك کە دامەزراوەیەك دەسەڵاتەکەی لێ وەردەگرێتەوە زیاتر پەیوەندییەکی کۆمەڵایەتییە. سەرچاوەی نەگۆڕ و بەردەوامی دەوڵەت، کۆمەڵگای مەدەنییە. کەواتە هێژمۆنی شتێك نییە کە بکرێ جارێك بۆ هەتاهەتایە سەقامگیر بکرێت و دواتر دەستی لێ بەردرێت بۆ ئەوەی داکۆکی لە خۆی بکات. دەبێ بەردەوام دارێژرێتەوە و بەیان بکرێتەوە. پرۆسەیەکە کە دەوڵەت دەباتە نێو پەیوەندییەکی بەردەوام لەگەڵ کۆمەڵگا و ئەو تواناییەی پێدەبەخشێت کە هێزێکی بنەڕەتی بەخۆی ببەخشێت.

گرامشی بەشێوەیەکی کاریگەر گوتاری سیاسی لە خەریکبوون بە پێکهاتە بەرینەکانی دەسەڵات دەرباز دەکات و سەرنجی بەرەو لای شێوازێك رادەکێشێت کە لە رێگای هێژمۆنییەوە دەسەڵات لەگەڵ ئەو، لە مەڵبەندی مەدەنیدا تەشەنە دەستێنێت. بەم جۆرە، مانای دەوڵەت دەتوانێت هەروەك رووبەری بەرینی پێکهاتەکان باسی رووبەرە وردەکانی پێکهاتەکانیش بکات. گرامشی دەیتوانی باسی دەسەڵاتی پرۆسە ئابوورییەکانی کۆمەڵگای سەرمایەداری بکات، بەڵام هەر بەو رادەیە دەیتوانی وەك بابەتێك بۆ سەپاندنی ئەو دەسەڵاتە ئاماژە بە خێزان بکات. هەر ئەوەندە بەسە بیر لەوە بکەینەوە کە بە چ شێوەیەك چەمکی یاساداڕێژ دەباتە ژێر پرسیارەوە؟ تەنانەت بێدەسەڵات ترین تاکیش دەتوانێت یاساداڕێژی جیهانی تایبەتیی خۆی بێت، هەروەك چۆن دایك و باوك لە ناو خێزاندا دەیکەن. دایك و باوك، بەتایبەت باوکەکان، جیهانبینی خۆیان بەسەر منداڵەکاندا دادەسەپێنن و بەم جۆرە دەسەڵاتی خۆیان دادەسەپێنن (٦١، ل٦-٢٦٥). کەواتە ئەوە دەسەڵاتە کە جیهانبینی تەواوی نەوەکان پێك دێنێت. روون و ئاشکرایە کەسێك کە لە پێکهاتەی دەسەڵاتدا لەدایك بووە، لەواندا بارهێنراوە، لەواندا کاری کۆمەڵایەتی دەکات، جێگاوشوێنی پیشەگەریی ئەو لەواندایە، ئەوانە لە ژیان و بوونی خۆیدا سەرلەنوێ بەرهەم دێنێتەوە. وە ئەو هەموو خوخدە گوێڕایەڵانەیە لە

دامەزراوەکاندا چێدەکات. ئەو تاکەی کە دوای ساڵانێك پەیڕەوی کردن لە پێکهاتـەکانی دەسەڵات، بە ئاسانی دەسەڵاتی دەوڵەت قبوڵ دەکات.

هەروەك فۆکۆ دواتر ئاماژەی پێکردەوە، هەموو هەڵوێسـتێکی کـاری کۆمەڵایـەتی، هەڵوێستێکە بۆ پەیوەندییەکانی دەسەڵات. بەڵام گرامشی بە پێچەوانەی فۆکۆ ئەو پرۆسـە وردانە بە بونیاتنەری پێکهاتە بەرینەکانی دەسەڵات دەزانێت کـە لـە ئاسـتی دەوڵەتـدا یاسامەند دەکرێن و ئاخێزگەکەشیان لـە پرۆسـەکانی کۆمـەڵگای سـەرمایەداری دایـە. سەرچاوەی ئەو پرۆسە وردانە بە پێچەوانەی ئـەوەی دواتـر فۆکـۆ باسـی کـرد، خواسـتی دەسەڵات نییە، بەڵکو لۆژیکی سیستەمە سـەرمایەدارییە پێکهێنەرکەیـەتی. گرامشـی دەڵێت دەسەڵات زنجیرەییە و راستایەکی هەیە و سەرچاوە و ئامانجێکی هەیە. چەقبەسـتن لە سەر چۆنیەتی بڵاوبوونەوەی دەوڵەت لە کۆمەڵگادا لە تیۆری گرامشی دا بە راپۆرتێك سەبارەت بە چۆنیەتی رێکخستنی ئەو بۆ شکڵ پێدان بە پێکهاتـەکانی زاڵـی دەسـەڵات کامـڵ دەبێـت. ئەگـەر بـەو چەشـنەی کـە فۆکـۆ دەڵێـت، دەسـەڵات لـە پەیوەندییـە کۆمەڵایەتییەکاندا گشتگیرە، بە بڕوای گرامشی زنجیرەییشە. ئەو سـەرنجی لای چەقبەستنی پەیوەندییەکانی دەوڵەت بە سەر هەموو شوێنەکاندایە، بەڵام هەر بەو رادەیەش سـەرنجی لای دەرخستنی ئەوەیە کە بۆچی وەها پەیوەندییەك لە ئارادان و لەوەش گرنگتر، ئەوەی بە چ شێوەیەك ئەگەری تێکشکانیان هەیە.

## راپەڕین وەك دژە هێژمۆنی:

کۆمەڵگای مەدەنی ئەگەر هەر لەو ئاستەدا بمێنێتەوە، هیچ شتێك نییە بێجگـە لـە وەرگرێکی پاسیڤی ئەو هێزانەی کـە لـە دەوڵـەت و چـینە باڵادەسـتەکانەوە سەرچـاوەی دەگرت. بەڵام لە تیۆری گرامشـی دا، رەهەنـدێکی چـالاك و بزێـو بەخۆیـەوە دەگرێـت، هەڵوێستێکە کە تێیدا چینە بنەڕەتیەکانی کۆمەڵگا و هەروەها گروپەکانی دیکەش کـە بەرژەوەندیەکانی خۆیان دەخەنەڕوو، پێگە چینایەتییەکان دیاری دەکەن. لە کاتێکدا کـە کۆمەڵگای مەدەنی هەڵوێستێکە کە شەرعیەتی دەوڵـەتی تێـدا بـاس دەکرێـت، بـواری رەزامەندیشە. رێك لێرەدایە کە چینە ژێردەستەکان دەتوانن ململانێ لەگـەڵ دەسـەڵاتی دەوڵەت بکەن.

بە بڕوای گرامشی کۆمەڵگای مەدەنی بە پێی پێویست شەڕخوازە، بەڵام ئەو ململانێیە لەوانەیە باس بکرێت و هەر بە هەمان رادەش لەوانەیە بە شێوەیەکی ئاماژەگەرانە بێنێتەوە. هێژمۆنی چینە باڵادەستەکان دەبێ لە ڕێگای دەستێوەردانی وشیارانەی سیاسی و لە ڕێگای چینە ئاسەرەکییەکانەوە بگۆڕدرێت. کۆمەڵگای مەدەنی بە شێوازی گرامشی خاوەنی زاتێکی نەگۆڕ نییە، کەشێکە کە بە کردەوەی دانیشتوانەکەی پێناسە دەکرێت. هێژمۆنی دەتوانێ دارایی چینە باڵادەستەکان بێت، بەڵام بە هەمان رادەش دەتوانێت بکەوێتە بەردەستی چینە ژێردەستەکان. بەڵام هەر چینێك بەر لەوەی دەست بە سەر دەسەڵاتی سیاسیدا بگرێت، دەبێ پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانی کۆمەڵگای مەدەنی بخاتە ژێر هێژمۆنی خۆیەوە. تەنیا لەو کاتەدا دەکرێت بنەمای ئەخلاقی دەوڵەت سەقامگیر ببێت.

بەڵام گرامشی هۆشدار دەدات کە تەنیا بەدەستەوەگرتنی دەسەڵاتی ئابووری یان دەوڵەتی بەس نییە. پرۆسەیەکی دژە هێژمۆنی دەبێ لە هەموو هەڵوێستە کۆمەڵایەتییەکاندا ململانێ لەگەڵ خاڵە ناڕوونەکانی دەسەڵات بکات. گرامشی بە پێچەوانەی فۆکۆ جەخت لە سەر ئەوە دەکاتەوە کە ئامانجی کۆتایی و گشتیی ڕاپەڕین دەبێ گۆڕینی دەسەڵاتی سیاسی و بەدەستەوەگرتنی دەوڵەت بێت. ئەوەی تیۆری هێژمۆنیی ئەو دەیکات، ئەوەیە کە ڕەنگە پەرە بە داوێنی خەباتی چینایەتی بدات و تەواوی بکات. خەباتی چینایەتی تەنیا لە سەر بەدەستەوەگرتنی دەسەڵاتی دەوڵەتی یان بە دەستەوەگرتنی هێزە بەرهەمهێنەرەکان نییە، بەڵکو لە سەر لادانی نهێنییەکانی ئەو هزر و ئایدۆلۆژیایانەیە کە تاك تا ئەم سەردەمە لە ڕێگای ئەوانەوە جیهانی خۆی ناسیوە.

گرامشی پێیوایە کە بەدەستەوەگرتنی دەوڵەت یان ئابووری بەس نییە، ئەوانە تەنیا بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ پەیوەندییان بە چالاکییەکانی ڕۆژانەی تاکەوە هەیە. ڕزگاری تاك پێویستی بەوەیە کە پرۆسەکانی ژیانی ڕۆژانە کە ئەو بوونی خۆی لەگەڵ ئەوان ڕێکدەخات، لە ئەفسانەکان بەتاڵ ببنەوە و گۆڕانیان بەسەر دابێت. دەوڵەتی ڕوسیا تەواوی دەسەڵاتەکەی لە لای خۆی کەڵەکە کردبوو، هەربۆیە ساتەوەختێکی شۆڕشگێڕانە دەیتوانی ئەو دەسەڵاتە بڕوخێنێت و جێگاکەی بگرێتەوە. لە کۆمەڵگای سەرمایەداریدا شۆڕشی سیاسی بە بێ شۆڕشی کۆمەڵایەتی وەدی نایەت. لەو شتەدا کە ئەو پێی دەڵێت شەڕی بزووتنەوە، گۆڕانکارییە بەشێنەیی و وردیلەکان لە کۆمەڵگای مەدەنیدا پێویستن.

خەبات لە دژی کۆمەڵگای مەدەنی و لە نێوخـۆی کۆمــەڵگای مــەدەنی دایــە. پێشــێتی کۆمەڵگای مەدەنی لە تیۆری گرامشی دا، ئاسەواری سیاسـی و ستراتژیی گرنگی هەیە.

هێژمۆنی ماوەیەکی زۆر بەشێك لە وشەکانی پەیوەندییە نێونەتەوەییەکان بووە و بـۆ ئاماژەکردن بە دەسەڵاتی ئەو دەوڵەتانە بەکار دەبرا کە لە بواری فەنناسـی، سـەربازی و ئابوورییەوە لەچاو دەوڵەتەکانی دیکە لە سەرترن. ئەو دەستەواژەیە لە لایەن پۆلخانۆف لە چەمکی تایبـەتیی رێبەریی پرۆلیتاریا لە یەکێتی کرێکاران و وەرزێران لە دەیەی ١٨٨٠دا بەکار برا. بە بڕوای لینین، هێژمۆنی رێگایـەك بـوو بـۆ راپەڕانـدنی ئەرکـەکان لـە ژێـر رێبەرایەتیی چینی کرێکاردا: "دەتوانین جەخت لە سەر ئەوە بکەینەوە کـە تیـۆر لەمـەڕ هێژمۆنی و بەدیهاتنەکەی کە ئیلیچ (لینین) بە ئەنجامی گەیاند، رووداوێکی میتافیزیکیی گەورەش بوو" (٦١، ل٣٥٧). لە فۆرمۆلبەندی گرامشی دا، لەو روەوە کە ئـەو لـە ژێـر کاریگەریی لینین دا بوو، هێژمۆنی رێگاچارەیە و باسی ئەوە دەکات کـە سـەرجەم هێـزە پێشکەوتنخوازە کۆمەڵایەتییەکان دەبێ لە دژی دەوڵەت و سیستەمی سەرمایەداری یەك بگرن.

بەڵام هێژمۆنی زۆر لەوە زیاترە، پەیوەندییەکە کە رێبەرایـەتیی چـینی کرێکـار لـەو یەکێتیە چینایەتیەدا نیشان دەدات. پرۆلیتاریا تا ئەو ئاستە دەتوانێت ببێتـە چـینێکی رێبەر و باڵادەست کە بتوانێ سیستەمێکی یەکێتیەکان بخولقێنێت کە ئـەو ئیزنـەی پـێ بدات زۆرینەی جەماوەر لە دژی سەرمایەداری و دەوڵەتی بورژوازی هەڵخرێنێت. گرامشی لەو بارەیەوە یارمەتییەکی بەرچاوی بە تیۆری مارکسیستی کردوە. نەتەنیا چینی کرێکار، بەڵکو خەباتە چینایەتی و جەماوەریەکانی کۆمــەڵگاش دەتـوانن شـۆڕش بـە سـەرەنجام بگەیەنن. ئەو هاوپەیمانە چینایەتیانە دەبێ لە رێگای پرۆلیتاریاوە هەماهـەنگ بکـرێن، بەڵام پرۆلیتاریا دەبێ بەڕادەی خۆیان دان بە گرنگـی و مانـای ئـەو خەباتانـەدا بنێـت. شـێوازەکانی دیکـەی خـەبات، لـە شـانۆی مارکسیسـتیی خەباتــە کۆمەڵایەتییەکانـدا دەردەکەون.

هێژمۆنی پێویستییەکشـە: ئەگـەر چـینی کرێکـار دەبـێ رێبەرایـەتی یەکێتییـەکی چینایەتی بکات، کەواتـە بـارودۆخی رێبـەرییـەکی ئـەوتۆ، تێپـەڕین لـە بەرژەوەندییـە ئابوورییە پیشەییە بەرچاوتەنگیەکانی پرۆلیتاریا و پێگەیاندنی روانگەیەکی بەرفراوانترە. لەوەش گرنگتر ئەوەیە کە چینی کرێکار بەو پرۆسەیە خۆی لە هەموو تێبینیە ئابوورییـە

بەرچاو تەنگەکانی خۆی دەرباز دەکات و دەگاتە ئەو جێگایەی کە لەگەڵ ئامانج و پێداویستیەکانی دیکەی هێزە نەتەوەییە خەڵکیەکان یەك بگرێت. چینی کرێکار تا ئەو ئاستە دەتوانێت چینێکی خاوەن هێژمۆنی بێت کە نوێنەری کۆمەڵێکی بەرفراوانی هێزە کۆمەڵایەتییەکان بێت. بۆ چینی کرێکار، چەمکی هێژمۆنی بەهایەکی فێرکاری هەیە. ئەو لەوە تێدەگات کە تەنیا کاتێك دەتوانێت سۆسیالیزم بونیات بنێت کە زۆرینەی هەرەزۆری ئەو چینە کۆمەڵایەتیانە یارمەتی بدەن و پەیڕەوی لێبکەن. کەواتە هێژمۆنی دەگەڕێتەوە سەر ئەو پرۆسانە کە بەرژەوەندی و روانگە کۆمەڵایەتییەکان، جا چ رێبەران و چ کەسانی پشتیوانیان، یەکپارچە و ئاوێتە دەکەن، پەرەیان پێدەدەن وگۆڕانیان تێدا دروست دەکەن.

گرامشی بەم جۆرە باسی پێویستی ئەو چینە بە سەقامگیر کردنی رێبەرییەکی ئەخلاقی دەکات:

تێگەیشتنی هیگڵ تایبەتە بە قۆناغێك کە تێیدا گەشەی پەرەستێنی بورژوازی هیچ سنوورێکی نەبوو، بەچەشنێك کە دەکرا باسی ئەخلاقیەت یان گشتییەتەکەی بکرێت: هەموو مرۆڤایەتی دەبێتە بورژوا. بەڵام لە راستیدا تەنیا گروپێکی کۆمەڵایەتی کە کۆتایی کاری دەوڵەت و کۆتایی خۆی دیاری دەکات ئەویش وەك ئامانجێك کە دەبێ دەستی پێی رابگات، دەتوانێ دەوڵەتێکی ئەخلاقی بخولقێنێت، واتە دەوڵەتێك کە خوازیاری ئەوەیە کۆتایی بە دابەشکردنە نێوخۆییەکانی ژێردەستەکان بێنێت (٦١، ل٩-٢٥٨).

چینی کرێکار ئەگەر بە هێژمۆنی تەیار کرا، دەتوانێ بەرەوپێش بچێت و لەنێو کۆمەڵگای سیاسیدا، کۆمەڵگایەکی مەدەنی ئاڵۆز و رێکخراو دروست بکات، کە تێیدا تاك بتوانێ بە سەر خۆیدا زاڵ بێت، بێ ئەوەی ئەو سەروەرییەی خۆی لەگەڵ کۆمەڵگای سیاسی لە ناکۆکی دابێت ــ بەڵکو بەردەوامبوونی ئەو و پێگەیاندنی ئەندامەکانی ئەو بێت (هەمان سەرچاوە، ل٢٦٨). کۆمەڵگای سیاسی کاتێك ئەخلاقی دەبێت کە گۆڕانکاریی کۆمەڵگای مەدەنی لەخۆنامۆبوو، لەناو بەرێت، کاتێك کە دەوڵەت نەك لە دژایەتی لەگەڵ کۆمەڵگای مەدەنی بەڵکو بۆ بەردەوامبوونی ئەو و پەرەسەندنی گشتیی ئەو لە ئارا دابێت.

شارەزایانی ئابووریی سیاسیی کلاسیك، ئەو چوارچێوەیەی کە پێیان دەگوت کۆمەڵگای مەدەنی، دیاریان کردبوو و بۆ جیاکردنەوە و خودموختاربوونی سوودیان لە دەوڵەت وەرگرتبوو. نەریتی (هیگڵی ــ مارکسی ــ گرامشی)ی کۆمەڵگای مەدەنی بردە ژێر پرسیارەوە و بونیادەکانی ئەو چوارچێوەیەی ئاشکرا کرد. هەم بۆ لیبراڵەکان و هەم بۆ مارکسیستەکان، ئەوە کۆمەڵگای مەدەنییە کە لە پێشەوەیە. بەڵام ئەو هاوئاراستەییە هەر لێرەدا کۆتایی پێدێت. سەرەڕای ئەو جیاوازیانەش کە لە ئەندێشەی ئەو سێ بیرمەندە ــ هیگڵ، مارکس و گرامشی ــ دا هەیە، ئەوان ڕێبازێکیان سەبارەت بە کۆمەڵگای مەدەنی هێنایە ئاراوە کە بەدیلی نەریتی لیبراڵەکان بوو. ئەوان ئەو گوتەی لیبراڵەکانیان قبوڵ نەبوو کە دەڵێت: کۆمەڵگای مەدەنی پانتایی مافەکان، تاکگەرایی، خاوەندارێتی و بازاڕ و گوتیان ئەوانە لایەنە روکەشیەکانی ئەو چوارچێوەیەن. ئەگەر ژێرەوەی ئەم رووبەرە وەدەرخەین، کۆمەڵگای مەدەنی وەك زاتی نامرۆیی نوێ خۆی دەردەخات. ئەگەر بیەوێت لایەنی بەهێزی خۆی وەدی بێنێت و بانگەوازی مێژوویی خۆی بە ئەنجام بگەیەنێت، دەبێ ڕێکبخرێت و گۆڕانکاری تێدا دروست بکرێت. هەرکام لەو سێ بیرمەندە بۆ ئەم پرسە کە کێ دەبێ ئەو ڕێکخستنە بە ئەنجام بگەیەنێت و بە چ شێوەیەك دەبێ ئەنجام بدرێت، ڕێگا چارەی تایبەتیی خۆیان هەیە. بەڵام هەرسێکیان دەیانزانی ناکرێ کۆمەڵگای مەدەنی هەر بەو شێوەیەی کە هەیە لێی بگەڕێن. کۆمەڵگای مەدەنی دەبوایە پەیڕەوی کۆنترۆڵێکی عەقلانی بووایە، ئاقارێکی بۆ دیاری بکرایە و ڕێبەرییەکی شیاوی بۆ دابین بکرایە، ئەوە میراتێکی تایبەتیی مێژووییە کە ئێستا لە هەوڵدان بۆ پێناسەی سەرلەنوێی کۆمەڵگای مەدەنی، باسی دەکەین.

## کۆمەڵگای مەدەنی لە روانگەیەکی دیکەوە:

### دروستکردنی چوارچێوەی مەدەنی

تیۆری لیبراڵی، پێیوایە کە کۆمەڵگای مەدەنی تایبەتە بە دەوڵەتە دیموکراتیەکان. هەبوونی کۆمەڵگای مەدەنی، گەرەنتی دیموکراتی بوونی دەوڵەتەکان دەکات، چونکە وەڵامدەربوونی دەوڵەتەکان و بەرتەسکیی دەسەڵاتی ئەوانە لە زومرەی بەهاکانی کۆمەڵگای مەدەنیدا. کۆمەڵگای مەدەنی کەشێکی پشت ئەستور بە رێساکان بەرهەم دێنێت کە سەربەخۆیە لە دەوڵەت، بەڵام دەوڵەت پارێزەری ئەوە و کەسە خاوەن مافەکان لە هاورێیەتی ئاشتیخوازانە لەگەڵ ئەوانیتردا بەشوێن بەرژەوەندییە تایبەتیەکانی خۆیاندا دەگەرێن. دەوڵەت وەك کۆمەڵێکی ئاڵۆز لە دامەزراوە و ئاراستەکان هەژمار دەکرێت کە یەکەم کاری تایبەتیان پاراستنی نەزمی کۆمەڵایەتی و ئازادیی ئەو بوارەیە. هەربۆیە، دەوڵەت لە دەستێوەردان لە ژیانی کارە بەرامبەرەکانی کۆمەڵگای مەدەنی قەدەغەکراوە. کەواتە تیۆری لیبراڵی جەخت لەسەر پێویستیی خولقان و ئاگاداری کردن لە چوارچێوەیەکی کارە دوولایەنە کۆمەڵایەتی دەکاتەوە کە دەوڵەت دەستیان تێوەر نەدات.

بەڵام لیبراڵەکان لە دۆزینەوەی سەرلەنوێی چۆنیەتی دروستبوون و شکڵگرتنی خودی ئەو کەشە، بەو شێوازە جۆراوجۆرانەی کە ناهێڵێت تاکەکان دەستیان بە بەرژەوەندیەکانی کۆمەڵگای مەدەنی رابگات، زۆر نابەدڵ بوون. ئەوە زیاتر لەو راستیەوە سەرچاوە دەگرێت کە گوتاری لیبراڵیی کۆمەڵگای مەدەنی بۆ خودی سەرچاوەکەیە، هەربۆیە هێمایەك لە بەشمەینەتیەکانی کۆمەڵگای مەدەنیمان پیشان نادات.

بۆ مارکسیستەکان، پێناسەی لیبراڵەکان سەبارەت بە کۆمەڵگای مەدەنی، وەك چوارچێوەیەکی یاسایی، رێگە بە باڵادەستیی چینی سەرمایەدار دەدات. کۆمەڵگای مەدەنی لە روانگەی مارکسیستیەوە، گۆرەپانی ململانێی خۆویستانە، چەوساندنەوە و نایەکسانیە چینایەتیەکانە. لە ئاکامدا تیۆری مارکسیستی کۆمەڵگای مەدەنی وەك چوارچێوەی کرین و فرۆشتن و سەرلەنوێ بەرهەم هێنانەوەی هێزی کار ناو بردوە. لەو روانگەیەدا، دەوڵەت بە

پاراستنی درۆینەی مافی یەکسانی و ئازادی، بەکردەوە گەرەنتی تالآن و برۆ و نەگبەتییە ئەخلاقیەکانی کۆمەلگای مەدەنی دەکات. نەریتی مارکسیستی بە چەقبەستن لە سەر پێگەیشتنی مێژوویی ئەو پانتاییە و لە سەر بەشمەینەتیەکان و پەراوێزخستنی کۆمەلگای مەدەنی، بۆچوونێك سەبارەت بە زولم و زۆری ئەو بوارە دابین دەکات.

لیبرالەکان لە سەر زولم و زۆرەکانی دەولەت جەخت دەکەنەوە، بەلام لێکۆلینەوە لە سەر زولم و زۆرییەکانی کۆمەلگای مەدەنی ناکەن و چەقبەستنی مارکسیستەکان لە سەر زولم و زۆرەکانی ئەو چوارچێوەیە ئەوانی بەرەولای لەبەرچاونەگرتنی هەرچەشنە شیکارییەك لەمەڕ دامەزراوە و بەهاکانی کۆمەلگای مەدەنی پال پێوەناوە. ئەو بە چوارچێوەیەکی مانـاداری مافەکان، گشتی، باس و گوتوبێژ، کە بەشێوەیەکی بەهێز هەم دەتوانێ دەولەت کۆنترۆل بکات و هەم دیموکراسییەکی نێوخۆیی لێ بکەوێتەوە، نازانن. لیبرالەکان و مارکسیستەکان هەردووکیان کۆکن لە سەر ئەوەی کۆمەلگای مەدەنی لە پێشەوەیە. بەلام سەبارەت بە چۆنیەتی هەلسەنگاندنی ئەو پانتاییە ناکۆکییەکی توندیان هەیە. هەربۆیە بۆچوونی ئەخلاقیی ئەوان سەبارەت بە کۆمەلگای مەدەنی هەر لە ریشەوە جیاوازە. چونکە هیچکام لەو دوو نەریتە نایانهەوێت دەرکی متمانەیەکی دیکە یان هەستیاریەکانی ئەوی دیکە بکات، پێموایە چەمکی کۆمەلگای مەدەنی، زیانێکی زۆری بەرکەوتووە.

نیگەرانیەکانی سەردەمی ئێمە هانی ئەو لێکدانەوەیەی کۆمەلگای مەدەنی دەدات کە هزری لیبرالی و مارکسیستی کۆمەلگای مەدەنی هاورێی یەکتری بکات. هەبوونی دەولەتێکی دەسەلاتدار لە راستیەکانی سەردەمی ئێمەیە، ئەو دەولەتەی کە سەرجەم داهێنان و قسەوباسەکانی خەلکی کپ کردوە ــ بەواتایەکی دیکە ، ئەو دەولەتەی کە دەیەوێت بەسەر کۆمەلگای مەدەنیدا زال بێت، ئەوە سەرجەمی دەولەتەکان و لەوانە دەولەتەکانی دوای راپەڕینیش دەگرێتەوە و ئەو دەولەتانەی کە دەیهانهەوێت بە سەر کۆمەلگای مەدەنیدا سەروەری بکەن، ئیتر پێویستییان بە وەلامدەرەوەبوون نییە، و ئیتر لە بەرامبەر خەلکدا بەرپرسیار نین. پێویستە سەپاندنی دەسەلاتی دەولەت کۆنترۆل بکرێت و دەولەتەکان وەلامدەرەوە بن. تەنیا لە رێگای رەوالە دیموکراتیەکانی کۆمەلگایەکی مەدەنیی سەربەخۆوە دەکرێ ئەو وەك بەرپرس بهێنێتەوە.

ئەفزەلیەت بەخشین بە کۆمەلگای مەدەنی وەك چوارچێوەیەك کە دەکرێ سیاسەتە دیموکراتیەکانی تێدا بینا بکرێت، گەلێك پێویستیی گشتیی هەیە. بۆ نموونە بە مانای

بږواهێنان بەو مافەیە کە دەوڵەت بەرپرس و وەڵامدەرەوە بێت و گەرەنتی ئەوەش بکرێت کە لێپرسینەوەی سیاسی تەنیا لە دامەزراوە و رێکخراوەکان و یاسا و رێساکاندا نەبێت بەڵکو ببێتە بەشێك لە پێکهاتەی کۆمەڵگا. لە راستیدا بږوا بە شتێکە کە هابرماس (٦٤) پێی دەڵێت شایستەیی "گشتیی سیاسی". ئەوە بە نۆرەی خۆی بۆ چەمکی کۆمەڵگای مەدەنی و بۆ پەیوەندییەکانی دەوڵەت و کۆمەڵگا، سێ پێویستیی هەیە.

یەکەم، چەمکی چوارچێوەی گشتیی کۆمەڵگای مەدەنی پێویستی بەوە هەیە کە خەڵك لە دەوری خواستە هاوبەشەکانیان کۆ ببنەوە. کاری گشتی تەنیا ئەوە نییە کە پەیوەندی بە هەموو کۆمەڵگاوە هەیە، پێکهاتەیەکی پێویستە کە ئەو تاك و گروپانەی کە لە گوتاری تایبەتیدا جێیان دەبێتەوە لە گوتارێکی پشت ئەستور بە خواستە هاوبەشەکان لەدەوری یەکتری کۆ دەکاتەوە. راگواستن لە تایبەتییەوە بۆ گشتی لە رێگای پێکهاتن و بڵاو بوونەوەی بیروڕای گشتییەوە بەڕێوە دەچێت و بیروڕای گشتیش لە رێگای باس و گوتوێژی بەڵگەمەندەوە بار دێت. هەمووی ئەوانە پێویستیان بە کەشێکی تا رادەیەك سەربەخۆ لە دەست تێوەردانی دەوڵەت، باوەڕ بە مافەکانی بەشدارانی ئەو مەڵبەندە، و بوونی دامەزراوەکانی وەك چاپەمەنیە ئازادەکان، یەکێتیەکان، شوراکانی نوێنەرایەتی و سەروەری یاسایی هەیە.[٤٦]

---

٤٦ - لە یەکەم نیگادا وادیارە کە گریك کلهۆن ئەم روانگەیە تەئید ناکات: "کۆمەڵگای مەدەنی و پانتایی گشتی دوو چەمکی بە تەواوی وەك یەك نین. لە راستیدا گرینگی پانتایی گشتی زیاتر لەوە دایە کە لە شرۆڤەی بنەما کۆمەڵایەتیەکانی دیموکراسی لە پشت بەستنی گشتی بە خوخدەی کۆمەڵگای مەدەنی ئەولاوەتریش بږوات و باسێك لە رێکخراوی تایبەتیی نێو کۆمەڵگای مەدەنی بۆ بنەما کۆمەڵایەتی و کلتورییەکانی پێگەیاندنی گوتاری عەقڵانی ــ رەخنەیی بە مەبەستی چارەسەری مناقشە سیاسیەکان بێنێتە ئاراوە. کەوابوو نابێ پەیڕەوی لە سەرچەشنی زۆربەی شیکارگەرەکانی ئەم دوایانە بکەین کە سەبارەت بەم چەمکە هەستەکانیان هەڵخڕاوە و پێیانوایە "کۆمەڵگای مەدەنی" و "پانتایی گشتی" کەم تا زۆر هاوواتای یەکترین... ئەوەی جێگای باسە پەیوەندیی نێوان سەرچەشنەکانی رێکخراوی کۆمەڵایەتی و چەشنێکی دیاریکراو لە گوتار و بەشداریی سیاسییە" (٢١، ل٢٦٩). بەڵام وادیارە کە کلهۆن پێیوایە رێکخراوە کۆمەڵایەتیەکان هەر هەمان کۆمەڵگای مەدەنین، و پێکهێنانی گوتارێکی رەخنەیی ــ عەقڵانی بە مەڵبەندی گشتی دەزانێت. ئەوە لە کاتێك دایە کە من باسی ئەوەم کردوە کە تەنیا رێکخستنی ئەو گوتارانەیە کە کۆمەڵگایەك دەکاتە کۆمەڵگایەکی مەدەنی.

دووهەم، باش وایە ئەم باسە، باسێکی گشتی بێت بەو مانایەی کە هەمووان دەستیان پێی رابگات. هیچ کەس نابێ بەهۆی پلەوپایەکەی لە چین یان دیکەی پێکهاتەکان پەراوێز بخرێت، کە هەڵبەتە ئەوەش پرسیەکی بنەڕەتی دێنێتە پێشەوە کە گوتاری گشتی بە مانای لە بەردەست دابوونەکەی تا چ رادەیەك گشتییە و ئەو پرسیە بۆ راپرسی دەباتە نێوخۆی پێکهاتەکانی کۆمەڵگای مەدەنییەوە؟

سێیەم، لە دەرەوەی رێگا رێگەپێدراوەکانی پەیوەندیەکان کە دەوڵەت دابینی کردوە، دەبێ کەشێك لە ئارا دابێت کە ئەم باسە "ئازاد" و گشتییە بتوانێت لە نێوخۆی ئەودا بەڕێوە بچێت. لە راستیدا ئەو کەشە دەبێ لە دەرەوەی سنوورەکانی هەموو ناوەندە سەلمێنراوەکانی وەك دامەزراوە ئایینیەکان بێت. کە ئەوەش بەشبەحاڵی خۆی بەرەورووی ئەو پرسیارەمان دەکاتەوە کە: کۆمەڵگای مەدەنی تا چ رادەیەك سەربەخۆ لە دەوڵەتە؟

بەم چەشنە هەرکام لە گریمانەکان پرسیارێك دەخولقێنن و ئەو گریمانە و پرسیارانە تەوەری قسەوباسی خوارەوەی ئێمەن سەبارەت بە کۆمەڵگای مەدەنی.

تیۆری سیاسیی دیموکراتی بۆیە سەرەتی بە کۆمەڵگای مەدەنی دەبەخشێت، کە هەبوونی دیموکراسی سەرەڕای هەبوونی کۆمەڵگای مەدەنی بە چەشنێك کە شیاوی سڕینەوە نییە، پەیوەندی هەیە. لە راستیدا هەبوونی کۆمەڵگایەکی مەدەنی، ئاڵۆز و چالاك پێشمەرجی بنەڕەتی و حاشاهەڵنەگری دیموکراسییە. سەرەڕای هەموو ئەوانەش، پەیوەندیی نێوان ئەو دووانە لە رادەبەدەر ناکۆك و ئاڵۆزە. سەرهەڵدانی کۆمەڵگای مەدەنی لە روانگەیەکی

---

تەنیا جەخت کردنەوە لەسەر رێکخراوی کۆمەڵایەتی وەکو "بەشێکی تایبەتی"ی کۆمەڵگای مەدەنی، لێکهەڵوەشاندنی کۆمەڵگایە لە کۆمەڵگای مەدنی دا. بەڵام لەگەڵ ئەو قسەیەی کلهۆن تەبام کە دواتر دەڵێت: " چوارچێوەیەکی گشتی ئەوتۆ پەیوەندیی بە لەباربونی رێکخراوی کۆمەڵگای مەدەنیەوە هەیە. هەبوونی کۆمەڵگایەکی مەدەنی، یان تەنانەت هەبوونی کۆمەڵگایەکی مەدەنی کە کەم تا زۆر سەربەخۆ بێت لە دەوڵەت، بەس نییە. ناکرێ بە سەر ئەنجومەن و یەکێتیەکاندا باز بدرێت بەو هیوایەی کۆمەڵگای مەدەنی دەوڵەمەند دەبێت و دیموکراسیمان لە پێش دەبێت" (هەمان سەرچاوە، ل٢٧٦). منیش هەر رێك لە سەر ئەو باوەڕەم، کۆمەڵگا دەبێ رێکخراوێکی سیاسیی هەبێت ــ تەنیا ئەوکاتەیە کە دەتوانێت ببێتە پانتایی گشتی کۆمەڵگای مەدەنی. کۆمەڵگای مەدەنی بەو واتایە جێگایەکە بۆ سیاسەت کە لە دەرەوەی سنوورەکانی دەوڵەت پێك دێت.

مێژووییەوە، مژدەی سەرهەڵدانی دیموکراسی بوو، بەڵام ڕەفتارەکانی کۆمەڵگای مەدەنی دیموکراسیشی تووشی خەسار کردوە. لە ڕاستیدا ئەوەی بە چ شێوەیەك کۆمەڵگای مەدەنی هەڵسەنگێنن و واتایەکی بۆ دانێین، تا ڕادەیەکی زۆر پەیوەندیی بەوەوە هەیە کە دیموکراسی چۆن دەبینین و پێچەوانەکەشی هەر ڕاستە.

بە واتایەکی زۆر بەرتەسك دەکرێ دیموکراسی بەو کۆنترۆڵ و چاودێرییە بزانین کە خەڵك بە سەر هەڵبژاردنی نوێنەرە سیاسییەکانی خۆیاندا دەیکەن. ئەو کۆنترۆڵکردنە بە پێی پێویست قۆناغ بە قۆناغە و لە چوارچێوەی ئەو ڕووداوە دیاریکراوانەدایە کە بەرچاوترینیان هەڵبژاردنە. ئەو ڕوانگەیە سەبارەت بە دیموکراسی، کە پێی دەگوترێت دیموکراسیی سیاسی، ئاماژەیەکی ئەوتۆ بە بارودۆخی کۆمەڵایەتی ناکات کە تاکەکانی تێدان. سەبارەت بە دیموکراسیی کۆمەڵایەتی یان نەبوونی ئەو هیچ هەڵوێستێکی نییە، و کەوابوو ئەو ڕاستیە لەپێش چاو ناگرێت کە ئەو تاکانە بارودۆخێکی یەکسانیان نییە، بە پێی ئازادی و یەکسانی توانایی بەشداریی کردن لە ژیانی سیاسیاندا نییە. ئەوە تەنیا باسکردنێکی نوقسان و ناپوختەی دیموکراسییە.

دیموکراسی لە واتایەکی مەزنخوازانە و ڕوو لە کۆمەڵ، کە من مانایەکی ئەوتۆم بۆ لە بەر چاو گرتووە، دەکرێ وەك پرۆسەیەك چاوی لێبکرێ کە تاکەکان لە ڕێگەی ئەوەوە چاودێر بن بە سەر ئەو بڕیارانەی کە بۆ کۆمەڵ دەردەکرێن. کەوابوو ئەوان چاودێری ئەو بارودۆخەن کە کاریگەریی بە سەر ژیانیانەوە هەیە. ئەو بڕیارانە لەوانەیە لە پەیوەندییەکانی خێزانی، بارودۆخی شوێنی کار، ئەو باڵادەستیەی کە ڕێبەری ئایینی بە سەر پەیڕەوەکانی خۆیدا دەیسەپێنێت، پرسەکانی هاوسێیەتی و تەنانەت بڕیارەکان و ڕێبازەکانی دەوڵەت، دوور کەونەوە. ئەو چەشنە ریزبەندییە دیموکراتیانەی کۆمەڵگا، پێشەکی و پێشمەرجێکن بۆ دیموکراسیی سیاسی.

ئەوە پێویستی بەوەیە کە خەڵکی قبوڵی بکەن کە بەرپرسیارێتی کۆتایی ریزبەندییە کۆمەڵایەتییەکان لە ئەستۆی ئەوانە و لەوە تێبگەن کە ناکرێ ئەو بەرپرسیارێتییە بەدەوڵەت بسپێردرێت، جا دەوڵەت بە هەر ڕادەیەکیش شەرعیەتی خۆی بنوێنێت. ئەوەش بە نۆرەی خۆی پێویستیی بەوەیە کە چاودێری کردن بە سەر بڕیارەکاندا تەنیا کاتێك وەدی دێت کە خەڵکی ئازاد بن لەوەی لە قسەوباس، گوتوبێژ و مشتومڕ سەبارەت بە ڕابوردو و ئێستا و داهاتووی کۆمەڵگای مەدەنی خۆیان دەرگیر بن و ئامادەی ئەوە بن کە زۆر بوێرانە پارێزگاری لەو مافە

بکەن لە بەرامبەر هەموو بەڕێوەبەرێك و لە سەرووی هەمووشیانەوە دەوڵەت ئەگەر مەترسیی ئەوە هەبێت کە ئەم چالاکییانە سەرکوت بکرێن. بە پێی گوتەی با یار "کۆمەڵگای مەدەنی تەنیا تا کاتێك بوونی هەیە کە خودوشیاری لەمەڕ هەبوونی و بەرەورووبوونەوەی لەگەڵ دەوڵەت لە ئارادایە" (٨، ل١١٧).

بەڵام کۆمەڵگای مەدەنی وەك کەشێك بۆ ئەو گوتوبێژ و مشتومڕە شتێك نییە کە بکرێ جارێك و بۆ هەتاهەتایە بونیات بنرێت. بە واتایەکی دیکە هاووڵاتیانی کۆمەڵگای مەدەنی دەبێ لە بەرامبەر دەستدرێژیەکانی دەوڵەتدا پارێزگاری لە سنوورەکانی خۆیان بکەن. بە گوێرەی وشە لەبیر نەکراوەکانی دۆ تۆکفیل "هیچ لەمپەرێکی دیکە بۆ پێشگرتن لە ملهوڕی" بوونی نییە. بەڵام بەو مانایەشە کە خەڵك لە بواری سیاسییەوە دەرگیر و چالاکن. هەروەك جان کاردن لە ساڵی ١٧٩٠ ئاماژەی پێکرد، "خوا بە مەرجێك ئازادی بە مرۆڤ بەخشیوە کە بۆ هەتاهەتایە پارێزگاری لێ بکات". ئەو چالاکییانە وەك پێشمەرج، پێویستییان بە هەبوونی کەشێکە کە تێیدا بکرێ ئەو قسەوباسانە لە بارودۆخێکی ئازاددا بکرێن: ئازادیی رادەربڕین، ئازادیی بڵاوکردنەوە، ئازادیی بیروباوەڕ، دەستڕاگەیشتن بە زانیاریەکان، گوتوبێژ و ئازادیی مشتومڕ لە گەڵ نەریتە سەلمێنراوەکان. دەتوانین ئەو پانتاییە گشتییەی قسەوباس و گوتوبێژ و مشتومڕ، نێو بنێین کۆمەڵگای مەدەنی.

دووهەمین خاڵ کە دەمەوێ باسی بکەم ئەوەیە کە توانای کۆمەڵگای مەدەنی بۆ پاشگەزکردنەوەی دەوڵەت لە سەپاندنی لێهاتوویی رەهای خۆی، مەرجێکی بنەڕەتییە بۆ دیموکراسی بەڵام بەس نییە. بایار وەبیرمان دێنێتەوە کە "ململانێ لە گەڵ پاوانخوازیی دەوڵەت لە مەڕ دەسەڵات لەوانەیە لە نێو خۆیدا پاوانخوازییەکی نوێ بەرهەم بێنێت... پێشڕەویی کۆمەڵگای مەدەنی، کە بە پێی پێویست هەڵگری ئایدیالی دیموکراتی نییە، خۆی لەخۆیدا گەرەنتیی دیموکراتی بوونی سیستەمێکی سیاسی ناکات" (٨، ل١١٨). کۆمەڵگای مەدەنی بۆ ئەوەی دیموکراتی بێت، وەك پێشمەرجێکی بنەڕەتی پێویستیی بەو راستییە کە خەڵك لە قسەوباس، گوتوبێژ، و مشتومڕ لەسەر بنەمای ئازادی و یەکسانی تێکهەڵچن. بەواتایەکی دیکە، کەشی گشتی کەشێکە کە تێیدا هەمووان ئازاد بن لەوەی بە بارودۆخێکی یەکسان و ڕێزێکی بەرامبەرەوە بەشداریی بکەن. هەبوونی کۆمەڵگای مەدەنی وەك مەڵبەندێك بۆ بەشداری، بڕیاردان، گوتوبێژ، و مشتومڕ هێمای توانایی تاکەکان نییە بۆ بەشداریکردن لە سەرجەمی ئەو چالاکییانەدا. کۆمەڵگایەکی مەدەنی کە بەراستی دیموکراتی بێت، وەك

پێشمەرجێك پێویستی بەوە هەیە كە سەرجەمی كەسەكانی ئەو دەرفەتانەیان بۆ بڕەخسێت. زنجیرەیەكی دوور و درێژی گریمانەكان لەو خاڵەوە سەرچاوە دەگرن كە باسی دەكەین.

ئەو خاڵەی كە دەمەوێ لێرەدا باسی بكەم ئەوەیە كە هەرچەندە هەبوونی كۆمەڵگای مەدەنی بۆ هەبوونی دیموكراسی شتێكی بنەڕەتییە، هەبوونی كۆمەڵگای مەدەنی هیچ نیشانەیەكی ئەو رەفتارانەمان بۆ دەرناخات كە لەوێدا دێنە پێشەوە و بەهێز دەبن. كۆمەڵگا مەدەنییەكان بە هۆی رەفتاری كەسەكانیانەوە وەسف دەكرێن. ئەو چەشنە رەفتارانە، بۆ ئەوەی دیموكراتی بن، دەبێ سەبارەت بە بەرپرسیارێتیەكانیان خودوشیار بن، وشیارییان لە مەڕ پەیوەندیەكانیان لەگەڵ دەوڵەت هەبێت، و لە هەمووی ئەوانەش گرنگتر دەبێ ئاگایان لە خۆیان بێت بۆ ئەوەی رەفتارەكانیان جێی پەسندی هەمووان بن بۆ ئەوەی بە راستی بتوانن نوێنەر بن.

كەواتە دەوڵەتە دیموكراتیەكان پێویستییان بە كۆمەڵگا مەدەنییە دیموكراتیەكان هەیە و كۆمەڵگای مەدەنی دیموكراتی كۆمەڵگایەكە كە نەتەنیا لە بەرامبەر دەوڵەتدا ئاگای لە خۆیەتی بەڵكو ئاگاداری سیستەمە نێوخۆییەكانی خۆیشی هەیە. بەڵام ئەوە هەموو شتەكە نییە، بەڵكو تەنیا رەهەندێكی كۆمەڵگای مەدەنییە. ئێستا ئەگەر ئەوەش زیاد بكەین كە دەوڵەتەكان نەتەنیا گوشارەكانی كۆمەڵگای مەدەنی بەشێوەیەكی پاسیڤ وەرناگرن بەڵكو هەم لە بیناكردن و هەم لە لاوازكردنی ئەو بوارەدا چالاك بوون، وە ئەگەر ئەو فیكرەش زیاد بكەین كە بنەمای دووهەمی كۆمەڵگای مەدەنی لە گەڵ بنەمای یەكەم بەردەوام لە ناكۆكی دایە، و ئازادی و یەكسانی بەتەواوی لە رەفتارەكانی كۆمەڵگای مەدەنیدا جا لە هەر كوێیەك كە هەبوویێت، دیار نەبوون، ئەو كات دەزانین كە كۆمەڵگای مەدەنی كەشێكی لە رادەبەدەر لاواز، لەرزۆك و لە هەمووان گرنگتر كەشێكە كە بەشێوەیەكی نایەكسان بونیات نراوە.

هەروەها هەست بەوەش دەكەین كە پەیوەندیی نێوان كۆمەڵگای مەدەنی و دیموكراسی هەم توانایی دەبەخشێت و هەم سەرچاوەی ناكۆكیشە. لە لایەكەوە، گریمانەكان و دامەزراوە سەرەكییەكانی كۆمەڵگای مەدەنی بۆ دیموكراسی حاشا هەڵنەگرن. هەوڵدان بۆ هەڵوەشاندنەوەی دیموكراسی هەمیشە لەگەڵ هەوڵدان بۆ هەڵوەشاندنەوەی ئەو مەڵبەندە هاوكات بووە. لە لایەكی دیكەوە، رەفتارەكانی كۆمەڵگای مەدەنی ــــ ئەو رەفتارانەی كە بەهێزتر لە هەموو شوێنێك لە بەرهەمەكانی هیگڵ، ماركس و گرامشی دا دەركەوتوون ــــ

کۆسپی سەر ڕێگای پڕۆسەکانی دیموکراسین و کۆمەڵگایەکی مەدەنیی ئازاد ناتوانێت بوونی هەبێت ئەگەر بنەماکانی ئازادی لە کار و کردەوە نێوخۆییەکانیدا نەبن.

بەم جۆرە کۆمەڵگای مەدەنی هەم کەشێکی بۆ دیموکراسی دابین کردوە و هەم وەك مەرجێکیش کاری لە سەر کردووە. ئەو پەیوەندییە نەگونجاوەیە کە کۆمەڵگای مەدەنی و دیموکراسی وەك یەك لێکردووە و لە هەمانکاتدا پێشی بەوەش گرتووە کە بوارێك بێت بۆ دیموکراسی. بووەتە کەشێك کە شیمانە ڕواڵەتیەکانی دیموکراسی تێیدا بنەڕەتی کراونەتەوە، بەڵام لە پشتەوەی ئەو دامەزراوە و گریمانە ڕواڵەتیانەی وەك شورا کۆمەڵایەتییەکان، ئازادیی ڕادەربڕین، قسەوباسی گشتی ــ کەشێك دێتە ئاراوە کە بەرتەسك و مەرجدارە و ئەویش بە نۆرەی خۆی دیموکراسی بەرتەسك دەکاتەوە.

ئەوە بەو مانایە نییە کە کۆمەڵگای مەدەنی شتێکی بێجگە لە ڕەمزێك بۆ زاڵبوون و چەوساندنەوە نییە. تەنیا بەو مانایەیە کە دەبێ بۆچوونەکانی دۆ تۆکڤیل و مارکس، ج.س.میل و گرامشی لە گەڵاڵەیەکدا کە بە پێشێتی کۆمەڵگای مەدەنی وەفادارە و لە هەمانکاتیشدا لێی دەپرسێتەوە لە پاڵ یەکتری دابنێین. میراتی لیبراڵی بە هەر ڕادەیەکیش بە شتێکی بورژوایی دابینێین، لە بواری ئەندێشەکان و دامەزراوەکانەوە کاریگەرییەکی بۆماوەیی بەجێهێشتووە. ئەو ئەندێشە و دامەزراوانە سەبارەت بە شێوازە دڵخوازەکانی ڕێکخستنی پەیوەندییەکانی دەوڵەت ــ کۆمەڵگا و پەیوەندییەکانی نێوخۆی کۆمەڵگا، بۆ زۆربەی گەڵاڵە گۆڕانکاریی پێکهێنەرە کۆمەڵایەتییەکان، حاشاهەڵنەگر بوون. بەڵام تێگەیشتنی دیموکراتی لە کۆمەڵگای مەدەنی دەبێ نەشتەر لە ژێر ئەو گریمانە ڕواڵەتیانە ڕابکات و سەرچاوەکانی بەرتەسك کردنەوەی دیموکراسی بدۆزێتەوە و هەستیاریی دیموکراتیی کۆمەڵگای مەدەنی دەبێ بەئاراستەی چالاك کردنەوەی ئەو دامەزراوە و فیکرانەدا هەنگاو هەڵبگرن.

لەم بەشەدا دوو لایەنی ئەو ئاوێتەبوونە نەگونجاوەی کە کۆمەڵگای مەدەنی پێك دێنێت، تاوتوێ دەکەین. بەوە دەست پێدەکەم کە کۆمەڵگای مەدەنی توخمێکە کە لە ژیانی دیموکراتیدا ناکرێ چاوپۆشی لێبکرێت. دواتر لە درێژەی باسەکەدا ئەوە تاوتوێ دەکەم کە بۆچی نەیتوانیوە وەك مەڵبەندێکی گشتی بە واتای ڕاستەقینەی دیموکراتی کار بکات. لە بەشی دواتردا سێیەمین لایەنی ئەو ئاوێتەبوونە نەگونجاوە تاوتوێ دەکەین، یانی ئەو ڕەفتارە کۆمەڵایەتیانەی کە لە کۆمەڵگای مەدەنیدا ڕەواجیان هەیە و دەتوانن یاریدەدەری وەدیهاتنی هێزی دیموکراتیی ئەو چوارچێوەیە بن.

# کۆمەڵگای مەدەنی وەك کەشێکی گشتی

# (١)

تیۆرە هاوچەرخەکان روویان لەو لایەنەیە کە کۆمەڵگای مەدەنی وەك وتەزایەکی پاشماوە سەیر بکات (بەشی ١ ). لەو لێکدانەوەیەدا، هەموو ئەو شتەی کە سەر بە دەوڵەت نییە (واتە پاشماوەکانی چەمکی دەوڵەت)، کۆمەڵگای مەدەنییە، کە خێزانەکان، تۆڕە ئایینیەکان، کۆڕوکۆمەڵەکان، شوێنەکانی کار و ئەنجومەنەکانی دیکە دەگرێتەوە کە دەکرێ بە بواری تایبەتی ناویان بەرین. لەو فۆرمۆلبەندیەدا، دەوڵەت بە پێی ئەو پاوانخوازییەی کە لە داسەپاندنی زۆرداریدا هەیەتی، پێناسە دەکرێت، بەڵام کۆمەڵگای مەدەنی بە بێ پێناسە دەمێنێتەوە، واتە وەك چێشتی مجێورە و بێجگە لە دەوڵەت هەموو شتێك دەگرێتەوە. سنوورەکان و ناوەرۆکی کۆمەڵگای مەدەنی بە شاراوەیی دەمێنێتەوە. بەڵام گرنگتر ئەوەیە کە لەو ریزبەندییەدا لەگەڵ کۆمەڵگا وەك یەك هەژمار دەکرێت. بە بڕوای من ئەوە بێ مروەتییە دەرحەق بە هەموو نەریتی تیۆری سیاسی کە بۆ کۆمەڵگای مەدەنی جەوهەر و رواڵەتێکی تایبەتی داناوە. کۆمەڵگای مەدەنی نەتەنیا وتەزایەکی پاشماوە یان هاوواتای کۆمەڵگا نییە، بەڵکو دەکرێ بەشێوەی خوارەوە لە کۆمەڵگا جیا بکرێتەوە.

دەکرێ کۆمەڵگای مەدەنی بە واتای سەرجەم رەفتارە کۆمەڵایەتییەکان دابنرێت کە کۆمەڵێکی دیاریکراو لە ساتەوەختێکی مێژوویی دیاریکراودا لە رێگای ئەوەوە خۆیان دەپاراست و سەرلەنوێ خۆیان بەرهەم دێنایەوە. واتای "لە ساتەوەختێکی دیاریکراودا" بە واتایەکی زۆر تایبەتی دەکار دەکەم. رەفتارە کۆمەڵایەتییەکان بە پێی پێویست ناسەقامگیر و لەرزۆکن، چونکە لە سەر بنەمای زاڵبون و هەروەها لە سەرکار لابردنەکان و پەراوێز خستنەکانەوە پشت ئەستوورن. لە هەر ساتەوەختێکی دیاریکراودا کۆمەڵێکی دیاریکراو لە رەفتارە کۆمەڵایەتییەکان لە پەیوەندیی لەگەڵ یەکتردا بە سەر کۆمەڵگادا زاڵن و پێناسەی دەکەن. بەڵام هەروەك رەفتارە کۆمەڵایەتییەکانی دیکە لەو "کۆمەڵە مێژووییە" دەرهاویشتراون، رەفتارە زاڵەکان لە بەردەم کێشمەکێش و ململانێی بەردەوام دان. ململانێکە لەوانەیە لەو رەفتارانەوە سەر هەڵبدات کە دەیانەوێت لە ناوخۆی رەفتارە

زاڵەکاندا بگونجێندرێن یان لەوانەن کە دەیانەوێت ڕەفتارە زاڵەکان نەهێڵن و کۆمەڵێکی مێژوویی نوێ سەقامگیر بکەن. حاڵەتی یەکەم بابەتێکی لەگەڕدابوونی هەلکەوتەکانە و ئەوەی دووهەمیشیان ماددەیەکە کە ڕاپەڕینەکان لەوەوە سەر هەڵدەدەن. بەڵام ڕاپەڕینەکان گروپێکی نوێ لە کەسانی هەلکەوتە و ڕەفتارە کۆمەلایەتییەکان زاڵ دەکەن کە ئەوانیش بە نۆرەی خۆیان دەکەونە بەر ململانێوە.

دەوڵەت (هەر وەك لە بەشی دووهەمدا باس کرا) لە ساتەوەختێکی مێژوویی دیاریکراودا بە کاری ڕێکخراو کۆمەڵێکی مێژوویی دیاریکراو سەقامگیر دەکات و لەم ڕێگەیەوە کۆمەڵگا سەقامگیر دەکات. بەڵام لەو ڕووەوە کە ئەو کۆمەڵە لە کۆمەڵگادا تووشی ململانێ دەبێت، بنەمای کۆمەلایەتیی دەوڵەت بە پێی پێویست ناسەقامگیرە ــ بە گوتەی گرامشی، ژیانی دەوڵەت "پرۆسەیەکی پێکەوە گرێدراوە لە پێکهێنان و لەناوچوونی هاوسەنگیە نابەردەوامەکان". ئەو دەوڵەتانەی کە نەتوانن وەڵامی ئەو هاوسەنگییە نابەردەوامانە بدەنەوە، دەبنە دەوڵەتێکی ناپەیوەندیدار ــ هەر دەڵێی دەوڵەتێکی بێ کۆمەڵگان.

بەڵام بۆ ئەوەی بتوانین ململانێکانی ڕووبەڕووی ئەو کۆمەڵە مێژووییەی کە بنەمای کۆمەلایەتیی دەوڵەت پێك دێنن، بە وردی و بەشێوەیەکی کاریگەر دەربڕین و بتوانین دەوڵەت وەك وەڵامدەرەوەی هێزە دیموکراتیە کۆمەلایەتییەکان بێڵینەوە، کەشێکی دیموکراتیمان پێویستە، ئەویش بە پێی پێویست ئەو کەشەیە کە هەم لە جەخت کردنەوەکان و هەم لە مشتومڕەکان لە بەرامبەر پەیوەندییە کۆمەلایەتییەکانی فۆرمۆلبەندییەکی فەرزکراو و دەوڵەت پێکهاتووە. ئەو کەشەی کە ئەو جەخت کردنەوە و نارەزامەندیانە بە نیسبەت کۆمەڵێکی مێژوویی بالادەستەوە تێیدا بەڕێوە دەچێت، چوارچێوەی گشتیی کۆمەڵگا و بەواتایەکی دیکە کۆمەڵگای مەدەنییە. بە ئاسانی دەتوانین بڵێین کە کۆمەڵگای مەدەنی پانتاییەکە کە گروپە ڕێکخراوەکان بە پێی چین و بەشەکانی ئەو ــ ڕەگەز، جنس، قەوم و ژینگە ــ لە ململانێ سیاسی و ئایدۆلۆژیەکاندا تێك هەڵدەچن. پانتایی سیاسەتێکی ڕێکخراوە، ڕێکخراو نەتەنیا بەو واتایەی کە ئەو ڕەفتارانە لە لایەن دامەزراوەکانی وەك گروپە سیاسی و بزووتنەوە کۆمەلایەتییەکانەوە بەڕێوە دەچن، بەلکو بەو مانایە کە بیروڕای گشتی لە مەڕ پێشهاتەکانی پرۆسەیەك ڕەنگدانەوەیان دەبێت.

ڕووداوێك کاتێك سیاسی و گشتگیر دەبێت کە ببێتە تەوەری گوتاری گشتی سەبارەت بەوەی دەبێ لە ئارا دابێت. کەوابوو کاتێك کە پەیوەندییە چینایەتیەکان، پەیوەندییەکانی دوو ڕەگەز، ڕووداوە ڕەگەزی و ئەتنیکیەکان، و نزیکایەتیە ئایینیەکان دەکەونە بەر لێپرسینەوە، ڕەخنەیان

لێدەگیرێت و دەچنە ناوەرۆکی باسێکەوە کە نیشانەکەی گشتی بوون، گەیاندنی زانیاریەکان و پێکهاتنی بیروباوەڕە، گشتگیر دەبن. لێرەدا تەنیا پێوانە یانی ڕێژەی ئەو کەسانەی کە دەچنە نێو باسەکەوە، یان گشتاندنی باسەکە لە مەودایەکی بەریندا لە ئارادا نییە، بەڵکو پرۆسەگەلێك لە ئارادان کە خەڵك لە ڕێگەی ئەوانەوە دەیسەلمێنن کە بابەتەکە تایبەت بە هەموانە و دەبێ بکەوێتە بەر قسەوباسی ڕاشکاوانە و گشتییەوە.

پرۆسەی بیرکردنەوە و دوان، پرۆسەیەکە کە تاکەکان تێیدا لە هاوڕێیەتی لەگەڵ یەکتری لەمەڕ بەهاکان و بیروباوەڕەکانیان لێپرسینەوە دەکەن. پرۆسەی بەهێزکردنی ئەو بەهایانەیە کە بایەخی دانپێدانانیان هەیە و ئاڵوێری دووبارەیە سەبارەت بەو بەهایانەی کە مەترسی ململانێیان لە سەرە. تێفکرین شێوازێکە کە کۆمەڵگاکان بەردەوام لە ڕێگەی ئەوەوە پێکهاتەی خۆیان نوێ دەکەنەوە و دیسانەوە سەرهەڵدەدەنەوە و پلانی نوێ بۆخۆیان دیاری دەکەن. دیموکراسی خوازیاری ئەوەیە کە ئەو کارە گشتی بکرێتەوە. لە یەکەمین فۆرمۆلبەندی ئێمەدا، ئەو پانتاییەی کە گشتگیربوونەوەی ڕووداوەکان تێیدا بەڕێوە دەچن، و هەڵوێستەکان تێیدا شکڵ دەگرن، پتەو دەبن و خوێندنەوەی دووبارەیان بۆ دەکرێت، کۆمەڵگای مەدەنییە.

ئێستا دەتوانین باسی جیاوازیی نێوان کۆمەڵگا و کۆمەڵگای مەدەنی بکەین. کۆمەڵگا بریتییە لە سەرجەم ئەو ڕەفتارە کۆمەڵایەتیانە ــ گشتی بن یان تایبەتی ــ کە دەرخەری هەبوونی کۆمەڵێکن. کۆمەڵگای مەدەنی پانتایی گشتیی کۆمەڵگایە. جێگای ئەو پرۆسانەیە کە ئەزموونی تاك و کۆمەڵەکان، و دەربڕینی ئەو ئەزموونانە لە قسەوباس و گوتوبێژدا، لە دانپێدانان و نارەزامەندیەکاندا، نێوبەندی دەکرێت. لە بەرنامەی دووهەمی ئێمەدا، کۆمەڵگای مەدەنی ڕووبەری نێوبەندی نێوان بواری تایبەتی و گشتی، یان بە واتایەکی دیکە، بواری نێوان ئەزموونە تاکە کەسیەکان و دەربڕینی کۆمەڵایەتییە.

بەڵێ، ئەو پرۆسانەی کە ڕووداوێك دێننە بەر باس و لێکۆڵینەوە و لە ڕەفتارەکانی دەکۆڵنەوە ــ کاتێك کە ئەو ڕووداوە دەکەوێتە بەر تیۆریە دژبەیەکەکانەوە، کاتێك کە داوای ئەوە دەکرێت کارێکی لەبارەوە بکرێت یان وازی لێ بهێنرێت ــ پرۆسەگەلی سیاسین. دەکرێ سیاسەت وەك ڕەفتارێك پێناسە بکرێت کە کاری ئەزموونی دەکاتە کارێکی تیۆر. کۆمەڵگای مەدەنی وەك ڕووبەری نێوبەندی نێوان بواری تایبەتی و گشتیی جێگاوشوێنی سیاسەت باسکراوە.

# کۆمەڵگای مەدەنی وەك شوێنێکی گشتی

# (۲)

## تایبەتی و گشتی:

دەزانین کە تایبەتمەندیی کۆمەڵگای مەدەنی وەك چوارچێوەیەکی گشتی کێشەی لەسەرە. لە تیۆری سیاسیدا بەردەوام کۆمەڵگای مەدەنی وەك شوێنێك ناوبراوە کە تێیدا تاکەکان بەشوێن بەرژەوەندییە تایبەتیەکانی خۆیانەوەن. لە ئاکامدا کۆمەڵگای مەدەنی وەك بوارێکی تایبەتی هەژمار کراوە، بەپێچەوانەی دەوڵەت کە لە زاتی خۆیدا بە شوێنێکی گشتی دادەنرێت. بەڵام لیبراڵیزم، کە دوانێتی بوونی بواری تایبەتی و گشتی لەوەوە هاتووە، بە کەلەبەرێکی واتایی دیاری دەکرێت. لە هەندێك لە رەنگدانەوەکانیدا، دابەشکردنی بواری تایبەتی و گشتی لە کۆمەڵگای مەدەنیدا بەڕێوە دەچێت. ئەوە خێزانە کە تایبەتییە و هەموو شتێکی دیکە و لەوانە کۆمەڵگای مەدەنی، شتێکی گشتییە. خێزان بۆیە تایبەتیە کە دەستڕاگەیشتن بە شوێنی فیزیکی و سۆزداریی خێزان سنووردارە و زانیاریەکانیش سەبارەت بە پرسەکانی خێزان هەر بە هەمان رادە سنووردارن. بە پێچەوانەی ئەوە، کۆمەڵگای مەدەنی کە کاری عاقڵانەی بەرامبەری تێدا دەکرێ، بۆیە گشتییە چونکە بە پێی بنەما لە بەر دەستی هەمووان دایە، بۆ نموونە بە دژواری دەکرێ تاکەکان لە ئاڵوویری بازاڕ یان لە بەشداریی لە چاوپێکەوتنێکی گشتیدا مەنع بکرێن، و هەموو کەس مافی ئەوەی هەیە کە دەستی بەو زانیاریانە رابگات کە بۆ هەمووان سەرنجڕاکێشن.

لە لێکدانەوەیەکی دیکەی لیبراڵیزمدا، کۆمەڵگای مەدەنی قەڵەمڕەوی بەشێکی کەم و تایبەتییە، و هەر بۆیەش وەك قەڵەمڕەوی تایبەتی هەژمار دەکرێت. کەواتە ئەوە دەوڵەتە کە گشتییە. ئەو لێکدانەوە هیگڵیە لە سەر تایبەتی بوونی کۆمەڵگای مەدەنی بە لێکدانەوەکانی

دیکەوە کامڵ کراوە. لە تیۆری لیبراڵیدا، کۆمەڵگای مەدەنی شوێنی تاکی خاوەن مافە و لە زومرەی ئەو مافانە، یەکێکیان مافی تایبەتی بوونە واتە مافی ئەوەی کەسی دیکە دەست لە کاروبارەکانت وەرنەدات. ئەو مافە تایبەتیە بە شێوەیەکی لۆژیکی چالاکیی تاکەکان بۆ هاوڕێیەتی لەگەڵ یەکتریش دەگرێتەوە. لە ئاکامدا سنووری ڕۆڵی دەوڵەت دیاری دەکرێت، دەوڵەت ناتوانێت دەست لەو کاروبارە وەربدات مەگەر لەو بوارانەدا کە لە پێشدا دیاری کراون. لەو لێکدانەوەیەدا، ئەوە دەوڵەتە کە گشتییە و کۆمەڵگای مەدەنی کە خێزانیش دەگرێتەوە، تایبەتییە.

پێشهاتەکان کاتێك ئاڵۆزتر دەبن کە وەبیرمان بێتەوە شارەزایانی ئابووریی سیاسیی کلاسیك لەو دڵنیا بوون ــ وە ئەوە دڵنیاییەکە کە زۆربەی لیبراڵەکان تێیدا بەشداربوون ــ کە بە شوێن پێگرتنی بەرژەوەندییە تایبەتییەکانی تاك، دەکرێ دەستمان بە خێرێکی هاوبەش/گشتیی کۆمەڵ رابگات. کەواتە ئەگەر کۆمەڵگای مەدەنی چوارچێوەی پێداویستیەکان و بەرژەوەندییە تایبەتیەکانە، چوارچێوەیەکیشە کە تێیدا بەرژەوەندی گشتی دەتوانێ وەدی بێت. لە تیۆر لیبراڵەکانی دواتر و لەوانە دۆ تۆکڤیل، کۆمەڵگای مەدەنی شوێنێکە کە تاکەکان بۆ قسەوباس لەمەڕ مەسایلی سیاسی و کۆمەڵایەتی تێیدا کۆدەبنەوە ئەو تێڕامانە دوو ئاکامی هەیە. یەکێکیان ئەوەیە کە تاکی پەراوێزخراو بە کۆمەڵگا و گەلاڵەکانیەوە پەیوەست دەبێت. دووهەم ئەوەیە کە لەو شورایانە گوتارێکی گشتی لێدەکەوێتەوە کە ململانێ لەگەڵ پاوانکردنی دەسەلات لە لایەن دەوڵەتەوە دەکات. بۆیە ــ لێرەدایە کە دوانێتیەکەی بەرنامەی لیبراڵی دەردەکەوێت ــ لە کاتێکدا کە دەوڵەت هەمیشە بوارێکی گشتییە و خێزان هەمیشە تایبەتییە، پلەوپایەی کۆمەڵگای مەدەنی بە دیاری نەکراوی ماوەتەوە. بە پێی ئەوەی لە سەر چ پرسیەك جەخت دەکرێتەوە، کۆمەڵگای مەدەنی بە شتێکی تایبەتی یان گشتی، و یان لەوانەیە بە هەردوکیشیان لە قەڵەم بدرێت.[٤٧]

---

٤٧ - لە ڕاستیدا تەنانەت کاتێك کە ئەو مانایە بۆ دەرخستنی قەڵەمڕەوی بەرژەوەندی و چالاکیی تایبەتیەکان بەکارهاتووە، لایەنی گشتی کۆمەڵگای مەدەنی زەق دەکرێتەوە. بۆ نموونە لە لای لیبراڵەکان کۆمەڵگای مەدەنی قەڵەمڕەوی تاکی خاوەن مافە. لە دوو بواریشەوە تایبەتییە: یەکەم، پێگەی بەرژەوەندییە تایبەتیەکانی تاکە، و دووهەم، مەبەست ئەوەیە کە لە ڕێگای پێش بینی کردنی دەستوورەوە تایبەتی بوونی ئەو بوارە لە بەرامبەر دەستێوەردانەکانی دەوڵەتدا بپارێزرێت. بەڵام لە هەمانکاتدا گشتییە، چونکە لێرەدایە کە تاکەکان لە ئەنجومەنەکاندا کۆ دەبنەوە بۆ ئەوەی گوتارێکی سیاسی لەمەڕ سروشتی دەسەلاتی دەوڵەت پێك

بەهۆی هێرشی بەردەوام و بە کـەمڕەنگ بوونـەوەی بـیری دوانـێتی یـان دوو جەمسـەری بوونی[48] کاروباری گشتی و تایبەتی، پلەوپایەی کۆمەڵگای مەدەنی روونتر بووەتەوە. بۆ نموونە فێمێنیستەکان باسی ئەوەیان کردوە کە دابەزینی خێزان بۆ ئاستێکی تایبـەتی، هـەڵاواردنی جنسیی ناسیاسی کردۆتەوە و ژنانی لە دەسـەڵات بێبەری کردوە. ئەم لێکدانـەوە فێمێنیسـتیە بە باشـی لەبەرچـاو نـەگرتنی سیسـتەمی بـاوك مەزنانـەی کۆمـەڵگای لـە تیـۆر لیبراڵیـدا دەرخستووە. لە راستیدا، لە جیاوازیەکانی نێوان کاروباری گشتی و تایبەتی کۆڵیوەتـەوە. لـە تیۆری لیبراڵیدا، خێزان بۆیە تایبەتیە چونکە لە سەر ئەو باوەڕەن کە لـە بـواری چـۆنایەتیەوە پشت ئەستوور بە کۆمەڵێك بـەهای جیـاوازی وەك سـۆزداری، نزیکایـەتی و وەفـاداریی بـیّ تێڕامان و بیرکردنەوەیە، و ئەوە جیاوازیـەکی قوڵە لە گـەڵ بـواری عـەقڵانی کـە پشـتی بـە بەرژەوەندیی تاك و خۆویستانەی گشتی بەستووە. لیبراڵەکان باسی ئەوە دەکەن کە خێزان وەك جیهانی سۆز و هەستەکان دەبیّ هەر بەو هۆیـە لـە بەرامبـەر هەرچەشـنە دەسـتێوەردانێکی دەرەکی بپارێزرێت و داکۆکی لـیّ بکرێـت. فێمێنیسـتەکان بـۆ رەخنـەگرتن لـەو هەڵوێسـتە بەڵگەیەکی بـەهێزیان هەیـە و ئـەویش ئەوەیـە کـە ئـەوە هـەر هـەمان پێکهێنـانی خێـزان

---

بێنن. بە بڕوای مارکس کۆمەڵگای مەدەنی لەگەڵ قەڵەمڕەوی پەیوەندییە ئابووریەکان کە سیستەمی سەرمایەداری تایبەتی کردۆتەوە، هەر وەك یەکن. بەڵام مشتومڕی سیاسی لەمەڕ خوخدەی ئابووری و دەوڵەتی سەرمایەداری ئەو قەڵەمڕەوە گشتی دەکاتەوە، و بە ئاسانی بە قەڵەمڕەوی خەباتی چینایەتی دەزانێت. بە بڕوای گرامشی کۆمەڵگای مەدەنی بوارێکە کە پەیوەندیە هێژمۆنیەکان لە مەڵبەندی دامەزراوە و رەفتارە تایبەتیەکانی وەك خێزان، کەنیسە، دامەزراوە پەروەردەیی و کولتووریەکاندا بەرهەم دێن و دەپارێزرێن. بەڵام ئەو دامەزراوانە لەو رووەوە دەبنە گشتی کە بنەمایەك بۆ دەربڕینی هێژمۆنی دەوڵەت دابین دەکەن. مانای هێژمۆنی گرامشی، بواری تایبەتی و گشتی ئاوێتەی یەکتری دەکات، چونکە ئەو پێکهاتانەی کە شمولی دەکەن بە سەر هەموو لایەنەکانی ژیاندا زاڵن.

٤٨ - بۆ نموونە بۆبیۆ باسی ئەوە دەکات کە تایبەتی و گشتی یەکێکە لە دوالیزمە گەورەکان لە بواری لێکۆڵینەوە لە زانستی کۆمەڵایەتی و مێژوویی دا. لە درێژەدا دەڵێت کاتێك ئێمە لەگەڵ جیاوازییەك بەرەوڕوو دەبینەوە کە جیهان بە سەر دوو بواری جیاوازدا دابەش دەکات، دەتوانین باسی "دوالیزمی گەورە" بکەین. ئەوەیکە سەر بە لایەکیانە ناتوانیّ سەر بەوەی دیکەیان بیّ، ئەو بوارانە سەرجەم دیاردەکان دادەپۆشن، سنورەکانی یەکێکیان بەوی دیکە کۆتایی پێدێت، و هەموو دابەشکردنەکانی دیکە لە چاو ئەم دابەشکردنە شتێکی لاوەکین (١٥، ل٢-١).

بەشێوەیەکی تایبەتی و هەر هەمان خۆڕێکخستنی ژن لـە گـەڵ خێزانیـە کـە گوێڕایـەڵبوونی ژنانی کردوەتە کارێکی ناسیاسی. لێکدانەوەی فێمێنیستی لـە سـەر سـێ لایـەنی دوالیزمـی نێوان کاروباری گشتی و تایبەتی چەق دەبەستێت کە دەکـرێ بـەکورتی بـەم شـێوەیە وەسـف بکرێت.

یەکەم، ئەوان باسی ئەوە دەکەن کە خێزان نەتەنیا لە کۆمەڵگا جیا نییـە و بـە کۆمـەڵێك بـەهای جیاواز دیـاری ناکرێـت، بـەڵکو جیهـانێکی بچـوکی کۆمەڵگایـە، جێگاوشـوێنێکە بـۆ سـەرلەنوێ بەرهەمهێنانەوەی هێزی کار، داواکاریی کاڵاکـان و خزمەتگوزاریـەکان دابـین دەکـات و بەشـێوەیەکی سیمبولیك بەهاکانی کۆمەڵگا بەرهەم دێنێتەوە و لـە رێگـای کۆمەڵایـەتی کردنـەوەی لاوان نەریتـە کلتوریەکان دەگوازێتەوە. خێزان ئەو جێگایە نییە کـە لـە سـەر بنـەمای سـۆزداری پەیوەندییـەکانی بگوازێتەوە، بەڵکو جێگاوشوێنی لێپرسینەوە خۆپەرستیەکان، رێگاچـارەکان و ئامرازەکـان و جێگـای ئاڵووێری بەگشتی چەوسێنەرانەی خزمەتگوزاریەکان، کار، نەختینەیی و دامرکاندنەوەی جنسـییە، بـا لەوەش گەڕێین کـە جێگـای ململانـێ و توندوتیژیشـە (٥، ل٣٧). خێـزان وەك جیهـانێکی بچـوکی کۆمەڵگا رەنگدانەوەی پەیوەندییە ملکەچیەکان و زاڵـەکانی کۆمەڵگایـە لـە شـێوازێکی نایەکسـانی نێوان دوو جنس دا. ئەوەی ئەو بوارە بە بوارێکی تایبـەتی دابنرێـت و بکەوێتـە دەرەوەی قەڵـەمڕەوی سەرنجی کۆمەڵایەتی یان دەستێوەردانی گشتییەوە، بەهێزکردنی ئەو زوڵم و زۆرانەیە کە لـەو شـوێنەدا بەڕێوە دەچێت. بەواتایەکی دیکە ناسیاسی کردنەوەی مەڵبەندێکی تەواوە کە چـونکە ئێسـتا زوڵـم و زۆر داسەپاوە دەبێ لە گەمارۆی ویستە هاوبەشەکانی هەموو خەڵکەکە دابێت.

دووهەم، فێمێنیسـتەکان لـە سـەر ئـەو بـاوەڕەن کـە مـافی تایبـەتی بـوون، دەسـەڵاتی سەرپەرشتی نێرینەی خێزان زیاد دەکات، چونکە لە بواری مێژووییـەوە ئـەوە پیـاو بـووە کـە خاوەنی مافی بواری گشتی بووە:

مافەکانی ئەم کەسانە بـۆ پـارێزراوبوون لـە دەسـتێوەردانی دەوڵـەت یـان کەنیسـە یـان پەیجووربوونی دەروجیرانـەکان، بـە مانـای ئـەو مافـەش بـوو کـە ئەنـدامانی دیکـەی بـوارە تایبەتیەکەی خۆیان کە لە ژێر کۆنترۆڵی ئەودا بوون، دەست لە کاروبارەکـەی وەرنـەدەن. ئـەو ئەندامانەی کە بەهۆی تەمەن، یان جنس، یان بارودۆخی خزمەتگوزاری، واپێدەچـوو کـە بـە حەق دەبێ لە ژێر کۆنترۆڵی ئەوان دابن و لە چوارچێوەی چـالاکییە تایبەتیـەکانی ئەوانـدابن. (١٤٤، ل٧٠).

سێیەم، تەنانەت ئەو کاتەش کە ژنان بە شێوەیەکی فەرمی مافی دەنگدانیان بەدەست هێناوە، نموونەکانی ناو خێزان، بێبەشیەکانی ژنانیان لە بواری گشتیدا بەهێز کردوە. پێناسەی ژنان لەگەڵ جیهانی هەستەکان و بیرلێنەکراوەکانی خێزان و پێناسەی پیاوانیش لەگەڵ جیهانی عەقلانی و بیرلێکراوەی گشتی هەڵسەنگێندراوە. لە ئاکامدا ژن بە عەقڵ کورت، سۆزدار و هەڵخڕێنەر دەزانن. تەنانەت ئەگەر ئەو لە بواری گشتیشدا بەشدار بێت، دابونەریتە جنسیە زاڵەکان بەر بەوە دەگرن کە وەك بوونەوەرێکی عەقلانی بەشداری بکات. کەواتە جیهانی خێزانیی تایبەتی بەرهەمهێنراوی خودی ژنە، ئەو راستییەی کە بۆ ئەو ژنانەی کە توانیویانە بچنە نێو بواری گشتییەوە، ڕێنوێنیی بەرچاوی هەبووە.

ئەوەش بە نۆرەی خۆی بۆ تێگەیشتنێکی دیموکراتی لە چوارچێوەی گشتی ڕێنوێنی گرنگی هەیە. بەشداری نەکردن یان بەشدارییەکی بەرتەسکی بەشێکی تەواوی خەڵك لە بواری گشتیدا، پێویستی بە بەرتەسك بوونەوەی بواری گشتییە. دیموکراسی، یان مافەکان، یان دەسەلاَتداربوون لە بواری گشتیدا، ئەگەر بەشێکی تەواوی خەڵك هەروا لە بواری تایبەتیدا زوڵم و زۆریان لێبکرێت، قورساییەکی ئەوتۆی نابێت. کەوابوو بۆ فێمێنیستەکان قەڵەمڕەوی گشتی و تایبەتی بەوجۆرەی کە بەرنامەی لیبراڵی کلاسیك پێشنیاری کردوە، جیاواز و یەکسان نین. گوێڕایەڵیی ژنان لە جیهانی خێزانییدا لە جیهانی گشتیشدا سەرلەنوێ بەرهەم دێتەوە. ئەو ژنەی کە لە ژیانی تایبەتیدا گوێڕایەڵی پێکهاتە باوك مەزنەکانی دەسەلاَتە، بە پێی لێکدانەوە ناتوانێت وەك هاوولاَتییێك بە مافی یەکسانەوە لە بواری گشتی دیموکراتیدا بەشداریی هەبێت. گوێڕایەڵیی ئەو لە نێو خێزاندا رەنگدانەوەی دەبێت لە بێبەشیی ئەو لە قەڵەمڕەوی گشتیدا یان لە گوێڕایەڵبوونی لە نێو ئەو قەڵەمڕەوەدا.

هەر وەك چۆن ژنێك لە پرۆسەکانی بڕیاردانی نێو خێزانەکەیدا گوێی بۆ ناگیرێت، جا چ ئەو بڕیارانە تایبەت بە بواری ماددی بن یان تایبەت بە زاڵبون بە سەر جەستەی خۆیدا بێت، ئاوهاش ناتوانێت بەشێوەیەکی یەکسان، لە گوتوبێژی گشتیدا بەشداری بکات. بنەمای جیایی بەلاَم یەکسانی پێشێل کراوە، چونکە ناتوانیٚ لەوە تێبگات کە ئەو کەسەی کە لە بواری تایبەتیدا نە یەکسانە و نە خودموختار، لە بواری گشتیشدا ناتوانێت یەکسان یان خودموختار بێت. پرسیەکی جێگای باس سەبارەت بە لیبراڵیزم و ئەو تێگەیشتنەی کە لە مەڕ بواری تایبەتی و گشتی بەدەستەوەی دەدات ئەوەیە کە نەزمی باوك مەزنانەی کۆمەڵگا و بێدەسەلاَتیی ژنانیش کە سەرچاوەکەی تێیدایە، لە پێش چاو ناگرێت. ئەو پێکهاتەیە لە

کردەوەدا خزمەت بە بەهێزکردنی پەیوەندیی دەسەڵاتی نێوان دوو جنس دەکات. پیاوان بە سەر هەردووك بوارەکەدا زاڵن، و ژنانیش لە هەردووك بوارەکەدا ژێردەستەن. ئەگەر ئاوا بێت ئەوکات ئەوانە دوو قەڵەمڕەوی جیاواز نین کە هەرکامێکیان لۆژیکی خۆی هەبێت، بەڵکو بە پێی پێویست یەکێکیان ڕەنگدانەوەی لۆژیکی ئەوی تریانە. پیتمەن دەنووسێت "لێکدانەوەی بنەڕەتیی فێمێنیستەکان ئەوەیە کە تیۆریە "جیا بەڵام یەکسان"ەکان و تاکگەرایی و یەکسانیخوازیی ڕواڵەتیی تیۆری لیبراڵی، ڕاستیەکانی باوك مەزنانەی پێکهاتەیەکی کۆمەڵایەتیی پشت ئەستوور بە نایەکسانی و زاڵبوونی پیاوان بەسەر ژناندا، دەشارێتەوە (١٤٧، ل٢٨٣).

هەربۆیە ڕەخنە فێمێنیستیەکان باسی ئەوە دەکەن کە چاوخشاندنێکی دووبارە بەر سەر پیرۆزیی قەڵەمڕەوی خێزان (تایبەتی)دا پێویستە، چونکە ستەمی جنسی مافی یەکسانی و دادپەروەری پێشێل دەکات کە لە بنەماکانی پێکهێنەری کۆمەڵگایەکی ئەمڕۆیین. دووەم، ئەگەر خێزان شوێنی ململانێ و توندوتیژییە، کەوابوو دەبێ بکەوێتە بەر سەرنج و دەستێوەردانی گشتییەوە. ناتوانێ لە بەر ئەو هۆیە کە تایبەتییە و کەوابوو دەبێ حورمەتی بپارێزرێت، لە قەڵەمڕەوی قسەوباس و گوتوبێژی گشتی دەرهاوێژرێت.

تیۆری مارکسیستی، لە ڕەخنەیەکی تەواوکەردا کە لە ڕوانگەیەکی جیاوازەوە باسکراوە، دابەشکردنی نێوان بواری گشتی و تایبەتی ڕەتدەکاتەوە. جیاوازی و نەگونجانی نێوان ڕوانگەی لیبراڵی و مارکسیستی لە سەر نەبوونی ڕێککەوتنێکی بنەڕەتییە لە مەڕ پەیوەندیی نێوان تاك و کۆمەڵگا. ڕوانگەی لیبراڵی لە سەر بنەمای جەمسەربەندی نێوان تاك و کۆمەڵگادا، پێیوایە کە تاك کۆمەڵێك مافی هەیە کە لە بواری زەمەنیەوە لە پێشەوەی کۆمەڵگا و دەوڵەتەوەیە و کەوابوو دەبێ ئەو مافەی نەتەنیا لە بەرامبەر دەسەڵاتی دەوڵەت بەڵکو دەبێ لە بەرامبەر دەسەڵاتی زۆرینەشدا بپارێزرێت. مافی تایبەتی بوون، پارێزەرێکە هەم لە بەرامبەر دەوڵەتدا و هەم لە بەرامبەر کۆمەڵگادا. بەڵام مارکسیستەکان چەمکی ئەبستراکتی مرۆڤی جیا لە کۆمەڵگا ڕەتدەکەنەوە. لە تیۆری مارکسیستیدا تاك لە لایەن کۆمەڵگاوە شکڵ دەگرێت و بایەخە بنەڕەتیەکانی خۆی لە کۆمەڵگاوە وەردەگرێت. مارکس باسی ئەوەی دەکرد ئەو تاکەی کە لە دەرەوەی کۆمەڵگا بار بێت، بە واتایەك نابێتە مرۆڤێك کە شتەکان لێك جیا بکاتەوە. کەوابوو هیچ شتێکی تایبەتی بە مانای لە پێشەوەبوونی کۆمەڵگا، یان لە دەرەوەی کۆمەڵگا و هەروەها لە دەرەوەی بازنەی ستەمی کۆمەڵایەتی بوون، بوونی نییە.

تیۆری مارکسیستی ڕەهەندێکی زۆر تازەی بە چەمکی تایبەتی بوونەوە زیاد کردوە. مارکسیستەکان باسی ئەوە دەکەن کە ئەو چەمکە ئاکامی گەشەی خاوەندارێتی بورژوازییە. مافی تایبەتی بوون ــ تووش نەبوون بە دەستێوەردانی ئەوانیتر ــ لە بنەڕەتدا دیارییەکە کە بە داراکان بەخشراوە. لیبراڵەکان بە ڕوانینێکی گشتی بۆ دەوڵەت و ڕوانینێکی تایبەتی بۆ کۆمەڵگای مەدەنی، سیاسەت لە پەیوەندییەکانی دەسەڵات لە ئابووری و کۆمەڵگادا دەسڕنەوە. پیرۆزیی بواری تایبەتی وەك بواری مافە نایەکسانەکانی خاوەندارێتی، پەیوەندییەکانی زاڵبوون و ململانێ لە نێو ئەو چوارچێوەیەدا سەرلەنوێ بەرهەم دێنێتەوە. بەخشینی پلەوپایەی تایبەتی بە کۆمەڵگای مەدەنی، بەکردەوە دیارییەکە کە پێشکەشی چینە باڵادەستەکان دەکرێت بۆ ئەوەی بە شێوەی تایبەتی ستەمی خۆیان داسەپێنن. لە ئاکامدا هیچ شتێکی تایبەتی، بەو مانایە کە پەیوەندیی بە کۆمەڵگاوە نەبێت و لە نێو کۆمەڵگاشدا کاریگەری لە سەر کەسانی دیکە دانەنێت، بوونی نییە. ئەگەر هەموو جێگاوشوێنەکانی کاری بەرامبەری مرۆیی لەوانە خێزان لە لایەن ستەمە کۆمەڵایەتییەکانەوە مەرجدار و دیاری کرابێت، کەوابوو دەبێ بە شێوەیەکی هەتاهەتایی لێپرسینەوەی لێ بکرێت. گرامشی ئەو تەوەرەی بەهێزتر لە هەمووان باس کردوە و باسی ئەوەی کردوە، ئەوەی تاکەکان خۆیان لە تایبەتی ترین چالاکییەکانیشدا دەبیننەوە، هەر لە ڕێگای ئەو گەلاڵە مەزنخوازانەیەی دەوڵەتی سەرمایەدارییەوە شکڵ دەگرێت.

بەدوای خۆتێوەردانی گرامشی و تیۆری فۆکۆ، پیرۆزیی کەشی تایبەتی ــ جا چ بگەڕێتەوە سەر کۆمەڵگای مەدەنی یان بگەڕێتەوە سەر جیهانی خێزانیی ــ و هاوکات لەگەڵ ئەویش جیاوازیی نێوان کاروباری تایبەتی و گشتی، خوێندنەوەیەکی دووبارەی بۆ کرا. ئەو ئەندێشەیە کە دەڵێت تایبەتی بوونەوە بریتییە لە مافی ئەو دامەزراوە یان ڕەفتارە کۆمەڵایەتییە لەمەڕ ئەوەی لە بەرامبەر دەستێوەردانی دەوڵەت یان کۆمەڵدا بپارێزرێت، ڕەتکراوەتەوە. ئەگەر هەموو شوێنەکانی کاری بەرامبەری کۆمەڵایەتی، خێزان، دامەزراوە فێرکارییەکان، ئابووری یان شورا سیاسییەکان، شوێنێکن بۆ دەسەڵات و باڵادەستی، کەوابوو ئەو شوێنانە پێویستە لە ڕێگای نێوبەندی بەکۆمەڵ و گوتاری گشتییەوە گۆڕانکاریان بەسەر بێت. بەو مانایە کاری کەسێکی سیاسییە. ئەوە بە واتای ئەوەشە کە دەبێ بە دوانێتی تایبەتی ــ گشتی دا بچینەوە (نەك ئەوەی ڕەتی بکەینەوە) و وەك پرۆسەگەلێك چاوی لێبکەین نەك وەك وتەزایەکی نەگۆڕ یان چەقبەستوو.

دەکرێ بواری تایبەتی و گشتی نەك بە شێوەی دوالیستی و دووجەمسەری، بەڵکو وەك ئەو خاڵە سەقامنەگرتوانە سەیر بکرێن کە لە درێژەی یەك رەوتدان. کۆمەڵگای مەدەنی وەك شوێنی نێوبەندییەکان (هەروەك لە بەرنامەی دووهەمی ئێمە بۆ کۆمەڵگای مەدەنی بەرچاو دەکەوێت) کەشێك دەخولقێنێت کە تێیدا جوڵەیەکی نەگۆڕ لە نێوان بواری تایبەتی و گشتیدا سەرهەڵدەدات. بیری جولان سێ پێویستیی هەیە: یەکەم ئەوەی دەرەجەی تایبەتی بوون و گشتی بوون، رێژەییە. بۆ نموونە بەشداریی تاك لە ژیانی بەکۆمەڵدا و لە چاو جیهانی خێزانیی گشتییە بەڵام ئەگەر لە گەڵ کۆمەڵێکی بەرینتر هەڵسەنگێندرێت، تایبەتییە.

دووهەم، دەرەجەی تایبەتی بوون، واتە بوون لە دەرەوەی نیگای گشتییەوە، بابەتی رێککەوتنێکی بەکۆمەڵە. ئەوەی ئەمڕۆکە وەك تەوەرێکی تایبەتی، یانی لە بواری زانیاری و دەستڕاگەیشتن و پاوانکراویەوە، هەژمار دەکرێت، لەوانەیە سبەینێ ببێتە شتێکی گشتی هەروەك چۆن هێندێك لە پێشهاتەکانی وەك پەیوەندیی نێوان دوو جنس، پەیوەندییەکانی نێو خێزان، بارهێنانی منداڵ، فۆرمەکان و ململانێ جنسییەکان، لە قسەوباسی گشتیدا جێیان دەکرێتەوە.

سێیەم، قسەوباس و گوتوبێژی گشتی، پێکهاتنی بیروباوەڕ و یاسا، یارمەتی بە پێداچوونەوەی کاروباری تایبەتی دەکات. کەوابوو کۆمەڵگای مەدەنی وەك شوێنێکی گشتی لە نێوان بواری تایبەتی و گشتیدا نێوبەندی دەکات، بەو مانایە کە پێشهاتە تایبەتیەکان دەباتە نێو بواری گشتییەوە.

کۆمەڵگای مەدەنی وەك شوێنێکی گشتی بە واتایەکی زۆر پێویست، لە بواری فۆرم دانانەوە گرنگی هەیە. یەکەم ئەوەی هەموو هاوولاتییێك مافی بەشداریی لەو بڕیارانەیدا هەیە کە چوارچێوە و بواری ژیانی خودی ئەو دابین دەکەن، بەڵام ئەگەر هاوولاتیان خۆیان لە چوارچێوە تایبەتیەکاندا گەمارۆ بدەن، یان بە پێچەوانەوە بە بێ تێفکرین و بیرکردنەوە پەیڕەوی لەدەوڵەت بکەن، ئەو رەهەندە دیموکراسییە بوونی نابێت. نابێ ئەوەمان لە یاد بچێت کە کۆمەڵگای مەدەنی لە لایەکەوە تەنیشتی بە تەنیشتی بواری تایبەتیەوەیە و لە لایەکی دیکەشەوە بە دەوڵەتەوەیە. پاشەکشەی تاك بۆ شوێنی یەکەم، یان خۆبەدەستەوەدانی تاك لە بەرامبەر دەوڵەتدا، بە بێ نێوبەندی سیاسیانەی کۆمەڵگای مەدەنی زۆر بە زیانی دیموکراسییە. دیموکراسیی بەشدارانە ناتوانێت بە بێ هەبوونی بواری گشتی وەك هۆکارێکی نێوبەندیی نێوان تاك و دەوڵەت بوونی هەبێت.

دووهەم ئەوەی تایبەتییە و ئەوەی گشتییە دەبێ بە ڕێککەوتنە کۆمەڵایەتییەکان لە کۆمەڵگای مەدەنیدا سنوورەکانیان دیاری بکرێت. ئەوە بەو مانایە نییە کە شتێك بەناوی شوێنی تایبەتی بوونی نییە، بە مانای پشتڕاستکردنەوەی ئەوەیە کە سەردەمانێك، بۆ پاریزراوبوونی ستەمی ژیانی ڕۆژانە لە بەرامبەر لێپرسینەوەی گشتیدا خزمەتی کردوە. تاك مافی تایبەتی بوونی هەیە بەڵام ئەوە بەو مانایە نییە کە دەتوانرێ تایبەتی بوون هەروەك بیانوویەك بۆ دوور بوون لە قەڵەمڕەوی سەرنجی گشتی بەکار بێت. کەوابوو کۆمەڵگای مەدەنی بەشێوەی "شانۆیەك کە دیالکتیکی نێوان بواری تایبەتی و بواری گشتی تێیدا ڕێکدەخرێت، سەر هەڵدەدات" (ژۆلین فروند، ١٦٥، ل٢٩٧).

# کۆمەڵگای مەدەنی وەك شوێنێکی گشتی

## (٣)

کۆمەڵگای مەدەنی وەك شوێنێکی گشتی بەواتایەکی دیکەش نێوبژیوانیکەرە. وەك شوێنی گوتاری گشتیی نێوان بیروڕای گشتی و دەوڵەت نێوبەندی دەکات. لێرەوە گوتارێکی گشتی لە سیاسەتی دانپێدانان و نارەزامەندی سەرهەڵدەدات کە دەیەوێ دەوڵەت وەك وەڵامدەرەوە و بەرپرس رابگرێت. بەرپرسیاربوونی دەوڵەت لە قۆناغی یەکەمدا پەیوەندیی بە توانایی کۆمەڵگای مەدەنی لە کۆنترۆڵکردنی دەوڵەت دایە. کۆمەڵگای مەدەنی " پرۆسەیەکە کە کۆمەڵگا لە رێگای ئەوەوە دەیەوێت کۆسپ بخاتە سەر رێگای گشتگیربوونەوەی دەوڵەت و لە بەرامبەر ئەودا کار بکات (٨، ل١١١). هۆکاری ئەوەی دەوڵەتە پاوانخوازەکان هەوڵدەدەن کە کۆمەڵگای مەدەنی پشوویر بکەن هەر ئەوەیە. ئەو دەوڵەتانە بە نابوتکردنی ئەو بوارە کاریگەریی سەرجەم ئەو شورا و تۆڕانە لەناو دەبەن کە باوەڕ تاکەکەسیەکان لە رێگای ئەوانەوە بەیان دەکرێن و لە دژی دەوڵەت رادەچن. کەوابوو هێشتنەوەی دەوڵەت وەك وەڵامدەرەوە، بەرپرسیارێتییەکە، کە تەنیا لە ئەستۆی دامەزراوە رواڵەتیەکانی حکومەت لەوانە یاسای بنەرەتی و دامەزراوە یاساییەکان نییە، بەڵکو بەشێك لە پێکهاتەی کۆمەڵایەتییە و جەوهەری کۆمەڵگای مەدەنییە.

ئەوە پێویستیی بەوە نییە کە تاك هەموو کاتێك لە رێگای قسەوباس و گوتوێژ و چالاکییە سیاسییەکانەوە، لەگەڵ دەوڵەت لە ململانێ دابێت. کۆمەڵگای مەدەنی ئیزنی زۆر کار بە تاکەکان دەدات، و زۆربەی ئەو چالاکییانە زۆر بەکەمی راستەوخۆ سیاسین ـــ بەو مانایە کە لە گەڵ دەسەڵاتی دەوڵەت بەرەوڕو بێتەوە. بەڵام بەواتایەکی بەرینتر سیاسییە، چونکە وەك هەندێك لە پێشهاتەکان زیاتر زەق دەبنەوە و دەبنە جێی قسەوباس و گوتوێژێکی بەربڵاو و دەوڵەت دەکەوێتە ژێر گوشارەوە. سیاسیی بوونی کۆمەڵگای مەدەنی کلیلی وەڵامدەرەوەبوونی دەوڵەتە. کنتین سکینر دەنوسێت "ئێمە هیچ روانگەیەکی راستمان لەمەڕ بەدەستەوە گرتنی راستەوخۆی پرۆسە

سیاسییەکان لە دەوڵەت نەتەوە (NATION-STATE)یەکی گەورەی سەردەم بەدەستەوە نییە. بەڵام... زۆربەی بوارەکانی ژیانی گشتییە کە کۆنترۆڵێکی راستەوخۆیان بەسەر کاروباری بەڕێوەبەرایەتیدا نییە و بەشداریی گشتیی زیاتر لەواندا دەتوانێت یاریدەدەری چاکسازیی وەڵامدەرەوەبوونی نوێنەرانی ئێمە بێت، تەنانەت ئەگەر لە رێگای ناچارکردنی ئەوان بە سەرنجی زیاتر بە باوەڕ و ئامانجە کردەنیەکانی زۆرینەی هاووڵاتیانیش بێت (١٧٠، ل٢٢٢).

کۆمەڵگای مەدەنی بوارێکی زۆر پێویستی ژیانی کۆمەڵایەتی و سیاسییە چونکە بوارێکی سیاسەتی رێکخراو و بەیان کراو وەك بەشێکی بنەرەتیی سیاسەتی دیموکراتی پێویستە. دووبارەناسینەوەی کۆمەڵگای مەدەنی وەك شوێنی سیاسەتی بەیان کراو بەمانای دووبارە ناسینەوەی شیاوبوونی سیاسیی ئەوە. لە راستیدا یەکسانیی کۆمەڵگای مەدەنی لەگەڵ سیاسەت، پەرە بە چەمکی سیاسەت دەدات. خوازراوبوونی چالاکیی و بەشداریی سیاسی لە دەرەوەی کەناڵە فەرمیەکانەوە دەوڵەت بە رەسمیەت دەناسێت. هەروەها شیاوبوونی کۆمەڵێکی سیاسی بە رەسمیەت دەناسێت کە لەو کەشە سیاسیانەدا پێك بێت کە بەواتای مافی بەشداریکردن، گشتی بێت. هەروەك چۆن جۆن دیویی (٣٨) دەریخستوە، بواری گشتی وەك کەرەستەی خاوی سیاسەت بەشێکی بنەڕەتیی دەوڵەتە. بێرنارد کریك ئەوەمان وەبیر دێنێتەوە کە "تایبەتمەندیی تاقانەی ژیانی سیاسی بە تەواوەتی لە گشتی بوونەوەی ئەودایە (٣٢، ل٢٠). کریك تایبەتمەندیی گشتی چالاکییەکان بە تایبەتمەندیی ناوەرۆکی کاری سیاسی دەزانێت.

باوەڕهێنان بە شیاوبوونی بواری گشتی لە باری سیاسییەوە، دیاردەیەکی تا رادەیەك تازەیە کە سەر بە سەردەمی نوێی سیاسییە. هەڵبەتە گوتاری سیاسەتی نوێ، گۆڕانکارییەکی سیاسیی گرنگی لە پەیوەندیی نێوان تاکەکان، گروپەکان و دەوڵەت بە ئەنجام گەیاند. یەکەم، لە جیهانی هاوچەرخدا کارەکانی حکومەت ژێردەستەی کۆنترۆڵی گشتییە لە لایەن دەسەڵاتەوەیە. دووهەم، کاری گشتی بە پێچەوانەی شێوازەکانی پێشووی حکومەت کە تێیدا سیاسەت و باڵادەستی وەك یەك شت وێنا دەکرا، لە دەرەوەی سنوورەکانی دەوڵەت سیاسی دەبێتەوە.

لە بواری مێژوویەوە... نیشانەی سەردەمێکە لە گۆڕانی قوڵی رواڵەتی دەوڵەت و گۆڕانی پەیوەندییەکان لە نێوان دەسەڵاتدار و ژێردەستەکان، سەردەمی لەدایکبوونی "جەماوەری سیاسی" بە واتای هابرماسی، کە تێیدا بواری گشتی لە رێگای دەستەی یاسادارێژەرەوە کاریگەرییەکی بنەڕەتی لە سەر حکومەت دادەنێت و ئەو کاریگەرییەش لەم رووەوە بەدەست دێت کە کردەوە زاڵە گشتییەکان، بەکردەوە گوێڕایەڵی بەڵێنی دیموکراتیی جەماوەر بووە (١٥، ل١٨).

ئەو گوتارە گشتییە لە بواری گوتاری مێژوویـیەوە بەخشینی دەسەڵات بە تاکە کە تا ئەو کـات لە دەرەوەی سیاسەت بوو. لـە دژی سـەرجەم هەوڵـەکانی دەسـەڵاتە سـەرەڕۆکانە کـە دەیانـەوێت دەسەڵات لە چوارچێوەیەکی دیـاریکراودا رابگـرن. یـورگن هابرمـاس، لـە یـەکێك لـە یەکـەمین بەرهەمەکانی خۆیدا کە لە ساڵی ١٩٨٩دا بە زمانی ئینگلیزی بڵاو بووەوە باسی ئەوە دەکـات کـە چوارچێوەی گشتی لە بریتانیا و فەرانسە بە چ شێوەیەك لە سەدەکانی حەڤـدە و هـەژدەدا لـە دژی دەوڵەتە سەرەڕۆکان سەری هەڵدا. ئەو بوارە گشتییە لە کۆمـەڵێکی بچـوك بـەڵام سـەروزمانداری بیروڕای گشتی پێکهات کە لە سالۆنەکان و کافەکاندا سـەری هەڵـدەدا، لـەو شـوێنەی کـە تاکـە تایبەتیەکان چاویان پێك دەکەوت و سەبارەت بە پرسـەکانی جێی پەسـندی هـەمووان قسەوباسـیان دەکـرد. سـەرهەڵدانی ئـەو بـوارە وەك قەڵـەمڕەوێکی هۆشـیاری و قسەوباسـی بەڵگەمەنـد بـە پێگەیانـدنی بـوارێکی تـەواوی فۆرمـەکان و دامـەزراوە کلتـوری و ئەدەبیـەکان، چـاپەمەنی و راگەیەنەرەکان، دەرفەتی بۆ رەخسا. کۆمەڵێك بیروباوەڕی خولقاند کە دەیتـوانی رەخنـە لەدەوڵـەت بگرێت و بۆ ئەوە بانگهێشتی بکات کە لە بەرامبـەر هاوولاتیانی وشیاردا وەڵامدەرەوە بێـت. ئـەوە کۆمەڵێکی بچوك بوو و بەگشتیش بیروباوەڕی بورژوایی بەسەریدا زاڵبوو، بەڵام فیکـری گوتـارێکی گشتی هێنایە ئاراوە و ئەو فیکرەی بنەڕەتی کردوە. بە واتایەکی دیکە چەمکی جەماوەری سیاسی هێنایە ئاراوە. هابرماس ئەوە قبوڵ دەکات کە سەرەڕای ئەو راسـتییەی کـە ئـەو کەشـە گشـتییە بەشوێن ئەودا لە بەر هۆکاری جۆراوجۆر سنووردار کرایەوە، گۆڕانێکی گرنگی لە ژیانی سیاسیدا بە سـەرەنجام گەیاند. PUBLICUM بـۆ ئاسـتێکی گشـتی و SUBJECTUM بـۆ سـوژەیەکی ئاوەزمەندانە گەشەی کرد، وەرگری رێساکان لە سەرەوەڕا بوو بە دژایەتیی بەرپرسـانی دەسـەڵاتدار" (٦٤، ل٢٦).

کۆمەڵگای مەدەنی وەك شانۆیەك کە دیالکتیکی نێوان تایبەتی و گشتی تێیدا رێکدەخرێت، و وەك شوێنی بیناکردنی گوتارێکی گشتی، بە دوو مانا شـوێنی نێوبەندییـە: شـوێنێکە کـە تێیـدا ویستە تایبەتیەکان دەبنە ویستی هەموو کۆمەڵەکە یان لانیکـەم زۆرینەیـەکی بەرچـاوی ئـەوان و شوێنێکە کە تێیدا هەوڵدەدرێت دەوڵەت بکەوێتە ژێر کاریگەریی گوتارێکی سیـاسـیی گشـتییەوە. بەڵام لێرەدا دەبێ دوو مەرج بێنینە ئاراوە:

یەکەم ئەوەی پەیوەندیی نێوان دەوڵەت و کۆمەڵگای مـەدەنی بـە هـیچ شـێوەیەك پەیوەنـدیی دژایەتییەکی سەرڕاست بەو مانایە نییە کە بوونـەوەرێکی هاوچەشـن لـە بەرامبـەر بوونـەوەرێکی هاوچەشنی دیکەدا بێت. هەروەك بایـار وەبیرمـان دێنێتـەوە "چـەمکی کۆمـەڵگای مـەدەنی...

پەیوەندییەكی دوولایەنە (و نەتەنیا جێگای مشتومڕ) ئالۆز، و بزێوە لە نێوان دەوڵەت و كۆمەڵگا دا" (٨، ل١١٧). لەو رووەوە دوولایەنەیە كە سیاسەتی كۆمەڵگای مەدەنی تەنیا شتێكی بەكۆمەڵ نییە، بەڵكو لە نێوان ئەو رەفتارانە كە دان بەدەسەڵاتی دەوڵەت دادەنێن و ئەوانەش كە ململانێی لەگەڵدا دەكەن، جەمسەربەندی بووەتەوە. توانایی كۆمەڵگای مەدەنی بۆ بەرەورووبوونەوە لەگەڵ دەوڵەت، پەیوەندیی بە هاوكێشەی دەسەڵاتەوە هەیە لە نێوان ئەوانەی كە پشتیوانیی لە دەوڵەت دەكەن و ئەوانەش كە دژایەتیی دەكەن.

دووهەم ئەوەی كۆمەڵگای مەدەنی وەك شوێنێكی گشتی، بەشێوەیەكی تایبەتی بوار، دامەزراوە، و لایەنەكانی پێداچوونەوە و هەڵوێستە سیاسییەكان بۆ تێكهەڵچوون لەگەڵ یەكتری دابین دەكات. خۆی بە تەنیایی پێكهاتەكەیان دیاری ناكات یان هەماهەنگی رێكخراوەیی یان واتاییان بۆ دابین ناكات. هەروەك پێشووتر باس كرا، چەمكی كۆمەڵگای مەدەنی خۆی لەخۆیدا خاوەنی هیچ فەزیلەتێكی سیاسی نییە. باسی بنكەیەك دەكات كە سیاسەت دەتوانێ لەوێدا خۆی دەربخات، بەهاكانی لە چەشنی ئازادی و مافەكان دابین دەكات كە سیاسەت دەتوانێ لەدەوری ئەو رێكبخرێت، و دامەزراوەكانی وەك ئەنجومەنە كۆمەڵایەتییەكان و دەستەی نوێنەرایەتی بۆ داكۆكی لەو مافانە دابین دەكات. بەڵام ئەو رەفتارانەی كە دەتوانێت كۆمەڵگای مەدەنی زاڵ بكات، دەرناخات. لە ئاكامدا كۆمەڵگای مەدەنی وەك بنكەیەك لە بەر هۆكاری جۆراوجۆر لە بەرامبەر دەست بەسەرداگرتنی لە لایەن چینە باڵادەستەكانەوە لاواز بووە.

سیاسەتی كۆمەڵگای مەدەنی بە پێی پێویست ئاگاداری بەرپرسیارێتییەكانی خۆی نییە لە بەرامبەر دەوڵەتدا. بۆ نموونە گرامشی باسی كۆمەڵگا مەدەنییە بەخسیرەكانی دەكرد، ئەو كۆمەڵگا مەدەنیانەی كە بوونەتە بەشی شوێنكەوتووی بەرنامەكانی هێژمۆنی دەوڵەت. نیشانەی ئەو رەفتارەكانی دەوڵەت و چینە باڵاكانیش نییە كە كاریگەرییان بە سەر ئەفراندن و پێكهێنانی وەها بوارێكەوە هەیە. لە بەشی دواتردا باسی ئەو رەفتارانە دەكەین.

# کۆمەڵگای مەدەنی وەك شوێنێکی گشتی

# (٤)

دەکرێ کۆمەڵگای مەدەنی لە مانایەکی دیکە و زۆر هەستیاریشدا بە شوێنێکی نێوبەند (وسیط) بزانرێت، ئەوە هەر ئەو مانایەیە کە گرامشی جەختی لە سەر کردۆتەوە. کۆمەڵگای مەدەنی بوارێکە کە تێیدا دەوڵەت بۆ پەروەردەکردنی بیروڕا و تێگەیشتنە گشتییەکان خۆی تێوەردەدات بۆ ئەوەی بتوانێت تەبایی و رەزامەندی بۆ رێبازەکانی خۆی بخولقێنێت. دەوڵەتی سەرمایەداری هێژمۆنی خۆی بە سەر کۆمەڵگای مەدەنیدا زاڵ دەکات و کۆمەڵگا مەدەنییەکانیش هەروەك دیتومانە، بوونە قەڵغانێك بۆ دەوڵەت نەك بۆ تاکەکان. بەڵام رێگاکانی دیکەش هەن کە دەوڵەتە سەرمایەدارییەکان لە رێگای ئەوانەوە دزە دەکەنە نێو کۆمەڵگای مەدەنییەوە، ئەو رێگایانە لەگەڵ پێکهێنانی خودی ئەو کەشە، بێبەشیەکان و خستنەپەراوێزی ئەوان، و پێکهێنانی شوناسی بەشداربوانەکەیەوە سەروکاری هەیە. وە ئەو رەهەندە هەستیارەیە کە کۆمەڵگای مەدەنی دەکاتە ئاوێتەیەکی نەگونجاو کە هەم پێشمەرجێکە بۆ دیموکراسی و هەم کۆسپێکیشە بۆ گەڵاڵەی دیموکراتی.

کۆمەڵگای مەدەنیمان وەك کەشێکی گشتی پێناسە کردوە، بەڵام کەشەکان لەوحێکی سپی نین، بەڵکو بەشێوەیەکی مێژوویی پێکهاتوون و بە شێوەیەکی کۆمەڵایەتیش بەرهەم هاتوون. بەم جۆرە گەمەکانی دەسەڵات و خەباتەکانی پێشوو لەواندا قەید کراوە. کۆمەڵگای مەدەنی وەك چوارچێوەی گشتیی قەڵەمرەوی سیاسەتە، بەڵام پرۆسە مێژووییەکانی وەها مەڵبەندێکیش خۆیان سیاسین. باس کردنی ئەو چەشنە پێکهێنەرانە، باسکردن لە پیلانەکان نییە، بەڵکو دیاریکردنی چوارچێوەیەکی تەواوی پێگە و کۆمەڵێکی ئاڵۆزی چالاکییەکانە کە لە زەمەنێکی دیاریکراودا مانایەکی تایبەتی بە باش لە قەڵەم دەدات. دەرککردنی ئەو رووداوانە پێویستیی بە چوارچێوەیەکی شیکاری هەیە، چوارچێوەیەك کە پەیوەستە بە گێڕانەوەی گەورەی گۆڕانکارییە پێکهاتەیی و کلتورییەکانی سەردەمی نوێ. ئەو گێڕانەوەیە تایبەت بە بیرمەندێك یان تەنانەت تایبەت بە نەریتێکیش نییە، بەڵکو دەکرێ لە سەرچاوەی

جۆراوجۆرەوە بەرهەم بێتەوە، لە هیگڵ، مارکس، ڤیبەر، هابرماس، کە روانگەی پڕبایەخیان لەمەڕ گۆڕانکارییە کلتوورییەکان هاوڕێ لەگەڵ گەلاڵەی قۆناغی نوێی سەرمایەداری بە ئێمە بەخشیوە. کەواتە دەکرێ بە هەڵقوڵاوی زۆرییەك لە نەریت و سەرچاوەکان، کە هەم لە چەقبەستنەوە سروشی وەرگرتوە و هەم لە بەرنامە تیۆرەکانەوە، دابنرێت. پێداچوونەوەی گۆڕانکاریی کلتوری پشت ئەستوور بە کۆمەڵێك بەرەوڕووبوونەوە و دژایەتی نێوان کۆمەڵگای سەرمایەداریی نوێ و کۆمەڵگا پێش مۆدێرنەکانی پێش سەرمایەدارین. ئەو دژایەتیانە پشتیان بە نموونەکان بەستووە، بەڵام هەروەك سەرجەم نموونەکان، یارمەتی ئێمە دەدەن بۆ ئەوەی دەرك بە دینامیزمی شێوەیەکی تایبەتیی کۆمەڵگا بکەین.

دروستبوونی ئەو دژایەتییە ئەو دەرفەتەمان بۆ دەڕەخسێنێت لەوە تێبگەین کە کۆمەڵگای مەدەنی لە بنەڕەتدا دیاردەیەکی نوێیە. مەمدنی دەنوسێت "چەمکی کۆمەڵگای مەدەنی کە لە ساڵنامەکانی تیۆری کۆمەڵایەتیی خۆرئاواییدا جێکەوتووە و رەگ و ریشەی لە دوالیزمێك دایە کە ناوەندێکە بۆ کۆمەڵناسیی نوێ و ئەو دوالیزمەش لە نێوان کۆمەڵ و کۆمەڵگا دایە... لەکاتێکدا کە پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان سروشتی و بەراییین، پەیوەندیی کۆمەڵگاکان بە چەشنێکی مێژوویی دەناسرێنەوە. باڵەخانەی دوای جەنگ دروستکراوی تیۆری مۆدێرنیتە لە سەر ئەو جیاوازییەی کۆمەڵگا و کۆمەڵ راوەستاوە و لە دەوری دوالیزمی نەریت و نوێبوونەوە بونیات نراوە" (١٠٩، ل٤٢). کۆمەڵگای مەدەنی ئاکامی کەلەبەری نێوان کاروباری ئابووری و کاروباری سیاسییە، دابەشکردنی نێوان کاروباری تایبەتی و کاروباری گشتی و هەڵکشانی دەوڵەتی نوێیە وەك سیستەمێکی دەسەڵاتی ناتایبەتی پشت ئەستوور بە رێساکان.

لە ئاکامی ئەو گۆڕانکاریانەدا، کەشێك دەخوڵقێت کە تاك تێیدا دەتوانێت ئەو نامانج و بەرژەوەندییانەی کە خۆی دیاری کردوون هاوڕێ لەگەڵ ئەوانیتر بەشوێنیان دا بگەڕێت. ئەو گۆڕانکاریانە بنەمایەکی زۆر تازە بۆ ژیانی سیاسی و کۆمەڵایەتی پێك دێنن. یەکێك لەو بنەمایانە کە بنەمای بوونناسیی لیبراڵیزم پێك دێنێت، بنەمای تاکی عەقڵانی مەزنخوازە کە بەشوێن دامرکاندنەوەی پێداویستییەکانی خۆیەوەیەتی. ئەو تاکەی کە لە کۆمەڵگا تەقلیدیەکاندا بە توندوتۆڵی لەنێو پێکهاتەکانی کۆمەڵدا پێچراوەتەوە و ژیانی رۆژانەشی یەخسیری بەڵێن و گوێڕایەڵیەکانە، ئێستا سەربەخۆیە و دەتوانێت دەست بۆ هەموو ئەو کارانە بەرێت کە پێیوایە بە قازانجی تەواو دەبن.

ئایدۆلۆژیای تاکگەرایی کە زانراوترین دەربڕینی خۆی لە تیۆری لیبرالیدا دۆزیوەتەوە و زیاتر لە هەمووان ئەفزەلیەت بە دوو بایەخ دەبەخشێت. یەکێکیان "دیاریکردنی خود" بۆ تاکە، ئەوی دیکەشیان ئازادی هەڵبژاردنە بۆ تاك.

ئەگەر کۆمەڵگا تەقلیدیەکان کۆمەڵگایان لە پێشەوەی تاك دادەنا، ئایدۆلۆژیای نوێی لە چەشنی لیبرالیزم، تاك بە سەر کۆمەڵگادا فەرز دەکەن و بە گۆڕانێکی پێشکەوتنخوازانەشی لە قەڵەم دەدەن. پاریخ دەنووسێت: "لە روانگەی لیبرالیدا هەرتاکێك جیاوازە لەگەڵ کەسانی دیکە و بە ئاسانی دەتوانێ جیاوازییەکان قبوڵ بکات، شتی وەك خۆی لێ بەرهەم نایەت و بوونێکی جیاواز ڕێنوێنی دەکات. تاکەکان، تاکێتی خۆیان بە پێی جیابوونەوەیان لە ئەوانیتر پێناسە دەکەن و کاتێك کە سنووری تاکێتیەکەیان کەمڕەنگ دەبێتەوە یان "خود"ی ئەوان لەگەڵ خودی کەسانی دیکە پێکدەچێت، هەست دەکەن لە بواری بووناسییەوە لە مەترسیدان" (١٤٦، ل١٥٨).

تاکگەرایی تایبەتمەندییەکی دەروونناسییە کە جیهانی نوێ پەروەردەی کردووە و بە بنەڕەتی کردووە. تاکی نوێ مافێکی هەیە، هاوڕێیەتی ئەو لەگەڵ ئەوانیتر خۆویستانە و شیاوی پەشیمان بوونەوەیە و لە سەر بنەمای تەمەن و پلەوپایە دیاری ناکرێت. شوراخوازی لەم جیهانەدا لە سەر بنەمای گرێبەست و ئازادیی هەڵبژاردنە و لە بەر کۆمەڵێك هۆکار سنوورداریشە. بەڵێنە کۆمەڵایەتییەکان لە لایەن دەستەواژە بڕیاردەر و گوێڕایەڵەکانەوە پێك نایەن. لە فۆرمە کۆمەڵایەتییەکانی پێشوودا، ژیانی کۆمەڵایەتی لە ڕێگای ئایین و ڕێبازە پیرۆزکراوەکانی بەڵێنیدان و لە ڕێگای دیاریکردنی سنوورەکانی نێوان کەسانی نێوخۆیی و دەرەکییەوە، کۆمەڵێك بەڵێنی دادەسەپاند. بەڵێنەکان لە جێگاوشوێن، بەرهەم هاتن، و جێگاوشوێنی تاك لە پلەبەندیی کۆمەڵایەتیدا سەرچاوەیان دەگرت. لە جیهانی ئەمڕۆدا، کاروباری دونیا بە سەر کاروبارە پیرۆزکراوەکاندا، بەڵێن بە سەر پلەوپایە، و گشتەکی بە سەر هەندەکی دا زاڵ بووە، و لە سەر مافەکانی تاك و پێشێتی تاك لە قەباڵ دەسەڵات و باڵادەستی ئەخلاقی و مەعنەوی کۆمەڵدا جەخت دەکرێتەوە.

بەڵام لە سەردەمێکدا کە تازە خەریك بوو پێشێتی تاك لە بواری مەعنەوییەوە بە گونجاو دادەنرا، ئەو شوێنەی کە پێی دەگوترا کۆمەڵگا و بنەمایەکەشی لە سەر بەرنامەی بەکۆمەڵ بوو، هەر لە حاڵی پێکهاتن دابوو. مارکس لە **گرۆند ریسە**دا دەنووسێت "ئەو سەردەمەی کە ئەو روانگەیە بەرهەم دێنێت، سەردەمی تاکی گۆشەگیر، ڕێك قۆناغی **پێگەیشتووترین**

پەیوەندییە **کۆمەڵایەتییەکانیشە**. مرۆڤ بە مانای دەقاودەقی وشە (ئـاژەڵێکی سیاسـی)یە... ئاژەڵێك كە تەنیا لە نێوخۆی کۆمەڵگادا دەتوانێت خۆی تاقانە بكات" (١٢٠، ل٨٤). بـەڵام لە کاتێکدا کە مارکس دەیتوانی بڕوای بە کۆمەڵخوازی تاك هەبێت، و بڕوا بـەوە بكـات كـە تاك بایەخ و جیهانبینییەکەی خۆی لـە کۆمـەڵگاوە دەسـتەبەر دەكـات، لیبراڵـەکان لـە گـەڵ پرسیەك بەرەوڕوو بوونـەوە. ئـەو تاکـە ئـازادە خودموختـارە کـە لیبراڵـەکان ئـاوا سـەرەتی پێدەبەخشن و ڕێزی لێدەگرن چۆن هاتوەتە نێو کۆمەڵگاوە؟ چۆن بووەتـە بەشـدارێکی حـازر و ئامادەی بەرنامە کۆمەڵایەتییەکان؟ دووهەمین پرسیەك کە لەگەڵی بەرەوڕوو بوونەوە، ئەوەبوو کە تاك لە سەر چ بنەمایەك لەگەڵ ئەوانیتر کاری هاوبەشی هەیە.

هۆبز بە ئاماژە بە گرێبەست وەڵامی ئەو پرسیارەشی دایەوە. لە ڕێگای گرێبەستەوەیە کە تاك بە شێوەیەکی خواستن دەچێتە نێو کۆمەڵگاوە. سەرەڕای ئەو ڕاستییە کە هەموو تاکەکان جیاوازن پێکەوە، تاکخوازانی لیبراڵ ئەوەیان قبوڵ دەکرد کە تاکـەکان کۆمـەڵێك بەرژەوەنـدی هاوبەشیان هەیە. لە نێو ئەوانەدا پاراستنی جەوهەر و حەقیقەت، خاوەندارێتی و ئـازادی لـە هەمووان زەقترن. هۆبز بە هێنانەئارای گرێبەست، بنەمای سەرەکیی پەیوەنـدیی کۆمەڵایـەتی بۆ کۆمەڵگای نوێ دابین دەکرد. تاك لەوە تێدەگات کە بۆ دەستەبەرکردنی شتەکان کە لێـرەدا بواری ئەمنییە، دەبێ شتی دیکە لە دەسـت بـدات. بنـەمای ئـاڵوێری دوولایەنـەکان و بـە قازانجی دوولایەن، دەبێتە هۆی هەبوونی کاری هاوبەشی نوێی کۆمەڵایەتی. هەربۆیە هۆبز لـە وەڵامی پرسیاری یەکەمدا، وەڵامی پرسیاری دووهەمیش ئامادە دەکات.

بەڵام گرێبەست شێوازێکی گونجاوە کەچـی بـە پێـی پێویسـت ناتـەواوە بـۆ ڕێکخسـتنی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان. یەکـەم لـە بـەر ئـەو هۆیەیـە تاکێـك کـە بـە پێـی بنـەمای پرنسـیپەکانی گرێبەسـت هاوڕێـیـەتی دەکـات، بوونەوەرێکـە کـە بەشـێوەیەکی مەترسـیدار خودموختارە. ئەو مافەشی هەیە کـە لـە هاوڕێـیـەتی لەگـەڵ گەڵاڵـە کۆمەڵایەتییـەکان کـە لەوانەیە ئازادییەکەی بەرتەسك بکەنەوە، پاشگەز بێتـەوە، مـافی ئـەوەی هەیـە لـەو بەڵێنـە دڵخوازانەی کە بە پێی گرێبەست سەپێندراون، پاشەکشـە بکـات، و لـەوانیش گـرنگتر مـافی ئەوەی هەیە کە کارەکەی خۆی وەك کاڵایەك نامۆ نەکات. ئەو بڕیارانە تەنیا و تەنیا تایبـەت بە ئەون. بۆ ئەوەی کۆمەڵگا پێك بێت و خۆی بەرهەم بێنێتەوە، ئەو تاکە خودموختارە دەبـێ بە کۆمەڵێك بـەڵێن و وەفـاداری خـۆی پابەنـد بکـات و کۆمـەڵگا بـە مەبەسـتی پاراسـتنی هاوسەنگی لەرزۆك و ناسەقامگیری هێزە کۆمەڵایەتییە پێکهێنەرەکانی، پێویستی بە شتێکی

زیاتر لە کاری ئامرازیی هاوبەش هەیە بۆ ئەوەی خۆی بپارێزێت و خۆی بەرهەم بێنێتەوە. هەروەك هیگڵ زۆر بە شارەزایی باسی کرد، کۆمەڵگایەك کە بە واتا ئامرازیەکانی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان پشت ئەستور بێت، بەردوام مەترسی لێکدابڕانی لە سەرە. هەڵبەتە دەوڵەتی هۆبزی، و بە چەشنێکی جیاواز دەوڵەتی هیگڵی، دەتوانێ لانیکەمی هەماهەنگی بۆ کۆمەڵگا دابین بکات، بەڵام ئەوەش رێگاچارەیەکی گونجاو نییە. ئەو ئەفسانانەی کە ئەو توانایییە بە کۆمەڵگایەك دەبەخشن کە بتوانێ بێنێتەوە و گەشە بکات دەبێ هەر لەو کۆمەڵگایەدا پەیدا ببن و ئەفسانەکان دەبێ ببنە هۆی ئەوەی شێوازە نوێیەکانی پەیوەندییە نوێیە کۆمەڵایەتییەکان و لە راستیدا تەنیا رێگای گونجاوی رێکخستنی کۆمەڵگا، دەر بکەون.

رۆڵێکی دیکەش هەیە کە ئەو ئەفسانانە دەبێ بینوێنن ـــ تاکی نوێ ئازادترە بەڵام نادیارتریشە، بە بێ هیچ هەستێکی سۆلیدارێتی کە پێکهاتە نەریتیەکانی کۆمەڵ دابین دەکەن. لە کۆمەڵگا نەریتیەکان و ئەو کۆمەڵگایانەی کە کەشێکی سنوورداریان هەیە، تاك پێناسێکی هەیە، جا ئەو پێناسە چ خێزانیی بێت، چ بە پێی هۆز یان کۆمەڵ بێت.[49] ئەو پێداچوونەوە قبوڵ دەکات، بەڵام لە کۆمەڵگا نوێیەکاندا، تاك ئەو ئایدۆلۆژیە کۆنانەی کە پێی دەڵێن ئەو کێیە، یان چ چاوەڕوانییەکی لێدەکرێت، لە دەست دەدات. تاکی نوێ نەناسراو و "بێ روخسار"ە، ئەو تایبەتمەندییەی کە زیگمۆند فرۆید و جۆرج زیمل بە شێوەیەکی وەها دەڵهەژێن جەختیان لە سەر کردەوە. دەبێ شێوازەکانی گونجاوی خودناسینەوەی پێ ببەخشرێتەوە، بۆ ئەوەی ئەو هەستی بەستراوەیی و وێکچون لەگەڵ کۆمەڵگایەکی بەربڵاوتر لە خۆیدا بدۆزێتەوە.

پێکچون و ناسینەوەی خود بۆ کارێکی کۆمەڵایەتیی دیکەش پێویستە. تاکەکان لە دانووستانە کۆمەڵایەتییەکانی خۆیاندا دەبێ بتوانن کەسێکی دیکەش بە جێی باوەڕ و متمانە

---

٤٩ - مارکس لە گرۆندریسەدا دەنوسێت: "هەرچی قوڵتر بچینەوە نێو مێژووی رابردووەوە، تاك و تاکی بەرهەمهێنەریش، زیاتر بەستراوە و زیاتر سەر بە کۆمەڵێکی گەورەتر خۆیان دەنوێنن. بە چەشنێکی تەواو سروشتی لە خێزان و لە بنەماڵەی پەرەگرتووی ناو خێڵ، دواتر لە شێوازە جۆراوجۆرەکانی کۆمەڵگای هاوبەشی پێکگرتووی نێو خێڵەکاندا دەبیندرێت. تەنیا لە سەدەی هەژدەیەم، لە "کۆمەڵگای مەدەنی"، شێوازە جۆراوجۆرەکانی پەیوەندییە کۆمەڵایەتیەکان لەگەڵ تاك، تەنیا وەکو ئامراز و هیچی دیکە بۆدابینکردنی مەبەستە تایبەتیەکانی خۆی، وەکو پێویستییەکی دەرەکی، بەرەوڕوو دەبنەوە" (٨٤، ١٢٠).

بزانن، ئەگینا دەبێ بە خاوەنی بەها هاوبەشەکانی جیهانبینیەکی هاوبەشیان بزانن. شتێکی زیاتر لە بنەمای گرێبەست پێویستە بۆ ئەوەی خەلکی بۆ سەرلەنوێ بەرهەم هێنانەوەی کۆمەڵگا لە دەوری یەکتری کۆ بکاتەوە.

بەگشتی، گەلاڵە کۆمەڵایەتییە نوێیەکان، چاولەدەستی دامەزراوەکان و رۆڵە نوێیەکان و ئەفسانە نوێیەکانە. لە هەمووان زیاتر پێویستیی بە شوناسێکی نوێیە وەك لایەنی ناسینەوەی خۆی. ئەو دامەزراوە نوێیانەی کە کۆمەڵگای نوێ هێناویەتی، کۆمەڵێکی سیاسی و ئابوورین. شوناسی پەیوەندیدار بەوەوە کە تاك لەو مەیدانانەدا بەدەستی دێنێت شوناسی هاووڵاتیی و شوناسی بەکارهێنە و ئەو کەشەش کە ئەو گۆڕەپانانە و شوناسە کارلێکانە رۆڵی مێژوویی خۆیانی تێدا دەگێڕن، کەشی کۆمەڵگای مەدەنییە.

# کۆمەڵگای مەدەنی وەك شوێنێکی گشتی

## (٥)

**گۆڕەپانی سیاسی:**

ئەو دامەزراوە گشتگیرەی کە جیهانی نوێ بەرهەمی دێنێت، دەوڵەت نەتەوەیە. ئەو شوناسە تایبەتییەی کە بۆ تاك بەرهەمی دێنێت، شوناسی هاووڵاتییە. تاك وەك ئەندامی کۆمەڵێکی سیاسی دەبێتە خاوەنی "سیما"یەك بەناونیشانی هاووڵاتی. هاووڵاتی ئەو پلەوپایەیە کە بە نسیبی ئەندامی دەوڵەت نەتەوە دەبێت، ئەم پێگەیە توانایەك بە تاك دەبەخشێت، کە لە ژیانی سیاسی و ژیانی مەدەنیدا، گەلێك کاروبار بەڕێوە بەرێت. تاك لە روانگەی دەوڵەت و یاساوە هاووڵاتیە. لە روانگەی ئەندامانی کۆمەڵگای مەدەنییەوە وەك هەڵگری مافەکان دەناسرێتەوە. بەم جۆرە، لەو مافانەی لە پلەوپایەی هاووڵاتییەوە سەرچاوە دەگرن، تاکی کۆمەڵگای مەدەنی دروست دەبێت.

ئەو مافەش لە لایەن دانیشتوانی کۆمەڵگای مەدەنییەوە بە چەشنێکی هاوبەش دەناسرێتەوە. کەوابوو، ئەو مافانە پەیوەندیی نێوان تاکەکان دابین دەکەن، بڕوابەخۆبوون پێك دێنن و هەل بۆ کاری هاوبەشی کۆمەڵایەتی دەڕەخسێنن. تاك وەك هەڵگری مافەکان لە کۆمەڵگای مەدەنیدا، مافی ئەرکن، رۆیشتن لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی دیکە، ئاڵوگۆڕ و گرێبەست، دەستەبەرکردن و ئاگاداری و سپاردنی خاوەندارێتی هەیە. لەوانەش گرنگتر ئەوەیە مافی ئەوەی هەیە کە خۆی تێکەڵاوی قسەوباسی سیاسی بکات و تەنانەت لە دەرەوەی ئەو رێبازە فەرمیانەی کە دەوڵەت دیاری کردوون، رەخنە لەدەوڵەت بگرێت.

چونکە تاکەکان بە پشتگیریی مافی ئازادیی رادەربڕین، ئازادیی دژایەتی، ئازادیی هاوڕێیەتی و ئەنجومەن، ئازادی شکڵ پێدان و وەگەڕخستنی بیروباوەڕی گشتی، لە کۆمەڵگای مەدەنیدا لە دەوری یەکتری کۆ دەبنەوە بۆ ئەوەی سەبارەت بە پرسە سیاسی و

کۆمەڵایەتییەکان قسەوباس بکەن. ئەو کاتەیە کە کۆمەڵگای مەدەنی دەبێتە بواری دیموکراسی سیاسی و کۆمەڵێك دەخولقێنێت کە سەرقاڵی کاری بەشدارانە و بیرلێکردنەوەن. ئەو کۆمەڵانە لە بوارێکی مەدەنی یانی نادەوڵەتیدا نیشتەجێیە. هەر ئەو راستیەشە کە مانای نوێی هاووڵاتیی لە مانا یۆنانیەکەی جیا دەکاتەوە.

چەمکی هاووڵاتی لە جیهانی یۆنانیەوە بە ئێمە گەیشتوە، هاووڵاتی لە جیهانی یۆنانیدا کەسێك بوو کە لە هەماهەنگی لەگەڵ کەسانی دیکەدا کاری دەکرد بۆ ئەوەی یاساکان بپارێزێت و گەرەنتی مانەوەی سیستەم (سوپا) بکات. ئەوە هاوکات بوو لەگەڵ سەرهەڵدانی چالاکییەك کە پێی دەگوترا سیاسەت. بەڵام چەمکی یۆنانیی هاووڵاتیبوون چەمکێك بوو کە بێ ئەملاو ئەولا پەیوەندیی بە ئەندێشەی "کۆمەڵگای سیاسی"یەوە هەبوو، ئەفزەلیەتێك بوو کە بۆ کەسانێك راگیرابوو کە هاورێی حکومەت بوون، هەربۆیە هاووڵاتی بەشداری تاوتوێکردنی رەخنەگرانەی حکومەتی خۆی نەبوو.

لەگەڵ سەرهەڵدانی بوارێکی کۆمەڵایەتی کە تێیدا رای گشتی لە سەر رێکوپێکردنی لەگەڵ دەسەڵاتی گشتی ململانێی هەبوو، ناوەرۆکی چوارچێوەی گشتیی نوێ (لە بەرامبەر کۆندا) لە کاروباری تایبەتیی سیاسیی ئەو هاووڵاتیانەی کە بەشێوەیەکی هاوبەش کاریان دەکرد... دەچێتە سەر ئەرکە تایبەتیە مەدەنییەکانی کۆمەڵگایەك کە سەرقاڵی قسەوباسی رەخنەگرانەی گشتییە ... لە سەرچەشنی یۆنانیی چوارچێوەی گشتیدا... رەفتاری هاووڵاتی تەنیا لە ململانێی وەرزشی لەگەڵ یەکتریدا توندوتیژانە بوو کە لاسایی کردنەوەی شەڕ لە دژی دوژمنی دەرەکی بوو، نەك لە مشتومڕ لەگەڵ حکومەتەکەی خۆیدا (٦٤، ل٥٢).

چەمکی نوێی هاووڵاتی، چەمکێکی بەشداریکارانەی رەخنەگرانەیە. هاووڵاتی لەم رووەوە لە کاروباری دەوڵەتدا بەشداریی هەیە کە مافی رەخنەگرتنی هەیە. ئەو چەمکە میراتی شۆڕشی ١٧٨٩ی فەرانسەیە. ئەوەی چینێکی باڵادەستی کۆمەڵایەتی دەسەڵاتی سیاسی بەدەستەوە بێت لە لایەن راپەرینەوە خرایە پەراوێزەوە و یەکسانی، روکەشیانەی تا ئەو جێگایەی کە یاسا لە گۆڕێ دایە، کردوویە بە شتێکی بنەڕەتی. بەواتایەکی دیکە دەسەڵاتی سیاسی دەبێ لە لایەن گروپێکی شارەزاوە بسەپێت کە ئینتمای بۆ هیچ چینێکی تایبەتی نەبێت، بەڵام کۆنترۆڵی بەڕێوەبەرایەتی ئەم دەسەڵاتە بە تاکەکانی کۆمەڵگای مەدەنی بەخشرا، واتە ئەو تاکانەی کە بە فەرمی بەشێك لە گروپی دەسەڵاتدار نین. ئەو کۆنترۆڵە لە وشەکانی مافی مەدەنیدا باس کرا.

تیۆری لیبراڵی خولقانی ئەو کۆمەڵە سیاسییە ئازاد و خودموختارەی بەرز نرخاندوە، چونکە ئەو پانتاییە کە جاریّ بە مافی سیاسی تەیارکراوە، دەتوانێت دەوڵەت وەك بەرپرسیار رابگرێت. بەڵام دەبیّ بە پارێز و نیگەرانییەوە بەرەورووی ئەو راستیە ببینەوە. بە دڵنیاییەوە لە کۆمەڵگا دیموکراتە نوێیەکاندا تاك مافی رەخنە لە دەوڵەت و بە بەرپرس زانینی ئەوی هەیە، بە واتایەکی دیکە تاك کۆمەڵێك مافی لە بەرامبەر دەوڵەتدا هەیە. بەڵام ئەو مافانەی کە وا لە تاك دەکات رۆڵی لێکۆڵەرێکی رەخنەگر لە مەڕ دەسەڵاتی دەوڵەت بگێرێت، پەیوەندیی بە پلەوپایەی هاووڵاتیی ئەوەوە هەیە. هەروەك چۆن هەموو کۆمەڵێکی کۆچبەران سەلمێنەری ئەوەیە، کەسانێکیش کە هاووڵاتی نین، نە لە دەوڵەت و نە لە کۆمەڵگای مەدەنیشدا ئەو مافەیان نییە. هەر لە بەر ئەو هۆیەیە کە ئەو خەڵکانەی کە هاووڵاتی نین یان دەوڵەتیان نییە، لە هەموو قەڵەمڕەوەکاندا تووشی گەلێك زوڵم و زۆر بوونەوە. ئەوە نەتەنیا سەبارەت بە جولەکەکانی ئەورووپا لە سەردەمی بەر لە شەڕی جیهانیی دووهەم، یان فەلەستینییەکانی ئیسرائیل، یان کۆچبەرانی "نایاسایی" بەنگلادشی لە هیندستان راستە، بەڵکو پەنابەرانی سیاسی و پەنابەران بەگشتی، لە زۆربەی وڵاتەکانی جیهاندا و لەوانە ئەو وڵاتانەی کە شانازیی بە بۆچوونی ئازادیخوازانەی مرۆیی خۆیان دەکەن، لە خۆ دەگرێت.

تاکی کۆمەڵگای مەدەنی کە ئەگەر وا نەبوایە "نادیار" بوو، وەك پەیڕەوێکی خاوەن ماف سەرهەڵدەدات، بەڵام ئەو مافە مەدەنیانە پەیوەندییان بە پلەوپایەی هاووڵاتیی ئەوەوە هەیە. بە دڵنیاییەوە هاووڵاتی کۆمەڵێك مافی هەیە، بەڵام تا ئەو جێگایەی کە دەوڵەت دێتە ئاراوە، کۆمەڵێك ئەرکیشی دەبێت. هاووڵاتی وەفادارە بە دەوڵەت، کار بە یاساکانی دەکات، لەو چوارچێوەیەدا کە دەوڵەت دیاری کردوە کار دەکات و ئەو سنوورە سیاسیانەش نابەزێنێت کە دەوڵەت دایناون. لە ئاکامدا ئەوەی لە هاووڵاتی چاوەڕوان ناکرێت ئەوەیە کە سەرەڕای هەبوونی دەوڵەت، یان لە گەڵ رەوایی بوونی ئەو ململانیّ بکات، یان خۆی سەرقاڵی ئەو چالاکییانە بکات کە مۆرکی رووخێنەریان لێدەدرێت. بەدڵنیاییەوە ئەو روخسەتی ئەوەی نییە سنوورە سیاسییەکان تێپەڕێنێت. بە واتایەکی زۆر بنەڕەتی ئەرکەکان بە سەر مافەکاندا زاڵن. بەڵێنەکانی هاووڵاتی ئەو کەشەیان گەمارۆ داوە کە ئەو لە کۆمەڵگای مەدەنیدا داگیری کردوە و هەروەها ئەو مافانەش کە ئەو لەوێدا دەیانسەپێنێت. مافە مەدەنییەکان دەکریّ بسەپێنرێن، بەڵام تەنیا لە کاتێکدا کە بنەماکانی کۆمەڵی سیاسی پێشێل نەکەن.

له ناکامدا بواری گشتیی قسەوباس و دژایەتی، مشتومڕ و ململانێ، بە تەواوەتی بەو رادەیە کە لە رەنگدانەوەکانی لیبرالّیدا دەردەکەون، ئازاد نییە. یەکەم لە بەر ئەوەی ئەو شتەی لە ململانێی هاوبەشی سیاسیدا رێگەی پێدراوە، تێگەیشتنێکی زۆر جیدین. تاك ئازادە خۆی لە قسەوباس و تەنانەت رەخنە لە دەولّەتیش هەلّقورتێنێ، بەلاّم لە نێو سنووری گوتارێکی سیاسی کە لە لایەن دەولّەتەوە پشتیوانی لێدەکرێ و لە چوارچێوەی ئەو سنوورانەدا کە پلەوپایەکەی وەك هاوولاّتییێك ئەو ئیزنەی پێدەدات. سەرجەمی یاساکانی پەیوەندیدار بە دنەدان و ئاژاوەگێری، خەیانت و تاوانە سیاسییەکان، نایاسایی بوونی گروپە سیاسییەکان و کردەوەی پێشگیرانەی دەولّەتی نوێ وەك بەشێك لە جبەخانەکانی بۆ خستنەژێر رکێفی خۆی، شایەتی ئەم کارەن. دەسەلاّتی یەکجارەکی دەولّەت لەو سزایانەدایە کە دەتوانێ دایسەپێنێت، و لە زومرەی ئەو سزایانە یەکێکیان بێبەش کردنی تاك لە مافی هاوولاّتییە کە تا ئەو جێگایەی کە دەستی یاسا و کردەوە دادوەریەکان دەیگرێتەوە، بە تەواوەتی بێ پشت و پەنایە. کەوابوو چوارچێوەی کۆمەلّی سیاسی لە دەرەوەی رێگا دیاریکراوەکانی دەولّەت و لە لایەن خودی دەولّەتەوە دیاری دەکرێت.

دووهەم، کۆمەلّگای مەدەنی لەو رووەوە بەرتەسکە کە دەبێ بوارێکی ناشتیخواز بێت. هاورێبوونی تاکەکان لەگەلّ کۆمەلّە بەرینترەکاندا پێویستی بە رەوالّی دیاریکراو و رێساکانی هەلّسوکەوتێکی بەردەوام و ناتوندوتیژ هەیە. بنەمای بونیات نەری ئەو بواری بنەمای چالاکیی ناشتیخوازانەیە. هێندێك چالاکی لەوانە بەکارهێنانی توندوتیژی بۆ کۆتایی هێنان بە کێشمەکێشەکان، کە لە شێوازەکانی پێشووتری کۆمەلّگا رێگەپێدراون، بوونەتە کارێکی نایاسایی. تاپۆکردن نایاساییە و چەکیش قەدەغەیە. تەنیا چەکێك کە تاك بۆی هەیە بیبێت، لێکدانەوە و بە قەناعەت گەیشتنی عەقلاّنیە. ئێستاکە گرژی و ناکۆکییەکان لە رێگای کارە باوەکانی دادوەرییەوە چارەسەر دەبن. ئەو کارە لە جیهانی پاش داگیرکاری لە هەمووشوێنێك بەرچاوترە، لەو شوێنەدا کە سیاسەتی نارەزامەندی کە دەرخەری خەباتی دژی داگیرکاری بوو، بەگشتی لە رێگای بەکارهێنانی هەر ئەو بوارانەی کە دەسەلاّتی چەوسێنەرانە بۆ گوێڕایەلّکردنی جەماوەر بەکاری دەبرد، جێگاکەی خۆی بە سیاسەتی سازان و ساتوسەودا سپاردوە. ئەوە ئاشکرا کراوە کە تێکهەلّچوونی بێ پێشگیری لە نێوان گروپەکاندا ئەگەری ئەوەی هەیە پەیوەندیی رێکوپێکی چالاکیی ئابووری و سیاسی بخاتە مەترسییەوە. لەوانەیە ئەفسانەییترین دامەزراوەی جیهانی نوێ یانی دەولّەت نەتەوە بخاتە مەترسییەوە. خودی

کۆمەڵگای مەدەنی دەبێ کەشێکی ئاشتیانە بێ کە تێیدا تەنیا چەکی ڕێگەپێدراو بۆ تاکەکان، چەکی قسەوباس و گفتوگۆ، لێکدانەوە و نارەزامەندیی ئاشتیانە بێت.

ئەوە لەوانەیە ڕەنگدانەوەیەکی ئاشتیخوازانەی کۆمەڵگای نوێ بێت. مێژوونوسانی وەك ئیلیاس (٤٤) بە ئێمەیان نیشان داوە چۆن پێگەیشتنی کەشێکی مەدەنی ئاشتیخوازانە پەیوەندیی بە ئاشتەوایی ژیان بەشێوەیەکی گشتی هەیە. شێوازی ژیانی تایبەتیی تاکەکان لە جیهانی نوێدا ڕێکوپێك بووە و پەیڕەوی لە شێوازەکانی خۆپاراستن، ڕێساکانی هەڵسوکەوتی بە ئەدەب و ئەمڕۆیی و گومانەکانی نەزاکەت دەکات. هەڵبەتە گوتارەکانی فۆکۆ نیشانی داوە کە تاك بە چ شێوەیەك ڕێکوپێك دەبێت و ئەشکەنجە دەدرێت بۆ ئەوەی بە چەمکە ئەخلاقیەکانی ژیانی گشتی و تایبەتی وەفادار بێت. بە گوێرەی دەربڕینی ڤاگنەر:

بۆ ئەوەی بکرێ قازانجەکانی بازاڕ کۆ بکرێنەوە، مرۆڤ دەبوایە فێری ڕێکوپێك کردنی کارەکان بوایە. دەبوایە بۆ بەشداری لە بڕیاری بەکۆمەڵدا ڕاهێنرابایە. دەبوایە بۆ دەربازبوون لە دابڕگەکان هەڵسوکەوتێکی مەعقولانەی هەبوایە. یان بەشێوەی دەربڕینی کۆمەڵایەتی (و بەگوێرەی زانستی کۆمەڵایەتی) خەڵك دەبوایە فێر ئەوە بن کە وەك جەماوەرێکی ڕێکخراوی ڕێکوپێك بەشێوەیەك هەڵسوکەوت بکەن کە شیاوی پێش بینی کردن بێت بۆ ئەوەی بەرژەوەندیی بەرنامەڕێژیی کۆمەڵایەتی کۆبکەنەوە (١٨١، ل٤٨٠).

بەڵام هەر بەو ڕادەیە لە چوارچێوەیەکی وەك خێزان، لەو شوێنەدا کە دەکرێ توندوتیژی لە ژێر عەبای تایبەتیبووندا حەشار بدرێت، یان لە کەلاوەنشینە هەژارنشینەکاندا کە توندوتیژی لەوێ شێوەیەك لە ژیانە، دەبێ توندوتیژی قەدەغە بێت. کۆمەڵگای مەدەنی خۆی دەبێ بواری ئالۆوێرە ئاشتیخوازانەکان بێت.

ئەوە بۆ ڕەفتارە سیاسییەکانی کۆمەڵگای مەدەنی ڕێنوێنیی قوڵی هەیە. کۆمەڵگای مەدەنی دەبێتە کەشێکی پوچەڵ، و ئەو شێوازانەی سیاسەت کە لە دەرەوەی سنوورن، یان ئەوانەی تێکەڵبوونی ئەو بوارە دەبەنە ژێر پرسیارەوە، پوچەڵ دەکاتەوە.[٥٠] تاك یان ئەو گروپەی

---

[٥٠]. هەروەك ڕاجنی کوتاری، کە باسی پێگەی هیندستان دەکات، دەڵێت: "پێکهاتەیەکی کەم تا زۆر تراژیکە: بە هەر ڕادەیەك زیاتر زوڵم و زۆر داسەپێنرێت، مەودا و شوێنی بەرهەڵستی لە کۆمەڵگای مەدەنی دوورترە کە ئەوەش بە نۆرەی خۆی ئەو هەستە پێکدێنێت کە دەوڵەت کەوتوەتە بەر پەلامار و دەبێ پشتیوانی لێ بکرێت" (٩٠، ل٢٠).

کـە دەسـت بـۆ شـێوازە "نایاسـایی"یەکانی نارەزامەنـدی دەبـات، یـان لـە سیاسـەتێکی "نایاسایی"دا چالاك دەبێتەوە، بۆ کەش و هەوای دەرەوەی کۆمەڵگای مەدەنی رادەگوێزرێـت ــ کەش و هەواکانی دوور لە یاسا و دەرەوەی بواری چالاکیەکی پێشکەوتووانە. دەرهاویشتنی توندوتیژی لە بواری گشتیشدا پێویستیی تایبەت بە خۆی هەیـە. دەوڵـەت دەسـت بـە سـەر توندوتیژیدا دەگرێ و ئەوە دەوڵەتە کە خاوەنی رێگەپێدراوی ئامرازەکانی ملهوڕیی دەسەڵاتە.

ئەو ئامرازانەش سەرڕای هەموو دڕندەیی خۆیان لە دژی کەسانێك بەکار دەبرێن کە بە پێی رێساکانی بواری گشتی ناژین.[٥١] شێوازەکانی چارەسـەری کێشەکێشـەکان کـە دەوڵـەت لـە فۆرمی دادوەرییـەکی بێ لایەنانەدا دابینی دەکات ئـەو کەشـانەی دەرەوەی یاسـا ناگرێتـەوە. هەڵسوکەوتی "ئەمرۆیی" پاداشت وەردەگرێت و هەڵسوکەوتی "بەسەرچوو"ش تەمێ دەکرێ. ئەوە دەکرێ بەو مانایەش بێت کە تاك ئەگەر بیهەوێت لە کۆمەڵگای مەدەنیدا بمێنێتەوە، زۆر هەل و دەرفەتی ئەوەی نییە کە چـەمکی بـەدیلێك لـە سیاسـەت یـان شـێوازەکانی بـەدیلی رێکخستنی کۆمەڵگا بێنێتە گۆڕێ. رەفتارە سیاسییەکان لە لایەن ئەو شتە باوانەوە سنووردار و بەرتەسك دەکرێنەوە کە دەوڵەت بە باشیان دەزانێت. ئەو فۆرمە باوانەش هەندێك لە رەفتارە سیاسییەکان دەخەنە پەراوێزەوە.

بۆ جیهانی پاش داگیرکاری، بارودۆخەکە لەوەش ئاڵۆزتر و نەگونجاوترە. لـەو ئابووریانـەدا کە بە گشتی ئابووریی لادێین، کۆمـەڵگای مـەدەنی تایبـەت بـە بەشـەکانی شـاری و چـینە مامناوەندیە گەشە کردووەکانە. کەسانی هەژارنشینی ئاوایـەکان کـە لـە شـوێنی ئـابووریی ژیانیان نیشتەجێن، نە مافێکیان هەیە، نە لە بواری سیاسییەوە پێگەیشتوون و نە لـە بـواری سیاسیشەوە ئامادەن. مەمدەنی کاتێك کە باسی قارەی ئەفریقا دەکات دەڵێت کە خەباتەکانی

---

٥١ - دەستووری هیندستان، گەرەنتی کۆمەڵێك ماف بۆ هاوولاتیی هیندی دەکات. بەڵام دەوڵەت زۆر بێبەزەییانە هەرچەشنە لادان لە رەفتارە باوە رێپێدراوەکان سەرکوت دەکات. سەرکوتی خەباتی چەکدارانەی تلنگانا، قەدەغە کردنی حیزبی کۆمۆنیست لە یەکەمین رۆژەکانی سەربەخۆییدا، کردەوەی دڕندانە لە دژی ناگزالیتەکان، راگەیاندنی باری نائاسایی لە ساڵی ١٩٧٥، داگیرکردنی راستەقینەی باکوری خۆرهەڵاتی وڵات لە رێگەی سەربازیەوە، پێشێلکردنی ئازادیە مەدەنییەکان لە پەنجاب و کەشمیر و ئەو یاسا دژوارانەی کە لە پەرلەمانەوە تێپەڕین، کۆمەڵگایەکی مەدەنی پوچەڵی خوڵقاندوە ــ کۆمەڵگای مەدەنی کە تەنیا بە پێی نەریتە دیاریکراوەکانی دەوڵەت دەتوانێت کار بکات.

دژی داگیرکاری ئەو بزووتنەوانە بوون کە نەتەنیا داگیرکراویان لە دژی داگیرکەر هاندەدا، بەڵکو جەماوەری وەرزێریشیان لە دژی کۆمەڵگا مەدەنییەکانی پشت ئەستوور بە "کۆچەرنشین"ە شارییەکان هەڵدەخراند. "بەڵام پەرەسەندنی جێگای سەرنجی کۆمەڵگای مەدەنی هێشتا هەر لە رێ دابوو، و ئەویش پاش سەربەخۆییەکە هات. ئەگەر بزووتنەوە دژی داگیرکاریەکانی دوای شەڕ، کە بە زۆری پێگەی گوندییان هەبوو لەگەڵ بزووتنەوە "دیموکراسیخواز"ەکانی ئەمڕۆیی کە بەگشتی پێگەی شارییان هەیە، هەڵسەنگێنین، تێگەیشتنێکمان لەم پەرەسەندنە سەرنجڕاکێشە دەبێت. چونکە لە کاتێکدا کە بزووتنەوەی نەتەوەخوازیی پێشوو بەگشتی هێزی خۆی لە پشتیوانیی رێکخراوی کۆڕوکۆمەڵە کشتوکاڵییەکان بەدەست دێنا، بزووتنەوەی دیموکراسیخوازی ئەمڕۆیی بەگشتی ریشەی لە کۆمەڵگای مەدەنی دایە" (١٠٩، ل٣-٤٢). مەمدەنی بەو ئاکامە دەگات "پاژنەی ئاشیلی بزووتنەوە پشت ئەستوورەکان بە کۆمەڵگای مەدەنی لە سەردەمی ئێمەدا نەبوونی بنکەیەکی ورزێری و هەر بەو پێیەش بەرنامەی کاری لیبراڵ و بەرتەسکی ئەوانە" (هەمان سەرچاوە، ل٤٧). شەت(SHETH) کە لە سەر هیندستان دەنوسێ، دەڵێت:

لەو رووەوە کە بەکارهێنانی "کۆمەڵگای مەدەنی" بۆ سەپاندن و پاراستنی مافەکانی هاووڵاتیانی سەربەخۆ کەم تا زۆر تایبەت بەو توێژانەی کۆمەڵگایە کە لە بواری سیاسی و ئابوورییەوە رێکخراون، چەمکی لیبراڵی و پابەندیی یاسایی مافەکانی مرۆڤ بۆ ئەو کەسانەی کە لەو مافانە بێبەرین و یان لە دەرەوەی بەشە رێکخراوەکانی ئەون، قازانجێکی ئەوتۆی نییە (١٦٩، ل٣٤).

بەداخەوە کۆمەڵگای مەدەنی بۆ بەشێکی بەرینی جەماوەر گۆڕەپانێکی سەروگوێ بڕاو و بەرتەسکە. ئەو کەسانەی کە دەستیان بە کۆمەڵگای مەدەنی راناگات لە دەسەڵات بێبەشن، رەفتارەکانی دەوڵەت خەڵکی نێوخۆی کۆمەڵگای مەدەنی دەکاتە هاووڵاتی. ئەوە یەکەمین لایەنی ئەو ئاوێتەبوونە نەگونجاوەیە کە پێی دەڵێین کۆمەڵگای مەدەنی. کۆمەڵگای مەدەنی بە مەبەستی ئەوەی وەك پانتاییەکی بەرینی قسەوباسی گشتی و رەخنە لە دەوڵەت و رێبازەکانی ئەوی لێ بێت، دەبێ ئازاد بێت. بەڵام چوارچێوەی ئالوویرەکانی کۆمەڵگای مەدەنی ــــ ئەو کۆمەڵگا مەدەنییەی کە لیبراڵەکانی پێشوو زۆر بە شەوقەوە باسی ئازادیەکانیان دەکرد ــ لە رێگەی خودی دەوڵەتەوە پێك دێت، و دەوڵەت هاوکات شوناسی دانیشتوەکانی دیاری دەکات. هەموو شوروشەوقی چالاکیی سیاسی کە دەرخەری

کۆمەڵگایەکی مەدەنیی چالاکە، لە چوارچێوەیەکدا ڕێگەپێدراوە کە دەوڵەت دیاری کردوە. ئەوە کۆمەڵگای مەدەنی لە تیۆری لیبراڵی دایە کە پێدەچێت دەوڵەت وەك وەڵامدەرەوە رابگرێت و دەسەڵاتەکەی سنووردار بکاتەوە!

دەکرێ رەخنەیەکی دیکەش لە تێگەیشتنی لیبراڵەکان بگیرێت. لیبراڵەکان باسی ئەوە دەکەن کە مافە سیاسییەکان بە هەر رادەیەکیش بەرتەسك کرابنەوە، لە روانگەی مێژووییەوە رێگاچارەن چونکە تاکەکانی کۆمەڵگای مەدەنی وەك کەسانێکی یەکسان بار دێنێت. هەر وەك چۆن ت.هـ. مارشاڵ لە لێکدانەوەیەکی جێی رێزدا باسی ئەوەی کرد، هاوولاتیی سیاسی "مەیلی بەرەو یەکسانی" هەیە (١١٢). هاوولاتی لە روانگەی یاساوە یەکسانە، کەواتە بە دڵنیاییەوە دەتوانین بڵێین کە تاکەکانی لە کۆمەڵگای مەدەنیدا یەکسانن. هەربۆیە مافێکی سیاسی یەکسانیش لە کۆمەڵگای مەدەنیدا دێنێتە ئاراوە.

بەڵام رووداوەکە زۆر لەوە ئاڵۆزترە. لە نێوان یەکسانی لە گۆڕەپانی سیاسی و یەکسانی لە گۆڕەپانی مەدەنیدا، پەیوەندییەکی یەکسان لە ئارا دانییە. لە راستیدا هاوکێشەیەکی لەم چەشنە هەر بوونی نییە، چونکە مافەکان و ئازادیە مەدەنییەکان ئیزنی زۆر شت بە هاوولاتیان دەدەن ـــ دۆزینەوەی پیشە، بەشداریی لە ژیانی فەرهەنگیی کۆمەڵدا و لە هەمووی ئەوانەش سەرتر دەستەبەرکردن و پاراستن و سپاردنی خاوەندارێتی، هەرچەندە ئەو خاوەندارێتییە هێزی کاری خودی ئەویش بێت، و لەم خاڵەدا دەگەینە سەر دووڕیانێك، چونکە ئەم مافە هێزێکی لە رادەبەدەر و رەوایی بوونی شێوەی زوڵم و زۆرێکی تایبەت بەخۆی بە چینە خاوەندارەکان دەبەخشێت. ئەوەی کۆمەڵگا نوێیەکان لێیان ستاندوونەتەوە، یانی دەسەڵاتی سیاسی و یاسایی، تا رادەیەکی زۆر قەرەبوو دەکرێتەوە، چونکە چینە داراکان، دەسەڵاتێکی ئابووریی مەترسیدار بەدەستەوە دەگرن.

دووهەمین ناتەبایی کۆمەڵگای مەدەنی ئەوەیە کە لە گۆڕەپانی سیاسیدا تاك یەکسانە بەڵام لە گۆڕەپانی مەدەنیدا تاك لە بنەڕەتدا نایەکسانە، چونکە لێرەدایە کە دەسەڵاتی تەواوی چینە داراکان بە پێی یاسا رێگە پێدراوە. ۆود دەڵێت: "کۆمەڵگای مەدەنی هێژمونی بەسەر خەڵك و ژیانی رۆژانەیان بە خاوەندارێتی تایبەتی و خاوەنەکانانی دەبەخشێت. ئەو دەسەڵاتەی کە حسابی هیچ کەس ناداتەوە و زۆر لەوانەیە دەوڵەتێکی ملهوڕی کۆنیش خۆزگەی بۆ بخوازێت (١٨٨، ل٧٣) وە دەسەڵاتێکە کە تا رادەیەکی زۆر یاسا لە ژێرپەردەی مافە مەدەنییەکاندا بە فەرمی ناسیوە.

ئەو پرسیەی کە قبولکردنی ناتەبای مافە مەدەنییەکان دەیهێنێتە پێشەوە، ئەوەیە کە ئەو مافە لە بواری مێژووییەوە پەیوەندیی بە داخوازیی ئازادی لە لایەن چینە داراکانەوە هەیــە، و گوتاری روکەشیانە، مافەکان و ئازادیەکانی ئەو کەسانەی کە خاوەندارێتییان بەشێوەی داراییە مادیەکان هەیە، لەو کەسانەی کە تەنیا خاوەنی کارەکەی خۆیانن، جیا ناکاتەوە. سەرمایەدار "ئازادە" کە هێزی کار بکڕێت و بەرهەمهێنەریش ئازادە لەوەی ئەو هێزە کارەی نامۆ بکات. رێك هەر لە بەر ئەو هۆیەیە کە مارکسیستەکان هەر لە کۆنــەوە کۆمــەڵگای مــەدەنییان بــە قەڵەمرەوێك زانیوە کە هێزی کار تێیدا بەرهەم دێت، دەفرۆشرێت و سەرلەنوێ بەرهەم دێتەوە، بە واتایەکی دیکە چوارچێوەی نایەکسانی چینایەتی و چەوسانەوەیە.

ت.هـ.مارشاڵ (١١٢) لە لێکدانەوەیەکی جیاواز بەڵام پەیوەندیداردا ئەو تێزەی هێناوەتــە ئاراوە کە لە پێگەیشتنی بەرایی ئابووریی بازاڕدا، بەخشینی مافە مەدەنییەکان بە تاکەکان، پێویستییەکی کاری بوو. مافە مەدەنییەکان پشتیوانی پەیوەندیەکانی بازاڕ، و لە راستیدا بــۆ هێشتنەوەی ئەو شێوە نایەکسانە، پێویست بوون. لەو رووەوە پشــتیوانیی کۆمەڵایــەتیی بــەو بیانوەوە لە خەڵك زەوت دەکرا کە هەر هاووڵاتییێك لە لایەن یاساوە پشتیوانی لێدەکرێ. بەڵام مارشاڵ لە سەر ئەو باوەڕە بوو کە هاووڵاتیی سیاسی، چالاکیی سیاســیی خێراتــر دەکاتــەوە، هەروەك چۆن یەکێتیە پیشەییەکان کاریگەریی مافە مەدەنییەکان کەم دەکەنــەوە. بــۆ نموونــە یاسای گرێبەستەکان بەهۆی مشتومڕی بەکۆمەڵ، تا ئاستێکی بەرچــاو دابــەزی. بــە بــڕوای مارشاڵ مافە سیاسییەکان" کۆمــەڵێك مەترســی بــێ ئەوپــەڕی بــۆ رژێمــی ســەرمایەداری" بەدواوەیە، چونکە ئامرازگەلێك بە چینی کرێکار دەبەخشێ بۆ بەهێزکردنی پلەوپایەی خۆیــان لە شوێنی کارەکەیان. جگە لەوەش چالاکیی سیاسی، وتەزایەکی تازەی مافەکانی تایبەت بــە هاووڵاتیی لەچەشنی مافە کۆمەڵایەتییەکان لێدەکەوێتەوە.

مافە کۆمەڵایەتییەکان، کە ئاستێکی دیاریکراو لە دەســت پێڕاگەیشــتن بــە بەرژەوەندیــە ماددیەکانی کۆمەڵگا بە تاك دەبەخشن، لەوانە شۆڕشگێڕانە نەبوون، بەڵام بە ئاقاری رێبــازە یەکسانیخوازەکاندا دەڕۆن. ئەو بیرمەندە ئەوەی قبوڵە کە مافــە کۆمەڵایەتییــەکان نــاتوانن، یەکسانیی داهاتەکان وەدی بێنن، یان لۆژیکی نایەکسانیخوازیی بــازاڕ کــەم بکەنــەوە، بــەڵام "دەوڵەمەند کردنی گشتیی جەوهەری دیاریکراوی ژیانی پێشــکەوتوو"یان لــێ دەکەوێتــەوە. گومانی نایەکسانیی کۆمەڵایەتی دەگۆڕن و دەبنە هۆی چارەسەری ناکۆکیی نێوان بنــەماکانی هاووڵاتیی و بنەماکانی بازاڕ، لەناوخۆی کۆمەڵگای ســەرمایەداریدا.

بەدڵنیاییـەوە لـەو رووەوە کـە ئەندێشـەکانی ئاوێتـەبوونی هـاووڵاتیی، بنـەڕەتی بوونەتـەوە، پەرەسـەندن و پـەرەگرتنی پێشـکەوتنخوازانە لـە داوێـنی دابەشـکردنی بەرژەوەندیەکاندا، خۆی دەرخستووە. بارودۆخی ژیانی توێـژە کرێکاریـەکان و دیکـەی گروپە پەراوێزخراوەکان بە سیاسیی بوونەوەی ئەو چینانە چارەسـەر کـراوە. یەکـەمین بەرژەوەندیی جێگای باسی پەرەگرتنی مافە سیاسییەکان لـە ئاکـامی خـەباتی چـینی کرێکار و توێژەکانی دیکەی وەك ژنان و کەمینە نەتەوەییەکانە. هەر ئـەو دەسـتەواژە گشتییانەی کە ئەو پێناسە تایبەتە لە رێگای ئەوانـەوە بـەیان دەکرێـت، وزەبەخشـە، چونکە ئەو ئیزنە بە گروپە پەراوێزخراوەکان دەدات کە بۆ گەیشتن بە بەرژەوەندیـەکانی پلەوپایە و سەرەتیەکانی هاووڵاتیی خەبات بکەن. کەوابوو مافەکان دەبنە تەوەرێك کە خەباتیان بۆ دەکرێت. وە چونکە بواری سیاسـی و یاسـایی بـە پێـی بنـەماکانیان بـۆ هەمووان کراوەن و هەمووان دەستیان پێڕادەگەن، پەرەپێدانی ئەو بوارە ئەو ئیزنـە بـە پـەراوێزخراوەکان دەدات کـە بچـنە نێـو ئـەم قەڵەمڕەوانـەوە و لـە رێگـای مافـە کۆمەڵایەتییەکانەوە، تواناکانی کۆمەڵگای مەدەنی پەرە پێبدەن.

بەڵێ، مافە کۆمەڵایەتییەکان وەك وتەزایەکی بەستراوە بە پلەوپایەی هاووڵاتی، پشتی بەو داواکارییە بەستوە کە دیموکراسیی سیاسیی پێگەیشـتوو، پێویسـتیی بـەو پێشـمەرجەیە کـە لانیکەمی پێوەر بە هەر تاکێك ببەخشرێت. توانایی ئەرکن وەك ئەندامێکی تەواوی دەوڵـەت پەیوەندیی بە بارودۆخی کۆمەڵگای مەدەنییەوە هەیە. بەخشـینی ئـەو مافـە کۆمەڵایەتیانـە بەشێوەیەکی بنەڕەتیی لەگەڵ بنەمای مافە مەدەنییەکان تێکەڵ دەبێت.

یەکەم، لۆژیکی گرێبەست ئاوەژوو دەبێتەوە، چونکە پێکهاتەی بازاڕ گوێڕایـەڵی بنـەمای دادپەروەریی کۆمەڵایەتی کراوە. دووهەم، داواکاریی لانیکەمی پێوەری ژیان بەو مانایەیە کە دەوڵەت لە پرۆسەی دابەشکردندا و لە ئاکامدا لە پرۆسـەی بەرهەمهێناندا، خۆی تێوەردیدات بۆ ئەوەی ئەو کالاّ کۆمەڵایەتیانەی کە لە دەرەوەی بنەمای بـازاڕی خـستنەڕووی داواکاریـەوەن، دابین بکات. دەبێ تۆرە ئەمنیەکان وەك کالاّ ناکالاّییەکان دابین بکات. مافە کۆمەڵایەتییەکان داخوازیی یەکجارەکی دابینکردنـی لانیکـەمی پێـوەری ژیـان و بـەم چەشـنە هێنانـەخوارێی بنەمای کالاّییان لە رێگای خولقاندنی بەشە ناکالاّییەکانەوە هەیە.

بـەلاّم واپێدەچـێت ئـاواتی بیرمەنـدانی وەك مارشـاڵ کـە سـەبارەت بـە مافـە کۆمەڵایەتییەکان باسـیان کردوون، لە رادەبەدەر گەشبینانەیە. کێشە و ناکۆکی لە نێوان

مافە مەدەنییەکان و مافە کۆمەلآیەتییەکاندا دیسانەوەش هەر دەمێنێتەوە. یەکێکیان لە بەر ئەو هۆیەی کە مافە مەدەنییەکان یارمەتیەکی پۆزەتیڤ بە دەسەلآتی چینە سەرمایەدارەکان دەکەن، چونکە لە پانتایی بەرهەمهێناندا کار دەکەن و بە خاوەنانی داراییەکان ئیزنی ئەوە دەدەن کە سەروەت و سامانی ماددی بەدەست بێنن و بەکاری بەرن و هێزی کار بچەوسێننەوە. لە لایەکی دیکەوە مافە کۆمەلآیەتییەکان لە چوارچێوەی دابەشکردندا کار دەکەن و لێرەدا تاك وەك بەکاربەر دەناسرێتەوە. هەر بۆیە بەهیچ شێوەیەك دەسەلآتێکی پێ نابەخشن.

دووهەم ئەوەی چونکە سەرچەشنی مافە کۆمەلآیەتییەکان، سەرچەشنێکی دابەشکارانەیە نەك بەرهەم هێنەرانە، ئەو مافانە ناتوانن کاریگەرییان لە سەر هەلێنجانی زێدەبایی، یان لە سەر جێگاوشوێنی بندەستی کرێکاران هەبێت. ناتوانن پەیوەندییەکانی دەسەلآتی نێو بەشی بەرهەمهێنان بگۆڕن. لە ئاکامدا دەکرێ نێوبەندی نایەکسانیە کۆمەلآیەتییەکان بکرێ (و رێك بخرێن) بەلآم ناکرێ هەلوەشێنەوە. پێکهاتە چینایەتیەکان وەك خۆیان دەمێننەوە، بەلآم رەزامەندی چینی کرێکار دەکڕدرێ ـــ "لوید جرجیسم" تانە و تەشەرێك بوو کە لینین بۆ وەسفی ئەم دیاردەیە بەکاری برد.

سێیەم، مافە مەدەنییەکان، هەروەك سی.ب. مەك فرسۆن لە ١٩٨٥ (١٠٨) هۆشداری دا، دەولەت بۆ دەستێوەردان هان دەدەن، چونکە کۆمەلێك داخوازییان لە دەولەت هەیە. لە کاتێکدا کە مافە مەدەنییەکان بۆ نموونە مافی خاوەنداریتی لە گوتاری لیبرالیدا لە دژی دەولەتن یان لانیکەم دەولەت سنووردار دەکەنەوە، مافە کۆمەلآیەتییەکان بە شێوازێکی بنەڕەتی دەسەلآتەکە دەبەنە سەرێ.

تێگەیشتنێکی توندە، لە کاتێکدا کە مافە مەدەنییەکان دەتوانن دەولەت بەرتەسك بکەنەوە، مافە کۆمەلآیەتییەکان دەسەلآتی پێدەبەخشن بۆ ئەوەی دەست لە هەموو بوارەکانی ژیانی تاك وەربدات. مافە مەدەنییەکان هەل بۆ سەرکوت لە پانتایی مەدەنیدا دەڕەخسێنن، مافە کۆمەلآیەتییەکانیش سەرکوتی دەولەتی دەکەنە راستیەکی ژیان. لە راستیدا تاك ناچارە لە نێوان "عەلمانیەت"ی سەرکوتی تایبەتیی چینی سەرمایەدار و "خارویدیس"ی سەرکوتی گشتیی دەولەتدا یەکێکیان هەلبژێرێت. (لە ئەفسانەکانی یۆناندا سکۆلا گاشەبەردێکی مەترسیدارە لە لایەکی تەنگەی سینا و خارویدیس گێژاوێکی ترسناك لە لایەکی دیکەی ئەوە کە مەبەست لە مەترسیداربوونی هەردووك لایەکەیەتی).

چوارەم ئەوەی مافە کۆمەڵایەتییەکان بە بەخشینی دەسەڵات بە دەوڵەت، دەیکەنە کاراکتەری سەرەکیی سەرجەم لایەنەکانی ژیان، و تاك لە بەرامبەر ڕەفتارەکانی دەوڵەت و بڕیارەکانی ئەودا، کەمبوونی بودجەی ئەو و کاردانەوەی لە بەرامبەر نسکۆکاندا، تووشی خەسارەت دەبێ. دیسانەوە دەبێ لە نێوان خەسارناسی لە بەرامبەر چینی سەرمایەدار و خەسارناسی لە بەرامبەر دەوڵەتی سەرمایەداری یەکێکیان هەڵبژێردرێت. هەردووکیان ڕەنگدەرەوەی نایەکسانیی کۆمەڵگای مەدەنین.

کەواتە کۆمەڵگای مەدەنی وەك قەڵەمڕەوی تاکی هەڵگری مافەکان، کۆمەڵێکی سیاسی پێدەگەیەنێت کە ئازادی تووشبوون بە قسەوباس و گوتوبێژ لە مەڕ ڕیزبەندییە نێوخۆییەکانی کۆمەڵگا و لە مەڕ پەیوەندیی کۆمەڵگا لەگەڵ دەوڵەتی هەیە. بەڵام سنوورەکانی ئەو کۆمەڵە، و هەروەها پێناسەکانی تاك وەك هاووڵاتی، لە لایەن دەوڵەتەوە دیاری دەکرێت. بێجگە لەوە هەرچەندە مافە مەدەنییەکان، هەلی پێکهاتنی وەها کۆمەڵێك دەڕەخسێنن، پەراوێزخەرن چونکە ئەو مافانە بوار بۆ سەرلەنوێ بەرهەم هاتنەوەی سیستەمی نایەکسان دەخولقێنن. هەربۆیە کۆمەڵگای مەدەنی تەنیا پانتاییەکی دروست کراو نییە، بەڵکو پانتاییەکیشە کە تێیدا سیستەمی نایەکسانی لە ڕێگای یاسا و پێکهاتەی مافەکانەوە وەدی دێت و بەرهەم دێتەوە. کۆمەڵگای مەدەنی بەو واتا تایبەتیە تەنیا پەراوێزخەر نییە، مادامێك کە تیۆری دەوڵەتتەوەری مافەکان هەروا زەینی دانیشتوانی کۆمەڵگای مەدەنییان داگیر کردووە، سیستەمی سەرکوتی ئەو هەروا بە بێ لێپرسینەوە دەمێنێتەوە.

# کۆمەڵگای مەدەنی وەك شوێنێكی گشتی

## (٦)

**چوارچێوەیەكی بەرینی ئابووری:**

كۆمەڵگای مەدەنی بەواتایەكی دیكە و دیاریكەر، دەكرێ وەك بوارێكی گشتی بەرتەسك بێتە ئەژمار. لەم واتایەدا، ئەو پرۆسانەی كە دەستڕاگەیشتنی تاك بە گوتاری گشتی و بەشداریی تێیدا بەرتەسك دەكەنەوە، لە ناوخۆی خودی ئەو بارودۆخەدان. كۆمەڵگای مەدەنی ستەم لە دانیشتوانی خۆی دەكات و دامەزراوەی بازاڕ كە بەگشتی وەك لایەنی پێكهاتەیی كۆمەڵگای مەدەنی هەژمار دەكرێت وەك ئامرازێك بۆ سەركوت و كاری زۆرەملێ كاردەكات.

دەبێ دان بەوە دابندرێت كە بازاڕ خۆی لە خۆیدا نایەكسانی ناخوڵقێنێت. هۆكارەكانی نایەكسانیی كۆمەڵایەتیی دەرەوەی كۆمەڵگای مەدەنی، لە چوارچێوەی بەرهەم هێنان دان. بەڵام ئەو نایەكسانیە لە لایەن ئایدۆلۆژیای بازاڕەوە بەكاڵایی دەكرێت و دەبێتە ئەفسانە. لە راستیدا ئەو ئایدۆلۆژیایە بۆ سەرلەنوێ بەرهەم هێنانەوەی نایەكسانی لایەنێكی بنەڕەتیی هەیە، و كۆمەڵگای مەدەنی وەك شوێنی پرۆسە كۆمەڵایەتییە دیاریكەرەكان، بوارێكی زۆر پێویست بۆ پرۆسەی بەرهەم هێنان دابین دەكات. تێگەیشتن لەم شێوە دەربڕینە واتایەی كۆمەڵگای مەدەنی دەكرێ بەمشێوەیە باس بكرێت.

بەرهەمهێنان پشتی بە خوڵقاندنی خێرای قازانج بەستوە و ئەوەش پەیوەندیی بە وەگەڕخستنی خێرای كاڵاكان، و لەوانە هێزی كارەوە هەیە. تا ئەو جێگای كە پەیوەندیی بە سەرمایەدارەوە هەیە، هەم پارە و هەم ئەو كاتەی كە بۆی تەرخان كراوە لە پێناو گەیشتن بە كاڵاكاندا، وەك تێچوو هەژمار دەكرێن. بەڵام لە كاتێكدا كە كاتوساتی بەكارهاتوو لە پرۆسەی بەرهەمهێناندا دەكرێ كورت بكرێتەوە و بە پێی فەنناسی بخرێتە بەردەست و شێوازەكانی بەڕێوەبەرایەتی بەوپەڕی باشیی خۆیان بگەن، ناكرێ كاتی پێویست بۆ پرۆسەی وەگەڕخستن

کـورت بکرێتـەوە. ئـەو کاتـە پەیوەنـدیی بـە زۆر شـتەوە هەیـە ـــ ژێرخـانی بەردەسـت، سیستەمەکانی گواسـتنەوە و هـەڵگرتن، ریزبەنـدیی دارایـی، و لـە هـەمووانیش زیـاتر لـە بەردەست دابوونی هێزی کارە. گرنگییەکی زۆر بنەڕەتیی هەیە کە سیسـتەمی سـەرمایەداری بە ئاسانی دەستی بە هێزی کار رابگات چونکە کار بەها دەخولقێنێت.

بەڵام کار کاڵایەکە کە وەك هیچ کاڵایەکی دیکە ناچێت، کار تەنیا کاڵایەکە کە لە پرۆسـەی بەرهەم هێناندا بەرهەم نایەت، و ناکرێ کار لەو پرۆسـەی بەرهـەم هێنانـەدا سەرلەنوێ بەرهەم بێتەوە، سـەرلەنوێ بەرهـەم هێنانـەوەی کـار تـەنیا دەتوانێـت لـە چوارچێوەی تایبەتیی بەکارهێناندا بەڕێوە بچێت. هەربۆیە پرۆسەکانی بەرهەم هێنـان و سـەرلەنوێ بەرهەمهێنانـەوەی هێـزی کـار نـە لـە پێشـدا فـەرز کـراون و نـە خودبەڕێوەبەریشن. ئەو پرۆسانە لـە کـۆنترۆڵی سـەرمایەداریدا نـین. تـاك دەبـێ بـەو قەناعەتە بگات کە کارەکەی خۆی وەك کاڵایەك هەروەك مارکس دەڵێت، لە بەرامبەر "پێخۆرێك"دا بفرۆشێت. کەوابوو کۆمەڵگای سەرمایەداری پێویستی بـە کۆمـەڵێکی تەواو لە شێوازەکانی بە قەناعەت گەیاندنە بۆ ئەوەی تاك فرۆشتنی هێزی کاری خـۆی بە شتێکی سروشتی، حاشا هەڵنەگر و ناچاری بزانێت. بە واتایەکی دیکـە دەبـێ وەك کـارێکی هەڵبـژاردنی تایبـەتی چـاو لێبکـات.[52] ئـەو دامـەزراوە و ئایـدۆلۆژیای پەیوەندیدار بەوەوە کە ئەو باوەڕەی پێدەبەخشـن، دامـەزراوەی بـازاڕە. چـونکە تـاك لێرەدا نەك وەك بەرهەمهێن، بـەڵکو وەك بـەکارهێن دەردەکـەوێت. جیهـانی بەرهـەم هێنان، چەوسانەوە و زوڵم و زۆرەکانی پرۆسـەی بەرهەمهێنان لە رێگـای ئایـدۆلۆژیای بازاڕەوە تاریك و لێڵ دەبن.

ئەوەی جێگای سەرنجە ئەوەیە کە تەنانەت ئەوەش دەرکەوتووە کە دامـەزراوەی بـازاڕی ئازاد لە کردەوەدا شتێکی ئاڵۆزە و ئایدۆلۆژیای بازاڕ هەروا بە سەر ئەندێشـەکانیدا زاڵـە. ئەو ئایدۆلۆژیایـە بـە شـێوەیەکی بەرچـاو تـا رادەیـەك لـە دامـەزراوە ئابووریـەکان جیـا

---

٥٢ - مارکس لە گرۆندریـەدا جیهانی ئاڵوگۆڕە سەپێنراوەکان بە سەر یەکسانی و ئازادیدا و جیهانی بەرهەمهێنانیش پێکەوە هەڵدەسەنگێنێت کە پرۆسەی تەواو جیاوازیان لەو رەوتەدا هەیە و ئەو یەکسانی و ئازادیە روکەشیە تێیدا دەتوێتەوە ــ و پرۆسەیەکی دژ بە ئاڵوگۆڕێکی یەکسان بەڕێوە دەچێت (١٢٠، ل٩٥).

بووەتەوە،[٥٣] بە چەشنێك كە ڕەخنەگرتن لەو بازارە ئابوورییەی كە هەیە و بە شێوەیەكی كردەكی كار دەكات، هێز و دەسەڵاتی ئەو لێكدانەوەیەی لاواز نەكردووە.

دەسەڵاتی ئەو ئایدۆلۆژیایە پشتی بەو ڕاستییە بەستووە كە "بازاڕی ئازاد" باس لە ئەگەری وەدیهاتنی هەڵبژاردن دەكات، كۆمەڵگا و ڕیزبەندییەكانی هەروەك كۆمكارێكی فرۆشگایی زەبەلاح دەردەخات كە بەكارهێن تێیدا ــ بە واتای فردریك جیمسۆن وەك "كڕیاری لێهاتوو" ــ دەتوانێ لە نێوان ئەو بەرهەمانەی كە بۆ فرۆش دادەنرێن، دەست بداتە هەڵبژاردن. بازاڕ بە هێنانە ئارای دوو خۆشباوەڕی، تاك وەك بەكارهێن دەناسێنێت. سەرەتا ئەو خۆشباوەڕییە دابین دەكات كە تاك دەستی بە هەڵبژاردنە بێسنوورەكان ڕادەگات. دووهەمیش ئەوەی تاك لە هەلومەرجێكدایە كە لە نێوان ئالترناتیڤە جۆراوجۆرەكاندا دەست بداتە هەڵبژاردن.

بەڵام بازاڕ نەتەنیا بواری ئازادی و هەڵبژاردن نییە، بەڵكو وەك دامەزراوەیەكی نەزم سەرهەڵدەدات كە تێیدا پێویستیی و مەیلی تاكەكان وەك ئامرازێك بۆ ناچاركردنی ئەوان بۆ چوونە ناو كۆمكاری فرۆشگاییەوە شكڵ دەگرێت. بازاڕ هاوتای ئابووریی "سوپاتان"ە، كە خوخدەی مرۆیی لە ئاقارێكی دڵخوازدا كۆنترۆڵ دەكات و نائازادی پێك دێنێت. بوارێكە كە تێیدا كاڵایەكی مادی بە سەر بەرهەمهێنەرەكاندا زاڵ دەبێت،[٥٤] بواری بت پەرەستی كاڵایە. لێرەدایە كە ئەو پەیوەندییە ڕاستەقینە ئاڵۆزەی كە بەرهەمهێنەر لەگەڵ كەسانی دیكە هەیەتی، دادەبەزێتە ئاستی هێزە ناتایبەتیەكانی بازاڕەوە. تاك، كە لە جیهانی كاڵاكاندا دەژیت، خۆی بە دانیشتووی جیهانی كەلوپەلەكان دەبینێت. ئەو ئاوێتەبوونەی مرۆڤەكان لەگەڵ كەلوپەلەكان، لایەنێكی بنەڕەتیی لە

---

٥٣ - بە بڕوای جیمسۆن "بەداخەوە ئایدۆلۆژیای بازاڕ ڕازێنەرەوە یان خەملێنەر یان نواندنەوەی تەواوكەر نییە كە بكرێ لە كۆڵ پرسی ئابووری بكرێتەوە و ڕەوانەی قەڵایەكی فەرهەنگی یان سەرخانی بكرێت كە لەوێ كەسانی پسپۆڕ لە سەری بدوێن. بەڵكو تارادەیەك بەرهەمی خودكالاییە، سێبەری عەینی پێویستیی ئەوە، دەبێ هەردوو ڕەهەندەكە كەم تا زۆر پێكەوە، لە وێكچوون و جیاوازیەكانیاندا بسەلمێندرێت. ئەوان... نیوەی خودبەڕێوەبەرن، واتە بە ڕاستی خودبەڕێوەبەر یان سەربەخۆ لە یەكتری نین، بەڵام بە تەواوەتیش وەكو یەك نین" (٧٩، ل٩٥).

٥٤ - ماركس لێكدانەوەی خۆی لەمەڕ سەرمایەداری بەو تێبینییەوە دەست پێكرد كە لە یەكەم نیگادا سیستەمی سەرمایەداری هەروەك كۆمەڵێكی زەبەلاحی كاڵاكان و خاوەنەكانیان خۆی دەردەخات. پەیوەندیی نێوان كاڵاكان، پەیوەندییەكانی نێوان خەڵكی لێڵ و تاریك دەكات، كاڵا بە سەر ئەندێشە و هەروەها بەسەر هەستەكانیشدا زاڵ دەبێت.

بەرهەمهێنانی کاڵایە. لێرەدا بەرهەمەکانی کار وەك شتە دەرەکییەکان، لە دەرەوەی کۆنترۆڵی ئەو کەسانەی کە ئەوانیان خوڵقاندووە، خۆ دەردەخەن. پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان نەك بە شێوەی پەیوەندیی نێوان مرۆڤەکان، بەڵکو لە نێوان بەرهەمەکانی کاری ئەواندا خۆیان دەردەخەن. لەبەر ئەوە لە نێوان راستی و دەرکەوتندا دوالیزمێك هاتوەتە ئاراوە، دووهەمیەکەیان لە ئایدۆلۆژیادا دەمەیت. هەربۆیە بازاڕ دەبێتە ئایدۆلۆژیای دەرکەوتنەکان.

ئایدۆلۆژیایەی دەرکەوتنەکان پێویستی بە بزێویی تایبەت بەخۆی هەیە. قووڵترین قوڵاییەکانی خودی مرۆڤایەتی، سەرجەمی هۆگرییەکانی خاوەندارێتی و دەستەبەرکردن کە دەبنە هۆی ئەوەی تاکی خودنامۆ هەست بکات کە بەهۆی کڕینەوە، خوخەدەی مرۆڤایەتی خۆی وەدی هێناوە، لە رێگای فرۆشیارانی ئەو ئایدۆلۆژیایەی بازاڕەوە، دەردەکێشرێت. بواری فۆرمە ماددیەکان کۆمەڵێك داواکاری بە سەر تاکدا دەسەپێنێت، کۆمەڵێك هۆگری تێدا پێك دێنێت و تاك تووشی هەستی نارەزامەندی و بێتوانایی تاکەکەسی دەکات. تاك بە تێربوونی ئیشتیا خەیاڵی و هۆگرییە توندەکانی، هەست دەکات دوورکەوتنەوەی لەو ستەمە کارێکی ئەستەمە. زاڵبوونی کاڵا بە سەر سەرجەم چالاکییەکانیدا، سەربەخۆیی تاك سنووردار دەکاتەوە، ناچاری دەکات لەو کۆبوونەوەیەدا بەشوێن ئەو بەختەوەریی خۆشباوەڕانەی بگەڕێت کە لە کەلوپەلە ماددییەکانەوە سەرچاوە دەگرن. ئەمە زۆرەملێ بوونی خشتەی ئەرکەکان، پەیوەندییە ئامرازییەکان و دەستەبەرکردن وەك گرنگترین لایەنی ژیانی لێدەکەوێتەوە. پێناسەکەی وەك بەکارهێن بە سەر پێناسەی بەرهەمهێنەرانەی ئەودا زاڵ دەبێت.

هەبوونی پارە وەك نێوبەندی گشتگیری ئاڵوێری بازاڕ، ئاڵوێری نێوان کاڵاکان زیاتر ئاڵۆز دەکات. دوایین پەیوەندیی لێڵ و تەماوی، پارەیە (بەر بە پەیوەندیی روونی نێوان مرۆڤەکان دەگرێت. و.ف) لە گەڵ زاڵبوونی پارە، بەهای سەرجەم کاڵاکان، هەم لە پێشدا و هەم دوای کاری ئاڵوێر، دەکرێ هەڵسەنگێندرێت. مارکس لەگرۆندریسەدا نیشانی دەدات کە پارە بەچ شێوەیەك کە سەرەتا خۆی کاڵایەکە، گرنگیی ئاڵوێر و گرنگیی ئاساندنی هەیە، و دواتریش پەیوەندیی دەرخستنی بەهای هەیە، لەوەی دەریدەخات جیا دەبێتەوە و وەك هێمایەك پلەوپایەی کۆمەڵایەتیی خودموختاری بەدەست دێنێت — دەرخەری قبوڵکردنی کۆمەڵایەتی، نوێنەری دەسەڵاتی کۆمەڵایەتی کە دەکرێ لە گیرفانی خۆتدا هەڵیبگری و جێگای ئیرەیی و چاوچنۆکیشە. چونکە دەکرێ بەخاتری خۆی بتەوێت،

ژیانێکی تایبەت بەخۆی دەدۆزێتەوە و بە وتەی مارکس دەبێتە "خوای بەغیرەتی ئیسرائیل".

پارە فۆرمێکی خەیاڵیی کاڵایە، چونکە لەو پلەوپایەوە کە پێشووتر پەیوەندیی ئاڵۆزێر بووە، بۆ پلەوپایەی دەسەڵاتی کۆمەڵایەتیی هەڵکشیوە. هەر بۆیە سەرسوڕهێنەرترین شتە — "جیهانێکی سەراوینە". لەجیاتی ئەوەی نوێنەری بەهاکان بێت، بەکردەوە جیهانی بەرهەمهێنان و ناواتەکان، ئێش و ئازار و خۆزگەی کەسانێك کە کارەکەیان خولقێنەری بەرهەم بووە، لە ئێمە دەشارێتەوە. بەکارهێنانی پارە هەموو چەشنە زوڵم و زۆرێك دادەپۆشێت. مارکسیستی جوگرافی زان، دەیڤید هارۆی دەنوسێت:

کاتێك کە یەك شت (پارە) لەگەڵ شتێکی دیکە (کاڵا) مامەڵەی پێ بکەین، بارودۆخی کاروژیان، هەستی تاموچێژ، توندوتیژی یان دڵساردبوونەوە کە لەودیوی بەرهەمهێنانی کاڵاکانەوەیە و حاڵەتە زەینیەکانی بەرهەمهێنەران، هەموویان لە ئێمە شاراوەن. دەتوانین نانی بەیانیی خۆمان بخۆین بێ ئەوەی بیر لەو بەر هەزاران کەسە بکەینەوە کە خەریکی بەرهەمهێنانی بوون. سەرجەم نیشانەکانی چەوسانەوە لە کاڵایەك داتاشراون (نانی رۆژانە جێگا پەنجەی چەوسانەوەی پێوە دیار نییە) (٦٦، ل١٠١).

جیهانی چەوسانەوە نەماوە و خەڵکی بەنیسبەت لەخۆنامۆبوون، کەمتەرخەم دەکات. حسابکردنی پارە، جیهانی کۆمەڵایەتیی ئەو کەسانەی کە بۆ نانی رۆژانەمان پێویستیمان پێیانە، لە ئێمەی شاردۆتەوە.

پارە سەرجەم پەیوەندییەکان و جیهانی ئاڵۆزی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان چارەسەر دەکات.[٥٥] کۆمەڵێکی خەیاڵاوی دەخولقێنێت کە تێیدا هەموو بەهاکان رێژەیین، نوێنەری

٥٥ - مارکس لە گرۆندریسەدا دەنووسێت: "چونکە پارە یەکسانە بە توانایی کڕین، هەموو شتێك دەبێ بکڕدرێت، دەکرێ هەموو شتێك بکرێتە پارە. بەڵام تەنیا لە رێگای نامۆکردنەوە، بە ستاندنی لە خاوەنەکەی، دەکرێ بکرێتە پارە. کەواتە مردەماڵە هەتاهەتاییەکان و پەیوەندییە خاوەندارانەییە نەگۆڕەکانیان ، لە رووبەڕووبوونەوە لەگەڵ پارەدا لێك هەڵدەوەشێن. لەوەش زیاتر چونکە خودی پارە تەنیا لە هێنان و بردندا بوونی هەیە و لە جیاتی شتە بەکارهێنەکان و هتد ئاڵوێری پێدەکرێت — ئەو بەهایانەی کە هەموویان لە ناکامدا تا ئاستی تاموچێژی تاکەکەسی دادەبەزن، واپێدەچێت کە هەموو شتێك تا ئەو جێگایەی کە تاك دەستی پێی رادەگات، پڕبایەخ بێت (١٢٠/ل٣٩).

بەهای هەموو شتەکان دەبێتە خەڵك و پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان. کاڵا و گرنگترین کاڵا واتە پارە بەم جۆرە پەیوەندییە تایبەتییە کۆمەڵایەتییەکان بەفیڕۆ دەدات و بە بارهێنانی پەیوەندییە عەینی و ئامرازییەکان، پەیوەندییە تایبەتیەکان هەڵدەوەشێنێتەوە. گیۆرگ زیمل کاریگەریی پارە لە سەر پەیوەندییەکان، ئەنجومەنەکان و کار و کلتوری مرۆیی بەجوانی هەڵسەنگاند. بە بڕوای زیمل پارە بە پێچەوانەی فۆرمەکانی دیکەی سەروەت و سامان، شتێکی بە پیت و فەڕە و بوار بۆ نەناسراو بوونی تاك خۆش دەکات. پارە تەنیایە و هیچ چۆنایەتیەکیشی نییە. سەپاندنی دەسەڵات لە ڕێگای دوورەوە خۆش دەکات و وادەکات کە چینی باڵادەست نەناسرێن. ئابووریی پارە رازیبوون و سوکایەتی بۆ تاك پێك دێنێت و پەیوەندیی نابەرپرسیارانەی لێدەکەوێتەوە. زیمل بە دەنگدانەوەی مارکس و شێوە دەربڕینێکی خەماوی لەمەڕ لەدەست چوونی لایەنی خودڕابوو لە پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکاندا و زۆربوونی پەیوەندیەکانی ئاڵۆوێر قسە دەکات کە لەواندا شتە مادیەکان بە سەر هەموو لایەنەکانی کۆمەڵگادا زاڵ دەبن (١٩٧٨).

زیمل خەمی لەدەست چوونی بکەرێکەیەتی کە چونکە درێژەی لۆژیکی ئاڵوێری کاڵاییە، زەینی مرۆیی هەژار دەکات. پارە حسابێکی سارد و توندی بەها مرۆییەکانە، توانای دەربڕینی مانای تاکەکەسی یان تایبەتیەکانی نییە، چونکە بەواتایەکی وردتر خاوەنی توانایی دەربڕینی چەندایەتیی بەهاکانە. بوونەوەرە مرۆییەکان و پەیوەندییەکانی ئەوان لێك هەڵدەوەشێنێتەوە، چونکە تاك لەواندا هەتا ئاستێکی گشتی هاوئاست دەچێت کە هەر شتێکی شیاوی فرۆشتن، بەتایبەت خودی پارە تێیدا بەشدارە.

کاتێك کە پارە بوو بە تەنیا پەیوەندیی نێوان مرۆڤەکان و خودی کاڵا توانی شوناسی خۆی لەدەست بدات، پەردەیەك بە سەر زوڵمە کۆمەڵایەتییەکاندا کێشراوە. چونکە لۆژیکی بازاڕ پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان ڕێکدەخات، حساب و کیتاب جێگەی پەیوەندیی گەرمی نێوان تاکەکان دەگرێتەوە، ئابووریی پارە ململانێی خۆویستانە بار دێنێت و دۆستایەتی لەناو دەبات. زیمل ئەو لێکدانەوە هیگڵیە لە مەڕ خولقاندنی جیهانی نوێ سەرلەنوێ دەخولقێنێتەوە کە خۆویستی و چاوچنۆکی کە پەیوەندییە مرۆییەکان لاواز دەکات لە هێماکانی ئەوە و تاکەکان تێیدا وەك "خۆویستییە ئابوورییە حسابگەرە وشیارەکان" لەگەڵ یەکتری بەرەوڕوو دەبنەوە. جیهانی نوێ کەسانی تەوقیت کراوی خولقاندووە. جیهانی ململانێی بارهێناوە و بە وتەی زیمل "کەسایەتیە بێ بنەماکان"ی دروست کردوون. جێگاوشوێنی چینایەتی لەتاك

حەشار دەدرێت، ستەمە کۆمەلآیەتییەکان پەردەپۆش دەکرێن و پەراوێزخستنەکانی کۆمەڵگای مەدەنی تاریك و لێڵ دەبێت.

رەفتارەکانی چینی باڵادەست بە وردی ئاگاداری لەو بەهایانە دەکەن، چونکە جیهانی پروپاگەندە و راگەیەنەرە جەماوەریەکان، بەشێوەیەکی بنەڕەتی بەکارهێنخوازی دەچێنن. بازاڕ ئیتر شوێنێك بۆ سەرلەنوێ بەرهەمهێنانەوەی هێزی کار یان مەیدانی ئالۆویێر نییە، نواندنەوەی شێوەکارانەی جیهانی ئەو ویستانەیە کە بە چەشنێکی دەسکرد خولقێندراون و ئەو شێوازانەی ژیانە کە تێیدا تاك بە هۆی فەرمانی دەروونناسیی خاوەنی ئەو هێما بەختەوەرانەیە و بە زۆری دەچێتە نێو سیستەمەکەوە. بازاڕ هەروەك بوارێك لە بەکارهێنان خۆی دەردەخات کە پێداویستیەکان و داخوازیە تایبەتیەکان تێیدا هەم دەخولقێندرێن و هەم دابین دەکرێن، و کار هەروەك پێویستییەك بۆ دابینکردنی ئەو پێداویستیانە دەردەکەوێت. زیادکردنی ئەو پێداویستیانەی کە فیکری بەکارهێن خوازی دەخولقێنن، خەڵکی رەوانەی بازاڕ دەکات.

فرۆشتنی زۆرملێی ئەو فیکرە یارمەتی قبولکردن و لە راستیدا تەنانەت یارمەتی بە بێدەرەتانیی بازاڕیش دەکات. جیمسۆن دەنووسێت "تاموچێژەکانی بەکارهێنان، شتێکی زۆر زیاتر لە پێشهاتە خەیاڵیە ئایدۆلۆژیکەکان نین کە بۆ بەکارهێنە ئایدۆلۆژییەکان دابین کراون کە ئەوانەیان بۆ تیۆری بازاڕ کڕیون کە خۆیان بەشێکن لێی" (٧٩، ل١٠٤). ئایدۆلۆژیای بازاڕ وەك ئایدۆلۆژیای بەکارهێن خوازی، سەرلەنوێ زاڵبوونی سەرمایە بەرهەم دێنێتەوە، و بەم جۆرە بازاڕ نەتەنیا وەك دیمەنێك بۆ سەرلەنوێ بەرهەمهێنانەوەی کاری کرێگرتە، بەڵکو خزمەتی سەر لەنوێ بەرهەم هێنانەوەی ئایدۆلۆژیای سەرمایەداریش دەکات، چونکە ئەو کڕیارە شارەزایانە لە بوارەکانی سیاسی، فەرهەنگی، پیشەگەری و کۆمەڵآیەتیدا، مافی ئازادیی خۆیان بۆ دیاریکردنی هێماکانی دامرکاندنەوەی تایبەتیی خۆیان دادەسەپێنن. کۆت و بەند و زنجیرە تایبەتیەکانی خۆیشیان هەڵدەبژێرن.

لە ئاکامدا بازاڕ، راستیەکانی نایەکسانیی کۆمەڵآیەتی دەکاتە شتێکی عەقڵانی و رێگەپێدراو. لەوانەیە نەبێتە هۆی نایەکسانیی کۆمەڵآیەتی، بەڵام بە کۆمەڵێك لەو ئەفسانە و ئەندێشانەی کە تاك وەك بەشداری ئازاد و دیاریکەری بازاڕ دەناسێنن، سەرلەنوێ بەرهەمی دێنێتەوە. تاکەکان کە بە شێوەی ئەندامانی چینەکان دەچنە نێو کۆمەڵگای مەدەنییەوە، لە رێگای ئەو ئەفسانانەوە زۆر بێبەزەییانە رێك دەخرێن. بازاڕ وەك لایەنی پێکهاتەیی کۆمەڵگای مەدەنی بەهاکان وچالاکییەکان دەکاتە شوێنکەوتووی لۆژیکی بێبەزەییانەی خۆی. بەواتایەکی دیکە ملهوڕیی بنەمای پێکهێنەری زاڵی ئەوە.

بازاڕیش زۆرەملێخوازە چونکە گوتاری بازاڕ گەڕانەوە بۆ خودە و ئاماژەیەك بەو بارودۆخە ناکات کە تاکەکان تێیدا کاری هاوبەشیان هەیە، هیچ ئاماژەیەك بەو کاڵایانە ناکات کە لە بازاڕدا دەخرێنە ڕوو، و هیچ ڕوونکردنەوەیەك نادات سەبارەت بەوەیکە خاوەنی کاڵاکە، بە چ شێوەیەك ئەو کاڵایەی دەستەبەر کردووە. بە واتایەکی دیکە هیچ ئاماژەیەك بەوە ناکات کە ئایا تاك دەستی بە پێداویستیی پێویست بۆ چوونەناو کۆمەڵگای مەدەنی ڕادەگات یان نا؟ ئایدۆلۆژیای بازاڕ لە ئاکامدا پاساوی دوورخستنەوە لە کۆمەڵگای مەدەنی دەکات.

ئەگەر دامەزراوەی بازاڕ وەك لایەنی پێکهاتەیی توندوتیژیخوازە، کەواتە چوونەناو ئەو بوارە سنووردارە. ئاکامەکەی ئەوەیە کە گوتاری گشتی لە کۆمەڵگای مەدەنیدا نە دەتوانێ گشتی بێت و نە دیموکراتی. ئەو تاکەی کە لە قەڵەمڕەوی کۆمەڵایەتی و ئابووریدا نایەکسانە ناتوانێت لە قەڵەمڕەوی سیاسیدا یەکسان بێت. هەڵسەنگاندنی بازاڕیی شێوازە جۆراوجۆرەکانی خاوەندارێتی، زنجیرە پلەوپایەیەکی لە کەسایەتیە خاوەن بەها نایەکسانەکان لێ دەکەوێتەوە کە سەرەڕای قبوڵکردنی ڕوکەشیانەی مافە یەکسانەکان و یەکسانیی تاکەکان، بە ڕوونی توانایی جیاوازیان بۆ وەدیهاتنی خۆیان هەیە.

مەبەست ئەوە بووە کە کۆمەڵگای مەدەنی وەك بواری گشتی و یاسایی، شوێنێکی کراوە و بەربڵاو بێت، بەڵام ئەو کەشە خۆی لە ڕێگای ئەو پرۆسانەوە سنووردار دەکرێت کە هەم دەوڵەت و هەم کۆمەڵگای مەدەنی دایاندەسەپێنن. کۆمەڵگای مەدەنی لەوانەیە هۆکاری نایەکسانی یان ستەم نەبێت، بەڵام ئەفسانەکان بەرهەم دێنێت و باڵادەستیی چینایەتی و باڵادەستیی دەوڵەت بەرهەم دێنێتەوە، و دەوڵەت و کۆمەڵگای مەدەنی پێکەوە ڕێوشوێنەکانی بەرهەمهێنانی ئەو کۆمەڵگایە تەئید دەکەن.

## قەڵەمڕەوی گشتیی کۆمەڵگای مەدەنی تا چ ڕادەیەك گشتییە؟

ئەو بەڵگانەی کە تا ئێرە باس کران، بەکورتی دووپات دەکەینەوە ـــ کۆمەڵگای مەدەنی شوێنێکی گشتییە کە تێیدا تاکەکان بە مەبەستی جۆراوجۆر هەم لە پێناو بەرژەوەندیی خۆیاندا و هەم بۆ سەرلەنوێ بەرهەمهێنانەوەی ئەو شتەی کە پێی دەگوترێ کۆمەڵگا، کۆ دەبنەوە. ئەوە شوێنێکی گشتییە چونکە بە شێوەیەکی گشتی لە بەر دەستی هەمووان دایە، و بە پێی بنەما هەمووان وەك کەسی خاوەن ماف، ئیزنی چوونەناو ئەو بوارەیان هەیە. سەرهەڵدانی مێژوویی ئەو چوارچێوەیە پێشکەوتنخوازانەیە و تەنانەت ڕزگاریدەریشە چونکە تاك لە زنجیرە پلەوپایە

ریشەدارە کۆمەڵایەتییەکان ڕزگار دەکات و ئیزنی کاری بەرامبەری پێدەدات لەو شوێنانەدا کە پێشووتر لێك جیابوون. دانیشتوانی ئەو شوێنە لە ڕێگای ئەو پەیوەندییە کۆمەڵایەتیانەوە کە لە شوناسی نوێ و دامەزراوەی نوێ سەریان وەدەرناوە، پێکەوە گرێ دراونەتەوە.

ئەو شوناسە سەرنجڕاکێشن، چونکە مافەکانیشیان لەگەڵدان. کۆمەڵگای مەدەنی لە بواری سیاسییەوە وەك شوێنێکی گشتی خۆی دەردەخات کە گوتارێکی سیاسی لە نێوان ئەو خەڵکانەدا دێنێتە ئاراوە کە لە بارودۆخێکی ئازاددا ئاڵوگۆڕی بیروڕا دەکەن. ئەو ڕاستییە بۆ دیموکراسی شتێکی چارەنوس سازە چونکە لێرەدا دانپێدانانەکان و نارەزامەندییەکان لەمەڕ خوخدەی دەسەڵات، ڕێکخراوی دڵخوازی کۆمەڵگان و پەیوەندیی ئەو لەگەڵ دەوڵەت بەڕێوە دەچن. بەڵام کەشە گشتییەکانی دیموکراتی نەتەنیا پێویستیان بە گشتییەت و باسی ئازاد و کراوە هەیە، بەڵکو بە پێی بنەما دەبێ هەمووان دەستیان پێی رابگات بۆ ئەوەی سەرجەم نوێنەرایەتیەکان بتوانن قسە بکەن و قسەکانیشیان ببیسترێت. بەڵام هەروەك دیتومانە هەندێك لە دەنگەکان نابیسترێن، بەر بە هاتنی هەندێك لەدەنگەکان دەگیرێت، و هەندێکیشیان ڕێکوپێك دەکرێن چونکە چارەڕەشیەکان و چەوساندنەوەکان هەمدیسان بەرهەم دێننەوە.

باسەکە بەو چەشنەی کە کلهۆن گەڵاڵەی دەکات تەنیا پرسی دەستڕاگەیشتن بە گوتارە. "ئەو دەستڕاگەیشتنە ئاوا بە ئاسانی بریتی نییە لە ویستی گوێڕاگرتن بۆ قسەی کەسانی دیکە، بەڵکو بریتیە لە پرسەکانی وەك دابەشکردنی هەموو جۆرەکانی فێرکارییەك کە توانای خستنەڕووی بەڵگەی "باش" بە قسەکەران دەدات. جیاواز لەوەش پرسی گرنگیی بەڵێنی ئایدۆلۆژی خستنە پەراوێزی جیاوای پێگە... لە یەکسانیخوازی لێکدانەوەی فیکری دایە" (١٢١، ل٢٧٤). لە بارودۆخێکدا کەتاك لە بواری کۆمەڵایەتییەوە نایەکسان و لە بواری فەرهەنگییەوە خراوەتە پەراوێزەوە، لە بواری ئایدۆلۆژیەوە پەراوێزخراوە و لە بواری سیاسییەوە بێبەشە، وەها کەشێك ناتوانێ گشتی بێت.

بواری گشتی وەك کەشێکی سنووردار سەرهەڵدەدات. بەڵام پرۆسە پەراوێزخراوەکان تەنیا لە دەرەوەی ئەو قەڵەمڕەوە نین، بەڵکو خودی کۆمەڵگای مەدەنی لە ڕێگای چالاکییە ئەفسانەییەکان و هێژمۆنی گوتاری بۆ خستنە پەراوێزی شێوازە دیاریکراوەکانی سیاسەت کار دەکات. سنوورەکانی کۆمەڵگای مەدەنی خاوەنی پێکهاتە و توانای خستنە پەراوێزیان هەیە و لە نێوخۆی ئەو چوارچێوەیەدا کۆمەڵێك ڕێگاچارە بۆ زاڵبوون بنەڕەتیی کراونەتەوە. ناکرێ کۆمەڵگای مەدەنی بەو شێوەی کە لە قسەوباسەکاندا دەبیسرێت، بە شێوەی بنەڕەتیی بوونەوەی

ئەندێشەکان و ئەرکەکان لێیان تێبگەین و بیانناسێنین کە خزمەت بە بەرتەسک کردنەوەی دەسەڵاتی دەوڵەت دەکەن و بەڵێنی رزگاربوون لە هەر چەشنە ستەمێك بە تاك دەدەن. کۆمەڵگای مەدەنی لە لایەنە پێویستیەکانەوە پوچەڵکراوەیە و بە شێوازی جۆراوجۆر تاکەکان لە نێوخۆیدا گۆشەگیر دەکات و رێکوپێکیان دەکات. فۆرمەکانی ستەم لەوانەیە زۆر رێکوپێك و هەست پێنەکراو بن، بەڵام سەرەڕای هەمووی ئەوانە شتێکی راستەقینەن.

بەڵام دەست بەسەرداگرتنی مێژوویی ئەو کەشە لە رێگای رەفتارە زاڵەکانەوە رەتناکاتەوە. هۆکارەکەشی ئەوەیە کە بوونی کۆمەڵگای مەدەنی، کۆمەڵێك پێداویستی بۆ دەست بەسەرداگرتنی سەرلەنوێ لە لایەن بزووتنەوە جەماوەریەکانەوە، دەخاتە روو. کۆمەڵگای مەدەنی بۆ توێژە جەماوەریەکان هەلی وا دەرەخسێنێت کە سەر لەنوێ بتوانن دەست بە سەر ئەو کەشەدا بگرنەوە، سیاسەتی چینە باڵاکان شکڵ پێبدەن و نێوبەندی بکەن. لەو رووەوە وەها دەرفەتێك دەرەخسێنێت کە بەهاکانی کۆمەڵگای مەدەنی هێزی هەڵخڕێنەریان بۆ دیموکراتی بوونی کۆمەڵگا دابین کردووە و دەتوانن دابینی بکەن. چونکە رێك ئەو بەهایانەن کە بوونەتە گۆڕەپانی ململانێی ئەو گروپانەی کە خوازیاری دەستڕاگەیشتن بە کەشی دەربڕینی بوونی دیموکراتیی خۆیانن. شەت(SHETH) دەنوسێت: "کردەوەکانی ئەم دواییانە لە مافی مرۆڤدا، بە گروپە جۆراوجۆرەکان، کار و خەبات، شێوەی رێکخستن و بەدەسەڵات گەیشتنی خێڵەکان، دالیتەکان، هەژارە گوندنشینەکان و ژنیان بەدەستەوە گرتووە. هیوا ئەوەیە کە ئەوان لە رێگای ئەو رێکخراوانەوە، پێداویستیەکانی خۆیان باس بکەن و ویستەکانیان بەرەوپێش بەرن ئەویش نەك وەك پەیڕەوێکی پاسیڤ بەڵکو وەك ئەو هاووڵاتیانەی کە پشتیان بەخۆیان بەستووە بۆ ئەوەی مافی رەوای خۆیان بۆ مانەوە و ئاسودەیی بسەپێنن" (١٦٩، ل٣١). هەرچییەك بێت سەرجەم کۆمەڵگا مەدەنییەکان نەك لە رێگای دەوڵەت یان چینە باڵاکانەوە، بەڵکو لە رێگای خەباتە کۆمەڵایەتییەکانەوە کە لە کۆمەڵگای مەدەنییەوە سەریان هەڵداوە و لە بنەما و بەهاکانی راگەیەنراوی کۆمەڵگای مەدەنی ئیلهامیان وەرگرتووە، پەرەی سەندووە.

کەوابوو ئەو بوارە توانای بێ تێکهەڵچوون لە گۆڕەپانی سیاسیدا دەخاتەڕوو، هەربۆیە هەرچەشنە پشت بەستنێك بە کۆمەڵگای مەدەنی، بانگهێشت کردنە بۆ گرژی سیاسی، بە واتایەکی دیکە بانگهێشتێکە بۆ دەستبەسەرداگرتنی کەشی سیاسی و کۆنترۆڵی بەرنامە سیاسییەکان. ئێستا دەبێ باسی ئەو خەباتە و ئیمکاناتە بێ سنوورەکەیان بکەین بۆ گۆڕانی چوارچێوەی گشتی.

## کۆمەڵگای مەدەنی، گۆڕەپانی مشتومڕ:

لە بەشی پێشوو تەرکیز لە سەر پوچەڵبوونەوەی هێزی رزگاریدەری کۆمەڵگای مەدەنی و دەست بەسەرداگرتنی لە لایەن چینە باڵادەستەکان و دەوڵەتەوە کرایەوە، هەر بۆیە هێزی ئەو بۆ ئەرکە و وەك شوێنێك کە تێیدا گوتارێکی گشتی سیاسی رزگاریدەر و گشتگیر دەتوانێ سەر هەڵبدات و خۆی پتەو بکات، تووشی خەسارەتێکی زۆر بووە. بەڵام دەست بە سەرداگرتنی ئەو کەشە لە رێگای چینە باڵاکانەوە، لە بایەخی ئەو کەم ناکاتەوە. چونکە گوتاری کۆمەڵگای مەدەنی فۆرم و ئەندێشەی جۆراوجۆری لە مەڕ شێوازەکانی دڵخوازی رێکخستنی پەیوەندییەکانی دەوڵەت و کۆمەڵگا بناغەرێژی و بنەڕەتیی کردۆتەوە. سەقامگیربوونی شوێنێك بۆ سیاسەتی دیموکراتی لە دەرەوەی سنووری فەرمییەکانی دەوڵەت و بنەڕەتیی بوونەوەی ئەم بایەخانە لە بواری مێژووییەوە، پێشکەوتنخوازانە بووە. واتاداربوونی ئەو بوارە، گوتارێکی پێکهێناوە کە ئەوەندە خۆی گونجاندوە کە گشتاندنەکەی شۆڕشگێڕانە بێت. هەروەك چۆن هابرماس باس لەوە دەکات کە پێکهاتنی گوتارێکی گشتی، پشت بەستن بە فۆرمە گشتییەکان، تاقانەکان، بابەتی و لەبیرنەکراوەکان هان دەدات، کە تێیاندا "عەقڵێك زاڵە کە ئەوەی راستە لەگەڵ ئەوەی بەرحەقە، لێك دێنەوە، سەپاندنی دەسەڵات تەنیا بە بەڕێوەبەرێکی ئەو فۆرمانە دەسپێردرێت" (٦٤، ل٥٣). لە راستیدا بە بێ هەبوونی بوارێك کە تێیدا گوتارێك کە لە مەڕ دەوڵەت ـ کۆمەڵگا و پەیوەندییەکانی نێوخۆی کۆمەڵگا بتوانێ لە ئازادییەکی رێژەیی لە دەوڵەت بەڕێوە بچێت، ناکرێ بیر لە دیموکراسی بکرێتەوە. ئەگەر پێویستیی ئەو بوارە قبوڵ و گەرەنتی نەکرێت و داکۆکی لێ نەکرێت پێشهاتی بەرینتری بەشداریی لە پرۆسەی بڕیارداندا لەکران نەهاتوویە. هەربۆیە هەبوونی کۆمەڵگای مەدەنی لەگەڵ دیموکراسی سیاسی، ئەگەر کۆمەڵایەتیش نەبێت، پەیوەندییەکی لێك دانەبڕاوی هەیە. هەروەك دیتوشمانە هەوڵدان بۆ نابوتکردنی دیموکراسی هەمیشە هاوکات بووە لە گەڵ هەوڵدان بۆ خەسارەت لێدانی کەشی کۆمەڵگای مەدەنی.

بەڵام ئەگەر ئەو بوارە گشتییە هەمووان نەگرێتەوە، بیرکردنەوە لە دیموکراسیش لەکران نەهاتوویە. سنووردانان بۆ بەشداریکردن دەبێتە هۆی ئیفلیج بوونی دیموکراسی. کەوابوو

دیموکراسی پەیوەندییەکی دوولایەنەی لەگەڵ چوارچێوەی گشتی هەیە. دیموکراسی بە بێ پانتایی گشتی ناتوانێ لە ئارا دابێت، بەڵام ئەگەر ئەو پانتاییە کراوە و دەرخەری هەمووانیش نەبێت، دیموکراسی بوونی نابێت. بەدڵنیاییەوە خەبات بۆ لە خۆگرتن و دەرخستنی ئەو بوارە لە لایەن گروپە پەراوێزکەوتووەکانی کۆمەڵگا و زۆرجارانیش لە دەرەوەی سنوورەکانی کۆمەڵگای مەدەنی، بەڕێوە چووە، بەڵام ئەو خەباتانەش سەریان هەڵنەدەدا، مەگەر کەشێك بووبێتن کە لەواندا ئاواتەکانی ئەم گروپانە ئەگەری دەربڕینیان هەبێت.

بەڵام هەبوونی کۆمەڵگای مەدەنی بەس نییە، دەبێ بەهاکان و فۆرمە دیموکراتیەکان بچەسپێنێت، و چونکە گوتاری فەرمی کۆمەڵگای مەدەنی گوتارێکی گشتی و هەمەلایەنەیە، کۆمەڵێك بەها دەخولقێنێت کە خەبات بۆ چوونەناو ئەو بوارە دەتوانێ لە دەرەوەی ئەوان ڕێکبخرێت. هەبوونی کەلەبەری نێوان ئەو فۆرمانە و دامەزراوەکانی کۆمەڵگای مەدەنی بانگهێشتێکە بۆ تێکهەڵچوون لەگەڵ ئەم دامەزراو و ڕەفتارانە. ئەم تێکهەڵچوونانە بەتایبەتی شێوازی بانگەواز بۆ قبولکردن و گونجاندنی ئەندامانی پەراوێزخراوی ئەو چوارچێوەیەی هەیە، پەرەپێدان بە بنەما بەشداریخوازانەکانی ئەم قەڵەمڕەوە و پەیوەندیی ئەو لەگەڵ دەوڵەت، ئەگەر لە پێناو ژێروژوور کردنی بنەماکانی ئەم دامەزراوەیەدا نەبن، بە مەبەستی چاکسازین. مێژووی خەباتە کۆمەڵایەتییەکان لە سەر ئەو بەهایانەی کە چەمکی کۆمەڵگای مەدەنیش هاوڕێیانە، و بەتایبەت یاسا، شایەتی ئەوەیە.[٥٦]

ناوەرۆکی سەرەکیی کۆمەڵگای مەدەنی، خۆڕاگریی سەربازی لە ڕێگای مافەکان و ریزبەندەکەیان لە نەزمێکی یاسایی و دامەزراوەیی دایە. مافەکان لەو رووەوە لە ژیانی سیاسیدا گرنگن، کە ئاگایان لەو چوارچێوە بنەڕەتییە هەیە کە لەگەڵ مرۆڤەکان بەچ شێوەیەك

---

٥٦ - کوتاری و ستی بەمچەشنە بۆچوونی خۆیان دەردەبڕن: مافی مرۆڤ ئێستاش هەم لێکدانەوەیەکە سەبارەت بە راستیەکان و هەم کۆمەڵێکی پەرستێن لە ئامانجەکانی خوازیاری وەدیهاتنە، و وەدیهاتنی ئەوان تەنیا لە رێگای پرۆسەیەکی خەباتی هەمیشەییەوە دێتە ئاراوە. کەوابوو لە کاتێکدا کە پشت بەستن بە یاسا یان بە دەوڵەت بۆ سەپاندنی یاسا و ڕەتکردنەوەی یاسا نوێیەکان هەروا ڕێگاچارەیەکی گرینگ و تەنانەت ڕەنگە سەرەکیش لە گۆڕانکارییەکانی بارودۆخی مرۆیدا دەمێنێتەوە، هێنانە ئارا و پەرەدان بە کارێکی کۆمەڵایەتی، کە ڕەگ و ریشەی لە پێویستیی زۆر لێکراوترین کۆمەڵەکاندا هەیە، و دەیهەوێ نۆرمی هاوبەش بۆ بوونێکی ئەمرۆیی بخولقێنێت، هەر بەو رادەیە گرینگ دەبێت. (٩١، ل٩).

دەبێ هەڵسوکەوت بکەن. ئەوان سەبارەت بەوەیکە مرۆڤەکان چ مافێکیان هەیە، بڕیاری کۆتایی دەدەن. ئەو تێبینییە، سەرجەم تێبینیەکانی دیکەی بەرژەوەندیی و قازانج دەخاتە پەراوێزەوە. بە واتایەکی دیکە، مافە بێتاوانە بنەڕەتیەکانی تاکەکان شرۆڤە دەکەن. وە ئەگەر ئەو گوتەیە کە دەبێ لەگەڵ هەر تاکێك بە ڕێز و حورمەتەوە هەڵسوکەوت بکرێت، ببێتە بنەمای ئەخلاقی و مەدەنییەتی سیاسی، مافەکان دەبنە چەکێك بە دەستی تاکەکانەوە کە دەکرێ لە دژی دەوڵەتەکان و کۆمەڵگاکان بەکار ببرێن. بە گوتەی بەکسی(BAXI) "قسەکردن سەبارەت بە مافەکانی مرۆڤ، بیری نافەرمانیی بەهێز بۆ باشتربوونی چارەڕەشی بێبەشان و زوڵم لێکراوان و هتد دێننە ئاراوە. لە سەردەمێکی مێژوویدا، مافە مرۆییەکان ئەو موژدەیە دەدەن کە مافەکانی سەرجەم مرۆڤەکان، مرۆڤایەتی دەبن (٩، ل١٥٨).

مافەکان لەو ڕووەوە بۆ چالاکانی سیاسی سەرنجڕاکێشن کە ئەگەر ویستەکانی ئەوان وەك ماف قبوڵ بکرێن، ئەوان دەتوانن بە فۆرم و دامەزراوە قبولکراوەکان لە ڕێگای ململانێوە لەگەڵ بەها ئەخلاقیەکانی ئەوان ململانێ بکەن. ئەوان دەتوانن لە سەر ئەوە پێداگری بکەن کە ریزبەندییە دامەزراوەییەکان، ریزبەندیی کۆتایی نین، کۆمەڵێك بنەمای ئەخلاقیی گشتیی هەن کە لە ڕێگای ئەوانەوە دەکرێ ئەو بنەمایانە هەڵسەنگێندرێن. داواکاریەکانی بەرێز نرخاندنی مافەکان دەتوانێ، کاریگەرییەکی رزگاریخوازانەی هەبێ، چونکە خوازیاری مافەکان دەتوانن بە پشت بەستن بە بەهاکانی خودی ئەو نەزمیە سەقامگیرە لەگەڵ ڕەفتارەکانی کۆمەڵگای مەدەنی خەبات بکەن. مافەکان بەو ڕوپۆشە دەتوانن کاریگەرییەکی رزگاریدەرانەیان هەبێت.

یوپندرا بەکسی دەنووسێت "مێژوو ئەوەی نیشان داوە کە بۆ ئەوانەش کە ژێر چەپۆکەن، ئەگەری گەیشتن بە مافەکان وەك ئامرازێك لە خەبات بۆ چاکسازی لە ئارا دایە. دەوڵەت کە خۆی وەك تەنیا دامەزراوەیەك بۆ وەدیهاتنی بەرژەوەندیی گشتیی کۆمەڵگا دەناسێنێت، ناتوانێ بەر بە کەڵك وەرگرتنی بەرامبەر لەم ئەندێشەیەی مافەکان بگرێت. و چونکە ناتوانێ دەبێ هەر هەمان مافی ئازادیش بە زۆرلێکراوان بدات (هەمان سەرچاوە، ل١٦١).

هەڵبەتە ئەوە ڕاستییەکی مێژووییە کە مافەکان هیچکات ئەوەندەی کە شیاویانە شمولیان نەبووە. حکومەتەکان و کۆمەڵگا مەدەنییەکان زۆربەی کاتەکان سیستەمێکی سەروگوێ بڕاوی مافەکانیان ڕاگرتووە کە زیاتر لە سەر بنەمای دوورخستنەوەیە نەك ڕاکێشان. ئەگەر مافەکان هەر بەو چەشنەی کە لە سەرەوە باسکرا، بوونە بنەمای رزگاریبەخش، ئەگەر چەکێك بوون بۆ پەرەسەندنی مافی دەنگدان، بەهۆی خەباتی کۆمەلایەتییەوەیە، خەباتی چینەکانی

ژێردەستە، بە شێوەیەکی بەرچاو بە تەواوەتی مەڵبەندی مافەکانی داگرتووە. هەر تیۆرێکی گەشەستێن سەبارەت بە کۆمەڵگای مەدەنی دەبێ ئەوە لەبەر چاو بگرێت. بۆ وێنە هابرماس ئەوەی قبوڵ نییە کە چوارچێوەی گشتی بورژوازی ئەو لە لایەن ئەو گروپە کۆمەڵایەتیانەوە کە سەرەتا لە دەرەوەی گوتاری کۆمەڵگای بورژوایی بوون، بەردەوام لێپێچینەوەی لەگەڵ کراوە و تا رادەیەکی زۆریش نێوبەندیان کردووە. وە ئەگەر چوارچێوەی گشتیی بورژوا لە ململانێکردن لەگەڵ دەوڵەتی سەرەڕۆدا سەرکەوتوو بووە، بەشبەحاڵی خۆیشی لە بەردەم ململانێی گروپە ژێردەستەکاندا بووە. کەوابوو چوارچێوەی گشتیی بورژوازیی هابرماس لە گۆڕەپانی پەیوەندییەکی کۆمەڵایەتی پڕکێشەدا بووە. وە چونکە گوتارەکەی ئەو بە زمانێکی گشتی باس کرابوو، دەبوایە وەڵامی خۆی بدایەتەوە و خۆی بێنابایە خوارەوە.

یەکەمین گشتاندنی ئەو چوارچێوەیە کاتێك دەستی پێکرد کە مافی دەنگدان لە ئاکامی خەباتی چینی کرێکاردا پەرەی سەند. هەڵبەتە سەرکەوتنەکانی چینی کرێکار و گروپەکانی پشت ئەستور بە جنسیەت، رەگەز، ئەتنیك و ئایین، لە قەڵەمڕەوی مافە مەدەنی و سیاسییەکاندا، چۆنیەتی پێکهاتەی بەرایی مافەکانیان لە رێگای دەوڵەتەوە لەگەڵ ململانێ بەرەورووو کردۆتەوە. سەرکەوتنەکانی ئەو خەباتانە بۆ کۆمەڵگای مەدەنی و گوتاری مافەکانی ئەو چوار پێشهاتی هەبوو:

یەکەم، رەوایی بوونی دەوڵەتان بە پێی ئەو مافانەی کە بە خەڵکی دەدات، هەڵسەنگێندرا. ئەو کارە بەشێوەیەکی بەرچاو گەڵاڵەی دەوڵەتی نێوبەندی و هێناوەتە خوارێ، چونکە ئەوی ناچار کردووە وەڵامی داواکاریی گروپە رێکخراوە سیاسییەکان بۆ بەخشین و بەکردەوە دەرهێنانی مافەکان بداتەوە.

دووهەم، چەمکی مافەکان بەردەوام بەرینتر بووەتەوە و ئەو مافانەش دەگرێتەوە کە پێشووتر بەشێك لە گەڵاڵەی جێی پشتیوانیی دەوڵەت نەبوون. بۆ نموونە لە گوتاری ئێستای مافەکاندا، مافەکانی مرۆڤ لەو جێگایەدا کە پێشینەی سیاسیی مرۆڤەکان لە ئارادایە، بایەخێکی گەورەیان بە دەست هێناوە.

سێیەم، جەوهەری مافەکان بەهۆی خەباتە جەماوەریەکانەوە پەرەی سەندووە. بۆ نموونە لە جیهانی پاش داگیرکاریدا مافی دەستڕاگەیشتن بە ئامرازەکانی ژیان و کۆنترۆڵی پێداویستی و سەرچاوەکان بۆ وەرزێرەکان، یان مافی کەمینەکان لەمەڕ کلتور و زمانی خۆیان، بووەتە توخمێکی ناوەندیی خەباتە سیاسییەکان.

چوارەم، گشتی بوونەوە و سیاسیی بوونەوەی ڕووداوەکانی وەك پەیوەندییە چینایەتیەکان و پەیوەندیی نێوان دوو جنس، جنسیت و پەروەردەکردنی منداڵ، ڕیزبەندیەکانی خودی کۆمەڵگای مەدەنیشیان لەگەڵ کێشە بەرەوڕوو کردوونەتەوە. بەگشتی دەوڵەت و کۆمەڵگای مەدەنی هەردووکیان بەناچار هەندێك لەو چەمکانەی مافەکان کە گروپە پەراوێزخراوەکان خوازیاری بوون، دانیان پێداناون و قبوڵیان کردون. ئەو مافانە نەتەنیا لە نێوان هاووڵاتیانی دەوڵەتدا، بەڵکو لە کۆڕ و کۆمەڵە نێونەتەوەییەکانیشدا بوونەتە دادوەری ڕەفتارەکانی دەوڵەت و بوونەتە پێوانە و نموونە. نارەزامەندییە کۆمەڵایەتییەکان لە کۆمەڵگای مەدەنیدا، سەرنجی خۆیان لە سەر مەسایلێك لەو مەڵبەندە داچەقاندووە و خوازیاری ڕیزبەندیی نوێن.[٥٧]

هەڵبەتە کۆمەڵگای مەدەنی لە زۆر ڕێگاوە تۆڵەی لە دەوڵەت کردۆتەوە چونکە بزووتنەوە کۆمەڵایەتییە جۆراوجۆرەکان لە گوتاری مافەکان لە دژی خودی دەوڵەت کەڵکیان وەرگرتووە. بۆ نموونە ئەو بزافانە بۆ مافەکانی خەڵك، تا ئەو جێگایەی کە ئاشکرا بووە، یارمەتییان بە پێناسەکردنەوەی سەرلەنوێ حکومەت کردووە بە شێوەیەك کە تا ئەمڕۆ دەرککراوە. داخوازیی ئەو مافانە ڕێك لەو بوارانەیە کە بە بەشداریی مافەکان دیاری ناکرێن، لە کەسانی هەژاری گوندنشین، خێڵەکان، پرۆلیتاریای شاری، و ئەو کۆمەڵانەی کە چالاکییەکانی دەوڵەت پەراوێزی خستوون و ئەوانی لە دەرەوەی "کاروکردەوەی" ئەمڕۆیی جێ کردوونەتەوە. ئەوانە ئەو کۆڕوکۆمەڵانەن کە مافی ئەوان بۆ ژیانێکی جێی شانازی، نوقسان و خەوشدار کراوە چونکە لە

---

٥٧ - مافەکانی سەرچاوەگرتوو لە کۆمەڵگای مەدەنی، هەر هەمان هەبوونی دەوڵەت و توانایی و دەسەڵاتی ئەو بۆ سەپاندنی نۆڕمەکان بەسەر دەوڵەتدا بردوەتە ژێر پرسیارەوە. ئەگەر سەرجەمی ئایدۆلۆژیای نەتەوەخوازی بە وشەکانی مافەکانی خەڵك بۆ دیاریکردنی خود بەیان بکرێن، لەنێو خۆی دەوڵەتی میللی دا، ئەو گروپانەی کە بە پێی سەرزەوی خۆیان پێناسە دەکرێن، هەر بەو وشانە خوازیاری هەمان ئەو مافانە بۆ خۆیان دەبن. هەبوونی دەوڵەت میللەت وەکو وتەزایەکی گشتگیر، بە توانایی دەوڵەت میللەت بۆ قسەکردن لە لایەن خەڵکەوە کەوتووەتە ژێر پرسیارەوە، لە زۆربەی بوارەکاندا بووەتە هۆی هەڵوەشاندنەوەی خودی دەوڵەت. ئەگەر یاسا ڕێگایەکی کلاسیك بووە کە دەوڵەت لە ڕێگای ئەودەوە تاکی شکڵ پێداوە و یارمەتی بە پێکهاتنی شوناسی ئەو کردووە، دەربڕینی هەبوونی گروپە پەراوێزخراوەکانی کۆمەڵگای مەدەنی، هەر بەهەمان ئەو وشانە باسکراوە.

چوارچێوەی گشتیی قسەوباسەکاندا جێگایەکیان نەدۆزیوەتەوە، ئەو داخوازییانەی مافەکان، بەهێنانە ئارای گوتاری تایبەت بەخۆیان بۆ ناو ئەو گوتارانەی کە ئەو چوارچێوەیە پێکدێنن، پانتایی مەدەنیان پەرە پێداوە، و بە باسکردنی مێژوو، نەشیاوبوونی ئەو چوارچێوە مەدەنییەیان نیشان داوە.

مافەکانی خەڵك وەك کاردانەوەیەك لە بەرامبەر ستەمە ئابووری و کۆمەڵایەتییەکانی دەوڵەتی هیند، ئەو ستەمانەی کە لە ژێر ناوی گەشە و پەرەسەندندا بەڕێوە دەچن، لە سێ وتەزادا جێگەیان دەبێتەوە: یەکەم، داواکاریەکانی دەوڵەت بۆ وەفاداربوون بەو بەڵێنانەی کە بە خەڵکی دراون سەبارەت بە کەسانیی کۆمەڵایەتی و ئابووری و بەشداریی سیاسی، لەو بوارەدا گروپەکانی ئازادیی مەدەنی، ڕۆڵێکی بەرچاویان هەبووە. ئەو گروپانەی کە دەوڵەت لە ڕێگای یاسادانی سەرکوتگەرانەوە نەوانی بۆ پەراوێزی کۆمەڵگای مەدەنی پاڵ پێوە نابوو، ڕۆژ بە ڕۆژ زیاتر خوازیاری زیندووکردنەوەی مافە مەدەنی و سیاسییەکانن.[٥٨] سیاسەتی نارەزامەندی توانیویەتی لە ڕەفتارە قبوڵکراو و ڕێگە پێدراوەکانی کۆمەڵگای مەدەنیدا کەشێك بۆ خۆی بکاتەوە.

دووهەم، ئەو خەباتانە بە زیادکردنی وتەزاکانی نوێی مافەکان، لەوانە مافی کەڵك وەرگرتن لە چوارچێوەیەکی مرۆیی و مافی خەڵکی خۆجێیی بۆ زاڵکردنی شێوەی ژیانی تایبەت بەخۆیان، بە شێوەیەکی بەرچاو یارمەتییان بە دەستەواژەی مافەکان داوە. ناکرێ ئەو داخوازییانە لەگەڵ ئەم گەلاڵەی مافانە کە هەیە ڕێکبخرێت. زۆربەی ئەو داواکاریانە پێویستیان بە بوژاندنەوەی مافە نەریتیەکانی کۆمەڵ لە سەر بەرژەوەندییە هاوبەشەکانە.[٥٩]

---

٥٨ - بەرهەڵستی لە بەرامبەر ستەمی دەوڵەت و چڕبوونەوەی ئەو توندوتیژیەی کە لە لایەن دەوڵەتەوە پشتیوانی لێدەکرا، لە بزووتنەوەیەکی بەریندا بۆ ئازادیە مەدەنیەکان پێکهات.

٥٩ - خەباتی خەڵکی کارناکاتا لەدژی کۆمپانیای هەویری چێو نمونەیەکی باشی لەم چەشنەیە. گوندنشینانی شەش ناوچە کە لە ناوچەیەکی باراناویدا دەژیان و زەوی و زاریان لە "گات"ی خۆرئاوادا هەبوو، لە ساڵی ١٩٨٦ خەباتێکی درێژماوەیان بۆ بوژاندنەوەی مافی خاوەندارێتی هاوبەش وەڕێخست، تەنیا مەبەستی کۆمپانیاکە ئەوەبوو کە لە ٧٥٠٠٠ جریب لە دارستانەکاندا، ئوکالیپتوس بچێنێت. زەویە هاوبەشەکان سەرچاوەی گژوگیا، کود، سوتەمەنی و خۆراکی خەڵکی خۆجێین. لە گەڵای هەندێك لە دارەکان بۆ دروستکردنی دەوری و سینی کەڵك وەردەگیرێت و پیشەوەرە بچوکەکان لە گژوگیاکان بۆ دروستکردنی سەوەتە

زۆربەی ئەوان لە سەر کۆنترۆڵی داهاتە خۆجێییەکان لەلایەن کۆڕوکۆمەڵە خۆجێییەکانەوە جەخت دەکەنەوە.[60] زۆربەی ئەوان خوازیاری بەدیلێکن بۆ گەشەسەندن و لەوانە دەکرێ ئاماژە بە بەنداوە بچوکەکان بکرێت.[61] زۆربەی ئەو خەباتانە توانایی دەوڵەتی هیند بۆ دوورکردنەوەی

---

و بەرە کەڵك وەردەگرن، دارستانەکە دارویەردوو بۆ دروستکردنی خانوەکان، مەودایەك بۆ کەرەستەکانی کشتوکاڵی، گەڵای سەوز بۆ کود، گیای دەرمانی، گەڵا و دار بۆ سوتەمەنی، میوە بۆ ترشیات و میوە بۆ نزیکەی ٥٠هەزار گوندنشین دابین دەکات. دەوڵەت بە بەخشینی ئەو زەویانە بە کۆمپانیاکان، گوندنشینەکانی لە کەرەستەکانی ژیان بێبەری کرد. چەندین گروپی چالاك لە ساڵی ١٩٨٦ بزووتنەوەیەکیان بۆ وەرگرتنەوەی زەویە هاوبەشەکان وەڕێخست. مەسەلەکە ئەوە بوو کە ئایاحکومەت دەتوانێت بە مەبەستی گەشەی ئابووری، مافە نەریتیەکانی خەڵك لەبەر چاو نەگرێت؟ ئەو سکالآیەی کە بە دیوانی باڵا درا، ئاماژەی بە پێشێلکردنی مادەی ٢١ کردووە کە مافی ژیان بە فەرمی دەناسێنێت و خودی دیوان گەلآڵەی کردووە. بەر لەوەیکە دیوانی باڵا بتوانێت بریارێك بدات، حکومەت لە بەرامبەر بزووتنەوەکەدا تەسلیم بوو و کۆمپانیاکەی هەڵوەشاندەوە.

٦٠- بۆ نمونە رێکخراوێك لە هۆزەکان و گوندنشینانی چینەکانی خوارەوەی ناوچەی چاتیسگرای هیندستان لە ساڵی ١٩٧٩ داوای خودموختاریی ناوچەیی کرد و درێژەی بەخەبات لەدژی چەوسێنەرانی کانەکانی ناوچەکەدا و ئەو هەوڵانە چاکسازیی پەیوەندیی نێوان کۆڕوکۆمەڵەکانیشی دەگرتەوە. لە ساڵی ١٩٨٩قسەوباس سەبارەت بە پێویستیی دارشتنی رێگەچارەی بەدیل لەمەڕ زەوی، دارستان، پیشەسازی، بەنداوە بچوکەکان، نوژنکردنەوەی گۆماوە بچوکەکان، راگرتنی مەکینەیی بوونی کانەکانی بەردی ئاسن، چوونەسەرێی نرخی کێڵگەی برنج، بەکارهێنانی زمانی خۆجێیی و کردنەوەی نەخۆشخانە و دامەزراوە فێرکاریبە فەننییەکان دەستی پێکرد. پێویستیی شێوازەکانی نوێی هاوکاری و یاریدەدەری و شێوازەکانی نوێی کۆنترۆڵی دیموکراتیکی باسکرد. گرینگترین داخوازیی ئەو کۆنترۆڵی سەرچاوەی کانەکانی خۆجێییە کە تا ئێستا لەبەردەستی دەوڵەت و سەرمایەی تایبەتی دابوون. مافی کەڵك وەرگرتن لە سەرچاوە خۆجێییەکان، خاڵی دەسپێکی خەباتە بووە.

٦١ - بۆ نمونە یەکێك لە ناوچەکانی ماهاراشترا کە زۆرترین بەنداوەکان لەوێن و بەهۆی چاندنی قامیشی شەکر بووەتە ناوچەیەکی دەوڵەمەند، بەڵام هەندێك لە ناوچەکان بە هەژاری و نەداری ماونەتەوە. کاتێك کە دەوڵەت دەستی بە دەرهێنانی لم لە رووباری یرالا کرد، دانیشتوانی گوندەکە خەباتێکی خۆڕاگرانەیان وەڕێخست. لە بەرامبەر ئەو دۆخەدا، کۆمپانیاکە پلانی دروستکردنی بەنداوێکی بچوکی دەست پێکرد کە ٩٠٠ جریب زەوی ئاودێری دەکرد و بە پارەی بەرهەمهاتووی لمەکە دروست دەکرا. بەنداوەکە لە ساڵی ١٩٩٠ دروستکرا و پێشنیاری دروستکردنی بەنداوێکی دیکەش هاتە ئاراوە. ئەو بزووتنەوەیە کاریگەریی مەسایلی گرینگی پێوە دیار بوو ـــ خۆڕاگری لە بەرامبەر سیاسەتی بێبەشکردن لە ئاو، کۆنترۆڵی سەرچاوەکانی ئاو و

خەڵك لە ژیان وماڵە نەریتیەکانی خۆیان تووشی ململانێ دەکەن کە نموونەکەشی بەنداوی نارمادایە. خۆڕاگریی لە بەرامبەر دروستکردنی بەنداوی ناماردا بەراستی جێ سەرنج بوو و کۆمەڵێك پرسی سەبارەت بە مافی خەڵك لە بەرامبەر مافی دەوڵەتدا بۆ دەستبەسەرداگرتنی سەرچاوەکان بەناوی گەشەسەندنەوە، دێنایە ئاراوە.[٦٢] بەرپرسی توێژەکانی خوارەوە (کاست) و خێڵە ناسراوەکان ب.د. شارما لە راپۆرتی ساڵی ٨-١٩٨٧ بۆخۆی تەرکیزی لە سەر پرسەکانی مافی مرۆڤ لەمەڕ دەرکراوانی گەلاڵەی نارمادا کرد و بەشێوەیەکی هاندەرانە رایگەیاند:

هەتا ئێستا بزووتنەوە جەماوەرییەکان لە دژی جێگۆڕکێ، پەرتەواز و کەم تا زۆر گۆشەنشین بوون. بێجگە لەوەش، حاشا هەڵنەگربوونی خودی ئەو جێگۆڕکانەش قبوڵ کرابوو و ئەو خەڵکانەی کە لە ژێر کاریگەری ئەودا بوون، تەنیا دەبوایە داوای کەمکردنەوەی بەشمەینەتیەکانیان بکردایە. لە خەباتی نارمادادا سەرجەم بەشەکانی وڵات لە بەرامبەر بەرهەمە نیگەتیڤەکانی گەشەسەندندا هەستان و لەوانەیە بۆ یەکەمین جار بوو کە پرسی مافەکانی یاسای بنەڕەتییان هێنایە ئاراوە. ئەو پێشهاتە تەنیا لە ئاستێکی واتایی و بە مەبەستی بەڵگەمەندکردن و قسەوباس گەلاڵە نەکرا، بەڵکو دەرك و بڕیاری خەڵك پشتیوانی ئەو بوو.

مافەکانی خەڵك بەردەوام واتای تازە و زیاتری بەو مانایە بەخشیوە کە لە وشەی "مرۆیی"یەوە دێن. لە خەبات لە دژی نەهێشتنی دارستان بۆ دروستکردنی بەنداو، لە سەر ئەوە جەخت کرایەوە کە خەڵك مافی پێنج ئێف (F٥)یان هەیە: FODDRE(گژو گیا)، FULE(سووتەمەنی)، FERTILIZER (کود)، FOOD(خۆراك)، FIBRE(ئەلیاف "ریشاڵ"). کەسانی دەستکورتی شارەکان داوای مافی سەرپەنایان کردووە، خەڵکی خۆجێییش

---

گرینگتر لە هەموان، مافی کەڵك وەرگرتنی هەموان لە ئاوەکە ـ بزووتنەوەیەکی نوێخوازانە بوو چونکە دەستپێڕاگەیشتن بە ئاوی لە خاوەندارێتی بە سەر زەویدا جیا دەکردەوە و دەیکردە کارێکی خۆویستانە.

٦٢ - دروستکردنی بەنداو گەورەترین و بەهادارترین پرۆژەیە لە هیندستان کە ٣٠ بەنداو لەخۆی دەگرێت و لە سەر ژیانی زۆربەی خەڵك و ژمارەیەکی زۆر لە گوندەکانی کاریگەری دەبێت. مەسەلەی کۆنترۆڵی سەرچاوەکان لە خەبات لە دژی نابوتکردنی ژینگە لایەنی ناوەندی هەیە و ئەو سیاسەتەی دەوڵەت نەفی دەکاتەوە کە بە پێشێلکردنی مافی نەریتی بەملیۆنها کەس، خەڵکی هۆزەکان و وەرزێرانی بچوك و پەراوێزکەوتوو بۆ کەڵك وەرگرتن لە سەرچاوە سروشتیەکان و بە بیانووی خەسارەتی زۆر لە خەڵك دەستی پێکردووە.

داوای مافی ژیانێکی جیاواز و تایبەت بەخۆیان و مـافی (تۆوچـاندن) هاتووەتـە پێشـەوە.[63] و دانیشتوانی ناوچە بێ پیت و بەرەکان داوای مافی خۆراکیان کردووە.[64] ئەوانە ئەو چـەمکانەی مافەکانن کە پێویستییان بە پەرەسـەندن و سـەرلەنوێ بونیاتنانـەوەی شـێوازەکانی نـەریتیی ئەندێشە لە بارەی مافەکانەوە هەیە.

سـێیەم، ئـەو داوایانـە ململانێیـەکی جیـاواز لـە بەرامبـەر هەوڵـەکانی دەوڵەتـدا بـۆ کۆنترۆڵکردن و گوێڕایەڵکردنی کۆمەڵگە پێك دێنن. گروپە پەراوێزخراوەکان بۆ دادخـوازی لـە بەرامبەر دەوڵەت و کۆمەڵگای مەدەنیـدا، پشـتیان بـە زمـانی مافـەکان بەسـتووە، ئـەوان دەیانهەوێ بەهاتنی ژمارەیەکی زۆر لەو گروپانەی کە تا ئێسـتا دەسـتیان بەسـەردا گیرابـوو، گۆڕەپانی کۆمەڵگای مەدەنی بەرینتر بکەن و لە زمانی مافەکان کەڵك وەردەگرن. ئەو کارەش تێگەیشتنی وەدەستهێنان و تازە وەدەست هێنانە لە مافەکان کە لە یاساوە سەرچاوە دەگرن و بە فەرمی ناسینی دەوڵەتەوە بەستراونەتەوە، تووشی ململانێ دەکات. هەربۆیە مافـەکان لـە سنوورەکانی یاسا و دەوڵەت دەرباز دەکات و پشت ئەستوور بە کۆمەڵگای مەدەنی دەکات.

هەر لە بەر ئەوە داواکاریی مافەکان وەك لێپێچینەوەیەك لە دەوڵـەتی هیندسـتان و ئـەو پاوانخوازییەی لێهاتووە کە بە سەر ژیـانی خەڵکیـدا دەسـەپێنێت، ئـەو خەباتانـە دەسـەڵاتی دەوڵەت بۆ دەستێوەردان لە ژیانی نەریتی خەڵکدا تووشی لێپرسینەوە دەکەن، ململانێ لە گەڵ پلانی مۆدێرنیتێ دەوڵەت دەکەن، سەپاندنی شێوازی ژیان و کلتوری بێگانـە ڕەتدەکەنـەوە، و خاوەندارێتی و کۆنترۆڵی تاکەکەسی سەرچاوەکان ڕەتدەکەنەوە. بەم جۆرە لـە گـەڵ دەسـەڵاتی دەوڵەت بۆ بڕیاردان لە سەر ئەوەی چ کەسێك خاوەنی ماف دەبێت، تێك هەڵدەچن. ئەو هەڵـە بەربڵاوانەی کە بۆ گەرەنتی مافە یاسـاییەکان و یاسـای بنـەڕەتیی لەوانـە پاشـگەزکردنەوەی یاساکانی هەڵاواردن، مافی زانیاری و بەشداریی، مافی بەڕێوەبردنی خود و خاوەندارێتی، مافە بنەڕەتیەکانی وەك خانوبەرە، ڕاهێنـان و تەندروسـتی و ژینگـەی ئـەمن بـەڕێوە چـووە، لـە

---

٦٣ - لە ساڵی ١٩٩٣ بەسەدان هەزار وەرزێر لە سەرتاسەری هیندستانەوە دژایەتی خۆیان لەگەڵ ڕێککەوتننامەی پێناسەکردن و بازرگانی دەربڕی و دژایەتیی ئەوان لەو ڕووەوە بوو کە بەمجۆرە چەقاندنی تۆوەکان و ڕووەکی هیندی لە دەرەوە بە یاسایی دەکرێت.

٦٤ - گادگیل و گوها (٥٣) کێشمەکێشی نێوان دەوڵەت و خەڵك وەکو کێشمەکێشی نێوان نابووریی سیاسی قازانج و نابووریی ئەخلاق پێش بینی و وەسف دەکات.

پرۆسەکانی ڕێبازی دەوڵەتدا نێوبەندییان کـردووە. بـەڵام بـە گەڕاندنـەوەی بڕیـارە زاڵـەکانی کۆمەڵگای مەدەنی، گۆڕەپانی ئەویشیان پەرە پێدا.

پێگەیاندنی چەمکی مافەکانی خـەڵك هـەوڵێکی هەسـتیارە بـۆ دەربـازکردنی فێرکاریـە یاساییەکان لە هاوڕێیەتی لە گەڵ دەوڵەت و نوێنەری بەدەستەوەگرتنی جڵەوی کۆمەڵگایـە لـە لایەن ئەو گروپانەوە کە پێداویستی و داواکاریەکانیان لە ڕیزبەندیە مەرجـدارەکان، پێشـبینی یاسادانەرانە، و بەڵێننامە نێونەتەوەییەکان بە دروسـتی نوێنەرایەتی نەکراوە.[٦٥] ئەو دەربـڕینی مافانە لە زۆربەی بوارەکانەوە لە فـۆرمی کلاسـیکی مافـەکان ئـەولاوەتر دەچـن و دەکەونـە ململانێ لەگەڵی. لە هیندستانیش هەروەك زۆربەی شوێنەکانی تری جیهان، مافەکان بوونەتە جێگای مشتومڕی ئایدۆلۆژی و سیاسی. ئەوان بوونەتە ئامرازێك بۆ ئازادیی خەڵك لە چنگی دەوڵەت و بەشە زاڵەکانی کۆمەڵگە.

لە بارودۆخی نایەکسان و نائاساییدا، زمانی مافەکان داواکارییـەکی جێگـای پاسـاوە بـۆ دەربڕین و بنەڕەتی کردنەوەی داواکاریەکان. لە هەردووك گۆڕەپانی نێوخۆیی و نێونەتەوەییدا، مافەکان بوونەتە لایەنی لە پێشتری لێکدانەوەکان لەمەڕ داخوازیـەکانی خۆیـان لـە پانتـایی تـەواوی پێشـهاتە سیاسـییەکاندا. کـەوابوو دەربـڕینی مافـەکان لـە ڕێگـای بزووتنـەوە کۆمەڵایەتییەکانەوە ڕۆڵێکی گرنگ دەبینێت لە پێناسەکردنەوەی سـەر لـەنوێی سـنوورەکانی کاروباری سیاسی و سەر لە نوێ داڕشتنەوەی گوتاری سیاسی و دەست بەسەرداگرتنی گوتـاری کۆمەڵگای مەدەنی.

---

٦٥ - بۆ نمونە ڕێکخراوێکی پێکهاتوو لە هۆزەکان، وەرزێران، نوێنەرانی کرێکاران کۆمەڵێك بڕیارنامەی لەمەڕ نەهێشتنی دارستانەکان، قات و قڕی، و بەڕێوەبەرایەتی سەرچاوە ئاوییـەکان دەرکرد کە دەیگوت پاوانکردنی دارستان دەبێ هەڵوەشێتەوە و لە نێوان گوندەکانی نێو دارستانەکاندا دابەش بکرێت و بەرپرسیارێتی پاراستن و پەرەپێدانی دارستانەکانیش دەبێ بەو گوندانە بسپێردرێت. بەرهەمهێنانی میوەکان، سەوزیەکان، و ڕووەکە دەرمانیەکان دەبێ خاوەندارێتی بەکۆمەڵی ئەو گوندانە بەسەریدا زاڵ بێت. بڕینی دارەکان لە تەمەنێکی گونجاودا دەبێ ئیزنی پێبدرێت بەڵام دارەکانی دیکە دەبێ بپارێزرێن. دەبێ یارمەتی پێویستی حکومەت بکرێت بەمەبەستی چاندنی دارودرەخت. حکومەت تەنیا دەبێ چاودێریی ئەوە بکات کە پاراستن و پەرەسەندنی دارستانەکان درێژەی هەبێت.

دەست بەسەرداگرتنی گۆمەلگای مەدەنی لە ڕێگای ئەو خەباتە کۆمەڵایەتیانەوە بە هیچ شێوەیەك کامڵ نییە، و ناشبێت تا ئەوەی کۆمەلگای مەدەنی تا رادەیەك گوتارەکەی خۆی سەربەخۆ لە دەوڵەت گەڵاڵە بکات و لەوەش گرنگتر ئەوەیە کە بتوانێت خودی ئەو مەڵبەندە تووشی ئاڵوگۆڕ بکات. بەڵام هەر لە نێو ئەو گەڵاڵەیەی کە لە لایەن دەوڵەتەوە پشتیوانی لێدەکرێت، دەکرێ دەسپێکی چوارچێوەیەکی گشتیی رەسەن و گوتارێکی گشتی هەمەلایەنە دیاری بکرێت. کەوابوو ئامادەبوون و رەفتارەکانی کۆمەلگای مەدەنی لە ڕێگای بزووتنەوە جەماوەریەکانەوە پێویستیەکانی دەستبەسەر داگرتنەوەیەکی سەر لەنوێ دێننە گۆڕێ، چونکە ئەوانە نوێنەری توانایی بەوزەی تێکهەڵچوون لە گۆڕەپانی نافەرمی سیاسیاندا هەیە. بەڵام لێرەدا دەبێ مەرجێك دیاری بکەین، ئەویش ئەوەیە کە سیاسەتێکی دیموکراتی، کە دەیهەوێ نەتەنیا لەگەڵ دەوڵەت، بەڵکو لە گەڵ چینە زاڵەکانی نێوخۆی کۆمەلگای مەدەنیش ململانێ بکات، بتوانێت دەست بەسەر ئەو چوارچێوەیەدا بگرێت، پەیوەندیی بە زۆر شتەوە هەیە. (بۆ نموونە خودەی دەوڵەتەکان، یان ناسینی پێویستیی هاتنە ئارای دیموکراسیی بەشدارانە لە ڕێگا دەوڵەتەکان و کۆمەلگاکانەوە)، بەڵام بە گشتی پەیوەندیی هەیە بە بارودۆخی تێکهەڵچوونی سیاسی کە ئەو بزووتنەوانە بۆ خۆیان گەڵاڵەی دەکەن. دەوڵەتەکان و چینە باڵاکان بەشێوەیەکی خۆویستانە ئازادی یان داهێنانی سیاسی بە چوارچێوەی گشتی ناسپێرن، دانیشتوانی کۆمەلگای مەدەنی دەبێ لە ڕێگای تێکهەڵچوونی سیاسییەوە داوای ئەو ئازادییە بکەن و گەرەنتیشی بکەن. ئێستا دەبێ باسی خودە و بارودۆخی ئەو تێکهەڵچوونە بکەین.

## دەستبەسەرداگرتنی سەرلەنوێی کۆمەلگای مەدەنی و پێویستی بنەمای ڕێکخستن:

کاتێك کە ئاماژە بە دەستبەسەرداگرتنی گوتاری گشتی دەکەین دەچینە ناو کۆمەڵێك پرس کە هەم پراکتیکی و هەم تیۆرین. یەکێکیان ئەوەی شتێك بەناوی گوتاری گشتیی هەماهەنگ، ڕێکوپێك یان تاقانە بوونی نییە. ئەوەی وەك گوتاری گشتی ئاماژەی پێدەکرێ بریتییە لە کۆمەڵێك گوتار کە هەرکامیان تەوەر، سەروەری، چەمکەکانی دەسەڵات و بەرهەڵستی، چەمکەکانی بەڕێوەبەرایەتی و سپاردنی دەسەڵات، ململانێ و رەهەندە تایبەتیەکانی خۆیان هەیە. چونکە هەر گوتارێك ریتم و رەوتی گۆڕانیی تایبەت بەخۆی هەیە.

به تەواوەتی ئەگەری ئەوە هەیە کە لەو کۆمەڵە گوتارانەدا کە کۆمەڵگایان پێ پێناسە دەکرێت ئەگەر یەکێکیان لە پێشەوەی ئەو گوتارەوە بێت کە لە ئارادایە، ئەوی دیکە بە نیسبەت ئەوەوە گەڕانەوە بەرەو دواوەیە. کەوابوو دەستبەسەرداگرتنی سەرلەنوێی کۆمەڵگای مەدەنی لە لایەن دیموکراسییەوە، بەشێوەیەکی ناڕێك دابەش دەکرێت. بۆ نموونە لە کۆمەڵگاکانی ئەم سەردەمەدا ئەگەر خەباتی جنسی لەو بوارەوە کە تایبەتە بە ئازادیی ژنانەوە پێشکەوتنێکیان هەبووە، هەر لە هەمانکاتدا رەواڵی بونیاتخوازیی ئایینی و رەگەزپەرستی کۆمەڵێك مەسایلیان بۆ ئازادی و خودموختاری تاك هێناوەتە پێشەوە. کۆی وشە رزگاریبەخشەکان و کۆی وشەکانی سەرکوت لە یەك ئاستدا و دەکرێ بگوترێت کە لە یەك سەردەمی مێژوویدا سەریان هەڵداوە. ئێستا ئەگەر ژنان لەگوتاری گشتی کۆمەڵگای مەدەنیدا مەجالی قسەکردنیان بەدەست هێنابێت، بەڵام کەمایەتیە ئایینی و ئەتنیکیەکان پەراوێزخراین، کەوابوو کۆمەڵگای مەدەنی هەر بە هەمان رادەی پێشوو وەك پانتایی گشتی پەراوێزخەر و سنووردار ماوەتەوە، و دەستبەسەرداگرتنی سەرلەنوێی کۆمەڵگای مەدەنی بە نوقسانی دەمێنێتەوە.

بە پێی لۆژیك، گوتاریی گشتیی دیموکراتی دەبێ توانایی ئەوەی هەبێت کە داخوازییە دیموکراتیە جۆراوجۆرەکان دەرببڕێت، و لە چەمکی دەربڕینیش وەها دەردەکەوێت کە ئەو داخوازییانە دەبێ لە داڕشتنی هۆکارە دیموکراتیە هاوبەشەکاندا هاوڕێ بن و ئاوێتەی یەکتری بن. بە واتایەکی دیکە، پێشەکی رەها بۆ دابینکردنی هەماهەنگی ناوەرۆکی سیاسەتە جۆراوجۆرەکانی جێگەی مشتومڕ، هەبوونی بنەمایەکی رێکخستنە. دروستکردنی ئەوجۆرە هەماهەنگیە واتاییانە پێویستی بە شارەزایی، دەستێوەردان، گومان، وشیاریی سیاسی، ئیرادە و لە هەمووان سەرتر پێکەوەهەڵکردن و خۆڕێکخستنە، و بە گشتی هەڵگری ئەو باوەڕ پێکردنەیە کە ئەگەر بزووتنەوە دیموکراتیەکانی کۆمەڵگای مەدەنی بیانهەوێت پانتاییەکی گشتی داگیر بکەن، هەبوونی وەها بنەمایەکی رێکخستن مەرجێکی رەهایە.

فیکری بنەمای رێکخستن لە لایەن بایارەوە هاتووەتە گۆڕێ. بایار زۆر بە هەستیاریەوە ئەوە وەبیر دێنێتەوە کە "لە قۆناغی یەکەمدا باسکردن لە کۆمەڵگای مەدەنی لە جێگایەکدا کە وەها بنەمایەکی رێکخستن بوونی نییە، وەدی نایەت" (٨،١١٧). ئاوبراو ئەو بنەمای رێکخستنە لە خودوشیاریی کۆمەڵگای مەدەنیدا، بە هەبوونی خۆی و رووبەڕوو بوونەوەی لەگەڵ دەوڵەت دەزانێت. بەڵام لێرەدا پرسیەك هەیە و ئەویش ئەوەیە کە کۆمەڵگای مەدەنی

وتەزایەکی لێکچوو نییە کە بتوانێت لە بەرامبەر دەوڵەتدا راوەستێت. ئەو نەتـەنیا هـەڵگری رێژەیەکی زۆری گوتارەکانە، بەڵکو هـەروەها لـە دەوری ئـەو سیاسـەتانەی کـە رێبازەکـانی دەوڵەت و دەسەڵاتی چینە باڵاکان تەئید دەکەن و ئەو سیاسـەتانەی کـە لـە گـەڵ ئـەوان لـە ململانێ دان، بوونەتە جەمسەرێك و حاڵەتێکی پلەبەندی بەخۆیەوە گرتووە. پلەبەندی زیاتر لە فرەیی دەرخەری رەفتارەکانی کۆمەڵگای مەدەنییە.

لە ئاکامدا بنەمای رێکخستن کە بابار باسی دەکـرد، تـەنیا کاتێـك مانـای دەبێـت کـە بیەوێت سیاسەتە دیموکراتیەکان لە کۆمەڵگای مەدەنیدا لە دژی ئەوانـەی کـە بانگەشـەکاری دەسەڵاتی چینە باڵادەستەکانن، رێکبخات. بەواتایەکی دیکە نەتەنیا بـۆ دانـانی کۆمـەڵگای مەدەنی لە هەڵوێستێکی بەرامبەری دەوڵەتدا، بەڵکو بۆ دانانی گروپە دیموکراتیەکان لـە دژی دەوڵەت و هەروەها لە دژی ئەو چینانە کـە بـە سـەر کۆمـەڵگای مەدەنیـدا زاڵـن، بنـەمای رێکخستن پێویستە.

چـەمکی بنـەمای رێکخسـتن هـەڵگری ئـەو فیکرەیـە کـە بزووتنـەوە جۆراوجۆرەکـانی کۆمەڵایەتی لـە کۆمـەڵگای مەدەنیـدا دەبـێ لـە گەڵاڵەیـەکی هاوبەشـدا لەگـەڵ هۆگرییـە دیموکراتیەکان پێکەوە هاورێ بن. ئەو بنەمایە پێویستیی گەڵاڵەیەکی بەکۆمەڵی هاوبەش کـە بتوانێـت شمـولی بزووتنـەوە کۆمەڵایەتییـە جۆراوجۆرەکـان بکـات و لـە سـەر رەهەنـدە جۆراوجۆرەکانی ئەزموونی مرۆیی جـەخت بکاتـەوە، و بتوانێـت لـە هەمانکاتـدا گۆڕەپـانی هاوبەشی هۆگریی و کردەوەکان بخولقێنێت، لە خۆیدا چەقبەستوو دەکات. بۆ پێویستیی وەهـا بنەمایەك لانیکەم دەکرێ دوو هۆکار باس بکەین.

یەکەم، ئەو پێویستییە کاتێك دەبێتە پێویستییەکی رەها کە وەبیرمـان بێتـەوە سـەرەرای فرەیی رەفتارە کۆمەڵایەتییە زاڵەکان، بنەمایـەکی رێکخسـتنی بـەهێز گەڵاڵـەی ئـەوان بـۆ چەسپاندن و پاراستنی دەسەڵاتی یەکانگیر دەکات. هەروەك گرامشـی و پـولانزاس جـەختیان کردۆتەوە، هێژمۆنی چینە سەرمایەدارەکان لە لایەن بەرێوەبەرێکەوە شکڵ دەگرێت کە رێك لە دەرەوەی خودی چینەکانە. بە بڕوای پولانزاس دەوڵەت هەمان ئەو رەفتارانە بەرێوە دەبات کـە رۆشنبیرانی ئۆرگانیك لە تیۆری گرامشی دا بەرێوەی دەبەن و ئەویش پێکهێنانی یـەکێتی لـە نێـو چـینە باڵاکاندایـە. ئـەگینا هـەروەك چـۆن پـۆلانزاس وەبیرمـان دێنێتـەوە، چـینە سەرمایەدارەکان لە شـەڕێکی پـڕ لـە کوشـت و کوشـتاردا یـەکتریان لاواز دەکـرد و خـودی سیستەمەکەیان تووشی نابوتی دەکرد. ئەگەر وەها بنەمایەك ناوەڕۆکی سـەرەکیی هێـژمۆنی

چینه سەرمایەدارەکانە، شعوری ئاسایی سیاسی دەڵێت کە بۆ پێکهێنانی یەکێتی نێوان گروپە بندەستەکان کە لە هەوڵی ململانێ لەگەڵ پێکهاتە رێکخراو و چەسپاوەکانی کۆمەڵگای مەدەنی و دەوڵەتیشن، وەها بنەمایەك پێویستە.

دووهەم، ئاراستەی بزووتنەوەکان بەرەولای تەوەرە سەربەخۆکان، چەند کەرتبوونی بەرنامەی سیاسی لێ کەوتووەتەوە. بۆ نموونە لە هیندستان:

بزووتنەوەی دژی کاست و بزووتنەوەی ژنان ئاگایان لە تەوەرەکانی جێگای باسی یەکتری نەبووە، و هیچ کامیان تا ئێستا بە شێوەیەکی بەکۆمەڵ لە شیکاریی پرسەکانی وەرزێران و سروشتدا زۆر بەرەوپێش نەچوون. لە بزووتنەوەی وەرزێراندا، تەوەرەکانی چەوسانەوەی ژنان لەم دواییانەدا گەڵاڵە کراوە، بەڵام پرسی کاستەکان بە لەبیرکراوی ماوەتەوە (مەگەر لە چەمکی "مارکسیستیی نەریتی"دا شەڕکردن لەگەڵ ئەو وەك فۆرمێك لە "دابەشکردنی وەرزێران") ئەوە لە کاتێکدایە کە بەگشتی لە شێوازەکانی زاڵبوون بە سەر نایەکسانی نێوخۆی ئاوایییەکاندا خافڵ بووە. بزووتنەوەی ژینگە پارێزیش هەر لە سەر تەوەرێك ماوەتەوە، کاری بە سەر پرسی چەوسانەوەی جەماوەری کاستەکانەوە نییە (کە رەنگدانەوەی کۆمەڵێك گومان لە پەیوەندییەکانی ئەو لەگەڵ هیندوخوازیە) و بە پێشهاتە ئابووریەکان کە وەرزێران یان چینی کرێکار ئازار دەدات، بەرامبەرکێ ناکات. وە سەرەڕای رەوتێکی نوێی فێمێنیزمی ئابووری، ئەو بزووتنەوەیە بەدەگمەن بە شێوەی کردەنی یان تیۆر لەگەڵ ستەمی سەر ژنان بەرامبەرکێی کردووە (١٤٥، ل٣١٦).

ئەگەر هەر کام لە گوتارەکان شوێنی خۆی داگیر بکات و خەباتەکەی خۆی بە شێوەیەکی سەربەخۆ لە گوتارەکانی دیکەی خۆڕاگری بەرەوپێش ببات، گۆڕەپانی کەرتبووی بەرهەمی ئەو رەفتارە هەندەکیخوازانەیە بە تایبەتی ئەو مەترسییەی لە سەرە کە لە لایەن دەوڵەت و چینە باڵادەستەکانەوە داگیر بکرێت. چەند کەرتبوونی سیاسەتی خۆڕاگری، کۆمەڵێك دەرفەت بۆ دەوڵەتی رێکخراو دابین دەکات کە بتوانێ بارودۆخی زاڵ بە سەر کۆمەڵگای مەدەنی بپارێزێت و پشتیوانیی لێ بکات. سیاسەتی دیموکراتی دەبێ لەگەڵ ئەو راستییە بەرەوڕوو بێتەوە کە دەوڵەت بە توندی بە سەر پێکهاتە و کاری کۆمەڵگای مەدەنیدا چاودێری دەکات. سیاسەتی کوت کوت و دابەشبوو هەلی ئەوە بۆ دەوڵەتی رێکخراو دەڕەخسێنێت کە چاودێریی خۆی بە سەر سیاسەت و کۆمەڵگای مەدەنیدا زیاتر بکات. کەوابوو ململانێ لەگەڵ رەواڵە زاڵەکان پێویستیی بە سیاسەتێکە کە لە هێرشکردنە سەر ئەو کارانەدا هەم رێکوپێك بێت و هەم راشکاوانەش بێت.

سێیەم، خەباتە دابەشکراو و خۆجێیی بووەکان ناتوانن کردەوەی گۆڕانکـاریی پێکهێنــەری تایبەت بەخۆیان هەبێت. سیاسەتی ئـەوان بـە پێـی پێویسـت دابەشـکراو، بەرگریکارانـە، و کاردانەوەییە و لە کۆتاییەکاندا هەندێك گـورزی زۆر سـاکار لـە دەوڵـەت دەوەشـێنێت. ئـەو سیاسەتانە ناتوانن گەلاڵەیەکی سیاسی لە گۆڕانی ئابووری، پەیوەندیی یان حکومـەتی بێننـە پێشەوە، تەنیا لە بەر ئەو هۆیەش کە توانایی ئەو کارەیان نییە. سەرەڕای ئەوەش نە بیـنین و نە توانایی ئەوەیان هەیە کە تەنانەت بیر لە ململانێ لە گەڵ ئـابووریی ڕێکخـراو، دەوڵـەت، بۆرۆکراسیەکان، یان سیستەمی زانیاریەکان بکەنەوە. بە پێی لۆژیـك کۆمەڵـە خۆجێییـەکان ناتوانن پەیوەندییەکانی نێوان بەرهەمهێنان، بەکارهێنان، و وەگەڕخستنی (پارە و کالاّ) سـەر لەنوێ ڕێکبخەنەوە، ئەو کارە لە ئابوورییەکدا کە لە بواری فەننییەوە ئالۆز بـووە و جیهـانیی بووەتەوە، لە توانای جەماوەری خۆجێیدا نییـە. لـە بەرامبـەر سـنوورەکانی ڕاگەیەنـەرەکانی بەرهەمهێنەری وێنەکان، لە بەرامبەر دەوڵـەتی زۆر ڕێکخـراو و ئـابووریی بـەهێز، کۆمەڵـە خۆجێییەکان بە ئاشکرا بێ دەسەلاّتن. هەر ئەو تێبینیانە پێویسـتیی بـە بنـەمای ڕێکخسـتن دەکەنە کارێکی ڕەهای پێویست.

چوارەم، پرسی بزووتنــەوە کۆمەلاّیەتییــە نوێیــەکان، لایـەنی پێکهاتـەیی هەیـە. ئـەو بزووتنەوانە کە جارێ بە بەشداریی بەکۆمەڵی کەسانی خۆجێیی، دیاریکردنی ئاراسـتە لـە دەوری تەوەرە سەربەخۆکان، و بەشداریی چەند چـینێك دیـاری دەکـرێن، ئـەو توانایـە لـە ڕادەبەدەرەیان نییە کە بەشە بەرینەکانی کۆمەڵگاش هەر بە هـەمان شـێوە ڕێکبخـەن کـە شێوازە پێشوەکانی خـەباتی چـینایەتی دەیـانکرد، گوهـا لـە گوتوبێژبێـدا سـەبارەت بـە هیندستان دەڵێت:

بە بەراورد بە خەباتانەی کە پشتیان بە کۆمڵگا قایە ـــ لەوانـە بزووتنـەوەی یەکێتییـە کرێکارییــەکان، بزووتنــەوە جوتیارییــەکانی لــە چەشـنی شارادجوشـی/ماهندرا تیکیـت، و بزووتنەوەکانی کرێکـاران و هـۆزە بـێ زەوی و زارەکـان بـە ڕێبـەری ناگزالیتـەکان ـــ ئـەو پشتیوانییە جەماوەرییەی کە بزووتنەوە تـازە کۆمەلاّیەتییـەکان هەیانـە، شـیاوی چاوپۆشـی لێکردنە... بە سەرنجدان بە پێگەی کۆمەلاّیەتیی بەرتەسکی ئەوان، ڕەنگە ڕۆڵێکی شیاوتر بۆ ئەوان ئەو ڕۆڵە بێت کە تەواوکەری بزووتنەوە بەهێزترەکانی پشت ئەستور بە چـینەکان بێـت. ڕوانگەی ئەخلاقی بزووتنەوە نوێیەکان لەوانەیە کاریگەریی زۆری هەبێت، بەو حاڵەشەوە ئەوان بە هیچ شێوەیەك جێگرێك نین بۆ ئەو ڕێکخراوانەی کە هەن، یـان بـۆ وەرزێـران و کرێکـاران.

چونکه لە هیندستان خەبات لە کۆمپانیـادا و خـەبات لـە سـەر زەوی و زار و بەرهەمەکـەی ئەمڕۆش هەر بە قەدەر رابردوو بایەخیان هەیە (٦٢، ل١٥).

گوها لە سەر ئەو راستییە جەخت دەکاتەوە کـە ئـەو بزووتنـەوە کۆمەڵایەتیانـە نـاتوانن گۆڕانکاری پێك هێنەر بن، مەگەر ئەوەی لەگەڵ دیکەی گروپـەکان یـەکبگرن کـە خوازیـاری نۆژنکردنەوەیەکی بنەڕەتین. گایل ئۆمڤێدت لە بەرهەمێکی گرنگدا سـەبارەت بـە بزووتنـەوە کۆمەڵایەتییە نوێیەکانی هیندستان ئەوە قبوڵ دەکات کە لە کاتێکدا کە:

هێژمۆنی ئایدۆلۆژیکی حیزبی کۆنگرە هاوڕێ لەگەڵ پێگە سیاسـییەکەی لـە ناوەنـد تێـك شکێندراوە، و زەقبوونی مارکسیزمی نەریتی لە نێـو نەیارەکانیـدا لـە لایـەن ئـەو دروشـم و تیۆرانەوە کە چالاکانی بزووتنەوە نوێیەکان هێناویاننە ئاراوە، سست و لاواز کردووە، سەرەڕای ئەوەش هیچ بەدیلێك، هیچ لێکدانەوەیەکی جیاواز لە سۆسیالیزم هێشتا وەك هێزێکی سیاسی سەری هەڵنەداوە. بەم جۆرە بزووتنـەوە کۆمەڵایەتییـە نوێیـەکان گەیشـتوونەتە سـەروبەندی سەرچەشنێکی بەدیل لە سیاسەت و گەشەسەندن، بەڵام هێشتا توانای تێپەڕین لەویان نەبووە، لە کاتێکدا کە سەرزەوی نەخشەبەرداری نەکراوی ئەودیوی ئەو هێشتا بە دروسـتی نەناسـراوە (١٤٥، ١٢-١٣).

پشتیوانانی بزووتنەوە کۆمەڵایەتییەکان ئەوە قبوڵ دەکەن کە ئەگەر ئەو بزووتنەوانە پردی پەیوەنـدیی نێوانیـان دروسـت نەکـەن و بەرنامەیـەکی گـۆڕانی روون و ئاشـکرا دانەڕێـژن، بەرنامەکەیان بە نوقسانی دەمێنێتەوە، و داهاتوویان نادیار دەبێت. کەوابوو پێویـستیان بـەوە هەیە کە لە ژێر ئاڵایەکی واتادار بنەمایەکی رێکخستنی گۆڕانکارییە ئابوورییەکان لـە دەوری یەکتری کۆ ببنەوە. تەنیا ئەو کاتەیە کە شانەی دژی دەوڵەتیی ئەو بزووتنەوانە بێ متمانەییان بە سیاسەتی حیزبی دەتوانێت سەرلەنوێ کـاری سیاسـی پێناسـە بکاتـەوە و کـاری سیاسـی سەرلەنوێ پێك بێنێتەوە. تەنیا ئەوکاتەیـە کـە ئـەو بزووتنەوانـە دەتـوانن بـەپێی دەربـڕینی هەڵخڕێنەرانەی ئۆمڤێت، "دەتوانن سـەرلەنوێ کۆڕوکۆمەڵـەکان وێنـا بکـەن، خوێندنـەوەی دووبارە بۆ مێژوو بکەن، و دیسانەوە راپەڕین داهێننەوە" (١٤٥).

بەڵام ئێمە هەروا دەبێ باوەڕ بەوە بکەین کە هەر چەمکێك لە بنەمای رێکخستن لە لایەن مشـتومڕی نێـوان روانگـەی سیاسـی یەکگرتوویـەخش و ئـاوات و ئـارەزوە رووکەشـی و تایبەتیەکانـەوە دیـاری دەکرێـت. کۆمـەڵگاکان لێکچـوو نـین و کۆمـەڵێك لـەو رەفتـارە کۆمەڵایەتیانەی کە کۆمەڵگا پێك دێنن، خاوەنی روانگـەی تایبـەت بـە خۆیـان و قاعیـدەی

کردەوەدا خزمەت بە بەهێزکردنی پەیوەندیی دەسەڵاتی نێوان دوو جنس دەکات. پیاوان بە سەر هەردووک بوارەکەدا زاڵن، و ژنانیش لە هەردووک بوارەکەدا ژێردەستەن. ئەگەر ئاوا بێت ئەوکات ئەوانە دوو قەڵەمڕەوی جیاواز نین کە هەرکامێکیان لۆژیکی خۆی هەبێت، بەڵکو بە پێی پێویست یەکێکیان ڕەنگدانەوەی لۆژیکی ئەوی تریانە. پیتمەن دەنووسێت "لێکدانەوەی بنەڕەتیی فێمێنیستەکان ئەوەیە کە تیۆریە "جیا بەڵام یەکسان"ەکان و تاکگەرایی و یەکسانیخوازیی ڕواڵەتیی تیۆری لیبراڵی، ڕاستیەکانی باوک مەزنانەی پێکهاتەیەکی کۆمەڵایەتیی پشت ئەستوور بە نایەکسانی و زاڵبوونی پیاوان بەسەر ژناندا، دەشارێتەوە (١٤٧، ل٢٨٣).

هەربۆیە ڕەخنە فێمێنیستیەکان باسی ئەوە دەکەن کە چاوخشاندنێکی دووبارە بەر سەر پیرۆزیی قەڵەمڕەوی خێزان (تایبەتی)دا پێویستە، چونکە ستەمی جنسی مافی یەکسانی و دادپەروەری پێشێل دەکات کە لە بنەماکانی پێکهێنەری کۆمەڵگایەکی ئەمڕۆیین. دووەم، ئەگەر خێزان شوێنی ململانێ و توندوتیژییە، کەوابوو دەبێ بکەوێتە بەر سەرنج و دەستێوەردانی گشتییەوە. ناتوانێ لە بەر ئەو هۆیە کە تایبەتییە و کەوابوو دەبێ حورمەتی بپارێزرێت، لە قەڵەمڕەوی قسەوباس و گوتوبێژی گشتی دەرهاوێژرێت.

تیۆری مارکسیستی، لە ڕەخنەیەکی تەواوکەردا کە لە ڕوانگەیەکی جیاوازەوە باسکراوە، دابەشکردنی نێوان بواری گشتی و تایبەتی ڕەتدەکاتەوە. جیاوازی و نەگونجانی نێوان ڕوانگەی لیبراڵی و مارکسیستی لە سەر نەبوونی ڕێککەوتنێکی بنەڕەتییە لە مەڕ پەیوەندیی نێوان تاك و کۆمەڵگا. ڕوانگەی لیبراڵی لە سەر بنەمای جەمسەربەندی نێوان تاك و کۆمەڵگادا، پێیوایە کە تاك کۆمەڵێك مافی هەیە کە لە بواری زەمەنیەوە لە پێشەوەی کۆمەڵگا و دەوڵەتەوەیە و کەوابوو دەبێ ئەو مافەی نەتەنیا لە بەرامبەر دەسەڵاتی دەوڵەت بەڵکو دەبێ لە بەرامبەر دەسەڵاتی زۆرینەشدا بپارێزرێت. مافی تایبەتی بوون، پارێزەرێکە هەم لە بەرامبەر دەوڵەتدا و هەم لە بەرامبەر کۆمەڵگادا. بەڵام مارکسیستەکان چەمکی ئەبستراکتی مرۆڤی جیا لە کۆمەڵگا ڕەتدەکەنەوە. لە تیۆری مارکسیستیدا تاك لە لایەن کۆمەڵگاوە شکڵ دەگرێت و بایەخە بنەڕەتیەکانی خۆی لە کۆمەڵگاوە وەردەگرێت. مارکس باسی ئەوەی دەکرد ئەو تاکەی کە لە دەرەوەی کۆمەڵگا بار بێت، بە واتایەك نابێتە مرۆڤێك کە شتەکان لێك جیا بکاتەوە. کەوابوو هیچ شتێکی تایبەتی بە مانای لە پێشەوەبوونی کۆمەڵگا، یان لە دەرەوەی کۆمەڵگا و هەروەها لە دەرەوەی بازنەی ستەمی کۆمەڵایەتی بوون، بوونی نییە.

پەلامار بردنە سەر تیۆرە گەورەکان، یان ئەوەی لیوتار ناوی سەروو گێڕانەوەی لە سەر داناوە، کە دەتوانن کارەکان ڕێنوێنی بکەن، هاوتەریب بووە لەگەڵ هێرش کردنە سەر ئەم چەشنە کارانە. مۆدێرنیتێ، وەك بەرهەمی قۆناغی ڕۆشنگەری، بەو متمانەیە دیاری دەکرێت کە سەرەڕای بشێوی و دڵنیانەبوونی ڕواڵەتیی تایبەتمەندیی جیهان، جیهانی کۆمەڵایەتی لەو ڕووەوە شیاوی ناسینە کە لە ژێر دەسەڵاتدارێتی بنەماقوڵەکان، یاساکان و سەرچەشنەکانە. مەیلی بناغەدانەری زۆربەی گەلاڵە نوێیەکان ئەو باوەڕەیە کە بە پێی بنەما دەکرێ بەشێویەکی فیکری دزە بکەیتە ناو قوڵایی ڕاستیەکانەوە. ئەو باوەڕە کاریگەرییەکی ڕاستەوخۆی لە سەر ڕەفتارە سیاسییەکان هەیە چونکە ئەگەر شیکاریی ڕابردوو و ئێستا لە بواری یاساکان و ڕاستاکانەوە ئیمکانی هەبێت، پێش بینی داهاتوو، کۆنترۆڵ و گۆڕانی ئەو بە ئاقاری دڵخوازدا لە ڕێگای ڕەفتارە گونجاوەکانەوە دەبێ وەدی بێت. ڕەفتارە سیاسییەکان لە دڵنیایی ئەو گەلاڵە نوێیەدا بەشداربوون کە دۆزینەوەی نهێنی و دۆزینەوەی یاساکانی زاڵ بە سەر مێژووی مرۆڤایەتی و گۆڕانی ئەوان لە ڕاستای دڵخوازدا شیاوی بوونە.

پاش مۆدێرنیتێ لە ڕێگای تەکنیکی گومان، شکاندنی بونیادەکان و لێپێچینەوە، ململانێی لەگەڵ خودی ئەو داواکارییە نوێخوازانەیە کردووە.[٦٧] ئەو تەوەرە ڕەنگدانەوەی کەش و هەوای گشتی دڵساردبوونەوە و بێهیوایی لە تواناکانی زانستی کۆمەڵایەتی و فەلسەفەیە بۆ دۆزینەوەی وەڵامی سەقامگیر بۆ مەسایل و مەتەڵەکانی بارودۆخی مرۆیی.[٦٨] پاش

---

٦٧ - پاش مۆدێرنیتێ خاوەنی داواکارییەکی مێژووییە لە واتایەکی تایبەتیدا. ڕایدەگەیەنێت کە قۆناغی نوێ کۆتایی پێ هاتووە یان لانیکەم تووشی گۆڕانی بنەڕەتی لە ژیانی ئابووری و کۆمەڵایەتی و سیاسیدا بووە. کەوابوو بیرمەندانی ئەو ڕێبازە باسی ئەوە دەکەن کە بیردۆزیی کۆمەڵایەتی و شێوازەکانی ناسینی نوێ کە لە قۆناغی نوێدا پێکهاتن، کۆتاییان پێهاتووە. هەروەها باسی ئەوەش دەکرێ کە بیردۆزیی نوێ نەتەنیا هیچ پەیوەندییەکی بە دەرککردنی پرسەکانی قۆناغی پاش مۆدێرنیتێوە نییە، بەڵکو توانای دەرککردنی خودی مۆدێرنیتێشی نییە.

٦٨ - اگنس هێلێر لە قسەوباس سەبارەت بە بارودۆخی زانستی کۆمەڵایەتی ئەوە وەبیر دێنێتەوەکە: لە زانستی کۆمەڵایەتیدا بەڵێنی دڵنیایی و خودوشیاری کە وەکو ناکامی دۆزینەوەی نوێ و تاکخوازانە مانای بەخشیوە، ئەو بەڵێنە جێبەجێ نەکراوە. لەو شوێنەی کە دڵنیایی هەیە نە مانا هەیە نە خودوشیاری، لەو شوێنەش کە مانا و خودوشیاری هەیە، دڵنیایی لە گۆڕێدا نییە (٧١، ل٤٠).

مۆدێرنیتیێ بە تەرکیز کردن لە سەر ئەو گومان و وەهمانـەی کـە لـە جیهـانی کۆمەڵایەتیـدا زاڵبووە، ئەوەی دەیزانین و چۆنیەتی زانینەکـەی ئێمـە، و هـەروەها ئـەو شـێوازانەی کـە لـە بەرهەمهێنانی سەرلەنوێ بەرهەمهێنانەوەی زانستدا دەستنیشان دەکرێت، وەك گرفتێك گەڵاڵە دەکات. لە راستیدا لە خۆی دەپرسێت ئایـا زانسـتی "راسـتەقینە" هـەر بـوونی هەیـە؟ لـە ئاکامدا بەهاکان و ریزبەندیی ناوەرۆکی کۆمەڵگای مـەدەنی و سـەرجەم نـەریتی رۆشـنگەری دەباتە ژێر پرسیارەوە.

پۆست مۆدێرنیستەکان بە ئاوڕدانەوە لە نیچە ئەوە بەڵگەمەند دەکەن کـە جیهانێـك کـە خەریکی بەرهەم هاتنە ناتوانرێ بە پێی سیستەمەکانی زانست و وتـەزاکانی وردی شـیکاری، بە نەگۆڕ دابندرێت. باسی ئەوە دەکرێت کە هەموو هـەوڵێك بـۆ شـیکاریی مێـژوو بـە پێـی جەوهـەر و حەقیقـەت، ناکۆکییـەکانی ناوەنـدەکان، یاسـاکان و سەرچەشـنە گشـتییەکان، داسەپاندنە. گومانی زەینی لە پێشدا دارێـژراو بـە سـەر جیهانێکـدا کـە ئـاڵۆز، نادیـار، و نەناسراوە، دادەسەپێنێت. پاش نوێخوازان باسی ئەوە دەکەن کە دۆزینەوەی وەڵامی کۆتایی بۆ جیهانێك کە حاڵەتی کاتیی درێژماوە و پێوانەنەکراوی دیاردەکان دیاریکەریەتی، بێ کەڵکـە. لە راستیدا ئەگەر شتێك پاش نوێخوازان یەکانگیر بکات، گوماخوازی بە نیسـبـەت چـەمکی "هۆ سازکردن" و لە ئاکامدا، بەڵێن بە لێکنەچوون، چەند کەرتبوون و جیاوازییە.

پۆست مۆدێرنیسـتەکان، بـە تـەیاربوون بـەو بەڵێنـە لەمـەڕ لێکنەچـوون، لـە جێگـەی میتانارەتیڤ (حیکایەتە مەزنەکان) تێکەڵاوێك لـە گێڕانـەوە رووکەشـییەکان دادەنـێن. لـە جیاتی یاسا مێژووییەکان کە ئەزموونی مرۆیی رێکدەخەن، لە سەر ئەگەری وەدیهاتن، دیاری نەکردن و مەرجداربوونەکەی جەخت دەکەنەوە و لە جیاتی گوتاری داپۆشینی یەکتری لە سـەر پێکەوە هەڵنەسەنگاندنی گوتارەکان جەخت دەکەنەوە. پاش مـۆدێرنیتیێ بـە دەسـتەواژەکانی وەك چەندکەرتبوون، "جیاوازی"، و پێکهاتە و پەلامارە کلتوریەکان دەنگی دەدایەوە. و پاش نوێخوازان بە بە تەیاربوون بە نالێکچوون و چەند کەرتبوون، سەرجەمی ئـەو رەفتارانـەی کـە داواکاری ناسینی جیهان و گۆڕینی ئەون تووشی ململانێ دەکەن. ئەو رەفتارانە پشـتیان بـەو تیۆریە گەورانە بەستووە کە بەشێوەی دەرخسـتنی بـەربڵاوی مێـژووی مرۆیـی کـار دەکـەن، هەوڵدەدەن رێگە چارەی بۆ بدۆزنەوە و هەوڵدەدەن بیگۆڕن و هەر لە بەر ئەو هۆیە وەك هەوڵـە گشتگیرەکان چاو لێدەکرێن. ئەوانە تـەنیا بانگەشـەی زانسـتی رەهـان، بـەڵکو لێکدانـەوەی تایبەتیی خۆیشیان لە تێگەیشتن بە سەر گوتارەکانی دیکەدا دادەسەپێنن، ئەو گوتارانەی کـە

لەو رەوتەدا حالەتێکی پەراوێزییان بەخۆیانەوە گرتوە. کەوابوو ئەو رەفتارانە نە تەنیا گشتی بەڵکو گشتیخوازیشن.

بە پێچەوانەی ئەو، بیرمەندانی پاش مۆدێرنیتێ باس لە فرەیی دەرکەکان و رەفتارەکان دەکەن، و باسی ئەوە دەکەن کە سەرجەمی لایەنەکانی ناسین لە جێی خۆیاندا جێی بایەخن. لەو رووەوە وەها گرنگییەکیان هەیە کە هیچ لێکدانەوەیەکی راستییەکی رەها بوونی نییە کە بتوانێت وەك پێوانەیەك کار بکات. پاش نوێخوازان بەلگەی ئەوە دێننەوە کە پێکهاتەی تیۆریە گەورەکان و رەفتاری هەر بەو چەشنە گەورەش کە بەشێوەی رێنوێنیکەری سیاسەت کار دەکەن و پشتیان بە پلەبەندی، پێشێتی بەخشینەکان و پەراوێزخستنەکان بەستووە گێرانەوە و درخستنەکانی دیکە لە خۆیاندا نوقم دەکەن.

قەیرانەکە لە گوتارە ئاکادیمیەکان ئەولاوەتر دەچێت و سەرجەم دامەزراوە کۆمەلایەتی و سیاسی و رەفتارە نواندنەوەکان دەگرێتەوە. کەوابوو ئەو تەوەرە بۆ رەفتارە سیاسییەکان پێویستیی جێگای سەرنجی هەیە. یەکێك لە کاریگەرە راستەوخۆکانی قەیرانەکە، رەتکردنەوەی هەموو ئەو رەفتارانەیە کە پشتی بە تێگەیشتنێکی ئاکاخوازانەی مێژوو بەستبێت، و رەتکردنەوەی هەموو ئەو بیروبۆچوونانەی کە باس لەوە دەکەن دەکرێ لە رێگای دەستێوەردانی وشیارانەی مرۆییەوە لە مێژوو تێبگەن و بیگۆڕن. شرۆڤەی مادەخوازانەی مێژوو، و ئەو چەمکە کە فلانە ناکۆکی لە شێوەی بەرهەم هێنان، بۆ بارودۆخی مرۆیی شتێکی ناوەندیە، وە ئەو فیکرە کە کارگێڕێکی پلەیەکی وەك پرۆلیتاریا هەیە کە دەتوانێ هەست بە بزێوی مێژوو بکات و بیگۆڕێت، یەکەمین و بەرچاوترین قوربانیی ئەو ئەندێشە پاش مۆدێرنیتێیە بووە. لە ئاکامدا، ئەو ئەندێشە، فیکری هەبوونی بنەمایەکی رێکخەر کە بۆ گرێدانەوەی رێگاچارە جۆراوجۆرەکانی خۆڕاگری لە گوتارێکی یەکانگیردا پێویست بێت، رەتدەکاتەوە. لێکدانەوەکانی پەیوەندیدار بە فرەیی شێوازەکانی تێگەیشتن، راستەوخۆ بەرەولای داخوازیی فرەیی لە سیاسەتدا رێنوێنی کراون.

سیاسەتی پاش مۆدێرنیتێ لە بواری رەفتارە سیاسییەکانەوە لە جیاتی چەمکی خەباتی چینایەتی و چەمکی شۆڕش، چەمکی بزووتنەوە فرەچەشنە کۆمەلایەتییەکانی چەقبەستوو لە سەر پێشهاتە تایبەتیەکان داناوە. پاش نوێخوازان لەو کارەدا کاریگەرییەکی زۆریان لە بزووتنەوە کۆمەلایەتییە نوێیەکان وەرگرتووە کە لانیکەم لە کۆتایی دەیەی ١٩٦٠ لە ولاتانی سەرتاسەری جیهاندا بەرچاو کەوتوون. لە راستیدا دەکرێ بانگەشەی ئەوە بکرێ کە سەرجەمی ئەدەبیاتی پەیوەندیدار بە بزووتنەوە کۆمەلایەتییە نوێیەکانەوە بنەمای واتایی هەلوێستە پاش

نوێخوازەکانیان شکڵ پێداوە، و چەمکەکانی پاش مۆدێرنیتیێ، سیاسەتی ئەو بزووتنەوە کۆمەڵایەتییە نوێیانەی کەڵەکە کردووە.

بە لەبەر چاو گرتنی ئەو مەسەلانە، ئاشکرایە کە هەر بنەمایەکی رێکخستن دەبێ بە نیسبەت ئەو هۆگری و سەرنجە جیاوازانەی کە بزووتنەوە کۆمەڵایەتییەکان دەری دەبڕن، زۆر هەستیار بێت. بەڵام ئەوکات پرسیەکی دیکە دێتە پێشەوە، و ئەویش ئەوەیە کە ئایا سەرووگوتاری یەکێتی بەخش دەتوانی دەنگەکانی دیکە دەربخات، یان تەنانەت ئەوانی دیکە هەر وێناش بکات؟ لە قسەوباسەکانی پاش مۆدێرنیتیێدا هەر ئەو پرسیە بە ناچار بە راستای بنەڕەتیکردنەوەی فیکری جیاوازدا چووە. باسی ئەوە دەکەن کە ناکرێ بە هیچ فەرمانگوزارێکی دیکە زەینییەتیەکان دیسانەوە پیشان بدرێنەوە چونکە لەوانەیە لە نێوان گوتاری نواندنەوە و گوتاری ئەوانەی کە پیشان دەدرێنەوە لێکدابڕانێکی بەرچاو لە ئارادابێت.[69] لە راستیدا یەکێك لە ڕەوتەکانی پاش مۆدێرنیتیێ هەر حاشا لە ئەگەری نواندنەوە دەکات.

چارەسەری سیاسی قەیرانی نواندنەوە کە سیاسەتی پاش مۆدێرنیتیێ دەیخاتە روو، ئەوە بووە کە جیاوازیی گرنگتر لە یەکبوون و وێکچوونی داشکێنەر، و فرەیی مێژوویی گرنگتر لە تاقانەخوازی سیاسی و فرەیی نواندنەوەکان گرنگتر لە گەلاڵە بەکۆمەڵەکان دێتە ئەژمار. بەگشتی، گەلاڵە بەکۆمەڵەکانی پشت ئەستور بە ئەولەویەتەکان ڕەتکراونەتەوە و ئەو تێگەیشتنە کە خەباتە فرەییە کۆمەڵایەتییەکانی دەرخەری پێشهاتە تایبەتیەکان، روکەشیەکان، و شەخسیەکان دەبێ بکەونە پێشەوە، زاڵ بووە. بیرمەندانی بزووتنەوە کۆمەڵایەتییە نوێیەکان ئەوە قبوڵ دەکەن کە ئەم بزووتنەوانە دەتوانن بە مەبەستی رێگاچارە، یەکێتییەکی ناپتەو پێکەوە پێك بێنن بەڵام هەرچەشنە بێدەنگییەك لە بەرامبەر گەلاڵەیەکی گەورەی کۆمەڵایەتیدا، تایبەتمەندیی ئەوان دەسڕێتەوە و ئەوان لە توانایی دەربڕینی ئەزموونەکانی خۆیان وەك ڕەفتار

٦٩ - بیرمەندانی پاش مۆدێرنیتیێ بەو قەیرانە دەڵێن قەیرانی نواندنەوە (٧٨ و ٤١). روی بوین و عەلی رتانسی پێی دەڵێن زنجیرەیەك قەیرانی نواندنەوە کە "تێیدا شێوازەکانی کۆنی پێناسەکردن، دەست بەسەرداگرتن و پێکهێنانی سەرلەنوێ، تەوەرەکانی زمانی هونەری فەلسەفی، ئەدەبی، کۆمەڵایەتی و زانستی ئیتر بایەخێکیان نییە و تێیدا لایەنێکی هاوبەش هەڵوەشاندنەوەی هەموو سنورەکانی نێوان زمان و تەوەری ئەوە (٦١، ل١٢).

پەتی دەكات. ڕەتكردنـەوەی بنـەمای ڕێكخسـتن كـە بتوانێـت ئـەو خەباتـە جۆراوجۆرانـە لـە خەباتێكی سیاسیی ڕێكوپێك و كاریگەردا لێك گرێداتەوە، ڕوون و ئاشكرایە.

بیرمەندانی بزووتنەوە كۆمەڵایەتییە نوێیەكان لە ژێركاریگەریی ئەزموونەكانی خۆیانـدا و پێگەیشتنیان لە پاش مۆدێرنیتێدا، لە سـەر فرەچەشـنی و شـیاوی هەڵنەسـەنگاندنی بنـەما كۆمەڵایەتییەكان، ئامانجەكان و ئایدۆلۆژیەكانی ئەم بزووتنەوانە جەخت دەكەنەوە. ئەوان بـەو ئاكامە دەگەن كە ناكرێ ئەو ئامانج و ئایدۆلۆژیە فرەچەشنانە لە نێـو یـەك گوتـاردا كـورت بكرێنەوە. گوتەی بەدیلی ئەوان ئەوەیە كە چـونكە كۆمـەڵگا لـە پەیوەندییـە كۆمەڵایەتییـە فرەچەشنەكان پێكهاتووە، ناكرێ ئەو پەیوەندییانە تا ئاسـتی یـەك نـاكۆكی ناوەنـدێتی بێتـە خوارەوە. ئەو پەیوەندییە فرەچەشنە كۆمەڵایەتیانەی دەسەڵات پێویستیان بە تێكهەڵچوون لـە سەرجەم ئاستەكاندایە. لە ئاكامدا، ڕوانگەی پاش مۆدێرنیتێ سیاسەت لە سەر ئەو باوەڕەیـە كە بە لەبەرچاوگرتنی ئەو ڕاستییە كە توانایی هەموو گوتارێـك بـۆ نواندنـەوەی دەنگـەكانی دیكە جێگەی گومانە، سەرجەم گروپەكان یان پێناسە كۆمەڵایەتییەكان دەبێ بتـوانن پـرس و گلەییەكانی خۆیان بە شێوەیەكی سـەربەخۆ لە هەرچەشنە پەرگوتارێك دەربڕن.

دەبێ ئەوە قبوڵ بكرێت كە بیرمەندانی بزووتنەوە كۆمەڵایەتییە نوێیەكان كە لە نێوخۆی ئەو ڕایەڵە واتاییدا كار دەكەن كە سیاسەتی پـاش مـۆدێرنیتێ دابـینی كـردووە، هـەم لـە زانسـتی كۆمەڵایەتیدا و هـەم لـە بەرنامـە سیاسـییەكاندا دەسـتێوەردانێكی گرنگیـان هـەبووە. ئـەوان سەرنجیان بە ژیانی كۆمەڵایەتی، بە "بەرنامە نهێنییەكان"، پێكهاتە تیۆرەكان، و پەراوێزخستنی چالاكییە سیاسییەكان داوە. هەربۆیە، سـەرجەم ئەو كەسانەی كە لەگەڵ پرسـەكانی گۆڕانكـاریی كۆمەڵایـەتی لـە پەیوەنـدی دان، ناچـار بـە تـاوتوێكردنی سـەرلەنوێی گریمانـە واتاییـەكان و شـێوازەكانی گرێبەسـتی ڕەفتـارە سیاسـییەكانی خۆیـان كـردوون. لـە ڕاسـتیدا بانگەشـەی سیاسەتەكانی پاش مۆدێرنیتێ، كە بە زمانێكی درێژدادڕی و بـاس و گفتوگـۆ دەردەبـڕێن، وەك ڕەخنەی ئەو هەڵوێستانەی كە لە ئارادان و لە بواری هەستیاركردنەوەی ئێمە بەو پێشهاتانەی كە كەمتر لە بەرچاو گیراون یان پێشێل كراون، مانای زیاتر بە خۆیانەوە دەگرن.

بەڵام واگنەر ئەوە وەبیر دێنێتەوە كە "لەو خاڵەدا زۆربـەی بیرمەنـدانی پـاش مـۆدێرنیتێ پاشگەز دەبنەوە. لە ڕوانگـەی خـودی ئەوانـەوە، شـیكاریەكانیان، ئـەوان بـەرەو وەڵامێكـی نیگەتیف بۆ هەرچەشنە گەڕانێك بەدوای ڕوونكردنەوە، مانا، و كـارگێڕی ڕێنـوێنی دەكـات" (١٨١، ل٤٧٨). ڕەنگە بە ئاسانی بكرێ لەوە تێبگەین كە بۆچی وەڵامەكانی پاش مۆدێرنیتێ

بۆ سەرقاڵیەکانی دۆخی مرۆیی پۆزەتیڤن؟ گوتاری پاش مۆدێرنیتیٚ چونکە سەرنجی کۆمەڵێکی زۆر لە خۆڕاگرییە باسکراوەکانی مێژوو دەدات، خاوەنی دەنگدانەوەی پێویستیەکانی بونیاتخوازە. بەڵام لە پرسەکانی ڕێگاچارەی سیاسیدا بێدەنگ و وەك دیاریکردنی دیاردە کۆمەڵایەتییەکان ناتەواوە.

ناتەواوە لە بەر ئەوەی پۆست مۆدێرنیستەکان بە مەبەستی دەربازبوون لە داوی واتایی هەرچشنە پێویستیەکدا، بەرەولای کارێکی نادیار، بیٚ شرۆڤە، و خۆدزینەوە دەچن. لە جیاتی دابینکردنی تیۆرێك بۆ دیاریکردنی فەرەیی بەڵام یەکتراپۆشی کۆمەڵایەتی، لە سەر ئەگەری وەدیهاتن جەخت دەکەنەوە. لە جیاتی توێژینەوە لە ناکۆکیی نێوان پێکهاتەکانی گشتی و کامڵبوونی خۆیان، لە سەر چەند کەرتبوونەکان جەخت دەکەنەوە، و لە جیاتی تاوتوێکردنی پەیوەندیی ئاڵۆزی نێوان پێکهاتە عەینی و خاوەنکارە بکەرەکان، لە سەر لایەنی بکەری تەرکیز دەکەن، و لەو کارەشدا هەتا ئاستی کەشەکانی سەروو ناوەرۆکی کلاسیکی تیۆری سیاسی پاشەکشە دەکەن. پاش مۆدێرنیتیٚ زۆربەی گریمانەکانی تیۆری کلاسیکی سیاسی بە دەردەسەرساز دەزانێت، بەڵام لە پرۆسەی بردنە ژێرپرسیاری ئەو گریمانانەوە، هەندێك لە ناوەرۆکە بنەڕەتیەکانی خودی تیۆری سیاسی دەردەهاوێژێت.

بە پەراوێزخستنی زۆربەی ئەو تیۆرانە وەك خەیاڵی لەکار کەوتوو و ناموەکین، ئەو مەسەلانەی کە ئەو تیۆرانە گەڵاڵەیان کردن و هەوڵیاندا وەڵامێکی بۆ بدۆزنەوە، لە بەرچاو نەگیراون. وە پەراوێزخستنی ئەو مەسەلانە بریتیە لەوەی نیگەرانیەکانی تیۆری کلاسیك لە کاتێکدا وەلانراون کە پرسەکانی دۆخی مرۆیی توندتر بوونەتەوە. هێژمۆنی سەرمایەداری، باوك مەزنی، هەڵاواردنی ڕەگەزی، و بونیاتگەری دینی هێشتا وەك ئایدۆلۆژیایەکی گشتگیر کار دەکات کە پێویستیی بە دژایەتی و تیۆری ڕەخنەگرانە هەیە. ئەگەر پاش مۆدێرنیتیٚ لە پێکهاتە نیگەتیڤەکانی خۆیدا چەندکەرتبوون و ناڵێکچونەکانمان دەداتیٚ، لە وێناکردنی داهێنەرانەی خۆیدا ئاوێتەیەك لە گێڕانەوە روکەشیەکانی خۆڕاگری باس دەکات، بەڵام چونکە هیچ ڕێنوێنیەك لەو بوارەدا باس ناکات کە بە چ شێوەیەك دەکریٚ ئەو گێڕانەوانە لەپاڵ یەکتری دابندرێن، سیاسەت بە چەند کەرتبوون و بەتاق کەوتنەوە تاوانبار دەکات. حاشا کردن لەو ئاکامە دژوارە، حاشاکردن لە ڕێگەچارە گشتگیرەکان، حاشا کردن لە کار و بەرنامە سیاسییەکانە، چونکە بەدیلە زانستییەکان لە پێش چاو ناگرێت.

بەڵام مەرجەكانی ئێمە سەبارەت بە پاش مـۆدێرنیتیێ وەك رەفتـاری سیـاسـی هەرچـییەك بێت، دەبێ ئەو پرسیارانەی كە ئەو روانگەیە هێناویەتیە ئاراوە بە هەنـد وەربگـرین، چـونكە پاش مۆدێرنیتیێ لا كاریگەرەكەی خۆی وەك رەخنە بەدەست دێنێتەوە. كەوابوو ئیتر ناكرێ بیر لە بنەمایەكی رێكخەرانە بكرێتەوە كە خەباتە جۆراوجۆرەكان بەشـێوەیەكی سەررِاسـت و بـێ كێشە خولقێن، یەك بخاتەوە. دەبێ بە پێـی پێویسـت نیگـەرانی پرۆسـەكانی پەراوێزخسـتن و زاڵبوون بین كە لەوانەیە لە ناخی ئەو بنەمایە دابێت. پرسیەك كە دێتە گۆرێ ئەوەیە: یەكەمین بنەمای گوتاری كە بتوانێـت خـەباتی چـەند كـەرتبوو، تـاكی و روكەشـیانە لـە گوتـارێكی هاوبەشی هۆگرییە هاوبەشەكاندا لە پاڵ یەكتری دانێت، دەبێ چی بێت؟

بە برِوای من واپێدەچێت كە یەكەمین بنەما ئەوەیە كـە بـەهاكانی دیمـوكراتیی ئـازادی و یەكسانی وەك بواری سـەرەكیی ئەو گوتارە دەست نیشان بكەین.

بەهاكانی ئازادی و یەكسانیی سەرەتییەكی دوولایەنەیان هەیە. یەكەم لەبەر ئەوەی بـە سـەر قبولكردنی گوتارەكان لە بوارێكی هاوبەشدا زاڵن، ناكرێ هیچـكامیان لـە بـەر ئـەوە پەراوێز بخرێن كە ئەو رووداوانەی دەیهێننە پێشەوە، بایەخێكیان بۆ رەفتاری سیاسی نییـە. بەڵام دووهەم و گرنگتر ئەوەیە كە كۆمەڵگای مەدەنی دیموكراتی توانایی ئەوەی نییە كە بە هەر گوتارێك و بە سەرجەم گوتارەكان ـــ گوتاری زاڵبوونی چینایەتی، بونیاتگەری دیـنی، باوك مەزنی و رەگەزپەرستی ـــ ئیزنی ئەوە بدات بچـنە نـاو بوارەكـەی ئـەوەوە. سـەرجەم گوتارەكـانی كۆمـەڵگای مـەدەنی دیـوكراتی نـین، و سـەرجەم گوتارەكـان لەگـەڵ بنـەما پەراوێزخەرەكانی كۆمەڵگای مەدەنی لـە ململانێـدا نـین. ئـەو گوتارانـەش كـە بـە دوای قبولكردن لە كۆمەڵگای مەدەنیدا دەگەرِێن، و ئەو گوتارانـەی كـە بـە شـوێن لێچـواندنی ئەوەوەن، لەوانەیە شێوازەكانی دیكـەی زاڵبـوون بـە سـەر گوتارەكـانی دیكـە و بـە سـەر ئەندامانی خۆیشیاندا لەگەڵ خۆیـان بێـنن. دەبـێ بـۆ قبـوڵ بـوون لـەگوتاری دیمـوكراتی كۆمەڵگای مەدەنیدا پێوانەیەك لە ئارادابێت. ئەگەر پێوانەی ئازادی و یەكسانی بـە سـەر گوتارە تاكەكاندا بـەپێنین، بنەمایەكی سەرەكی بۆ قبوڵبوون لە كەشی دیموكراتیـدا پتـەو دەبێت. ئەو گوتارانەی كە ئەو پێوانەیە دابین ناكەن دەبێ بە پێی لۆژیـك جێگایـەكیان لـە گوتاری دیموكراتیی كۆمەڵگای مەدەنیدا نەبێت.

بەڵام ئەوە بەو مانایەشە كە گوتارە دیموكراتیەكانی كۆمەڵگای مەدەنی دەبێ، لە گەڵ ئەو رەفتارانەی كە بەر بە وەدیهاتنی ئارمانی دیموكراتی دەگرن، ململانێ بكەن. كەوابوو ئازادی و

یەکسانی تەنیا و تەنیا بەها نین، پێودانگیشن. هەربۆیە بە هەر دووك بوارەکەدا، هۆگرییەکی گشتی و بنەمایەکی گشتی بۆ ڕیزبەندیی دڵخوازانەی هەر کۆمەڵگایەکن.

لێرەدا گشتەکی بە مانای سڕینەوەی کاروباری هەندەکی نییە، چونکە هەڵگری بەشێکە لە ناو خۆیدا. بۆ دەرککردنی ئەو خاڵە دەبێ بگەڕێینەوە سەر بیرمەندانی گەورەی فەلسەفەی سیاسی ــ هیگڵ، دۆ تۆکڤیل، ج.س.میل، و مارکس. گوایا بەو چەشنە نییە کە تەرکیز کردن لە سەر کاروباری هەندەکی و لە سەر جیاوازیەکان شتێکی نوێ بێت، تیۆری سیاسیی هەمیشە بە نیسبەت فیکری جیاوازەوە هەستیار بووە ـــ سەرجەمی ئەدەبیاتی پەیوەندیدار بە فرەخوازی سیاسی شایەتیی ئەوەیە، و مارکسیزم لە سەر ئەو شیکاریە تەرکیزی کردوە کە بۆچی جیاوازیەکان بە شێوەی مێژوویی باس نەکراون بەڵکو لە ڕەوتی تەوەری زاڵبون و ملکەچ بووندا پێکهاتوون. کەوابوو تیۆری مارکسیستی بەو ئاکامە گەیشتوە کە ئەو جیاوازیانە کە ڕەگ و ڕیشەیان داکوتاوە ناکرێ لە چوارچێوەی ئێستای کۆمەڵگا و دەوڵەتدا پێکەوە ئاشت بکرێنەوە.

بەڵام تیۆری کلاسیکی سیاسی لە بەرامبەر ئەو فیکرەشدا هەستیار بووە کە سەرەڕای جیاوازیەکان، مەیدانێکی هۆگریەکانە کە بۆ باروودۆخی مرۆیی هاوبەش و گشتییە. لە لیبراڵیزمدا، ئەو هاوبەشی و گشتێتیە لە زمانی مافەکان و ئازادیەکانەوە دەردەبڕێت. سەرجەم تاکەکان پێویستیان بە مافەکان و ئازادییە دیاریکراوەکان هەیە وەك پێشمەرجی هەبوونێکی مرۆیی، و ئەوەیە کە خەڵکی لە کەشە تایبەتیە هەندەکیەکانەوە بەرەو گوتاری هۆگرییە هاوبەشەکان و خێرخوازیی هەمەلایەنە دێنێت. بنەمای ڕێکخەری سیاسەتی لیبراڵ بە پێی نەریت گوتاری مافەکان بووە. مارکسیستەکان هەنگاوێك بەرەوپێشتر دەچن، بۆ ئەوەی بوونەوەرە مرۆییەکان بتوانن هەبوونی چەشنیەتی خۆیان وەدی بێنن پێویستە کە لە پێکهاتەکانی ململانێی دامەزراوە کۆمەڵایەتی و سیاسییەکان ڕزگاریان بێت. لە تیۆری مارکسیستیدا ڕەفتارە جۆراوجۆرەکانی خۆڕاگری لە لایەن گوتارە ڕزگاریبەخشەکانەوە یەکانگیر دەکرێن.

بەم جۆرە هەکییەتی گوتار و ڕەفتاری سیاسی بەهایەك، بۆتە ڕێگەچارە و بووەتە پێوەر. لە نەریتی هیگڵی ــ مارکسیدا، گشتێتی بەهایە. بە بڕوای هیگڵ، هەمەکییەت ئامرازێك بوو کە هەندەکی لە ڕێگای ئەوەوە بەکردەوە دەردەهات و پێکەوە دەلکا، بە بڕوای مارکس هەمەکییەت پێگەیەك بوو کە ناکۆکییە فۆرمۆلبەندییە کۆمەڵایەتییەکان تێیدا کۆ دەبوونەوە

و هەربۆیە ئاشتەوایی دەهاتە گۆڕێ. ئەم دووانە پێکەوە نەدەگونجان، چوون بەرەولای گشتێتی، لایەنی هەندەکی نەدەسڕیەوە، و هەندەکی لە ڕێگای گشتێتیەوە وەدەی دەهات.

هەمەکییەت، وەك فۆرم پێوانەیەك دابین دەکات کە ئیزن بە هەڵسەنگاندنی ڕەفتارە تایبەتیەکان دەدات. بە پێی ئەو لۆژیکە ڕەفتارە هەندەکییەکان لەوانەیە ڕەفتارەکانی چەقبەستوو بە سەر خۆیاندابن. لە لایەکی دیکەوە، ئەو ڕەفتارانەی کە لەگەڵ فیکری گشتێتی یەك دەگرنەوە، بۆیە گونجاون کە پەیوەندییان بە بەرژەوەندییەکی هاوبەشەوە هەیە.

هەمەکییەت وەك ڕێگاچارەیەکی سیاسی، پشتی بەو لێکدانەوەیە بەستووە کە تا کاتێك کارە سیاسییەکان لە گوتاری هۆگرییە هاوبەشەکاندا لە دەوری یەك کۆ نەبنەوە، چەند کەرت دەبن و لە تێکهەڵچوونێکی پڕ کوشت و کوشتاردا، وردە وردە خۆیان لەناو دەبەن.

بەڵام تیۆری سەردەم لە ئەفزەلیەت بەخشین بە لایەنی هەندەکی کەڵك وەردەگرێت و لەو بانگەشەیەی خۆیدا کە هەر بەشێك دەبێ لە لایەن خۆیەوە قسە بکات، لایەنی گشتی و لایەنی هەندەکی وەك دوو جەمسەری دژبەیەك چاو لێدەکات کە ناکرێ هەماهەنگ بکرێن. وەها باس دەکرێت کە لایەنی گشتی هەمیشە تێگەیشتنێکی هەندەکی (ئەورووپا تەوەر) سەبارەت بە جیهان لە ژێر پەردەی گشتێتیدا حەشار دەدات. لە ئاکامدا دەبێتە گوتارێکی گشتگیر کە هەموو چەشنە ستەمەکان دادەپۆشێت. لاکلائو دەڵێت:

ئەو گوتەیەی یەکسانە لەگەڵ گوتنی ئەوەی گشتێتی شتێکی زیاتر لە هەندەکی نییە کە زاڵبووە ــ و ڕێگایەك نییە بۆ گەیشتن بە کۆمەڵگایەکی ئاشتبۆوە، و لە ڕاستییەکی کردەییدا، دیمەنی خەباتە کۆمەڵایەتی و سیاسییەکانی دەیەی ۱۹۹۰ی ئێمە لەگەڵ چوونەسەرێی هەندەکی خوازیەکان بەرەوڕوو دەکات، ئەوە لە کاتێکدایە کە ڕوانگەی گشتێتی هەموو کات و ساتێك زیاتر وەك خەیاڵێك کە باوی نەماوە دەخرێتە پەراوێزەوە. بەڵام من دەمەوێ ئەوە بسەلمێنم کە پشت بەستن بە هەندەکیخوازیی بێگەرد، ڕێگەچارەیەك نییە بۆ ئەو مەسەلانەی کە لە کۆمەڵگاکانی سەردەمدا لەگەڵیان بەرەوڕووین. بانگەشەی هەندەکیخوازی ناتێکەڵاو و بێگەرد، سەربەخۆ لە هەر ناوەڕۆك و هەرچەشنە پشت بەستنێك بە گشتێتی، هەوڵێکە کە تووشی شکست دەبێت. چونکە ئەگەر ئەو تەنیا بنەما نۆرماتیڤە قبوڵ بکرێت، ئێمە لەگەڵ پارادۆکسێکی لە چارەنەهاتوو بەرەوڕوو دەکات. من دەتوانم بەناوی هەندەکیخوازییەوە لە مافی کەمینە جنسیەکان، ڕەگەزیەکان و نەتەوەییەکان داکۆکی بکەم،

بەڵام ئەگەر هەندەکیخوازی تەنیا بنەمای جێی بایەخ بێت، دەبێ مافەکانی هەموو جۆرە گروپە دواکەوتووەکانی سەرقاڵ بە رەفتارە دژی کۆمەڵایەتییەکانەوە قبوڵ بکەین (٩٩،٨٧).

لاکلائۆ بەداخەوەیە بۆ لە دەست چوونی پێوانەیەکی بەهادار کە بتوانێت یارمەتی ئێمە بدات بۆ دادوەری کردن لە مەڕ بزووتنەوە و خەباتەکان لە سەر بنەمای بەها گشتییەکان. بەڵام لەوەش گرنگتر ئەوەیە کە لە سەر بنبەستەکانی وەها هەڵوێستێك جەخت دەکاتەوە، چونکە رێژەییخوازیی ناسینی مەعریفە و هەروەها سیاسی لێدەکەوێتەوە. رێژەییخوازی لە بواری ناسینی مەعریفەوە جێگەی نیگەرانییە چونکە بەبێ هیچ دڵنیاکردنەوەیەك ئەوە بە ئێمە دەڵێت کە هەندێك لە راڤەکان لەوانی دیکە باشترن چونکە بنەمایەکی ئەخلاقیان هەیە. بە چەشنێکی دیکە ئێمە لە گەڵ ئەو هەستە بەرەوڕوو دەکات کە سەرجەم راڤەکان دڵخوازانەن. وە ئەگەر فلانە خوێندنەوەی دیاریکراو شتێك بە زیانی خوێندنەوەکانی دیکە پێشکەش بکات کە ئەوانیش هەر بەو رادەیە جێگای بایەخن، یان ئەگەر هەر نواندنەوەیەك، نەواندنەوەیەکی هەڵە بێت، ئەوکات ئێمە لە رەوتێکی بێکۆتایی لە گومان و حەسودیخوازیدا گیرۆدە دەبین کە بانگەشەی گوماناوییبوونی زانست دەکات. ئەگەر هەر خوێندنەوەیەك هەر بەو رادەیە باش بێت کە خوێندنەوەیەکی دیکە باشە، ئەوکات ئیتر شێوازێکمان بۆ دادوەریی نێوان راڤەکان نییە. وە ئەگەر هەموو راڤەیەکیش جێی بایەخ بێت، ئەو کات هەروەك چۆن هێلێر(HELLER) و فێهێر(FEHER) باسی دەکەن، دەکرێ پاش مۆدێرنیتیێ بە دۆخێك پێناسە بکرێت کە تێیدا هەموو شتێك رێگەپێدراوە (٧٢،١٣٩).

لە بواری سیاسییەوە، هەر کارێکی نەواندنەوە هەر بەو رادەیە رێگەپێدراوە کە ئەوی دیکە شەرعیەتی هەیە، وە ئەوەش تا رادەیەك لە بەر ئەو هۆیەیە کە پاش مۆدێرنیتیێ لە سەر ئەوە پێداگری دەکات کە هەرکام لەوان دەبێ بە پێی خۆی و نەك بە پێی پێوانە دەرەکییەکان هەڵسەنگێندرێت. ئەو کارە بە شێوەی هەستیار کاریگەری لە سەر رەفتاری سیاسی داناوە: هەمەکییەت وەك رێگاچارە و وەك فۆرمێکی پێوانەیی بۆ دادوەری و هەڵسەنگاندن دابین دەکات. پێوانەیەك دابین دەکات کە بە پێی ئەو بتوانرێت هەندێك لە کارەکان بۆ دۆخی مرۆیی بەگونجاوتر بزانرێن. سیاسەتی پاش مۆدێرنیتیێ، بە رەتکردنەوەی هەمەکییەت وەك بەهایەك لە ناو خۆیدا و یان وەك پێوانەیەك، دەوردانی خۆی بە سەر هۆگری و کردەوە نەریتیەکان لەدەست دەدات. چالاکی سیاسی و بیرمەندی سیاسی لە بێ باوەڕی و گوماندا بە جێ دێڵێت. هانتر(HUNTER) ئەوەمان وەبیر دێنێتەوە "زۆربەی چالاکان پێوانەی دیاریکردنی ئەوەیان

لەدەست داوە کە ئایا فلانە کاری تایبەتی بە قازانجی تاك یان گروپەکەی ئەون یـان نـا، و لـە ڕەفتارگەرای و ڕێژەییخوازییەکی نەگونجاو کەوتوون" (٧٧، ل٨٨٦).

ڕێژەییخوازی لە سیاسـەتدا دەتوانێت بۆ سیاسەتی ڕزگـاریی و دیمـوکراتی بـوون لاوازکـەر بێت. هەندێك لە بەهێزترین و بەربلاوترین بزووتنـەوە کۆمەڵایەتییـەکان کـە لـە کۆمـەڵگای مەدەنیی سەردەمدا پێکهاتوون ــ بۆ نموونە سەرهەڵدانی بونیاتخوازی دینی کە ئەندامانی خۆی ترساندوە، سەرهەڵدانی فاشیستە نوێیەکان لە ئەڵمانیا، شەپۆلی هیند و توا لە هیندستان ــ دواکەوتووانە و سەرکوتگەرن. لە نەبوونی هەرچەشنە پێوانەیەکی پشت ئەستور بە بـەهاکانی گشتیی ئازادی و یەکسانی، بۆ چـاودێری سیاسـی هـیچ هـەلێك بـۆ تاوانبـارکردن و ڕەخنـە نامێنێتەوە.

ئەگەر تیۆری سیاسی نەتوانێت لە خۆی دوور بکەوێتەوە، و بە دەربڕینێکـی خـوازەیی لـە پلەوپایەی تاکەکەسی و ڕوکەشیانەی خەبات سەرووتر بڕوات، ئەگەر تیۆری سیاسی نـەتوانێت ئامانجی هەندێك لە خەباتەکان لە بەر ئەو هۆیەی کە لە ڕوانگەی ئەخلاقی و سیاسی داکۆکی لە خۆیان دەکەن، بەرەو پێشەوە بەرێت، ئەوکات لۆژیکی سەرجەم خەباتەکان بە چەشنێك کـە لە ڕوانگەی خۆیانەوە باس دەکرێت، وەك شتێکی جێگای پەسند خۆی دەنوێنێـت.[٧٠] وە ئـەوە

---

٧٠ - بلدان فیلدز نمونەیەکی سەرنجڕاکێش لەو هەڵانە باس دەکات کە وەها هەڵوێستێك پێی دەگات. فۆکۆ لەگەڵ گروپێك لە چالاکانی مائۆنیست لە پەیوەندی دابوو. چەپی پرۆلیتاریایی بەڵگەکانی فۆکۆی پەسند کرد لە مەڕ ئەوەیکە سەرجەم دەسەڵاتەکان بە قازانجی دەوڵەت کار دەکەن و کەوابوو دەبێ پشتیوانی هەموو خەباتەکانی دژی دەوڵەتی بکەن. بەو لۆژیکەوە ئەوان مافی خۆیان بوو کە لەگەڵ ئەو دوکاندارانەی کە لە دژی مالیاتەکان نارەزایەتییان دەردەبڕی، بچنە بەرەیەکەوە! بەلام لە لایەن سارتەرەوە بە توندی ڕەخنەیان لێگیرا لە بەر ئەوەیکە بۆچی خوخدەی مشتومڕ ڕاڤە ناکەن و نازانن کە ئەو خەباتەی کە وەڕێ کەوتووە بە هیچ شێوەیەك پێشکەوتنخوازانە نییە. لە هیندستانی نمونەیەکی هاوشێوەمان بوو. لە ساڵی ١٩٩٠ حکومەت فێرکاری و پێش بینیەکی پیشەیی بۆ ئەو چینە ژێردەستانە ڕاگەیاند کە بەشێوەیەکی مێژوویی هەر بێبەش بوون. خێرا و بەپەلە چینەکانی دیکە و بەتایبەت خوێندکارانیش دەنگی نارەزایەتیان بەرز بووەوە کە هەستیان بە قوربانی بوونی خۆیان دەکرد. پشتیوانیی جەماوەری لە بزووتنەوەکە، بە شتێکی پێشکەوتنخوازانە وێنا کرا، بە بێ لەبەر چاوگرتنی ئەو ڕاستیە کە بزووتنەوەکە لە لایەن توێژەکانی خوارەوە پشتیوانیی لێدەکرا کە

دیسانەوە ئێمە دەباتەوە جێگایەك كـە لاكلائـۆ باسـی كـردووە و تێیـدا هـیچ بەڵگـە و یـان پاساوێك بۆ تاوانباركردنی هیچ بزووتنەوەیەك بوونی نییە.

لەدەستچوونی هەمەكییەت وەك پێوانەیەك، پرسیەكی دیكەی لێدەكەوێتەوە. لەبەرئـەوەی هەر گوتارێك لە دژی ئـەویتر هەڵوێـست وەردەگرێـت، بـۆ نـەزمی ئـەوجۆرە كێشمەكێشـانە بنەمایەكی گشتی بەدەر لە گوتاری تایبەتی پێویستیە. ئەو بنەمایە بە پێی پێویسـت دەبـێ پشت ئەستور بە تێگەیشتنێك لە بەرژەوەندیی گشتی بن كە لە گوتـاری تایبـەتی ئـەولاوەتر بچێت. ئەگەر وەها مانایەك لەمەڕ بەرژەوەنـدیی گشـتی لـە ئـارادا نـەبێت، پێكهاتەیـەكی دادوەرانە بوونی نییە. كەوابوو چەمكەكانی ئازادی و یەكسانی وەك بنەمای گشـتی پێویسـتن بۆ ئەوەی لە نێوان تەوەرە جۆراوجۆرەكاندا دادوەری بكەن. نەبوونی هەمەكییەت وەك بنەمای گشتیی ڕێكخەر یان تووشی بشێوی دەبێت كە تێیدا هەر بەشێك بە شێوەیەكی بێكۆتایی لـە دژی ئەویتر بوونی خۆی دەردەبڕێت ــ ئەو دۆخەی كە هیگڵ لێی دەترسا ــ یـان سـەركەوتنی یەكێكی لێدەكەوێتەوە كە بە سەر زۆربەی پێداویستیە ئەخلاقی و هـەروەها مادد‌یـەكانیشـدا زاڵە ــ ئەو دۆخەی كە ماركس لێی دەترسا.

بێجگە لەوەش، لەدەست چوونی هەمەكییەت وەك ڕێگاچارەیەكی سیاسی بەو مانایەیە كە ڕەفتارەكان پێویستییەكیان بەوە نییە كە لەگەڵ یەكتری بكـەون، و ڕەفتـاری سیاسـی پارچـە پارچە كۆمەڵگای مەدەنی پارچە پارچەشـی لێدەكەوێتـەوە. كۆمـەڵگا مەدەنییـەكان هـەروا گرێدراو بە بەزەیی ڕەفتارەكانی چینە باڵادەستەكانەوە دەمێننەوە. گەیشتن بەو ئاكامـە دژوار نییە كە گوتاری هەندەكی بە دڵنیاییەوە دەچێتە چوارچێوەی فرەییخوازی لیبراڵییەوە، بەڵام بە بێ هۆگرییە بەرینترەكان كە ئەو گەلاڵەیە لەوانەوە سەرچاوەی گرت، دەكرێ هەموو شتێك لـە نێو ئەو چوارچێوەیەدا بگونجێندرێت و هیچكامێكیشی سەرەتییەكی نییە. ئەوە هەڵوێستێكە كە سەرەڕای بانگەشەی ڕەچەڵەكخوازی، لە زۆر ڕێگاوە تووشی مەیلی پاراسـتنی ئـەو دۆخـە دەبێت كە لە ئارادایە.

بەڵام واتاكانی ئازادی و یەكسانی، تەنیا بەها، پێوانە و فۆرم نـین. ئـاوات و ئارەزووشـن، چونكە دەبێ لە ڕێگای خەباتەوە وەدی بێن. ئەوە بەو مانایەیە كە بزووتنەوە كۆمەڵایەتییەكان

---

بەشێوی مێژوویی خاوەنی دەسەڵاتی كۆمەڵایەتی، ئابووری، و سیاسی بوون، و لە دژی پێشنیازێك بوو كە دەكرێ بە پێشكەوتنخوازانە لە قەڵەم بدرێت، بەو واتایە كە ویستی چاككردنی هەڵەكانی ڕابردووی هەبوو.

دەبێ تێکهەڵچوونی سیاسیان هەبێت. واتە دەبێ لە دژی خودی پێکهاتەکانی دەسەڵات و گرنگتر لە هەمووان لە دژی دەوڵەت، کە دەبنە کۆسپی سەر ڕێگای گەیشتن بەو ئامانج و مەبەستانە، خەبات بکەن. لێرەدا لەگەڵ پرسیەکی دیکە بەرەوڕوو دەبینەوە.

بیرمەندانی بزووتنەوە کۆمەڵایەتییە نوێیەکان کە سەرنجێکی قوڵ بە زمان، وشەکان و فەرمانبەریی گوتارە سیاسییە نەریتیەکان نیشان دەدەن، ئیتر نەك باسی ململانێی سیاسی بەڵکو باسی ململانێی کلتوری دەکەن. بزووتنەوە کۆمەڵایەتییە نوێیەکان بە ئەنقەست و ڕاشکاوانە لە شێوازەکانی کۆنی مینەقی سیاسی جیا دەبنەوە. باوەڕەکە وایە کە شێوازە کۆنەکان تا ئەو جێگایەی کە ئەرکەکەیان پەرەپێدانی گوتاری هاوولاتیی بوو و کاتێك کە سنوورەکانی گوتاری دیموکراتی لە ڕێگای خەباتی جەماوەریەوە دەکرانەوە، گونجاو و ڕزگاریدەر بوون. دەگوترێت قۆناغی وروژێنەر کە نوێنەری ئاوەژوو بوونەوەی ڕێزمانی مافەکان و هاوولاتیی، یەکسانی و ئازادی و پەرەسەندنی ئەو بوو، ئێستا ئیتر تەواو بووە. زۆربەی بارودۆخەکانی گوتار کۆن و دوویات بوونەوە و لە بەرامبەر هەبوونی ڕووداوە نوێیەکاندا قایم و پتەو بوون. سەرەڕای ئەوەش بە پێی بەڵگەی بیرمەندانی بزووتنەوە کۆمەڵایەتییە نوێیەکان، ئەو فەرمانبەریانەی کە جارچی گۆڕانی کۆمەڵایەتی بوون، لەوانە پارتەکان، بزووتنەوەی کرێکاری، یەکێتیەکان، بۆرژوکرات و بیرتەسك بوونەتەوە، لە بنەما کۆمەڵایەتییە بەراییەکانی خۆیان دوور کەوتوونەتەوە و ئیتر شتێك نین بێجگە لە بەشدارانی گەمەی دابەشکردنی دەسەڵات.

لە لایەکی دیکەوە، بزووتنەوە کۆمەڵایەتییەکان، بە پێچەوانەی ئەو بزووتنەوانەی کە لەدەوری ناوەرۆکە سیاسییەکان پێکهاتوون، بە داهێنەرانە و نوێخواز دەزانرێن. کاستلز دەڵێت "سیستەمی سیاسی فۆرمێك لە زاڵبوونی کۆمەڵایەتی سیمبولیك دەکات و ڕێساکانی ئاڵوێر لە هەندێ فۆرمی ئەوتۆ دا پەسند دەکات، بەڵام لە لایەکی دیکەوە، هەندێ بزووتنەوە کۆمەڵایەتی هەن کە کۆمەڵگای مەدەنی پێدەگەیەنن و پەیوەندییان پێیەوە هەیە، و بە پێی پێویست لە چوارچێوەی ڕێساکانی ئەم گەمەیە و بنەڕەتی بوونی بەهاکان و فۆرمە زاڵەکاندا بەرتەسك نەکراونەتەوە" (٢٩٤،٢٥).

بناغەی ئەو هەڵوێستە جێگۆڕکێیەکی مانادار لە شێوازی واتا دانانی کۆمەڵگایە، و ئەو جێگۆڕکێیە لە سەرنجدان بە تێکهەڵچوونی سیاسییەوە بەرەو تێکهەڵچوونی کلتورەکان چووە. لە سەر ڕۆڵی کلتور لە پێکهێنان و سەرلەنوێ بەرهەمهێنانەوەی کۆمەڵگا جەختی زۆرتر

کراوەتەوە، و کلتوری چوارچێوەی دەرککردنی تاکەکان و گروپەکان بە هی خۆیان دەزانرێت و بە جیهانبینیەکی پێکهێنەری رەفتارەکان دەزانرێت. ئەو چەمکەش کە کلتور هۆکاری پێکهێنەری شوناس و بەرهەم هێنانی مانایە، خودی کلتورەکەی کردوەتە ناوەندێك. قسەوباسە رەخنەییەکانی ئەو بە بوارێك دەزانن کە سیستەمە واتاییەکانی پێکهێنەری تاك تێیدا بەردەوام سەرلەنوێ فۆرمۆلبەندی دەکرێنەوە. بۆ نموونە تۆرن (١٧٩) خەباتەکانی بواری کلتور وەك خەبات لەسەر مێژوو خوازی دەردەبرێت یانی ئەوەی بە چی شێوەیەك کۆمەڵگا لە بەرهەم هێنانی مانادا ژێروژوور دەبێت، دیسانەوە ئاڵوویێری لە سەر دەکرێت و دیسانەوە پێناسە دەکرێتەوە.

باسی ئەوە دەکرێت کە ئەو ململانێیانە لە بەرامبەر کلتوردا، لە دەرەوەی لایەنی نەریتیی سیاسەت دان و هەر لە بەر ئەوە پێویستیان بە زمانە نوێیەکان، رەواڵی نوێی دەرککردن، فەرمانبەری نوێ و رەفتاری نوێی مشتومڕ هەیە. ملوکی، وەك نوێنەری ئەو رەوتە هزریە، بەڵگەی ئەوە دێنێتەوە کە "رەهەندە کۆمەڵایەتی و سیاسییەکانی تێکهەڵچوونە بەکۆمەڵەکان لێك دوور کەوتوونەتەوە. تێکهەڵچوونە کۆمەڵایەتییەکان ــ بە واتایەکی وردتر تێکهەڵچوونی تایبەت بە پەیوەندیی کۆمەڵایەتی پێکهێنەری سیستەمێکی فەرزکراو، خەبات بۆ پەرەپێدانی هاووڵاتیی: یانی بۆ گونجاندنی گروپە پەراوێزخراوەکان یان بەشمەینەتەکان لە بواری مافەکان و رێساکانی گەمەی سیاسیدا ــ لێك جیابوونەتەوە و رەفتارخوازان و فۆرمەکانی ئەرکنی تەواو جیاوازیان بەخۆیانەوە گرتووە" (١٢٦، ل٢٤٦). هەر بۆیە بەو ئاکامە دەگات کە بزووتنەوەکانی بواری کۆمەڵگای مەدەنی لەگەڵ بزووتنەوە کۆنترە کۆمەڵایەتییەکان جیاوازن. لە راستیدا ئەو لە دژی هەر شرۆڤەیەك کە بزووتنەوە کۆمەڵایەتییەکان لە چوارچێوەی سیاسیدا دابنێت، یان ئەوان بە گروپەکانی گوشار، پارتە سیاسییەکان یان هەر لایەنێکی دیکەی سیاسەتی سەقامگرتوو گرێ بداتەوە، بەڵگە دێنێتەوە. تۆرن (١٧٩) لە چەشنێکی لێکچوو لە نێوان کاری بەکۆمەڵ و رێدۆزینەوەی ئامرازی کە ئامانجەکەی دەوڵەتە، جیاوازی دادەنێت. کستلزیش دەڵێت "بزووتنەوە کۆمەڵایەتییەکان سەرچاوەی داهێنانی کۆمەڵایەتین، ئەوە لە کاتێکدایە کە حیزبەکان یان یەکێتیە سیاسییەکان ئامرازی ئاڵوویێری کۆمەڵایەتین" (٢٥، ل٢٩٤).

گرنگیدان بە رەفتارەی پانتاییە سیاسییەکان ئێستا جێگەی خۆی داوە بە گرنگیدان بەو رەفتارانە کە باس لە رووخان و ئاوەژووکردنەوە و شرۆڤەی سەرلەنوێی ئەو نهێنی و هێما

کلتوریانه دەکات کە کۆمەڵگا لە ڕێگای ئەوەوە خۆی ڕێکدەخات و ژیانی ڕۆژانەی خۆی سەرلەنوێ بەرهەم دێنێتەوە. ئەو جێگۆڕکێیە لە گوتاری سیاسی و بەڕێوەبەرانیدا لە ڕێگای ئامرازی نوێ و داهێنەرانەی بردنەسەرێی ئاستی وشیاریەوە بەڕێوە چووە. ئەوەی ئەو بزووتنەوە کۆمەڵایەتییە نوێیانە لە بزووتنەوە کۆنەکان جیا دەکاتەوە، تەنیا تەرکیزی ئەوان لە سەر ئەو پێشهاتە نوێیانەی کە باس کراون و شێوازی خەباتی ئەوان نییە، بەڵکو ناچاریی ئەوان بۆ بەشداریی لە خەباتدا لە سەر دەسەڵاتە. "بزووتنەوە کۆمەڵایەتییە نوێیەکان لە پلەی یەکەمدا تایبەتمەندییەکی کۆمەڵایەتییان هەیە نەك تایبەتمەندییەکی ڕاستەوخۆی سیاسی. ئامانجی ئەوان هاندانی کۆمەڵگای مەدەنییە، نەك دەست بەسەرداگرتنی دەسەڵات" (٤٧، ل٣٧).

لەو ڕوانگەیەدا لانیکەم دەکرێ دوو پرسی سەرەکیی لێك جیا بکەینەوە. یەکەم ئەوەی جیاوازیی نێوان بزووتنەوە کۆمەڵایەتی و سیاسییەکان کە بزووتنەوە کۆمەڵایەتییەکان لە چوارچێوەی کۆمەڵگای مەدەنیدا و ئەوانی دیکەش لە کۆمەڵگای سیاسیدا بەرتەسك دەکاتەوە، دڵخوازانەیە. لەو ڕووەوە دڵخوازانەیە چونکە بۆ خەباتی نەریتی پلەوپایەی بزووتنەوە کۆمەڵایەتییەکان لەبەرچاو ناگرێت، دڵخوازانەیە چونکە جیاوازیی نێوان لایەنەکانی بزووتنەوەیەك دەکاتە جیاوازیی نێوان خودی بزووتنەوەکان، و دڵخوازانەیە لە بەر ئەوەی گۆڕەپانی خەبات چەندپارچە و دابەش دەکات. لە هەمووان زیاتر، دڵخوازانەیە چونکە جیاوازییەك لە نێوان کاروباری سیاسی و کاروباری کۆمەڵایەتیدا دادەسەپێنێت. وە ئەوان بەو بوونەوەرە لێکدابڕاوانە دەزانن کە هەرکامیان بزێوی و شێوەکاری تایبەت بەخۆیان هەیە. ئایا دەکرێ جیهانی سیاسی و جیهانی مەدەنی/کۆمەڵایەتی بە سەر بونیادە جیاواز و سەربەخۆکاندا دابەش بکرێت؟ ئایا خەباتە کۆمەڵایەتییەکان کە بەگشتی لە هەردوك جیهانەکەدا پێگەی خۆیان هەیە، دەکرێ بەوچەشنە دابەش بکرێت؟

بۆ نموونە بزووتنەوەی ژنان وەك ململانێیەك لە بەرامبەر نهێنییە کلتوریەکاندا ڕاستبوەوە کە ژنانیان لە خێزان و لە جێگاکانی دیکەدا ژێردەستە و گۆێڕایەڵ دەکردن، هەروەها خەباتێکیشە بۆ بەخشینی پێگەیەکی بەرحەق لە قەڵەمڕەوی سیاسی و گشتیدا بە ژنان. خەباتی یەکەم هەڵگری بەخشینی قاڵبێکی نوێ بەو نهێنیانەیە کە بونیاتنەری جێگاوشوێنی ژن لە نێو خێزاندان، و خەباتی دووهەم هەڵگری بەخشینی شێوازێکی نوێ بەو نهێنییانەیە کە حاشا لە دەستڕاگەیشتنی ژنان بە کەشی گشتی کۆمەڵگای مەدەنی دەکەن. هەردووکی ئەو نهێنیانە شوناسێك بە پێی جنسیەت

پێکدێنن و خەباتەکانیش لە هەوڵی تێکدانی هەردووکیانـدان. چـۆن دەکـرێ بزووتنەوەکـە تـەنیا بـە بزووتنەوەیەکی سیاسی یان تەنیا بە بزووتنەوەیەکی کۆمەڵایەتی بزانین؟

بەچەشنێکی هاوشێوەی ئەوە، بزووتنـەوەی ژینگـەپارێزی، پەیوەنـدی بـە هەماهـەنگی و پەیوەندیی تاك لەگەڵ سروشتەوە هەیە، بەڵام هـەروەها رەخنەیـەکی بـەهێزی سـەرچەشـنێکی گەشەپێدانە کە دەوڵەت دایسەپاندوە. ئایا ئێمە بزووتنـەوەی ژینگـەپارێزی بـە رەنگدانـەوەی پەیوەندیی خەڵك لەگەڵ سروشت دەزانین یان رەخنەیەکە لەو سیاسـەتانەی کـە لـە سـەر ئـەو چەمکە جەخت دەکەنەوە کە گەشەسەندن بریتیە لە کۆنترۆڵی مرۆڤ بە سەر سروشتدا و بە سەر ئـەو سەرچـاوە و پێداویسـتیانەی کـە دەیخاتـە روو؟ بـە دڵنیاییـەوە هـەردووکیان، چـونکە تێدەکۆشێت هەم گرێیانەکانی شعوری ئاسایی سەبارەت بە پەیوەندیی مرۆڤ و سروشـت و هـەم شـێوازی ئـامرازی هەڵسـوکەوتی سەرچەشـنەکانی گەشـەکردن لـە رێگـای سروشـتەوە، لێپێچینەوەیان لەگەڵدا بکات.

روکاری چەقبەستوو لە سەر کلتور بەواتایەکی دیکـەش دڵخوازانەیـە. لەسـەر لایـەنێکی بزووتنەوەی کۆمەڵایەتی تەرکیز دەکات و دواتر هەوڵدەدات بزووتنەوەکە هەر بەهەمان لایەنی تایبەتیەوە بناسێنێت. جیاوازیی نێوان بزووتنەوە نەریتی و نوێیـەکان ئەوەیـە کـە دەگوترێـت ئەوانەی دوایی لەگەڵ شکڵدانی شوناس، وەجموجۆڵ خستن، ناسـاندن، پرۆسـەکانی وەدیهـاتنی کەسایەتیی تاك و کۆمەڵ سـەروکاریان هەیە. بزووتنەوە سیاسـییەکان بـە دەرخـواردانی ئـەو پێشهاتانە بە سیستەمی سیاسی و لەگەڵ بەشداربوون لە دەسەڵاتدا سەروکاریان هەیە.

ئێستا دەتوانین بەو ئاکامە بگەین کە بە پێچـەوانەی ئـەو لێـك جیاکردنەوەیـە، هـەموو بزووتنەوەیەك رەهەندی جۆراوجۆری هەیە بەڵام بـە پێـی پێویسـت جیـاوازیش نییـە، ئەوانـە دەتوانن پێکەوە کار بکەن، و لەوانەیە یەکێك لەوان لە ساتەوەختێکی دیـاریکراوی زەمەنیـدا زاڵ ببێت. زاڵبـونی یـەکێك لـەوان لـە سـاتەوەختێکی دیـاریکراودا بـەو مانایـە نییـە کـە رەهەندەکانی دیکە ئامادە نین. ئەوەی بەواتای نەریتی پێیان دەگـوترێ بزووتنـەوەی سیاسـی، خەبات لە سەر شوناس، و دەستەبەرکردنی شوناس، سۆلیدارێتی و وەدیهاتنی تاکن. هەر بـەو چەشنە، بزووتنەوە کۆمەڵایەتییەکان هەندێك داواکارییان لە دەوڵەت و ئەو پێداویستیانە هەیە کە دەتـوانن بیخەنـە روو، بەشـوێن مافـەکان و دەستراگەیشـتنیان بـەو بەرژەوەندیانـەن کـە لەبەردەستی ئـەوانیتردان و بـە پێـی ئـەوانیش دەکـرێ پەراوێزخسـتنی گروپـە تایبەتیـەکان

هەڵـــەنگێندرێت. ئەوان لە دەوری داخوازیەکانی ئەو گروپانەوە رێکخراون کە لە سەرەتیەکانی ئەندامبوون لە کۆمەڵە بەرینترە سیاسییەکاندا بێبەشن.

بۆ نموونە ئەو خەباتەی کە لە سەر جیاوازیی کلتورەکانی کەمایەتی تەرکیز دەکاتەوە، بە پێی پێویست خوازیاری ئەوەیە کە وەك هەڵگری مافەکان لە بواری سیاسیدا بە فەرمی بناسرێت. پێناسەکردنی بزووتنەوەکان بەناوی ئەوەی ئایا کلتورین یان کۆمەڵایەتی، شێوازێکی داشکانە کە بە بێ هیچ سەرنجێك بەلای لایەنە جیاوازەکانی خودی خەباتەکەدا تێدەپەڕێت.

بەڵام تەنیا ئەوە نییە، ئـەو جیاوازیـیە بزووتنـەوە کۆمەڵایەتییـەکان ناسیاسـی دەکـات. کۆمەڵگای مەدەنی دەبێ وشیار بێت کـە خەباتـەکان لـە سـەر زۆر شـتن. بـەڵام لەهـەمووان گرنگتر، ئەوە دەوڵەتە کە دەبێ لە کۆمەڵگای مەدەنیدا رووی خەباتە کۆمەڵایەتییـەکان لـەو بێت. کۆمەڵگای مەدەنی شوێنی کۆمەڵێك چالاکییە ــ قسەوباس و گوتوبێژ و بەرامبەرکێ، دەربڕنـی بیروبـاوەڕ و وەگەڕخسـتنی ئـەو بیروباوەڕانـە، بـەڵام هـەمووی ئـەو گەلاڵانـە بـە تێکهەڵچوونی سیاسییەوە بەستراونەتەوە. بە چەشنێك کە والتسر هۆشدار دەدات:

دەمەوێ سەبارەت بە مەیلە ناسیاسـیەکان کـە بەشـێوەیەکی هاوبـەش لەگـەڵ ستایشـی کۆمەڵگای مەدەنین، هۆشدار بـدەم... هەڵبەتـە ئـەوە راسـتە کـە بزووتنـەوە کۆمەڵایەتییـە نوێـیەکان... پەیوەندیدار بـە ژینگـە، مافـەکانی ژنـان، مافـەکانی کۆچبەران و کەمایەتیـە نەتەوەییەکان، پاراستنی شوێنی کار و بەرهەم هێنان، و هتد ــ ئامانجیان بەدەستەوە گـرتنی دەسەڵات نییە... بەڵام هیچ سـەرکەوتنێك ناتوانێ لە ئارا دابێ کە هەڵگری کۆنترۆڵی دەزگای دەوڵەتی، یان کەڵك وەرگرتن لەو نەبێت (١٨٤، ل١٠٣).

سڕینەوەی سیاسەت لە بزووتنەوە کۆمەڵایەتییەکان پێویستیی بەوەیـە کـە بکـرێ دەسـت بەسـەرداگرتنی گوتاری لە پشت سەری دەوڵەتەوە رێکبخرێت. بەواتایـەکی دیکـە کۆمـەڵگای مەدەنی دەبێ پشت لە دەوڵەت بکات، ئەم هەڵوێـستە بۆ دەوڵەتێکی پاسیڤ فـەرزکراوە کـە خۆی بە ئەرکەکانی بەتەواوەتی سـیاسیی حکومەتـەوە بەرتەسـك دەکاتـەوە و نایهـەوێت کـە دەست لە سـیاسـەتی کۆمەڵگای مەدەنی وەربدات. هەر بۆیە ئەو راستیە لە بەر چاو ناگرێت کە دەوڵەت لە بواری مێژوویـیەوە بە رێکوپێك کردنی خـودی کەشـی مـەدەنی و بـە پێکهێنـانی شوناسی دانیشـتوانی کۆمەڵگای مەدەنی سەروکاری هەبووە. ئەگەر بـەم جـۆرە بێـت،کەواتـە کۆمـەڵگای مـەدەنی بـەر لـەوەی بچـێتە سـەر ئەرکـەکانی دیکـە، دەبـێ لەگـەڵ دەوڵـەت تێکهەڵچێت. کۆمەڵگایەکی مەدەنی دیمـوکراتی کاتێـك وەدی دێـت و بـەردەوام دەبێـت کـە

دەوڵەت دیموکراتی بێت، یانی کاتێک کە گوێ لەدەنگی کۆمەڵگای مەدەنی بگرێت و وەڵامدەرەوەش بێت. والتسر هۆشدار دەدات "تەنیا دەوڵەتێکی دیموکراتی دەتوانێت کۆمەڵگایەکی مەدەنی دیموکراتی بخولقێنێت، تەنیا کۆمەڵگایەکی مەدەنی دیموکراتی دەتوانێت ئاگاداری دەوڵەتێکی دیموکراتی بێت".

ئەو مەدەنییەتەی کە سیاسەتی دیموکراتی وەدی دێنێت دەکرێ لە تۆڕەکانی شوراییدا بدۆزرێتەوە، ئەو توانابیە کەم تا زۆر یەکسان و زۆر پەرتەوازانەی کە ئاگاداری لەو رایەڵە دەکات، دەبێ لە لایەن دەوڵەتێکی دیموکراتیەوە بار بێن... بەڵام دەوڵەت هەرگیز ناتوانێت بەو جۆرە بێت کە لە تیۆر لیبراڵیدا وێنا دەکرێت، یانی تەنیا و تەنیا چوارچێوەیەك بێت بۆ کۆمەڵگای مەدەنی. ئامرازێکیشە بۆ خەبات، کە بۆ شکڵ پێدانی ژیانی هاوبەش بەکار دێت. کەوابوو هاوولاّتیی ــ لە نێوان سەرجەم ئەندامێتیە شاراوە و کردەنیەکانیدا ــ لە بواری کرَدەنیشەوە بە شێوەیەکی تایبەتی دیار و بەرچاوە، ئەوە بەو مانایە نییە کە ئێمە دەبێ هەمیشە روگەش بین و بەو چەشنەی کە رۆسۆ قەوینتی دەکرد زۆرترین بەختەوەریی خۆمان لە سیاسەتدا بدۆزینەوە. زۆربەی ئێمە بەختەوەرتر دەبین ئەگەر لە جێگای دیکە بین و تەنیا جاروبارە بەکاروباری دەوڵەتیەوە خەریك بین. بەڵام دەبێ دەوڵەتێکمان هەبێت کە لە بەرامبەر تێکهەڵچوونی جارجارەی ئێمەدا کراوەبێت (هەمان سەرچاوە، ل٥-١٠٤).

والتسر باسی ئەوە دەکات کە پێشێتی بەخشین بە شوناسی سیاسی، گرنگییەکی بنەڕەتی هەیە، چونکە دەبێ دۆخێك بخولقێت کە تێیدا دەوڵەت تێکهەڵچوونی جارجارەی ئێمە قبوڵ بکات. بەڵام ئەگەر کۆمەڵگای مەدەنی پشت لە دەوڵەت بکات، کرانەوەی دەوڵەت بۆ ئەو جۆرە تێکهەڵچوونانە روو نادات. ئەگەر بڕیار وابێ کە کۆمەڵگای مەدەنی دیسانەوە دەستی بە سەردا بگیرێتەوە، خەبات بۆ دەسەڵاتی دەوڵەتی دەبێ تەوەری تێکهەڵچوون و دەستێوەردانی هەمیشەیی و بێ پسانەوەی سیاسی بێت. خەباتەکانی کۆمەڵگای مەدەنی دەبێ بە پێی پێویست سیاسی بن چونکە بۆ گەیشتن بە ئازادی و یەکسانی دەبێ خۆیان بە پێکهاتە یاسامەندەکانی دەسەڵاتەوە خەریك بکەن.

بەڵام تەنانەت دوای ئەوەی دەوڵەت ئەوەندە گۆڕا کە دەنگی جەماوەر ببیستێت، ئەوە بەو مانایە نییە کە ئیتر ئەرکی کۆمەڵگای مەدەنی تەواو بووە. تەنانەت ئەگەر دەوڵەت گۆڕانکاری تێدا پێکهاتبێ، تەنانەت ئەگەر دەستی بە "بیستنی"دەنگی کۆمەڵگای مەدەنی کردبێت، دیسانەوە کۆمەڵگای مەدەنی دەبێ هەمیشە وشیار و چاودێر بێت، دەبێ بە

بەردەوامی و سەرلەنوێ خۆی بەرێوە بەرێتەوە. دەستێوەردانی سیاسی دوای پێگەیاندنی پرۆسەکانی پەرەسەندنی مەڵبەندی دەوڵەت لە پرسی مافەکان و هاوولاتییدا کۆتایی پێ نایەت. پرۆسەیەکی بەردەوام و نەمرە.

دەستێوەردانی سیاسی، پێویستییەکی هەیە، و ئەویش دەستێوەردان لە دەسەڵاتی ئابووری دایە. چونکە کاتێك کە بیر لە ئازادی دەکرێتەوە، بیر لە ئازادیی زاڵبوون بە سەر کاری خود، ئازادیی زاڵبوون بە سەر جەستەی خود، و ئازادیی زاڵبوون بە سەر ژیانی خۆتدا دەکرێتەوە. بیر لە کۆتایی بەکاڵایی بوون و چەوسانەوە، و سەرهەڵدانی کۆمەڵێکی خولقێنەر دەکرێتەوە کە خۆیان بتوانن خۆیان رێکبخەن. ئەوە بەرنامەیەکە کە پێشمەرجی رەهای کۆمەڵگایەکی دیموکراتی لە سەر بنەمای یەکسانی و رێزگرتنی سەرجەم ئەندامەکانیەتی، ئەو بەرنامەیەی کە بە ناوی گۆرانی کۆمەڵایەتییەوە بەرەوپێش دەروات. بەواتایەکی دیکە ئازادیی لە خولقاندنی بارودۆخی کۆمەڵایەتی ئابووری، بەشداریی کاریگەری مەدەنیی سیاسییە.

تا رادەیەك جێگای داخە کە تیۆری سیاسی لە خۆ دەربازکردن لە مسۆگەرخوازیی ئابووری گەیشتوەتە ئەو شوێنەی کە چاوپۆشی لە هەمووی ئەو پێکهاتانەی دەسەڵات دەکات کە دەبنە کۆسپی سەر رێگای سەرجەم رەفتارەکانی دیکە. بەڵام بۆ شرۆڤەکردنی دەسەڵاتی سامدار و خوخدەی بەردەوامی هەندێك لە دامەزراوەکان و پێکهاتەکان هیچ پێویستییەك بە قبوڵکردنی مسۆگەرخوازی ئابووری نییە. لەو رووەوە کە دیاردە کۆمەڵایەتییەکان بەردەوام لە نێو ئەو چوارچێوانەدا کە پێکهاتە ئابوورییەکانی کۆمەڵگا دروستیان کردوون، پێکدێن و سەرلەنوێ خۆیان شکڵ دەدەنەوە، ناتوانین ئەوە لەبەرچاو نەگرین کە ئەو پێکهاتانە بە چ رادەیەك لە شکڵ پێدانی سەرجەم پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانی دیکەدا کاریگەرن. ناتوانین چاوپۆشی لەوە بکەین کە بە چ شێوەیەك بزێویی ئابووری بۆ زۆربەی رەفتارە کۆمەڵایەتی و سیاسییەکان چارەنوس سازە، و ناتوانین سەرنج بە پانتایی کاریگەرییەکانی ئەو پەیوەندییە نەدەین. پەیوەندییە ئابوریەکان لە بەرتەسك کردنەوەی ریتمی گۆراندا کاریگەرییەکی لەرادە بەدەریان هەیە. هەربۆیە، لە مشتومرە سیاسییەکاندا دەبێ بۆ هۆکارە ئابووریەکان سەنگێکی تەواو دابنرێت، بە بێ ئەوەی پێمانوابێت کە چارەنوس سازی هەموو شوناسەکانن.

بەڵام ئەگەر خەباتە ئابووریەکان لە سەر سیاسەتی دەسەڵاتن، سیاسەت ئاگای لە زاڵبون بە سەر بەرژەوەندیەکان و پێداویستیەکانی بەردەستی گروپە کۆمەڵایەتییە جۆراوجۆرەکانی کۆمەڵگا و چۆنیەتی بەکارهێنان و تەیارکردنی ئەو بەرژەوەندیی و پێداویستیانە هەیە. سیاسەت ئاگای لە دەستراگەیشتن بەو سەرچاوە و پێداویستیانە و شێوازی بەکارهێنانیان

هەیە. لە هەمووانیش گرنگتر ئەوەیە کە سیاسەتی دیموکراتی پشتی بەو دەرککردنە بەستوە کە کۆنترۆڵی پێداویستییە ئابووریەکان بۆ کۆنترۆڵی لایەنە بنەڕەتیەکانی ڕێکوپێك کەری دەرفەتەکانی ژیانی خەڵك گرنگیەکی هەستیاری هەیە. لە ئاکامدا کردەوەکان دەبێ ئاگایان لە دابەزینی ئەو پێکهاتانە بێت. بە واتایەکی دیکە سیاسەتی دیموکراتی ناتوانێ تەنیا بواری سیاسی داگیر بکات، دەبێ بوارە ئابووریەکەش داگیر بکات. وە هەر ڕێك لە بەر ئەوە کە پێکهاتەکان و دامەزراوە ئابووریەکان ئەوەندە کاریگەرن، دەبێ وەك ناوەرۆکی چەقبەستووی مافی ئازادی و یەکسانی لەبەرچاو بگیرێن.

بەگشتی بزووتنەوە کۆمەلایەتییەکان دەتوانن ناوەندی پێشهاتی جۆراوجۆر بن و سەرەتی بە شوناسی جۆراوجۆر ببەخشن. بەڵام ئەو بزووتنەوانە دەبێ لەبیریان بێت کە سەرکەوتنەکان لە قەڵەمڕەوی سیاسی و ئابووریدا پێشمەرجی ڕەهای سەرجەم سەرکەوتنەکانی دیکەن. ئەوەش پێویستی بەوەیە کە بزووتنەوە کۆمەلایەتییەکان لە قۆناغێکدا دەبێ لەگەڵ بوارە جۆراوجۆرەکان تێکهەڵچن و ئەوەش بەنۆرەی خۆی پێویستی بەوەیە کە لە ئاکامدا بتوانرێ بزووتنەوەی کۆمەلایەتی بە پێی کاریگەرییەك کە لە سەر ئەو پێکهاتانە دەیبێت، هەڵسەنگێندرێت.

بەڵام لێرەدا بیرمەندانی بزووتنەوە کۆمەلایەتییە نوێیەکان بە تەواوەتی نەیاری ئەوەن. ئەوان ئەوە بەڵگەمەند دەکەن کە تەرکیزکردن لە سەر بوارە جۆراوجۆرەکان پێویستیی بەوەیە کە بزووتنەوەی کۆمەلایەتی بە پێی ئەو کاریگەرییەی کە لە سەر ئەو پێکهاتانە دایدەنێت، هەڵسەنگێندرێت. یانی پێوانەیەك کە بۆ خودی بزووتنەوەکە شتێکی دەرەکی بێت، سەرنجێك بە بەختەوەریی بزووتنەوەکە لە هاندانی تاکەکان و ئەو ئامرازانەی کە بۆ بردنەسەرێی وشیاری بەکاری دێنن، نادات. لەجیاتی ئەوە ئەو پرسیارە دێنێتە ئاراوە کە بزووتنەوەیەکی کۆمەلایەتی چۆن پێك دێت؟ ئەو ڕەفتارە بەڵگەییانەی کە تاکەکان بەوانەوە لەگەڵ ڕووداو و پرۆسەکانی هێمایی هاندان، هاوڕێ دەبن، کامانەن؟ خەیاڵ و وشیاریی تاکەکان بە کێهە ئامرازە هاوتاسازی دەکرێت؟ (١٤٣و١٢٦). بەڵام لێرەدا دەبێ هەڵوەستەیەك بکەین، چونکە هەر بەوچەشنەی کە گرامشی باسی دەکات:

ئەگەر... دەوڵەت کۆی گشتی ئەو چالاکییە زانستی و تیۆرانە بێت کە چینی دەسەلاتدار لە ڕێگای ئەوەوە نەتەنیا زاڵبوونی خۆی پاساو دەکات و دەیپارێزێت، بەڵکو دەتوانێ ڕەزامەندی ئەو کەسانەش بەدەست بێنێت کە سەروەریان بەسەردا دەکات، کەوابوو ئاشکرایە

که هەموو پرسە بنەڕەتیەکانی کۆمەڵناسی شتێکی بەدەر لە پرسەکانی زانستی سیاسی نین. ئەگەر شتێك بمێنێتەوە، تەنیا دەتوانێ لە پرسە دروێینەکان، واتە پرسە فریوکارانەکان، پێکهاتبێت (٦١، ل٢٤٤).

لەم باسە دەتوانین ئەوە هەڵێنجین کە ئەگەر پرسی ناوەندیی کۆمەڵناسی ئەوە بێت کە بە چ شێوەیەك بزووتنەوەی کۆمەڵایەتی پێك دێت، ئەو پرسە ناوەندییە سیاسییەش هەر بەو رادەیە گرنگی هەیە کە پێکهاتەکانی ئەو دەسەڵاتەی کە بەر بە بزووتنەوەیەکی کۆمەڵایەتی دەگرن یان وەدی دێنن، کامانەن؟ دەوڵەت و کۆمەڵگای مەدەنی بە چ شێوەیەك ئەو بزووتنەوانە قبوڵ دەکەن؟ و ئاکامی کاریگەریەکانی ئەو بزووتنەوانە لە سەر دەوروبەر چییە؟

بە دڵنیاییەوە سەرهەڵدانی بزووتنەوەیەکی کۆمەڵایەتی خۆی لە خۆیدا رووداوێکی وروژێنەر و پڕرووداوە و بەلایەنی زۆرەوە شانۆیەکی سیاسییە. بەڵام بە تەنیا تەرکیز کردن لە سەر ئەو لایەنە، هەر بەو چەشنەی کە بیرمەندانی بزووتنەوە کۆمەڵایەتییە نوێیەکان مەیلیان بەرەو ئەو لایە هەیە، کارێکی نەگونجاوە، چونکە داخوازیی کارگێڕی و دەستەبەرکردنی دەوڵەت بە بێ گەڕانەوە بۆ بوارەکان بانگەوازێکە کە لە بۆشاییەکی مێژوویدا بەرێوە دەچێت. ئەدەبیات سەبارەت بەو بزووتنەوە نوێیە بە چەشنێك کە موزلیس بەگشتی سەبارەت بە پاش مۆدێرنیتێ دەڵێت "لە بۆشاییەکی دامەزراوەیی"دا تیۆر دادەڕێژێت. ئەوە لە پێش چاو ناگرێت کە بە چ شێوەیەك هەندێك لە رەفتارەکان لە رێگای کارە یاسامەندەکانەوە، هەر لە پێشدا بوارەکانیان داخستوون. لە ئاکامدا ناتوانێ لەوە تێبگات کە بەچ شێوەیەك هەلومەرجێکی دسەڵات، دەسەڵاتەکەی بە شێوازێکی دیاریکراو لە سیاسەت دەبەخشێت و بە چ شێوەیەك لە ساتەوەختێکی مێژوویی تایبەتدا شرۆڤەیەکی تایبەتی بەهێز دەکات.

ئەگەر بوارەکان نەبن کلیلێکمان نییە، ناتوانین دەنگەکانی نارەزامەندی لە پێکهاتەی کۆمەڵایەتی، یان جێگاوشوێنی ئەوان دوای بیستنیان بناسێنین. ئەو روانگەیە ئەوەش دیاری ناکات کە بۆچی شێوازێك لە دەنگەکان لە رابردوودا سەرکوت کراون یان لە ئێستا و داهاتوودا چ پێگەیەکی دەبێت؟ پرۆسەی گوێگرتن لەوەی دەبیسترێت، لە چۆنیەتی بیستنی ئەو، یان لەوەی ئایا دۆخێك خولقاوە کە ئەو دەنگانە لە دەربڕینەکانی سیاسیی کۆمەڵگادا جێگایەکی هەبێت یان نا، بە گرنگتر دادەنرێت. بێگومان بیستنی ئەو دەنگانە وەك سەرلەنوێ بەرهەم هێنانەوەی پەراوێزەکان گرنگیی خۆی هەیە، بەڵام دیسانیش ئەوە

دەرناخات کە بۆچی ئەو دەنگانە لە رابردوودا کپ کراون، یان لە داهاتوودا چ کاریگەرییەکیان دەبێت.

ئاکامی ناڕازیکەر ئەوەیە کە سەرنجدان بە بوارەکان لە کاتێکدا کە پەراوێزخراوەکان دەنگێکیان بەرز کردۆتەوە، دڵخۆشکەر نییە، فێمێنیستەکان بەحەق لە مەڕ سیاسەتی پاش مۆدێرنیتیێ هەڵوێستێکی دووانێتییان هەیە، ئەگەر لە سەر ئەو باوەڕە بن کە گێڕانەوەی زاڵی نێرینە ئیتر هیچ سەرەتییەکی نییە، ناتوانن لەگەڵ روانگەیەك هاودڵی بکەن کە سەرنجێکی تایبەتی بە گێڕانەوەی ئەوان نادات. بە دڵنیاییەوە ئەو روانگەیە هیچ گەرەنتییەك نادات سەبارەت بەوەیکە لە داهاتوودا کارێك بۆ چارەسەری ستەمی جنسی بکرێت.

چەقبەستنی پاوانخوازانە لە سەر پرسە کۆمەڵناسییەکان دوو پێویستی سیاسیی بە دواوەیە. یەکەم، چەقبەستن لە سەر کارگێڕی، لەبەرچاو نەگرتنی پێکهاتەکان، و جەخت کردنەوە لە سەر پڕۆسەکانی پێکهێنانی هەڵوێستێکی بکەرانە، بە زیانی ئەو تیۆرەیە کە پێکهاتەکان بەچ شێوەیەك ئاسانکاری بۆ رەفتارە تایبەتیەکان دەکەن و یان پێشیان پێدەگرن. هەروەك موزلیس لە خوێندنەوەیەکدا بۆ بەرهەمێکی سەرەتایی لاکلائو و موفە (١٠٠) باسی دەکات، تەرکیزی ئەو نووسەرانەی سەرەوە لە سەر پیشاندان ئەوەیە کە بەچ شێوەیەك:

رەفتاری بیرمەندەکان بەردەوام شوناسی خۆیان، هەڵویستی بکەرانە، خاڵە بەکۆمەڵەکان، کەشە کۆمەڵایەتی و سیاسییەکان و هتد دروست دەکەن و خراپی دەکەنەوە. بەڵام دۆخی بوونی ئەو رەفتارانە، چۆنیەتی مانەوەیان و بەرتەسك بوونەوەی رەفتارەکانیش لە لایەن بونیادە دامەزراوە بەردەوامەکانی سەرمایەداریەوە هیچ کات بە دروستی باس نەکراون (١٣٢، ل٢٨).

بیرمەندانی بزووتنەوە کۆمەڵایەتییە نوێیەکان، کە لە هەستیاریەکانی پاش مۆدێرنیتێەوە کاریگەرییان وەرگرتوە، بەڵگەی ئەوە دێننەوە کە پێکهاتەکان نەگۆڕ نین بەڵکو لە پڕۆسەیەکی نەگۆڕ لە فۆرمۆڵبەندی و فۆرمۆڵبەندیی نوێدان. بەڵام پێکهاتەی واش هەیە کە مێژوویەکی دوور و درێژیان هەیە ــ بۆ نموونە دامەزراوەی خاوەنداریێتی تایبەتی، و دامەزراوەی بازاڕ. وە ئەو پێکهاتانەش مەیلێکی سامناك و تا رادەیەك شایانی باسیان بۆ پێشگرتن لە رەفتارە رزگاریخوازانەکان دەربڕیوە. موزلیس دەڵێت "بۆ

جەخت کردنەوە لە سەر ئەو راستیە بەرچاوە لە روانگەی بکەرانی تایبەتی کە لە سەردەمێکی مێژوویی و کەشی کۆمەڵایەتیدا جێگایان خۆش کردووە هەمیشە ریزبەندیی دامەزراوەیی لە ئارادایە کە بە ئاسانی لە رەفتارەکانی ئەوان کاریگەری وەردەگرن و ئەو ریزبەستنانەی دیکەش کە کاریگەری وەرناگرن، بێگومان نابێ هەڵوێستێکی دەروون خوازت هەبێ" (هەمان سەرچاوە، ل٢٧). هەر رێك ئەو ریزبەندیە دامەزراوەییانەشە کە ئەگەر بزووتنەوەیەکی کۆمەڵایەتی بیهەوێت بە ئاکامەکانی خۆی بگات، دەبێ ئاڵوویریان لە بارەوە بکرێت.

دووهەم، ئەدەبیاتی پەیوەندیدار بە بزووتنەوە کۆمەڵایەتییەکانەوە بە تەواوەتی بێ لایەنیی خۆی نیشان دەدات لەمەڕ کاریگەری ئەو خەباتانە لە سەر دەوروبەر. چۆن دەبێ لەگەڵ ئەو خەباتانە بەرەوڕوو ببینەوە؟ ئەوان بە چ شێوەیەك پەیوەندییەکانی دەسەڵات کەم دەکەنەوە و دایاندەبەزێنن؟ بە چ شێوەیەك زنجیرەیەك لە رووداوەکان دەست پێدەکەن کە دەسکەوتەکانی ئەو خەباتانە پوچەڵ دەکەنەوە یان بەرەوپێشیان دەبەن؟ ئەوانە ئەو پرسیارانەن کە ئەو بیرمەندانە هەر باسی ناکەن. هەروەك جێسۆپ دەڵێت، بۆچوونەکانی پاش مۆدێرنیتێی سیاسەت (لەمەڕ تیۆر لاکلائۆ و موفە، ١٠٠)، دۆخی بەرەوڕوو بوونەوە لەگەڵ گوتار لە بەرامبەر پێکهاتەی بەڵگەمەندی بەرهەمهاتنی ئەودا لەبەرچاو ناگرن...". کەوابوو بەکردەوە، راکێشی گەڵاڵەیەکی هێژمۆنی خوازانە بۆ بەهای ئەو بۆ دەروونی تاکەکەسی (تواناکەی بۆ سەقامگیرکردنی پەیوەندیی نێوان لۆژیکی کۆمەڵایەتی و لۆژیکی شاراوە و نەناسراو ـ دێنێتە خوارەوە... چونکە تەنیا ئاماژە بە دەروونی تاکەکەسی دەکات و هیچ بانگەشەیەکی بۆ هاندانی بەکۆمەڵ نییە (٨٠، ل٢٩٨).

ئەگەر تەرکیز کردن لە سەر بارودۆخێك کە بزووتنەوەیەکی کۆمەڵایەتی ئاسان دەکاتەوە یان بەری پێدەگرێت، لە ئارا دانەبێت، ئامرازێکمان نابێت بۆ ئەوەی بتوانین واتایان لێك دەینەوە یان هەڵیاسەنگێنین. ئەوەی لە هەڵسەنگاندنی ئەو بزووتنەوە کۆمەڵایەتییەدا تەوەری سەرەکییە، ئامانجەکانی ئەو رێگایانەی کە بۆ گەیشتن بەوان دەیبڕێت، رادەی وەدیهاتنی ئەو ئامانجانەیە. ئەوە بەڵگەیەکە سەبارەت بە تواناکان و ئەو پێویستیانەی کە هەموو خەباتێك لەبەر دەستی دایە. وەها بەڵگەیەك سەبارەت بە پێکهاتەکان و بوارێکە کە ئاسانکاری بۆ خودی بزووتنەوەی کۆمەڵایەتی دەکەن یان پێشی پێدەگرن. بزووتنەوە کۆمەڵایەتییەکان ریزبەندییە سیاسییەکانی کۆمەڵگا تووشی ململانێ

دەکەن، لە سنوورەی ئەو گوتارە جۆراوجۆرانە دەپەڕنەوە کە کۆمەڵگا دروست دەکەن و لە ڕەفتارە سەقامگیرەکان و شوناسە قبوڵکراوەکان دادەبڕێن. سەرچاوەی بزووتنەوە کۆمەڵایەتییەکان، فۆرمۆڵبەندیەکانی لۆژیکی دەسەڵاتە چونکە لێپێچینەوە لەگەڵ ئەو ڕێسا و ڕەفتارانە دەکەن.

نابێ تەنیا لێپێچینەوە لەگەڵ دەوروبەردا بکرێت، بەڵکو دەبێ گۆڕانکاریشی تێدا پێك بێت، چونکە دەبێتە کۆسپی سەر ڕێگای نامانجەکانی ئازادی و یەکسانی کە بزووتنەوەی کۆمەڵایەتی لە خۆیدا کۆ دەکاتەوە. کەوابوو سەرکەوتن یان شکستی بزووتنەوەیەکی کۆمەڵایەتی پەیوەندیی بەو کاریگەرییەوە هەیە کە لە سەر دەوروبەری دادەنێت. هەر هەڵسەنگاندنێك کە ئەو ڕەهەندە لەبیر بکات، هەڵەیە، چونکە لە پاساوی مەبەستە بنەڕەتیەکانی بزووتنەوەکەدا یانی تۆخمی نارەزامەندی کەم کاری کردووە. بزووتنەوەکان سەبارەت بە چی نارەزامەندی دەردەبڕن؟ ئەو گوتارانەی کەهەن بە چ شێوەیەك دژکردەوە نیشان دەدەن و لەگەڵ ئەو بەرژەوەندیە باسکراوانە ڕێکدەکەون یان لەو کارەدا دەمێننەوە.

ئێمە ناتوانین لەوە تێبگەین کە ئەو بزووتنەوانە بەچ شێوەیەك بەرنامە سیاسییەکان سەرلەنوێ ڕێکدەخەنەوە، بەرنامە نوێیەکان بەچ شێوەیەك دەخولقێن، ڕێکخستن یان بەخشینی قالبێکی نوێ بە بەرنامەکان تا چەندە بە دەست خۆمانە، چونکە دەوڵەت لە نێوان بزووتنەوەکان و لە نێوان مەیلەکانی نێوخۆی بزووتنەوەکە بۆ خۆی هەڵدەبژێرێت. بە پێچەوانە، تێگەیشتنێك لەوەی گوتارەکان بەچ شێوەیەك داواکاریەکانی ئەوان ڕێکدەخەن و دەبنە هۆی شکست یان سەرکەوتنی ئەوان، لە ئارادا نییە. ئەگەر دیسانەوە باسی گرامشی بکەین، بزووتنەوە کۆمەڵایەتییەکان لە کۆتاییدا شتێك نین جگە لە بزووتنەوە سیاسییەکان.

تا ئێرە ئەوەم بەڵگەمەند کردووە کە بۆ جووتکردنی بزووتنەوە جۆراوجۆرە کۆمەڵایەتییەکان بنەمایەکی ڕێکخەرانە پێویستە بۆ ئەوەی ئەو بزووتنەوانە لە ئاستێکدا بن کە نەتەنیا لەگەڵ بونیادەکانی دەسەڵات ململانێ بکەن، بەڵکو ئەوان بگۆڕن. ئەگەر پێشهاتەکە ئاوەژوو بکەمەوە، چی ڕوودەدات؟ واتە ئەگەر حاشا لە پێویستیی وەها بنەمایەك بکەین.

یەکەم، خەڵك لە کەشە تایبەتیەکاندا و بە گوتەی س.پ. موهانتی، "کەشە تواناخولقێنەکان" گەمارۆ دەدرێن و جێگاوشوێنی خەڵك لە کەشە تایبەتیەکاندا لەوانەیە پێویستیی بە دوور مانەوە بێت لە حەزە بەرینە کۆمەڵایەتییەکان. دووهەم بە چ شێوەیەك ئەگەری ئاڵوویر لە نێوان مێژووی من و مێژووی ئێوەدا دەکرێ هەبێت؟ چۆن بۆ ئێمە دەکرێ کە حاڵەتی بەکۆمەڵی ونبووی خۆمان... توێژاڵەکانی رابردوو و جۆراوجۆرەکانی ئێستا، پەیوەندییە نەسڕاوەی ماناکان، بەهاکان و پێداویستیە ماددییە هاوبەشەکان و پەیوەندیدار بە خۆمانەوە، دەستەبەر بکەینەوە؟ پێویستە تایبەتمەندییەکانی خۆمان، جیاوازییەکانی ژیان و خەیاڵی خۆمان، دەربڕین، بەڵام ئایا دەمانتوانی ئەو پرسە بە بێ تیۆر هەروا بەجێ بێڵین کە جیاوازیەکانمان چۆن ئاوێتەی یەکتری دەبن و لە راستیدا بەشێوەیەکی پلەبەندی رێکدەخرێن؟ بەواتایەکی دیکە ئایا دەمانتوانی مێژووی تەواو لێك جیاوازمان هەبێت، پێمانوابێت بە تەواوی لە کەشەکانی نەگونجاو و لێکدابڕاودا دەژین — و ژیاوین؟ (۱۳، ۱۳۰).

بە واتایەکی دیکە ئەو بنەما رێکخەرانەیە دەبێ مێژووی هاوبەشی ستەم و زاڵبوون کە بە سەر مێژووی مرۆییدا باڵادەست بوون، بگرێتەوە و ویستی خۆی بۆ بەرێوەبردنی کارێك سەبارەت بەو نیشان بدات. دەبێ خواستە دیموکراتیەکان لە خۆیدا کۆ بکاتەوە کە بە دڵنیاییەوە بێ ئەوەی مێژووی کورتی تاکەکەسی لەگەڵ گەلاڵەی ئازادی و یەکسانی رێکبخرێن، وەدی نایەن.

هەڵبەتە ئەو بنەما رێکخەرانەیە دەبێ لە بەرامبەر پێشهاتە جۆراوجۆرەکاندا کە بەشێك لە گشتێتی پێکهاتەی ئەون، هەستیار بێت. راشکاوانە هەر لە پێشدا ئەوە قبوڵ کراوە کە وەها گوتارێك دەبێ سەرنجی فرەیی و جۆراوجۆریی بدات. ا.م. ۆود ئەوە وەبیر دێنێتەوە "هیچ سۆسیالیستێك ناتوانێت لە گرنگی فرەچەشنی، یان فرەیی ئەو ستەمانەی کە دەبێ لەناو بچن، گومانی هەبێت" (۱۸۸، ل۷۵). هیچ گروپێکی قەومی، دینی یان جنسی ناکرێ و نابێ بەو هۆیەوە سزا بدرێت کە لەگەڵ بەهاکانی کۆمەڵ نایەتەوە کە بە پێی زۆرینەبوون دیاری دەکرێت. هەموو گروپێك شیاوی هەبوونی تایبەتمەندی، بەهاکان و شێوازە کلتوریە تایبەتیەکانی خۆیەتی.

هەر بۆیە پێشنیاری ئەوە کراوە کە بنەمای دوالیزمی ئازادی و یەکسانی دەبێ لۆژیکی واتاداری ئەو بنەمایە بن. ئەو بنەمایە بەهاکان، پێوانەکان، فۆرم و ئامانجەکانی

گەلاڵەیەکی سیاسی تاقانە و هەروەها بەهاکان، پێوانەکان و فۆرمەکانی هەرکام لە گوتارەکانی ئەندامی ئەو دابین دەکەن. بزووتنەوە کۆمەڵایەتییەکان بە ئیلهام وەرگرتن و ئاگاداریی لەو بەهایانە، دەتوانن گوتارێکی سیاسی بە راستی دیموکراتی لە کۆمەڵگایەکی مەدەنی بەرین و سەرلەنوێ لەدایك بووەوە بخولقێنن.

لە هەمووی ئەوانەش ئەوەلاوەتر دەبێ ئەوە دووبارە بناسرێتەوە کە پێویست بە هەندێك یاسای هاوبەشی پشت ئەستور بە چەمکەکانی بەرژەوەندیی هاوبەشە کە بتوانن کلتورەکانی کۆمەڵگا پێکەوە گرێ بدەنەوە. جەخت کردنەوە لە سەر جیایی و فرەچەشنی خۆی لە خۆیدا، بە بێ قسەوباسێك سەبارەت بەوەیکە چۆن دەکرێ ئەوانە رێك بخرێن، یان بە چ شێوەیەك دەکرێ رابردوو و ئێستای مانا هاوبەشەکان دەستەبەر بکرێنەوە، دەتوانێ سیاسەتێك بێت کە لە هۆگرییە نۆرماتیڤ و ئەخلاقیاتی خۆیان بەهۆکارەکانی خوارەوە دوور بووەتەوە.

یەکەم، ئەگەر ئەو بەڵگەهێنانەوەیە کە هەر بنەمایەکی رێکخەرانە کە بتوانێت ئەو هۆگرییە تایبەتیانە لە هۆگرییەکی هاوبەشدا کۆبکاتەوە لە روانگەی تێگەیشتنی پاش مۆدێرنیتیێ سیاسەتەوە، گشتیخوازە، کەواتە لێگەڕان لە گوتاریش هەر بەو رادەیە دەتوانێت گشتی خواز بێت. ستەمی سەر ژنان لە بونیاتخوازی دینیدا شایەتی گونجاوە بۆ ئەو. بە بێ پێش بینی ئەوەی بەهاکانی ئازادی و یەکسانی کە بە سەر دیاریکردنی جێگاوشوێنی گوتارە تاکەکەسیەکانی نێوخۆی گوتارە هاوبەشەکاندا زاڵن، دەبێ لە سەر هەرکام لە گوتارەکان کاریگەرییان هەبێت، ناکرێ ستەمەکانی کۆمەڵگای مەدەنی چارەسەر بکرێن. هەر گوتارێك دەبێ بە پێی پێوانەکان و بەهاکانی ئازادی و دیموکراسی هەڵسەنگێندرێت.

دووهەم، رێزگرتن لە فرەچەشنیی کلتورەکان بە مانای ئامادەنەبوونی کۆمەڵێکی بەرینتر نییە. بنەمای رێکخەرانەی ئازادی و یەکسانی دەتوانێت ببێتە ئامرازێك بۆ نزیك کردنەوەی گروپەکانی کۆمەڵگای مەدەنی و وەك پێوانەیەك بۆ هەڵسەنگاندنی رەفتارە تایبەتیەکان بەکار بێت. لەو رووەوە دەتوانێت بەو مەبەستە بەکار بێت کە بنەمای رێکخەرانە بڕیاری ئەوە دەدات کە بنەماکانی ئازادی و یەکسانی دەبێ ناواخنی رێکخەرانەی سەرجەمی گوتارەکان بێت. هیچ کۆمەڵگایەکی مەدەنی ناتوانێت وەك بوارێك خزمەت بە دیموکراسی بکات، مەگەر مەیلە باڵادەستەکان لە هەموو گوتارەکان و

لە نێو گوتارەکاندا کۆنترۆڵ بکرێن. بنەمای دیموکراتییش پێوانەیەکە کە دەکرێ بە پێی ئەو رێگەی سیاسەت بۆ ناوخۆی کۆمەڵگای مەدەنی بکرێتەوە.

کەوابوو پەراوێزخستنی کۆمەڵگای مەدەنی بە پێی پێویست پەیوەست نییە بە بێتوانایی تاك لە بەشداریی لە بواری گشتی بەهۆی پێگە کۆمەڵایەتییەکەی و پەراوێزخستنەکانی بازار، بە پێی پێویست پشت ئەستور نییە بەو پێوانانە کە دەوڵەت دیاری کردوون. بنەما هاوبەشەکانی نێوان هێزە دیموکراتییەکان دەبێ لە رێگای قسەوباس و گوتوبێژ لەمەڕ خودی کۆمەڵگای مەدەنییەوە باس بکرێن، بەڵام دەبێ پشت ئەستور بێت بە باوەڕکردن بە بەهای گەڵاڵەی ئەو گوتارە سیاسییە کە بەشداریخوازانە و گشتگیرە و لە قبوڵکردنی کۆنترۆڵی بڕیارەکاندا رێك بکەون. ئەگەر بڕیاربێت کۆمەڵگای مەدەنی دەستی بە سەردا بگیرێت، بنەمایەکی رێکخەری پشت ئەستور بە مەیلە دیموکراتیەکان بۆ رێکخستنی ئەو خەباتە جۆراوجۆر و جیاوازانە، دەبێ هەماهەنگی واتایی ئەو چوارچێوەیە دیاری بکات.

## پێرستی سەرچاوەکان


1. Alavi, H. (1972). 'The State in Post-colonial Societies: Pakistan and Bangladesh.' New Left-Review, no. 74: 59-82. Also in K. Gough and H. Sharma ed., (1973), Imperialism and Revolution in South Asia(New York: Monthly Review Press).
2. Almond, G. (1988). 'The Return to the State.' American Political Science Review 82,.no. 3, September: 853-74.
3. Arato, A. (1981). 'Civil Society vs. the State.' Telos; no. 47: 23-47.
4. Arato, A. and Cohen, J. (1984). 'Social Movements, Civil Society and the Problem of Sovereignty.' Praxis International, vol. 4, 3: 266-83.
5. Avineri, S. (1972). The Social and Political Thought of Karl Marx (Cambridge: Cambridge University Press).
6. Barkan, J.D. McNulty, M.L., and Ayeni M.A.O. (1991). '"Hometown" Voluntary Associations, Local Development, and the Emergence of Civil Society in Western Nigeria.' Journal of Modern African Studies, no. 29: 457-80.
7. Barry, N.P. (1981). An Introduction to Modern Political Theory (London: Mac- millan).
8. Bayart, J.F. (1986). 'Civil Society in Africa'. In Chabal, P., ed.,

Political Domination in Africa: Reflections on the Limits of Power, (Cambridge: Cambridge University Press): 109-25.

9. Baxi, U. (1991). 'From Human Rights to the Right to be Human.' In S. Kothari and H. Sethi, Rethinking Human Rights (New York: New Horizons Press): 151-66.
10. Belde..-Fields, A. (1988). 'In Defense of Political Economy and Systemic Analysis: A Critique of Prevailing Theoretical Approaches to the New Social Movements.' In C. Nelson and L. Grossberg, ed., Marxism and the Interpretation of Culture (London: Macmillan): 141-56.
11. Benbabib, S. and Cornell, ed. (1987). Feminism as Critique (Cambridge: Polity).
12. Benn, S.I. and Gaus, G.F., ed. (1983). Public and Private in Social Life (London: Croom Helm).
13. Block, F. (1980). 'Beyond Relative Autonomy.' In The Socialist Register (London: Merlin): 227-42.
14. Bluntscbli, J.K. (1895). The Theory of the State (Oxford: Oxford University Press).
15. Bobbio, N. (1989). Democracy and Dictatorship the Nature and Limits of State Power, translated by P. Kennedy (Cambridge: Polity).
16. Boyne, R. and Rattansi, A. (1990). 'The Theory and Politics of Postmodernism: By Way of an Introduction'. in R. Boyne and A. Rattansi, eds., Postmodernism and Society (New York: St. Martins Press): 1-45.
17. Bratton, M. (1989). 'Beyond the State: Civil Society and Associational Life in Africa.' World Politics. no. XLI: 407-30.

18. Buci-Glucksmann ,C. (1980). Gramsci and the State, translated by Fembach (London: Lawrence and wishart).
19. Bums, J.P. (1989). 'China's Govemance: Political Reform in a Turbulent Environment.' The China Quarterly, no. 119: 481-518.
20. Bryant, C.G.A. (1993). 'Social Self-organization, Civility and Sociology: A Comment on Kumar's "Civil Society".' British Joumal of Sociology, vol. 44, 3: 397-401.
21. Calhoun, C. (1993). 'Civil Society and the Public Sphere.' Public Culture, no. 5: 267-80.
22. Cammack, P. (1989). 'Bringing the State Back In.' Review article: British Joumal of Political Science, vol. 19, 2, April: 261-90.
23. ---. (1990). 'Statism, New Institutionalism and Marxism.' The Socialist Register (London: Merlin): 147-84.
24. Caporaso, J. and Levine, D. (1992)., t."eories of Political Economy, (Cambridge: Cambridge Univers'ity Press).
25. Castels, M. (1983). The Oty and the Grassroots (London: Edward Amold).
26. Chabal, P. (1986). 'Introduction. Thinking about Politics in Africa.' In Chabal, ed., Political Domination in Africa. Reflections on the Limits of Power. (Cambridge: Cambridge University Press): 1-16.
27. Chandhoke, N. (1994). 'Marxian Political Economy as Method: How Political is Political Economy.' In Special Review of Political Economy, Economic and Political Weekly, vol. 29, 5,

29 January 1994:. PE2-PEI4.
28. Clarke, S. (1991, 2nd edn.). Marx, Marginalism and Modern Sociology (Houndsmill: Macmillan).
29. Cohen, J. (1982). Class and Civil Society. The Limits of MarxUln Critical Theory (Amhers : University of Massachussets Press).
30. ---. (1988). 'Discourse Ethics and Civil Society'. Philosophy and SocUll Criticism, no. 14: 315-37.
31. Cohen, J. and Arato, A. (1992). Civil Society and Political Theory (Cambridge: Institute of Technology Press).
32. Crick, B. (1962, revised ed. 1964). In Defence of Politics (London: Weidenfeld and Nicolson. Middlesex: Penguin).
33. Dear, M. (1986). 'Postmodernism and Planning.' Society and Space, no. 4: 367-84.
34. Desai, A.R. (1986). Violations of Democratic Rights in India (Bombay: Popular Prakasan).
35. -.(1990). Repression and Resistance in India (Bombay: Popular Prakasan).
36. --- (1991). Expanding Government Lawlessness and Organized Struggles in India (Bombay: Popular Prakasan).
37. De Tocqueville, A. (1900). Democracy in America. 2 vols., translated by Keene, H. (New York: The Colonial Press).
38. Dewey, J. (1927). The Public and its Problems (London: George Allen and Unwin).
39. Dhanagre, D.N. (1988). 'Action Groups and Social Transformation in India.' Lokayan Bulletin, 6, 5.
40. Dunn, J. (1969). The Political Thought of John Locke

(Cambridge: Cambridge University Press).
41. Eagleton, T. (1985). 'Capitalism, Modernism and Postmodernism.' New Left Review, no. 152: 60-73, July-August.
42. Easton, D. (1985). 'Political Science in the United States. Past and Present.' International Political Science Review, vol. 6, 1: 133-52
43. --. (1981). 'The Political System Beseiged by the State.' Political Theory, no. 3: 303-25.
44. Elias, N. (1988). 'Violence and Conflict.' In J. Keane ed., Civil Society and the State (London: Verso): 177-88.
45. Evans, P., Rucsdtcmeycr, D. and Skocpol T., (1985) ed. Bringing the State Back In (Cambridge: Cambridge University Press).
46. Fergusen, A. (1767, 1966). An Essay on the History of Civil Socicty, edited by D. Forbes (Edinburgh: U.P. Edinburgh).
47. Feher, F. and Heller, A. (1983). 'From Red to Green.' Telos, no. 59: 35-44.
48. Fine, B. (1984). Democracy and the Rule of Law (London: Pluto).
49. Foucault, M. (1980). Power/Knowledge (Brighton: Harvester Press).
50. --. (1987). 'Truth and Power.' In P. Rabinow, ed., The Foucalt Reader (Harmondsworth: Penguin).
51. Fraser, N. (1987). 'What's Critical about Critical Theory? The Case of Habermas and Gender.' In S. Benhabib and Cornell, ed., Feminism as Critique (Cambridge: Polity): 31-55.
52. Freeden, M. (1991). Rights (Milton Keynes: Open University

Press).
53. Gadgil, M. and Guba, R. (1992). This Fissured Land; An Ecological History of India (New Delhi: Oxford University Press).
54. Gaus, G.F. (1983). 'Public and Private Interests in Liberal Political Economy. Old and New.' In S.1. Benn and G.F. Gaus, ed., Public and Private in Social Life (London: Croom Helm): 183-222.
55. Gellner, E. (1991). 'Civil Society in Historical Context.' International Social Science Journal, no. 129: 495-510.
56. Giner, S. (1985). 'The Withering Away of Civil Society?' Praxis International, vol. 5, 3, October: 247-67.
57. Ghosh, A. (1989). 'Civil Liberties and the Uncivil State.' In Seminar, Special issue on 'New Social Movements', no. 355: 34-37.
58. Gold, T.B. (1990). 'The Resurgence of Civil Society in China.' Journal of Democracy, no. 1: 1S-31.
59. Gouldner, A. (1980). 'Civil Society in Capitalism and Socialism.' In A. Gouldner, The Two !t!arxisms: Contradictions and Anomalies in the Development of Theory (London: Macmillan): 355-73.
60. Gray, J. (1986). Liberalism (Milton Keynes: Open University Press).
61. Gramsd, A. (1971). Selections from Prison Notebooks of A. Gramsci, edited by Q. Hoare and G.N. Smith (New York: International Publishers).
62. Guha, R. (1989). 'The Problem.' In Seminar, special issue on 'New Social Movements', no. 355: 12-15.
63. Gupta, A. (1989). 'The Political Economy of Post-independence India.'

The Joumal of South Asian Studies, no. 48: 787-97.

64. **Habermas,** J. (1989). Thc Structural Transformation of the PublU: Sphere, translated by L. Burger, assisted by F. Lawrcnce (Cambridge: Polity).
65. Harrinaton, M. (1992). 'What Exactly is Wrong with the Liberal State as an Agent of Change?' In Petcrsons, ed., Gendered States Feminist (Re)Visions of International Relations Theory (Boulder: London Lynne Rienner Publishers).
66. Harvey, D. (1989). The Condition of Postmodemity (Oxford: Basil Blackwell).
67. Hegel, G.W.F. (1942). Philosophy of Right, translated by T.M. Knox (Oxford: Oxford University Press).
68. Held, D. (1989, 1990). Political Theory and the Modem State, (Cambridge: Polity, in association with Basil Blackwcll).
69. Held, D. cd. (1991). Political Theory Today (Cambridge: Polity).
70. --. ed. (1993). Prospects for Democracy (Cambridge: Polity).
71. Heller, A. (1990). Can Modemity Sruvive? (Cambridge: Polity).
72. HcUer, A. and FeUer, F. (1988). Thc Postmodern Political Condition (Cambridgc: Polity).
73. Hobbes, T. (1967). Leviathan, edited and with an introduction by J. Plamenatz (Collins Fontana Library, printed by Cox and Wyman in London, Reading and Fakenham).
74. Hoffman, J. (1988). State, Powcr and Dcmocracy (Sussex: Wheatsheaf).
75. Hunt, R.N. (1974). The Political Ideas of Marx and Engles.

Vol. 1: Marxism and Totalitarian Democracy, 1818-1850. (Pittsburg: University of Pittsburg Press).

76. ---. (1984). The Political Ideas of Marx and Engles. vol. 2: Classical Marxism, 1850-1895 (Pittsburg: University of Pittsburg Press).

77. Hunter, A. (1988). 'Post-Marxism and the New Social Movements'. Theory and Society, no. 17: 885-900.

78. Jameson, F. (1984). 'Foreword' to J.F. Lyotard The Postmodern Condition: A Report on Knowledge (Minneapolis: University of Minneapolis Press): VII-XXI.

79. ---. 'Postmodernism and the Market.' The Socialist Register (London: Merlin): 95-110.

80. Jessop, B. (1990). State Theory: Putting Capitalist States in Their Place (Cambridge: Polity).

81. Jordan, Z. (1967). The Evolution of Dialectical Materialism (London: Macmillan).

82. Keane, J. (1988a). 'Introduction.' In Keane, ed., Civil Society and the State (London: Verso): 1-32.

83. ---. (1988b). Democracy and Civil Society (London: Verso).

84. Kesselman, M. (1983). 'From State Theory to Class Struggle and Compromise: Contemporary Marxist Political Studies'. Social Science Quarterly, vol. 64, 4, December: 826-45.

85. Kohli, A., ed., (1988). India's Democracy: An Analysis of Changing State-society Relations (Princeton: Princeton University Press).

86. ---. (1990). Democracy and Discontent: India's Growing Crisis of Governability (Cambridge:Cambridge University Press).

87. Kothari, R. (1970). Politics in India (New Delhi: Orient Longman and Little Brown).
88. --. (1988). State Against Democracy (New Delhi: Ajanta).
89. --. (1989). Politics and the People (New Delhi: Ajanta).
90. --. (1991). 'Human Rights: A Moment in Search of a Theory.' In S. Kothari and H. Sethi ed., Human Rights: Challenges for Theory and Action (New York: New Horizons Press): 19-30.
91. Kothari, S. and Sethi, H. (1991). 'On Categories and Interventions.' In Kothari and Sethi, ed., Rethinking Human Rights: Challenges for Theory and Action (New York: New Horizons Press): 1-18.
92. Kothari, S. (1990). 'The Human Rights Movement in India.' Social Action, 40,1, January-March: 1-15.
93. Kowlakowski, L. (1978). Main Currents of Marxism. Vol. 1: The Founders (New York: Oxford University Press).
94. ---. (1978). Main Currents of Marxism. Vol. 2: The Golden Age (New York: Oxford University Press).
95. Kowlakowsld, L. (1978). Main Currents of Marxism. Vol. 3: The Breakdown (New York: Oxford University Press).
96. Krasner, S.D. (1984). 'Approaches to the State: Alternative Conceptions and Historical Dynamics.' Comparative Politics, January: 223-46.
97. Kumar, R. (1983, 1986). Essays in the Social History of Modern India (Calcutta: Oxford University Press).
98. Laclau, E. (1990). New Reflections on the Revolution of Our Times (London: Verso).
99. __ . (1992). 'Universalism, Particularism, and the Question of

Identity.' In October, no. 61: 81-90.
100. Laclau, E. and Mode, C. (1985). Hegemony and Socialist Strategy (London: Verso).
101. Landes, J.B. (1988). Women and the Public Sphere in the Age of the French Revolution (Ithaca, N.Y.: Cornell University Press).
102. --. (1992). 'Jurgen Habermas, the Structural Transformation of the Public Sphere: A Feminist Inquiry.' Praxis International, vol. 12, 1, April: 106-27.
103. Lash, S. and Urry, J. (1987). The End of Organized Capitalism (Cambridge: Polity).
104. Levin, D.M. (1989). 'The Body Politic: The Embodiment of Praxis in Foucalt and Habermas.' Praxis International, vol. 9, 1-2, April-July: 112-32.
105. Locke, J. (1970). 'Political or Civil Society.' In Two Treatises on Civil Government, introduction by W.S. Carpenter, book3 (London: Dent).
106. Macintyre, A. (1981). After Virtue: A Study in Moral Theory (London: Duckworth and Co.)
107. Macpherson, C.B. (1962). The Political Theory of Possessive Individualism (Oxford: Clarendon).
108. __ . (1985). 'Problems of Human Rights in the Late Twentieth Century.' In The Rise and Fall of Economic Justice and Other Essays (Oxford: Oxford University Press): 21-34.
109. Mamdani, M. (1993). 'The Sun is not Always Dead at Midnight.' Monthly Review, July-August: 27-48.
110. Manor, J. (1989). 'India: State and Society Diverge.' Current

History, no. 88: 429-32.

111. Marcuse, E.S. (1986). Emancipation and Consciousness (Oxford: Basil Blackwell).

112. Marshall, T.R. (1973). Class Citizenship lind Social Development (Westport Con- necticut: Greenwood Press).

113. Marx, K. and Eqels, F. (1845-46). 'The German Ideology.' In A.W. Wood, ed. (1988) Marx Selections (London: Macmillan): 85-109.

114. --. (1848). 'Manifesto of the Communist Party.' In A.W. Wood, ed. (1988) Marx Selections (London: Macmillan): 141-68.

115. --. (1973). Selected Works in One Volume (London: Lawrence and Wishart).

116. Marx, K. (1843). 'Towards a Critique of Hegel's Philosophy of Right Introduction.' In A.W. Wood, ed. (1988) Marx Selections (London: Macmillan): 21-35.

117. --. (1844). 'Excerpt Notebooks.' In A.W. Wood, ed. (1988) Marx Selections (London: Macmillan): 36-39.

118. __ . (1852). 'The Eighteenth Brumaire of Louis Bonaparte.' In A.W. Wood, ed. (1988) Marx Selections (London: Macmillan): 122-33.

119. __ . (1859). 'Towards a Critique of Political Economy. Preface' In A.W. Wood, ed. (1988) Marx Selections (London: Macmillan): 134-38.

120. Marx, K. (1973). Grundrisse translated by M. NiCOl'US (Hannondsworth: Penguin).

121. ---. (1977). 'On the Jewish Question.' In Karl Marx. Selected Writings, edited by D. Mclellan (Oxford: Oxford University

Press).
122. ---. (1977). Capital, vol. 1 (Moscow: Progress Publishers).
123. --. (1977). Capital, vol. 3 (Moscow: Progress).
124. --. (1975). Marx. Early Writings. Introduction by L. Colletti (Hannondsworth: Penguin).
125. Meek, R.L. (1977). Smith, Marx and After. Ten Essays in the Development of Economic Thought (London: Chapman and Hall).
126. Melucci, A. (1988). 'Social Movements and the Democratization of Everyday Life.' In Keane, ed., Civil Society and the State (London: Verso): 245-60.
127. Miliband, R. (1986).' The State -in Capitalist Societies (London: Weidenfeld and Nicolson).
128. Mill, J.S. (1910). 'Considerations on Representative Government.' In Utilitarianism, Liberty and Representative Government, vol. 2 (London: J.M. Dent).
129. Mitchell, T. (1991). 'The Limits of the State Beyond Statist Approaches and Their Critics.' American Political Science Review, vol. 85, 1: 77-96.
130. Mohanty, S.P (1989). 'Us and Them: On the Philosophical Bases of Political Criticism.' Yale Journal of Criticism, Spring: 1-31.
131. Mouffe, C. (1992). 'Preface, Democratic Politics foday.' In Mouffe, ed., Dimensions of Radical Democracy Pluralism, Citizenship Community (London: Verso): 1-14.
132. Mouzelis, N. (1990). Postmarxist Alternatives: The Construction of Social Orders (Houndsmill: Macmillan).

133. Nandy, A. (1989). 'The Political Culture of the Indian State.' Daedalus, no. 118: 1-26.

134. Nathan, A.J. (1989). 'Chinese Democracy in 1989: Continuity and Change.' Problems of Communism, no. XXXVIII: 16-28.

135. Nordlinger, E. (1981) .. On the Autonomy of the Democratic State (Massachusetts: Harvard University Press.

136. ---. (1988). 'The Return to the State. Critique.' American Political Science Review, vol. 82,3, September: 875-78.

137. Offe, C. (1974). 'Structural Problems of the Capitalist State.' In K. von Beyme, ed., German Political Studies (London: Russel Sage): 31-57.

138. ---. (1975a). 'Introduction' to part 3. In L. Lindberg, R. Alford, C. Crouch, and C. Offe, ed., Stress and Contradiction in Modern Capitalism (Lexington: D.H. Heath): 245-59.

139. -. (1976). 'Crisis of Crisis Management: Elements of a Political Crisis Theory.' International Journal of Politics, 6, 3: 29-67.

140. ---. (1984). Contradictions of the Welfare State (London: Hutchinson).

141. ---. (1985). Disorganized Capitalism (Cambridge: Polity).

142. Offe, C. and Volker, R. (1975). 'Theses on the Theory of the State.' New German Critique no. 6 (Fall): 137-47.

143. Offe, C. and Wiesenthal, H. (1985). 'Two Logics of Collective Action.' In Disorganized Capitalism (Cambridge: Polity): 170-220.

144. Okin, S.M. (1991). 'Gender, the Public and the Private.' In D.

Held, ed., Political Theory Today (Cambridge: Polity): 67-90.
145. Omvedt, G. (1993). Reinventing Revolution (New York: M.E. Sharpe).
146. Parekh, B. (1993). 'The Cultural Particularity of Liberal Democracy.' In D. Held, ed., Political Theory Today (Cambridge: Polity): 156-76.
147. Patema, C. (1983). 'Feminist Critiques of the PubliclPrivate Dichotomy.' In S.1. Benn and G.I. Gaus, ed., Public and Private in Social Life (London: Croom Helm): 281-306.
148. Pelczynski, Z.A. (1984). 'Introduction: The Significance of Hegel's Separation of State and Civil Society.' In Pelczynski, ed., The State and Civil Society (Cambridge: Cambridge University Press): 1-13.
149. --. (1988). 'Solidarity and "the Rebirth of Civil Society" in Poland, 1976-81.' In J. Keane, ed., Civil Society and the State (London: Verso): 361-80.
150. Pierson, C. (1986). Marxist Theory and Democratic Politics (Berkeley, Los Angeles: University of California Press).
151. Plant, R. (1980). 'Economic and Social Integration in Hegel's Political Philosophy.' In D.P. Verene, ed., Hegel's Social and Political Thought: The Philosophy of Objective Spirit (New Jersey: Humanities Press): 59-90.
152. Polanyi, K. (1957). 'Aristotle Discovers the Economy.' In Polanyi et al., Trade and Markets in Early Empires (Chicago: Gateways 'edn.).
153. Poulantzas, N. (1972). 'The Problem of the Capitalist State.' In R. Blackburn, ed., Ideology in Social Science (London: Fontana):

230-53.
154. --. (1973a). 'On Social Classes.' New Left Review, no. 78, March-April: 27-54.
155. ---. (1973b). Political Power and Social Classes (London: New Left Books).
156. ---. (1975). Classes in Contemporary Capitalism (London: New Left Books).
157. --. (1976). 'The Capitalist State: A Reply to Miliband and Laclau.' New Left Review, no. 95, January-Feburary: 63-83.
158. (1978). State, Power Socialism (London: New Left Books).
159. Ray, A.K. (1986). 'Civil Rights Movement and Social Struggle in India.' Economic and Political Weekly, vol. 21, no. 28, 12 July: 1202-1205.
160. Riedel, M. (1984). Between Tradition and Revolution. n.e Hegelian Transformation of Political Philosophy, translated by W. Wright (Cambridge: Cambridge University Press).
161. Reidy, D.A. (1992). 'Eastern Europe, Civil Society and the Real Revolution.' Praxis International, vol. 12, 2, July: 168-80.
162. Rubin, B. (1987). 'Civil Liberties Movement in India; New Approaches to the State.' Asian Survey, vol. 27: 371-92.
163. Rudolph, L. and Rudolph, S. (1987). In Pursuit of Lakshmi: The Political Economy of the Indian State (Chicago: University of Chicago Press).
164. Rupnik, J. (1988). 'Totalitarianism Revisited.' In J. Keane, ed., Civil Society and the State (London: Verso): 263-90.

165. Sales, A. (1991). 'The Private, the Public and Civil Society: Social Realms and Power Structures.' International Political Science Review, vol. 12,4: 295-312.

166. Sardar Sarovar, The Report of the Independent Review. (1992). Chairman B. Morse. Deputy Chairman T.R. Berger (Ottowa: Resources Future International).

167. Sen. A. (1982). The State, Industrialization and Class Formation in India (London: Routledge and Kegan Paul).

168. Shah. G. (1988). 'Grass Roots Mobilization in Indian Politics'. In A. Kohli, ed., India's Democracy (Princeton: Princeton University Press). 262-304.

169. Sheth, D.L. (1991). 'An Emerging Perspective on Human Rights in India: In S. Kothari and H. Sethi., Rethinking Human Rights (New York: New Horizons Press): 31-36.

170. Skinner, Q. (1992). 'On Justice, the Common Good and the Priority of Liberty.' In C. Mouffe, ed., Dimensions of Radical Democracy Pluralism, Citizenship Community, (London: Verso): 211-24.

171. Skocpol, T. (1979). States and Social Revolution: A Comparative Analysis of France, Russia and China (Cambridge: Cambridge University Press).

172. ---. 'Bringing the State Back In: Strategies of Analysis in Current Research.' In P. Evans et al., ed., Bringing the State Back In (Cambridge: Cambridge University Press): 3-37.

173. Smith, A. (1976, 1976a). The Wealth of Nations, edited by R.H. Campbell, and A.S. Skinner, vol. 2 (Oxford: Oxford University Press).

174. ---. (1976b). Theory of Moral Sentiments (Oxford: Clarendon).

175. Staniland, M. (1985). What is Political Economy? (New Haven: Yale University Press).

176. Stepan, A. (1985). 'State Power and the Strength of Civil Society in the Southern Cone of Latin America.' In Evans et al. ed, Bringing the State Back In (Cambridge: Cambridge University Press): 317-43.

177. Strauss, L. (1953). Natural Rights and History (Chicago: University of Chicago Press).

178. Therborn, G. (1976). 'What does the Ruling Class do when It Rules? Some Reflections on Different Approaches to the Study/of Power in Society.' Insur- gent Socialist, 6, 3: 3-16.

179. Touraine, A. (1981). The Voice and the Eye: An Analysis-of Social Movements (Cambridge: Cambridge University Press).

180. Urry, J. (1981). The Anatomy of Capitalist Societies the Economy, Civil Society and the State (London: Macmillan).

181. Wagner, P. (1992). 'Liberty and Discipline: Making Sense of Postmodernity or, Once Again, Towards a Sound Historical Understanding of Modernity .' Theory and Society, vol. 21, 4: 467-92.

182. Walton, A.S. (1983). 'Public and Private Interests. Hegel on Civil Society and the State'. In S.I. Benn and G.F. Gaus, ed., Public and Private in Social Life (London: Croom Helm). 249—66.

183. Walzer, M. (1984). 'Liberalism and the Art of Separation'

.. Political Theory, no. 12: 315-30.
184. ---. (1992). 'The Civil Society Argument.' In C. Mouffe, ed., Dimensions of Radical Democracy Pluralism, Citizenship Community (London: Verso): 89-109.
185. Whyte M.K. (1992). 'Urban China: Civil Society in the Making?' In A.L. Rosenbaum. ed., state and Society in China: The Consequences of Reform (Boulder: Westwiew): 77-101.
186. Wood, D. (1992). 'Civil Society in Europe and Africa: Limiting State Power through a Public Sphere.' African Studies Review, no. 35: 77-100.
187. Wood, E.M. (1986). Retreat from Class (London: Verso).
188. ---. (1990). 'The Uses and Abuses of Civil Society.' The Socialist Register: 60-84.
189. Wright, Mills C. (1956). The Power Elite (New York: Oxford University Press).

# فەرهەنگۆك

استیلا: هەژمونی
اسطوره شناسی: میسۆلۆژی
الگو: سەرچەشن
امتیاز: سەرەتی-ئیمتیاز
اولویت: ئەولەوییەت
بعد: رەهەند
تحلیل: راڤە
جزئی: هەندەکی
خاستگاه: ئاخێزگە-چاوگ
دستورکار: رێکار
دولت محور: دەوڵەتتەوەر
دیگران: ئەوانیتر
سازوکار: ئالییەت، میکانیزم
عنصر: توخم
فراگفتمان: میتاگوتار
کلی: هەمەکی
کلیت:هەمەکییەت

گفتمان: گوتار
متمرکز: چەقبەستوو
محافظە کار: کۆنسێرڤاتیزم-پارێزکار
مشروعیت: رەوایی
مطلق: رەها
معادلە: هاوکێشە
مفهوم: چەمک
مفهومی: واتایی
مقولە: وتەزا
منطق: لۆژیک
نظریە پرداز: تیۆریسیەن
نظم: رێکی – نەزم
نقطە نظر: روانگە